نەوشیروان مستەفا ئەمین

# لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ

## دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عیراق

## ۱۹۷۵-۱۹۷۸

خودایا ! بەسیە ئیتر لابەری دەیجوری ئیضمیحلال
طلوعێ پێ بکە خورشیدی رۆژی پاکی ئیستقبال
لەگەڵ خولیای هیجرتدا بەسەر چو عومری شیرینم
دەسا نۆبەی ویصالە ,ئاه.....
ئەی ئومێدی ئیستقلال !

(م.نوري ۱۹۹۲)

# ناوەرۆک

له نزیک سلیمانی: گەرانی بەردەوام

له شەمەزینانەوە بۆ شارباژیر. ناوی شوێن. بەنداوی دوکان. دولی جافەتی. ریکخستنەوەی کاروباری هەریم. زەردە و دەرزی. ق م له ناوچەی سلیمانی. هاتنی خالید و شیخ حسین بۆ ناوچەی سلیمانی. پاسوک. شیخان. شلیر. کوژرانی ئارام. تیکەوتن له چنگنیان. راوەکەو. زی ی پچوک. ل ١٩١ - ٢٤٥

نزکان: سەرەتای کارەسات

شەری دەشتیو. کوبونەوەی کادرەکانی کومەلە. کیشە له ناو بزوتنەوەدا. دەفتەری سەروەری. راگویزانی سنور. دوەمین کوبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی. گەرانەوە بۆ ناوچەی ٣ سنور. دیسانەوە ق م. بە ری کەوتنی هیزەکانی یەکیتی بو ٣ سنور. ل ٢٤٧ - ٢٧٦

هەکاری: شانوی کارەسات

هیزە چەکدارەکانی عیراق، ئیران، تورکیا. دژوارییەکانی ریگا. شەری بازی. کشانەوە و لەتوپەت بون. دوایین شەر و نە ناوچونی یەکجاری. ل ٢٧٧ - ٢٩٥

قەندیل: هەستانەوە

دولەنی و مراد شیریۆ. هەوالنامە. دولی بالەییان. سەراسیٚ و شەوبیداری. کوشتنی عەلی عسکەری و خالید سەعید و شیخ حسین. کوری روژنامەوانی صەددام. ٣ حاجی. زلکردنی دوژمن. ماموستا عەزیز له داوی دوژمن دا. مفە حەیاتەکە. «تقییم» ەکەی د. مەحمود. هەلگرتن - رەدوکەوتن. ئائارامی له جەزیرەی ئارام دا. بوشایی سیاسی له کوردستانی ئیران دا. هەستانەوەی سیاسی، پیشمەرگەیی، ریکخراوەیی.. یەکیتی. ل ٢٩٧ - ٣٥٦

خری ناوزەنگ: پایتەختی شورش

کوبونەوەی کادرەکانی کومەلە. شەری شینی. دامەزراندنی بنکەکانی سەرکردایەتی. ل ٣٥٧ - ٣٦٢

بەلگە

# پیشەکی

ئەم کتیبە، ئەلقەی یەکەمە لە زنجیرەیەکی پینج ئەلقەیی، کە چیرۆکەکانی دیوی ناوەوەی روداوەکانی سالانی ١٩٧٥ - ١٩٩٦ ی کوردستانی عیراق ئەگیریتەوە. ئەگەر خوای گەورە یار و جەوهەری شیرین باقی بی، بە دوای یەک دا بلاویان ئەکەمەوە.

*

روداوەکانم لە روانگەی خۆمەوە بە شیوەی «ریپۆرتاجی رۆژنامەوان» نوسیوەتەوە. تێیالی گشت هەوال و دەنگوباسەکانی، ئاگاداری و زانیارییەکانی، بیر و بۆچونەکانی، سەرنج و تیبینیەکانی، گیرانەوە و هەلسەنگاندنەکانی... بە تەنیا لە ئەستۆی خۆم دایە.

بیگومان من لە نوسینەکەم دا ناتوانم بیلایەن بم، چونکە خۆم لە کیشەکان دا لایەن بوم، بۆیە لە باتی ئەوەی خوینەر رەخنەی بیلایەن نەبونم لی بگری، باشترە داوا لە کەسانی پەیوەندیدار بکا ئەوانیش بیرەوەرییەکانی خۆیان لە باری سەرنجی خۆیانەوە بنوسنەوە.

*

کاتی خۆی من جیگایەکی ئەمینم نەبو نامە و نوسراو و بەلگەی تی دا هەلبگرم، لە بەر ئەوە زۆر کەم شتم هەلئەگرت، بە تایبەتی بەیان و بلاوکراوە و کتیب و گۆڤار و رۆژنامە... و، ئەوی هەلیشم گرت بو سالی ١٩٩٠ هەمویم تیکەلاوی ئارشیفە دەولەمەندەکەی مام جەلال کرد. ئەو ماوەیەی خەریکی نوسینی ئەم ئەلقەیە بوم، دەستم نەیانگەیشتی. نەیشمویست بەو هۆیەوە دوای بخەم. کی ئەزانی چەند ئەژی و، چۆن و کەی و لە کوی ئەمری؟ ویستم تا خۆم زیندوم و، زۆر لەوانەی ناویان لەم پینج ئەلقەیەدا دی زیندون، بلاو ببیتەوە.

لیرەدا بە پیویستی ئەزانم لە ناخی دلەوە سپاسی هەردو دۆستی بەریزم: د. فوئاد مەعصوم و، د. لەطیف رشید بکەم. هەردوکیان بەوپەری دلسۆزییەوە ئارشیفەکانی خۆیان خستە بەردەستم بۆ ئەم نوسینە کەلکیان لی وەربگرم. ئەگەر چاکەی ئەو دو جوامیرە نەبوایە ئەم کارەم بەمجۆرە بۆ تەواو نەئەکرا.

لەندەن، ١ ی شوباتی ١٩٩٧

نەوشیروان

# ڤییەننا: بوکی رازاوە

*

مارتی سالی ١٩٧٥ کە تاشەتال بو، ٣ سال زیاتر بو من لە ڤییەننا بوم.

ئەوسا کوردی عیراق لە ئەوروپا بە گشتی و، لە نەمسە بە تایبەتی زور کەم بون. ئەوانەی لە ڤییەننا بون بە پەنجەی دەس ئەژمیردران:

کونترینیان د. وریا رەواندزی بو کە لە سەرەتای پەنجاکانەوە لەوی جیگیر بوبو و پزیشکی پسپوری نەخوشییەکانی هەناو بو. عومەر دزەیی لە سەفارەتی عیراق کاروباری وەرگیرانی روژنامەوانی ئەکرد. وریای ئەحمەدی قازی و بەختیاری برای. وریا لەشەستەکانەوە لەوی ئەژیا و کاری ئەکرد. فوئادی مەلا مەحمود سەرەتای حەفتاکان چوبوە ڤییەننا. فوئاد هاورییەکی زور نزیک و خوشەویستم بو، بە خوشیی ئەوەوە منیش چو بوم بو ئەوی. دواییتر یەکدوکەسی تریش هاتن.

ژمارەی کوردی ئیران لە کوردی عیراق کەمتر بو. لە ناو ئەوان دا کەریمی پیروتی دیار بو، کە تیکەلاوی کوردەکانی تر ئەبو.

ژمارەی کوردەکانی سوریاش لە پەنجەی دەس تیپەری نەئەکرد.

ژمارەیەکی زور کریکاری کوردی تورکیا لە نەمسا بون. بەلام هیشتا جولانەوەی سیاسییان تی نەکەوت بو. زور کەم بەشداری چالاکی سیاسی ئەبون.

لە ناو ئەم کومەلە کوردییە پچوکەدا چەند کەسی لە کوردەکانی سوریا لە هەموان چالاکتر بون. هەندیکیان بوبون بە ئەندام و بەرپرس لە پ د ک ی عیراق و کومەلەی خویندکاران دا. کاریان بو ئەوان ئەکرد.

ئیمە: کوردەکانی عیراق، ئەگەرچی ناوبەناو یەکتریمان ئەبینی و ئەچوین بو گەران و پیاسە و سەیران و، هەمو نەوروزی ئاهەنگمان ئەگیرا و، ئەگەر بونەیەکی گرنگ بهاتایەتە پیشەوە کو ئەبوینەوە، بەلام هەر کەس خەریکی کار و ژیانی تایبەتی خوی بو. یەکیکی تازەی وەکو من ئەبو بو راپەراندنی کارەکانی خوی پشت بە خوی ببەستی. هەول بدا بە زویی زمان فیر ببی و، شارەزایی پەیدا بکاو، تاسپاو بو خوی بدوزیتەوە.

نە من و نە کیچکام لە کوردەکانی عیراق ئەوسا نەبوبون بە پەنابەری سیاسی. پەنابەری سیاسی لە ناو کوردەکانی عیراق دا هەر نەبو، یان ئەگەر بویی زور دەگمەن بو.

من خویندکار بوم لە زانستگای ڤییەننا، کە یەکیکە لە زانستگا کونەکانی

ئەوروپا. وەزارەتی خوێندنی بەرز موافەقەتی بو کرد بوم لە یەک کات دا دو خوێندن تەواو بکەم: زانستی سیاسەت لە «فاکولتیتی فەلسەفە» و، پەیوەندی ناودەولەتان لە «فاکولتیتی قانون». ماموستای سیاسەتم پروفیسوری زانستگا «هاینریک شنایدەر»، سەروکی ئینستیتوتی پولیتولوگی و، ماموستای پەیوەندی ناو دەولەتانم پروفیسوری زانستگا «شتیفان ڤیروستا»، سەروکی ئینستیتوتی قانونی ناودەولەتان بو. دوستایەتیم لە گەڵ هەردو پروفیسور و، هەندی لە ماموستاکانی تر و، لە گەڵ زور خوێندکاری نەمسایی دامەزراند بو. وا باوە کە نەمسایی گیانی خوبەزلزانینیان تی دایە و، بە چاوی سوک سەیری بیگانە، تەنانەت، هی ئەوروپاییش ئەکەن، بەڵام کە تیکەڵاویان ئەبی ئەم قسەیە هیچ مەعنایەکی نامینی. ناسک و قسەخوش و میواندوستن. لە دوستایەتی دا دلسوز و سەرراستن. لە پیویستی دا بە پی ی توانا بە دەنگتەوە دین.

سەرەتا چەند جاری جیگورکیم کرد لەم ژورەوە بو ژوریکی تر. پاشان جیگیر بوم. سالی زیاتر لە فلاتیکی سەر شەقامی گشتی «گویرتل» و، پاشماوەی ماوەی مانەوەم لە ڤیەننا لە ژوریکی «خانوی جیهانیی خوێندکاران» بوم لە شەقامی «شتارکفریدگاسە». خانوەکەمان هی ژوری بازرگانی بو، جیگاکەمان تا بلی ی خوش و، کەشی ناو خانوەکە بو خوێندن و لیکولینەوە نمونەیی بو. هەمو خوێندکاریک ژوریکی سەربەخوی هەبو. تەوالیت و شوینی دروستکردنی خواردنی هەر ۱۰ خوێندکار پیکەوە بو. باخی گەورە، ئەستیلی مەلە، مەیدانی یاری، هولی ئاهەنگ، شوینی تایبەتی تەماشای تەلەفزیون، قاوەخانە و ریستورانتی تی دا بو. ئوتیلیکی ریکوپیکی پچوکیش لە ناو بلوکی ئەم خانوانەدا تەرخان کرا بو بو میوانی خوێندکارەکان. کاتی وچانی هاوینەی زانستگا هەمو خانوەکانیان ئەکرد بە ئوتیلی توریستی. کاتی خوی کە لە زانستگای بەغداد ئەمخوێند ماوەیەکی کورت لە «مدينه الرشاد» بوم، خومم پی نەگیرا، بە جیم هیشت، دوا سالی لە «دار الطلبە» بوم، گوایە ئەمە باشترین خانوی خوێندکاران بو، تەرخان کرا بو بو خوێندکارانی دوا پولی زانستگا، ٦ خوێندکار پیکەوە لە یەک ژوردا بوین.

زانستگای ڤیەننا وەرزشی بو هەمو خوێندکارەکانی لە هەر تەمەن و، پلەیەکی شارەزایی و، لە هەر بابەتیکی خوێندن دا بوایە، دابین کرد بو. من بە منالی وەرزشکار نەبوم. باوکیشم هەرگیز هانی نەدابوم بو یاری و وەرزش. بەڵام لە نەمسا تیگەیشتم وەرزش بەشیکی پیویست و گرنگی ژیانە.

دارستانی ڤیەننا «ڤیەنەر ڤالد» زور دور نەبو لە خانوەکەمانەوە. زور جار بو پیاسەی دریژ ئەچوم بو ئەوی. لیرەواریکی چروپر و فراوان بو. بە پی ی رویشتن وەرزشیکی

باو بو، زور کەس بو ئەم وەرزشە ئەهاتن بو ئەوێ و، هەندێکیان بە درێژایی روژەکە لەوێ ئەمانەوە. جگە لەمەش لە زانستگا چو بومە کورسی دو جور وەرزشی خوشەوە: جومناستیک و شاخەوانی.

بو هەردو باری جلوبەرگ و کەلوپەلی تایبەتی خوی پێویست بو.

جومناستیک لە هولەکانی ناو زانستگا و، لە روژانی خوێندن دا بو، بەلام شاخەوانی لە روژانی کوتایی هەفتە و، لە شاخەکانی دەرەوەی ڤیەننا بو، زور جار شەوانی یەکشەممە لە شاخ ئەمایەنەوە. لەو ولاتە شاخاوییانە، لە کونەوە خێرومەندەکان خانوی زوریان لە چیاکان دروست کردوە. رێبوار و راوکەر و شوانەکان بە شەو وەکو «نوا» یەکی گەرم و ئەمین تیایان دا ئەمێننەوە.

شاخەوانیی لە ئەمسا باو بو. چەندین یانەی هەبو. راهێنەرەکانی ئێمە هەر یەکەیان مەشقی بە گروپێکی ٦ کەسی ئەکرد و، ئەیان کردین بە تاقمی دوکەسی. هەردوکەس پێکەوە بە شاخ دا هەلئەگەران بو ئەوەی لە کاتی پێویست دا یارمەتی یەکتری بدەن. هەندێ لەو شوێنانەی مەشقمان لێ ئەکرد گوری ئەوانەی لێ بو کە لە شاخەکە هەلدێرا بون. راهێنەرەکانی ئێمە هەمو کەسانی لێهاتوی شارەزا و، لەوانە بون بە هیمالایادا هەلگەرا بون.

لە هەردو وەرزش دا من نەشارەزا بوم. لە سەرەتاوە دەستم پێ کرد و، تا گەیشتمە قوناغی ناوەڕاستی رویشتم، ئیتر وازم لێ هێنان.

سواری یەکێکە لە وەرزشە ئاریستوکراتیەکانی خەلکی ئەمسا. لە کونەوە فێرگەیەکی سواری بە ناوبانگی لێ بە ناوی: «فێرگەی سواریی ئیسپانی» یە و، رەسمێکی تایبەتی ئەسپیشیان هەیە. هاوڕێیەکم هەبو حەزی لە سواری ئەکرد. جارێکیان پێکەوە چوین بو یانەیەکی سواری بو چەند سەعاتێک ولاخیان لێ بە کرێ بگرین. کابرای ولاخدار لە منی پرسی: «سواری ئەزانیت؟». وتم : «بەلێ». ئەسپێکی بو هێنام وتی: «سواری بە!». منیش یەکسەر خوم هەلدایە سەر پشتی. هێشتا بە سەر پشتی ئەسپەکەوە بوم لێ ی پرسیم ئەگەر ویستم غاری پێ بکەم چی لێ ئەکەم.

منیش وتم: «بە پاژنەی پێلاوەکانم لە ورگی ئەژەنم».

کابرا یەکسەر وتی: «دابەزە!». دابەزیم. وتی: «هەرگیز ولاخ بە تو نادەم سواری بیت».

قسەکەیم بەلاوە سەیر بو وتم: «بوچی؟»

وتی: «من ولاخەکانم بە نوقل و پسکیت بە خێو ئەکەم، جەنابیشت لێ یان

ئەدەی، لیرە لە ولاخ نادەن بە رەشمەکەی ئیشارەتی ئەدەنی»
چەندی لە گەلی خەریک بوم کابرا تەی سەلماند، وتی: «تو بە لیدانی راهاتویت، تازە ناتوانی شیوەی سواری خوت بگوری»

*

ڤییەننا یەکیکە لە شارە هەرە خوشەکانی دنیا.
ناوەندیکی گرنگی دیپلوماسی و موسیقا و فەلسەفە بوە و، ئیستاش ناوەندیکی خوشبیی توریزمە. سەدان فەیلەسوف، زانا، سیاسی، موسیقار، ئەدیبی گەورەی تی دا هەلکەوتوە کە ناوبانگیان بە هەمو دنیادا بلاو بوتەوە. تەنانەت هیتلەریش نەمسایی بوە.
خەلکی ڤییەننا ئیستاش شانازی بەوەوە ئەکەن کە دو جار ئوردوی زەبەللاحی تورکیان لە بەر دیوارەکانی شارەکەیان دا شکاندوە و، نەیانهیشتوە شارەکەیان داگیر بکری. یەکی لە موزەخانەکانی بو ئەم شەرانە تەرخان کراوە. دەواری ئاغاکانی کوردیشی تی دایە کە لە ئوردوگای تورک دا، دوای شکاندنیان، بە تالان گیراوە.
بارەگای ریکخراوی «ئوپیک» و، چەندین ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەوانە «دەزگای جیهانیی وزەی ئوتوم» لە ڤییەننایە. نەتەوە یەکگرتوەکان شاریکی تایبەتییان لە ناو ڤییەننادا هەیە.
ڤییەننا دەیان کوشکی دیرینی شاهانە و، دەیان موزەخانەی جوراوجور و، دەیان پارکی رەنگینی خوشی تی دایە. بورگ تیئاتر، شتاتس ئوپەر، کونسەرت هاوس... ٣ جیگای کەم وینەن لە دنیادا. رازاندنەوەی دەرودیوار و بنمیچی بیناکان و، کورسی و پەردە و کەلوپەلی ناوی. تەماشاکەران: ئافرەتەکان، هەمو جوانترین و گرانترین جلوبەرگیان لە بەر کردوە و، پیاوەکان هەمو بە قاتی رەش و کراسی سپی و بوینباخەوە، لە وچانەکانی نیوان پەردەکان دا، هیمن و بیدەنگ، لەسەر خو و، بە ریز و سەربەرزییەوە بە یەک دا دین و ئەچن. من کە ئەچوم بو ئەم شوینانە وام ئەزانی لە دەرباری قەیسەر دام. لە ناو ئەو پارچانەدا کە ئەو سەردەمە بو تەماشا کردنی چوم: «ئایدە» و، «زەماوەندی شای قەرەجەکان» ی شتراوس بو.
لە سەر جادەی بەناوبانگی «رینگ» باخی شار هەیە. دەرگایەکی سەفارەتی عیراقی بەرامبەر بە دەرگایەکی ئەم باخە بو. تیپیکی موسیقا لەم باخەدا تایبەت بو بە دوبارەکردنەوەی ئاوازەکانی شتراوس. من هەندی جار بە تایبەتی بو گوی گرتن لەم ئاوازە خوشانە بە تایبەتی پارچەی «دانوبی شین» ئەچوم بو باخی شار.
«پراتەر شتیرن» کە شاری یارییە و، باخی «شوینبرون» کە کوشکی قەرالیچە

ماریا تریزا بوه و، «تیـیـر گارتن» کـه بیشـەلانی درنده و مـەلی کـیـویـیـە، له شـوینه خوشەکانی گەران و سەیران بون.

زورم حەز له دانیشتنی روژانەی قاوەخانەکانی ڤییەننا بو. دانیشتنی قاوەخانەکانی تام و لەززەتیکی تایبەتی هەیە. شیرینی و کـاری هەویری نایابیان تی دا دەس ئەکەوی. ریکوپیک و هیمن و جوانن، سەرەرای ئەوەش زوربەی روژنامـە و گوڤـارەکـانی نەمسـا و ئەلمـانیا و، هەندی جار هی ئەمەریکاو بەریتاناشی بە تازەیی لی دانراوە بو خـویندنەوە. لەو شـوینە خـوشـانەی کـە حـەزم ئەکـرد شـەوان لە گـەڵ دوست و هاوری و، میـوان بچم «ئوگوستینە کیلەر» و «۱۲ ئەپوستل کیلەر» بە زستان و، مەیخانەکانی «گرینسینگ» بە هاوینان. ئەو جورە مەیخـانانە شتی تایبەتی ڤیـیەننان. زور جـار شـەوان لە گـەڵ فـوئاد و عومەر ئەچوین بو ئەم شوینانە.

زور شـوینی ناو ڤـیـیەننا شـارەزا بوم و، زور شـار و ناوچەی نەمـسـە گـەرام. چەند جاری چوم بو بورگنلاند، شتایەرمارک، تیرول و، شارەکانی لینتز، سالسبورگ. لەمەش دا بە زوری قەرزاری دوسـتیکی لینتزی: گیـردا مـاوکس بوم. جگە لەوەی زوری یارمـەتی دام بو فیر بونی زمانی ئەلمانی، زوریش یارمەتی دام بو شارەزا بونی ژیانی کومەلایەتی و روشنبیری و هونەریی خەلکی نەمسا.

هەمو سالی ژوری بازرگانی یەکی لە هەریمەکانی نەمسـا، خویندکارە بیانیـەکانی خانوەکەی ئیـمـەیان بانگهیـشتن ئەکـرد بو سـەردانی ناوچەکـە و، پیـشـان دانی نیـشـانە پیشەسازی و بازرگانی و توریستی و روشنبیرییەکانی. جاریکیـان منیش لە گەلیان چوم بو «شـتـایەرمـارک» حـەفـتـەیەک مـاینەوە. لەو شـوینانەی پیـشـانیـان داین: کـارگـەی دروستکردنی تفەنگ، کوتال، مەکینەی کشتوکال، ئیستگای بەرهەمهینانی کارەبای... بو. چیاکانی کوردستان شوینی زور و لەباری لەو بابەتەی لی یە بو دامەزراندنی ئەو جورە ئیستگانەی لەم ناوچەیەدا بو بەرهەمهینانی کارەبا دایان نا بو.

گەلان بە جوری جیا جیا ریز لە پیاوە هەلکەوتوەکانیان ئەگرن. لە مەیدان و شەقام و باخ و کـوشک و زانسـتگاکـان دا بە سـەدان پەیکـەری پیـاوە هەلکەوتوەکـانیـان داناوە و، شـەقـام و کـولانیـان بە ناوەوە نـاو ناون. خـانوی هەندیکیـان کـردوە بە «مـوزەخـانـە» بو تەماشاکردنی گشتی. سـتالین مـاوەیەک لە ڤیـیەننا ژیاوە. یاسـە بە ناوبانگەکـەی لە سـەر «نەتەوە» لەوی نوسـیـوە. پلیـتـیـک بە دیواری ئـەو مـالەدا هەلواسـراوە لـە سـەری نوسـراوە ستالین فلان سال لەم خانوەدا ژیاوە و، یاسەکەی لە سەر نەتەوە لیرەدا نوسیوە.

سالسبورگ پایتەختی هاوینەی قەیسەرەکانی نەمسا بوە. شاریکی بچوکی خوشە.

هەمو سالی ئاهەنگی جیهانیی موسیقای لی ساز ئەکرا. تیپە بەناوبانگەکانی فیلهارمونیکا بەشداریـیـان تی دا ئەکـرد و، ئاوازە کـلاسـیکـیـەکـانی مـوزارت، بیـتـهـوڤن، هایدن، باخ، دفورشـاک... تی دا دوبارە ئەکرایەوە. هاوری یەکی سالسبورگیم: توماس کراوس، چەند جاری بانگی کردم بو مـالی خویان میوانی ئەو ئەبوم. ئەو فلاتەی کاتی خوی «موزارت» ی تی دا ژیـا بو کـرا بو بە مـوزەخـانە. هەندی لە کـەلوپەلەکـانی و نوتەکـانی و ئامـرازە موسیقییەکانی لی دانرا بو.

*

ئەو مـاوەیەی من لە ڤـیـیـەننا بوم هەندی لە کوردە ناسـراوەکـان بو گەشت و گـەران سەردانی ڤییەننایان ئەکرد لەوانە: مامجەلال کە تازە ژنی گواست بوەوە، رەحمانی زەبیحی، رەشـیـد عـارف، سـامی حسـیـن ناظم، د. مـحـمـد باقـر و، د. ئومـیـد مـدحـت مـوبارەک، د. موراد عەزیز.

د. موراد چاکەی تایبەتی بە سەر منەوە هەبو. کاتی خوی لە بەغدا گیرم خوارد بو نەمـئـەتـوانی دەربچم چونکە چەندین «مـەنـعی سـەفـەر» ی کـون و تازەم لـە سـەر بو. د. موراد، بە هوی زەبیحییەوە، یارمەتی دام لە بەغدا دەرباز بوم.

سەرهەنگ نەوائی کە یەکی بو لە ئەفسـەرانی بەشداری روداوەکانی ئازەربایجان و، مـاوەیەکی دریژی لە سـوڤـیـت و چین بە سـەر برد بو. مـاوەیەکـیش لـە بەغـدا بو. لە گـەل خـیـزانەکـەی هاتە ڤـیـیـەننا. هاوسـەرەکـەی ناسـاغ بو. زەبیـحی فـوئاد و منی راسـپـارد بو یارمەتی بدەین. نەوائی پیاویکی روشنبیر و نەجیبزادە بو.

*

زەبیحی دو سال لە سەر یەک بو گەشتوگەران هات بو ڤییەننا. بەشیکی لە خوشی فـوئادی مـەلا مـحـمـود و من بو. هەردوجـار زوری کاتـەکـەی لە گـەل من و فـوئاد بە سـەر ئەبرد.

لیرەدا بە پیویستی ئەزانم لە ئاستی ئەم پیاوە گومناوەدا ئیستیک بکەم.

هەرچەندە تەمەن و بیروبوچونمان لە زور لایەنەوە جیاواز بو بەلام رەحمانی زەبیحی دوسـتـیـکی خوشـەویـست و دلسـوزم بو. تیکوشـەریکی کولنەدەری ریگەی کـوردایەتی بو. زەبیحی لە سابلاغی موکریان لە دایک بوبو. بە گەنجی تیکەلاوی جولانەوەی کـورد بوبو. یەکی بو لە دامەزرینەرانی کومـەلەی «ژ ک» و، تا هەلوەشانەوەی سکرتیری بو. دوای ئەوە بو بە ئەندامی کومـیـتـەی ناوەندی حـیـزبی دیموکـراتی کوردسـتـان. دامـەزرینەری گـوڤـاری نهـینی «نیشـتـمـان» بو. زور وتاری سـیـاسی لە گوڤـاری «نیـشـتـمـان: بلاوکەرەوەی بیری

کـومـەڵەی ژ ک» و ڕۆژنامـەی «کـوردسـتـان: بڵاوکـەرەوەی بیـری حـیـزبی دیمـوکـراتی کوردستان» دا بڵاو کرد بووەوە. دوای ڕوخانی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد بە نهێنی هاتبووە عـیـراق. پاش مـاوەیەک لە عـیـراق ئاشکرا ئەبی ئەچی بۆ سـوریا. لـە سـوریا بە عەرەبی نامـیلکەیەکی نوسی بو بـە ناونیشـانی «الرد علی الکوسمـوپولیتـیـە» ویست بوی تیـا بسـەلمێنی کـورد بە گوێرەی تیگەیشـتنی سـتالـین نەتەوەیە. لە سـوریا بەشـداریـیـەکی کـاریگەری کـرد بو هاندانی دامـەزراندنی «پارتی دیمـوکـراتی کـورد». پاشـان گـەڕایەوە کوردستانی عیراق لە ناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان کاری ئەکرد. مـاوەیەک ئەندامی کـومیـتـەی ناوەندی و مـەکـتـەبی سیـاسی بو. لە دەسـپـیـکردنی شـورشی ئەیلول دا لیپرسراوی لقی کەرکوک و، دواییتر لیپرسراوی لقی بەغداد بو.

زەبیـحی خـونەویسـت و دل و دەرون فـراوان و نەفس بەرز بو. هەتا بلی ی نـتم بو. روداوەکانی ژیانی سیاسی و ئەدەبی خوی باس نەئەکرد. تەنانەت ئەوەی ماوەی زوریشی بە سەردا تی پەری بو.

زەبیـحی نوسـەر و ئـەدیب و روژنامـەوان بو. چەندین زمـانی ئەزانی. زور شـارەزای زمـان و ئەدەب و مـیـژوی کـورد بو. لە مـیـژ بو خـەریکی نوسـینی فـەرهەنگی کـوردی – کوردی بو. لە کوتایی شـەسـتـەکان دا منی راسپـارد لە سلیمـانی «فـەرهەنگی مـەردوخ» و هەندی شـتی تری لەو بابەتەی بو پەیدا بکەم. زور جار سـاخکردنـەوە و لیکدانەوەی وشـەی سلیمانی و دەوروبەری لی ئەپرسیم.

دوەم جـار کە بینیم زوری لە گـەڵ خـەریک بوم لە ڤـیـیـەننا بمینیـتـەوە تا خـەریکی تەواو کردنی فەرهەنگەکەی بی. فوئاد و من پیشنیـارمان بو کرد بو خو خەریک کردن و دابینکردنی ژیانی، دوکانیکی کتیبفروشی کتیبی عـەرەبی و فـارسی و تورکی دابنی و، ئیـمەش یارمەتی بدەین. ئەوسا کتیبفروشی وەها لە ئەوروپا نەبو، یان ئەگـەر هەشبوبی بە ناوبانگ نەبو. زەبیحی پیشنیارەکەی قوبوڵ نەکرد و سور بو لە سەر گەڕانەوەی بو عیراق. هەندی بیـانوی هینایەوە بو من قـانعکەر نەبو. بە تایبـەتی زەبیـحی خەلکی کـوردسـتـانی عیراق نەبو، ژن و منال و خزم و کەسوکاری لەوی نەبو. هەتا مردیش هەر رەبەن بو.

مەلا مستەفای بارزانی رقی لی ی بو، چونکە ئەو وەکو هەژار، خوی بە لای ئەودا نەخست بو.

سـەرانی دیمـوکـرات، بە تایبـەتی د. قـاسـملو، حـەزیان لە چارەی نـەئەکرد، چونکە کـاری لە گـەڵ ئەوان نـەکرد بو. زەبیـحی باوەری وابو هـەر کوردی کـەوتە هەر پارچەیەکـەوە پیویستە خزمەت بەو پارچەیە بکا.

حیزبی بەعس قینیان لی ی بو. چونکە بە دوستی مامجەلال و ئیبراهیم ئەحمەدیان دائەنا. جاریک گیرا و چەند مانگی لە زیندان دا بی سەروشوین بو. ئەشکەنجەی زوریان دا. هاوسەرەکەی جەنەرال تەیموری بەختیار بوی تی کەوت لە گرتن و مردن رزگاری کرد.

لە دوا سالەکانی تەمەنی دا هەلەیەکی سیاسی گەورەی کرد، چوە ناو یەکی لە حیزبە کارتونییەکانەوە، لە کاتیک دا نە ئەو پیویستی بە مە هەبو، وە نە لەو ریگایەشەوە ئەیتوانی خزمەتیکی کورد بکا.

دوای روخانی شا، زەبیحی سەردانی کوردستانی ئیرانی کرد. لە گوندی شینی جاریکی تر بینیمەوە. پیشنیارە کونەکەم بو دوبارە کردە: کە لەوی بمینیتەوە و خەریکی تەواو کردنی فەرهەنگەکەی بی. بە تایبەتی لەو کاتەدا تایپرایتەری تازە بابەت داهات بو، کومپیوتەر پیشکەوت بو، ئەیتوانی کەلکیان لی وەربگری. دیسان نەی سەلماند. مانەوەی پروژەی فەرهەنگەکە بە ناتەواوی خەسارەتیکی گەورە بو بو زمانی کوردی. زەبیحی زورتر خوی بە تیکوشەر و سیاسی ئەزانی تا زمانەوان و ئەدیب، لە کاتیک دا کەم کەس زەبیحی وەکو تیکوشەری سیاسی ئەناسی، کەچی زور کەس وەکو زمانەوانیکی گەورە سەیری ئەکەن.

زەبیحی دو بەرگی لە فەرهەنگەکەی بلاو کردەوە. هەرچی دیویتی بە شاکاریکی زمانەوانی دائەنی. فریا نەکەوت بەرگەکانی تری بلاو بکاتەوە لە هەلومەرجیکی ئالوزدا لە ناوچەیەکی سنوری نیوان کوردستانی ئیران و عیراق بی سەروشوین بزر بو. وەکو ئەلین مسودەی بەرگەکانی تری فەرهەنگەکەی کەوتوتە لای دەزگا ئەمنییەکانی عیراق، چونکە مالەکەی لە بەغدا بو.

*

لەو کاتەوە کە چو بوم بو فیینننا هەولم ئەدا خوم لە روداوە سیاسییەکانی کوردستانی عیراق دور رابگرم. بەشداری هەندی لە کوبونەوەکانی خویندکاران ئەبوم بەلام کەم تیکەلاوی چالاکی پارتایەتی ئەبوم. بە دریژایی ئەو ماوەیەی لەوی ئەمخویند هاوبەشی هیچ کونگرەیەکی خویندکاران نەبوم و، بو هیچ کونفرەنسیکی پارتی نەچوم. زورتر لە گەل چەپەکانی ئیران تیکەلاو بوم. لەبەرئەوە عەرەبەکان وایان ئەزانی من ئیرانیم و، ئیرانییەکانیش، چونکە فارسییەکەم «غەلیز» بو وایان ئەزانی من ئەفغانیم.

ئەوسا لە نیوان کورد و حکومەتی بەعس دا هیشتا ئاشتی بو. نیوانی ئیمەش لە گەل سەفارەت ئاسایی بو. بو ئاهەنگە رەسمییەکانیان بانگیان ئەکردین. بە ریکوپیکی روژنامەکانی بەغداد: «الثورە» و «الجمهوریە» یان بو ئەناردم. بە هوی پارتیشەوە جاروبار

«التاخی» م ئەبینی. شازاد صائیب و بەختیاری برام بە ریکوپیکی گوڤار و کتیبە کوردیەکانیان بو ئەناردم.

*

خویندکاریکی کوردی سوریا نامیلکەیەکی کورتیلەی بە زمانی ئەلمانی لە ژیر ناوی: «کورد: گەلیکی بی دەولەت» نوسی بو. هەندی زانیاری سەرەتایی و گشتی لە سەر کورد و نیشتمانەکەی تی دا بو. بو ناساندنی کورد بە کەسیکی نەشارەزا شتیکی باش بو. نەخشەیەکی فراوانکراوی کوردستانی لە سەر بەرگەکەی کرد بو، لای خواروی لە سەر خەلیج و لای روژئاوای گەیشت بوە سەر دەریای سپی ناوەراست. نامیلکەکە بە ناوی «لقی نەمسای کومەلەی خویندکاران» ەوە بلاو ئەکرایەوە.

چەند جاری کوبونەوەی لە سەر کرا و، ناوەروکەکەی خرایە بەر باس و لیکولینەوە. لە سەر نەخشەکەی کوردستان من هەندی بوچونم دەربری. کورتەی قسەکانم ئەمە بو: «ئەمجورە نەخشەیە گەلانی دراوسی ئەترسینی و، دژی کورد ئەیان وروژینی، چونکە هەندی شوین خراوەتە ناو سنوری جوگرافی کوردستانەوە، ئیستا بە ئەرزی کورد دائانرین، رەنگە هەبی بلی: کورد هیشتا دەولەتی نیە چاوی بریوەتە ئەرزی گەلانی تر، ئەبی ئەگەر دەولەت و لەشکری هەبی چی بکا؟»

قسەیەکی زور کرا لە سەر دەسکاری نەخشەکە. چەند کەسی تریش قسەیان کرد. کوریک لە کورەکەدا بو، ناوی «حەننان»، خەلکی چیای کرمانج بو لە سوریا و، تەندروستی ئازەلی ئەخویند. سور بو لە سەر هەلویستی خوی، زور بە گەرمی دیفاعی لە باری سەرنجی خوی ئەکرد، ئەیوت: «ئەوانە هەزار سالە کوردستان تالان ئەکەن، لە باتی تەعویضی ئەوە، من بە پارە لی یان رازی نابم، ئەرزیان لی وەرئەگرم». هەرچی کردمان و کوشاین ئیستا و ئەوسا بیانوەکانی ئیمەی نەسەلماند و پیلەبازیەکەی بەوە بریەوە: «ئەز دەڤ ژ بەحری بەر نادەما»، واتە من دەس لە دەریا بەر نادەم. دەسکاری نەخشەکەی نەکرد.

پی ی وابو من گرنگیی هەبونی دەریا نازانم، و نازانم نەبونی سنوری دەریایی چ کاریکی خرایی کردوتە سەر چارەنوسی سیاسی کورد، بویە من دەستم لی بەر ئەدا و، ئەو دەستی لی بەر نەئەدا.

*

ئەو کاتەی خەریکی ئامادەکردنی نامەی دکتورا بوم لە سەر: «پەیدا بون و گەشەکردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد» روبەروی پرسیاری ئەبومەوە، ئەبو وەلامیکی زانستیی بو بدوزمەوە، ئەوەبو: «کورد بوچی نەیتوانیوە دەولەتی تایبەتی خوی

دامەزرینی، لە کاتیک دا هەمو نەتەوە دراوسیکانی: عەرەب، فارس، تورک، ئەرمەنی.. دەولەتی خویان دامەزراندوە؟»

ئەمە پاسیکی قول و، لیکولینەوەی زوری گەرەک بو، نوسەرانی کوردیش زور کەم و بە کورتی لی ی دواون. لە ناو ئەوانەدا لەم مەسەلەیە دواون، لە کونەکان: ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی، ئەحمەدی خانی، حاجی قادری کویی و، لە ناو نوسەرانی هاوچەرخیش دا: ئەمین زەکی، عەلائەدین سجادی، جەمال نەبەز، مسعود محەمەد.

نوسەرانی کون: هەمویان هویەکەیان گیراوەتەوە بو خوخوری کورد و تەفرەقە و نیفاق.

نوسەرانی هاوچەرخ: ئەمین زەکی لە «خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان» دا ئەیگیریتەوە بو «پی نەگەیشتن» و نەبونی «عیلم و سەروەت» و، عەلائەدین سجادی لە «شورشەکانی کورد» ا بو «موسولمانەتی» کورد و، جەمال نەبەز لە «کوردستان و شورشەکەی» دا بو نەبونی «دین یا مەزەب» یکی تایبەتی بە کورد و، مسعو محەمەد لە «حاجی قادری کویی» دا بو «نزیقی ئابوری» کە بە هوی دراوسی بە هیزەکانیەوە توشی کوردستان بوە.

هەر کەسی لە مانە لە ئەنجامی لیکدانەوەی قول و دریژی خوی دا ئەم ئەنجامەی هەلهینجاوە و، بیانوی خوی هەیە بو سەلماندنی، بەلام هیچکامیان دریژەیان بە پاسەکەیان نەداوە.

بە دوای سەرچاوەدا هەردو کتیبخانە گرنگەکەی ڤیەننا: کتیبخانەی دەولەت «شتاتس بیبلوتیک» و، «کتیبخانەی زانستگا» بە وردی گەرام. کتیبی کوردییان تی دا نەبو. کتیبی عەرەبییش زور دەگمەن بو. بە زمانە ئەوروپاییەکانیش بە دەگمەن سەرچاوەی لە سەر کورد تی دا دەس ئەکەوت. یەکی پیویستایە پابەتی لە سەر کورد ئامادە بکا ئەبو خوی سەرچاوەکانی پەیدا بکا. زوری ئەو کتیبانەی لە سەر کورد بە زمانی ئەلمانی لەو دو کتیبخانەیەدا بون سەیرم کردون، بە تایبەتی ئەوانەی کون چاپ کرا بون. لەوانە: کتیبەکانی لیرخ، جوستی، وەرگیرانی ئەلمانی شەرەفنامە لە لایەن «بارب»، نامەکانی مولتکە.

مولتکە، کە دوایی وەکو جەنەرالیکی ستراتیجی زان ناوی دەرکرد و، بو بە سەروکی «هەیئەتی ئەرکان» ی پروسیا، ئەوسا وەکو ئەفسەریکی پچوک لە هەندی لە لەشکرکیشییەکانی ئوردوی عوسمانی دا بو سەر میرایەتییەکانی کورد لە کوردستانی تورکیا، بەشداری کرد بو. لە شوینی شەرەکانەوە هەندی نامەی نوسیوە پاسی شەرەکان

ئەگیریتەوە. بابەتی میژوویی خوش و بەنرخیان تی دایە، بە تایبەتی لە سەر رەفتاری هیزی داگیرکەری تورک. نوسخە کونەکانی چەند نەخشە و وینەی دەستکری قەلاکانی ئەوسای کوردستانی تی دا بو.

هەندی بابەتی خوش و نایابم لەم کتیبانە وەرگرت بو، بە تایبەتی لە نامەکانی مولتکە، بە هوی گەرانەوەمەوە بو کوردستان، نەمتوانی کەلکیان لی وەربگرم.

*

من نەمئەتوانی بە ئازادی هاتوچوی عیراق بکەم. پشوودانەکان سەفەری ولاتانم ئەکرد.

- زستانی ۷۲ - ۷۳ سەفەریکی دریژم کرد بو سویسرا، ئیتالیا، فەرەنسا، ئیسپانیا. ئیسپانیا هیشتا لە ژیر دەسەلاتی دیکتاتوریی فرانکودا ئەینالاند. طەیب بەرواری لەو کاتەدا دیپلومات بو لە سەفارەتی عیراقی لە مەدرید کاری ئەکرد. جەنەرال حەسەن ئەلنەقیب سەفیر و، حەمید سەعید «ملحقی صحفی» بو. هەردوکیان دورخرا بونەوە. بە ئاشکرا نارەزاییان دەرئەبری. دیپلوماتیکی تری لی بو، پیاویکی قسە خوش و دلپاک بو. حەزی زوری لە خواردنەوە بو. چەند جاری لە مالی خویان و دەرەوە میوانداریی کردم. هەمیشە ئەم وتەیەی دوبارە ئەکردەوە: «من المحيط الى الخليج قطيع من الغنم!». طەیب و من هاوری ی سالانی زانستگا و کاری سیاسی بوین. ئەوسا هەردوکمان سەلت بوین. زیاتر لە ٤ حەفتە لە مەدرید مامەوە. شەوی سەری سالم لە مەیدانیکی گشتی مەدریدا لە گەل دەیان هەزار گەنج بە سەر برد.

د. فوئاد جەلال و ناجیبەی خوشکم بو گەشت و گەران هات بون بو ڤییەننا. پیکەوە بە ئوتوموبیل سەفەری هەنگاریامان کرد.

لەو ماوەیەدا سەردانی ئەلمانیای روژهەلات و روژئاوا، یوگوسلافیا، بولگارستان...م کرد. هەولی زورم دا سەردانی موسکو و لەندەن بکەم. سەرکەوتو نەبوم. ئەیانوت: «ئەبی لە بەغداد ڤیزای سەردانی ئەو شوینانە وەربگری».

جاریکی تر سەفەریکی دریژی چیکوسلوفاکیا و رومانیام کرد. هاوری ی سەردەمی قوتابخانەم ئیبراهیمی شیخ مەحمود لە بوخارێست ئەیخویند. ئەو زەمانە ئیتر کومونیزمی ئەو ولاتانەم لە بەرچاو کەوت. بەرتیلخوری بو بو بە نەریتیکی باو، لە هەمو ئاستەکانی حکومەت و حیزب دا، تەنانەت لە ناو پروفیسورەکانی زانستگادا، بلاو ببوەوە. هیشتا خانوی لە قور دروستکراو لە گوندەکان زور بو. ئاستی ژیانی کاربەدەستانی حیزب و خەلک بە ئاشکرا دیار بو جیاوازە. تەنانەت ژمارەی

ئوتومبیلەکانیشیان جیاواز بو. خوێندکارە رومانییەکان هەندێکیان ئەوەندە هەژار بون لە مینزا چاوەڕوانی خوێندکارەکانی تریان ئەکرد کەی قاپەکانیان بە جێ ئەهێشت، ئەمان هێرشیان ئەکردە سەر مێزەکە و پاشماوەکانیان ئەخوارد. لە خانوی خوێندکاران کەس سابونی بە جێ نەئەهێشت و، فانیلە، دەرپێ، گورەوی، خاولی.. لە دەرەوە هەڵئەئەواسی چونکە ئەیان دزی. بێگانە راوە کچی بە گورەوی و بلوز و مەمکەوانە ئەکرد. گەورەترین ئەخوشخانەی «سفلس» لەوی بو.

کە ئەم دیاردە دزیوانەم ئەبینی سەیرم بەو زنجیرە وتارە ئەهات کە چەند ساڵی لەوەو پێش، «پاریزەر بەهجەت محەمەد» لە هەفتەنامەی «ژین» ی سلیمانی دا لە ژێر سەرناوی: «رومانیای تیر و تەسەل» دا نوسی بوی. لەخۆمم ئەپرسی: «ئەگەر ئەمانە تیر و تەسەل بن، ئەبێ برسی کێ بێ؟».

لەو سەردەمە دا هەر لە بابەتی ئەم وتارە ئایدیولوجییەی بو پشتیوانی لە سوڤیت نوسرا بو، چەندین وتار و نامیلکەی لەم بابەتە لە عێراق بلاو ئەکرایەوە. لە بیرم دێ نامیلکەیەکیان بە ناونیشانی: «لە یەکێتی سوفیت گەڕاومەتەوە» بو، نوسەر هەر ئەوەندەی مابو پێی لە بەهەشت هاتومەوە وەرن بو زیارەتی دەستم. نوسەری روسی «بوریس پاسترناک» لە سەر داستانی «دوکتور ژیڤاکو» خەلاتی نوبلی وەرگرت. محەمەدی مەلا کەریم، چونکە بیست بوی ئەم داستانە دژی سوڤیتە، بێ ئەوەی داستانەکەی خوێند بێتەوە یا دی بێتی، وتارێکی درێژی لە دژی نوسی. هەروەها چەندین وتاریان لە سەر خۆشیی ژیان و پێشکەوتنی سیاسی و روشنبیریی و ئەدەبیی کوردەکانی سوڤیت ئەنوسی، کەچی وەکو دوایی دەرکەوت کوردەکانی سوڤیت لەو زەمانەدا وەکو کوردە ئەنفالکراوەکانی گەرمیانیان لی کرا بو.

لە سەردەمی شەڕی ساردا کە دنیا دابەش بو بو بە سەر بلوکی رۆژهەلات و بلوکی رۆژئاوادا، حشع ئەندامەکانی خوی بە «سوڤیتپەرستی» پەروەردە ئەکرد. وای فێر کرد بون کە مێشکی خۆیان بە کار نەهێنن بو جیاکردنەوەی چاک لە خراپ. باوەرێکی پێشەکی ئامادەکراوی لە لا دروست کرد بون کە هەرچی لە دنیای سەرمایەداری دا بێ خراپە و، هەرچی لە دنیای کومونیستی دا بێ باشە.

سەردانی ئەم وڵاتانە کە سیستەمی حوکمرانیبان و، جوری ژیانی دانیشتوانیان جیاواز بو، پارمەتیبان دام زور لە بوچونە کونەکانم سەبارەت بە سەرمایەداری، سوسیالیزم، کومونیزم، دیموکراسی، ئازادی بیر و روژنامەوانی و پارتایەتی... بگورم.

*

حیزبی شیوعی عیراق چوبونە ناو جەبهەکەی حکومەتەوە. هەروەها بەشداری وەزارەت بون. نیوانیان لە گەل پارتی تیکچوبو. روژنامەکانی «طریق الشعب» ی حیزبی شیوعی و «التاخی» پارتی پەلاماری یەکتریان ئەدا. پارتی لەو شوینانەی دەستی ئەرویشت تەنگی پی هەلچنی بون. ئەندام و لایەنگرەکانیان ئەگرتن و ئازاریان ئەدان. عیسا سواری بارزانی، سەرلەشکری هیزەکانی پارتی لە بادینان، ١٢ کادری شیوعی کە لە سوریاوە ئەگەرانەوە، بە کومەل کوشت. وەکو دوایی بارزانی لە نامەیەکی دا بو کارتەر دانی پی دا نابو، تەنگ هەلچنین بە کومونیستەکان بە زوری بو رازی کردنی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بوە.

لەو ماوەیەدا پیوەندی سەرکردایەتی بارزانی لە گەل ئیران و ئەمریکا و ئیسرائیل و، پیوەندی سەرکردایەتی بەعس لە گەل سوڤیت بەهیز بوبو. عیراق و سوڤیت «پەیمانی هاوکاری و دوستایەتی» یان ئیمزا کرد بو.

*

رژیمی بەعس گرنگیی مەسەلەی کوردو گەورەیی مەترسی ئەم جولانەوەیەی بو سەر خاکی عیراق و پاشەروژی ئەزانی و ئەیزانی چ قورساییەکی عەسکەری، ئابوری، سیاسی لەسەر دروست کردوە.

حیزبی بەعس لە ئیمزاکردنی بەیانی ئازاری ١٩٧٠ لەگەل بارزانی ئومیدی وا بو کە کارتی کوردی لە دەس شا دەربهینی و، بە قازانجی خوی بە کاری بهینی، بەلام هەولدانی شا لەگەل بارزانی بو ئەوەی پەشیمانی بکاتەوە لە ریکەوتن لەگەل بەعس و، پیلانگیرانی بەعسی دژی بارزانی و، بزوتنەوەی کورد، هەروەها بی بروایی بارزانی بە بەعس و نەویستنی ریکەوتن لەگەل بەعس، ئەو ئومیدەی بەعسی نەهینایە دی و کارتی کوردی بە موافەقەتی سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد لەدەس شادا مایەوە.

ئەو ٤ سالەی لە بەیانی ئازاردا بو بلاو کردنەوەی قانونی ئوتونومی دیاری کرا بو بەرەو تەواو بون ئەچو. بەعس سور بو لە کاتی خوی دا قانونەکە بلاو بکریتەوە. سەرکردایەتی پارتی ئەیویست دوای بخا. بیروبوچونی هەردولا لە سەر زور مەسەلەی بنەرەتی جیاواز بو. هیچ لایەکیان بروای بەوی تر نەمابو.

مانگی مارتی ٧٤ گفتوگوی سەرکردایەتی بارزانی و بەعس چوە ناو کولانیکی داخراوەوە، بە تایبەتی دوای چونی ئیدریس بو بەغدا بو بینینی صەددام و، گەرانەوەی بە بی ریککەوتن.

چەند جاری صەددام باسی ئەم کوبونەوەیەی گیراوەتەوە. دواتریش، لە گفتوگوکانی

٨٤ دا بو نوینەرایەتی یەکیتی باس کرد و، پیش داگیرکردنی کویت بو ئەپریل گلاسپی سەفیری ئەمەریکای گیراوەتەوە. وت بوی: «چارەنوسی ئیوە بەستراوە بە پشتیوانی ئیرانەوە و، ئیران داوای شەطولعەرەب ئەکا، شەطولعەرەب لە کوردستان خوشەویستتر نیە. ئەگەر شەر دەس پی بکەنەوە، سالیک شەرتان لە گەل ئەکەم، ئەگەر نەمتوانی بە سەرتانا زال بم. لە گەل ئیران ریک ئەکەوم نیوەی شەطولعەرەبی ئەدەمی بەرامبەر بەوەی یارمەتیتان لی ببری.. ئوبالەکەی لە گەردنی ئیوەدا ئەبی و، واتان لی ئەکەم پەشیمان ببنەوە. بەلام ئەوسا ئیتر پەشیمانی کەلکی نابی...»

بارزانی ئەوسا ئەم هەرەشەیەی بە هەند نەگرت بو. بارزانی پشت ئەستور بو بە هاوپەیمانەکانی. خوی بە خورت و هیزدار ئەزانی. تەنانەت د. مەحمود عەلی عوسمان لە کوبونەوەیەک دا لە مزگەوتەکەی گەلالە وت بوی: «حکومەتی عیراق بە کام چەک لیمان بدا بە هەمان چەک لی ی ئەدەینەوە!»

لە مانگی نیسانەوە شەر بە گەرمی لە کوردستان دا دەستی پی کردەوە. نزیکەی هەمو کوردی عیراق لە ژیر ئالای بارزانی دا کوبونەوە و، دژی حیزبی بەعس راوەستان. جگە لە حشع و ژمارەیەکی کەمی کورد کەسیکی ئەوتو هاوکاری بەعسی نەکرد.

شەری ئەمجارە لە چاو قوناغەکانی پیشودا لە هەمو کات گەرمتر و سەختتر بو. پشتیوانی کوردیش لە شورشەکە لە چاو قوناغەکانی پیشودا لە هەمو کات فراوانتر بو. سەدان هەزار کەس چونە ناو ریزی شورشەکەوە لەوانە بە سەدان ئەفسەر، مامۆستای زانستگا و قوتابخانەکانی ناوەندی و سەرەتایی، پزیشک، ئەندازیار، پاریزەر... توپخانەی قورسی ئیران و شارەزاکانی بەشدار بون.

نوینەرایەتی دەرەوەی پارتی لە ١ ی ئابی ٧٤ دا بەیانیکی بە ئینگلیزی دەربارەی هەلومەرجی کوردستان بلاو کرد بوەوە، بو نیشاندانی گەرمیی شەرەکە، لیرەدا ئەم چەند هەوالەی لی رائەگویزم:

– لە ماوەی: ٤/١٥ تا ٧/١٥

ژمارەی هیرشی ئاسمانی: ١٥٤٢

ژمارەی کوژراو: ٤٨٥

ژمارەی دی و شاری بردومانکراو: ٤٣٣

– خەرجی روژانەی شەر نزیکەی نیو ملیون دیناری عیراقی بەرامبەر ....,٦٢٥ پاوەنی ستەرلینی تی چوە.

– ئەم هیزانەی جەیشی عیراقی بەشداری شەر بون:

فیرقەکانی ١ و ٢ و ٤ و ٦ و ٨
لە نیوە زیاتری فیرقەکانی ٣ و ١٠
نزیکەی ٢٥ کەرتی تانک
هەمو هیزی ئاسمانیی
چەندین کەرتی جاشی بەکریگیراوی کورد
تا ئاشبەتال شەر بە سەختی دریژەی کیشا.

پاش ماوەیەک لە ئاشبەتال سەروکی هەیئەتی ئەرکانی جەیشی عیراق و، جاریکیش صەددام خوی لە بەردەمی «المجلس الوطنی» دا بە بونەی هەلوەشاندنەوەی ریککەوتنی جەزائیرەوە لە ١٧ ی ئەیلولی ١٩٨٠ دا وتی: جەیشی عیراق لە ماوەی دوانزە مانگی شەردا زیاتر لە ١٦ هەزار ئەنگاوتەی، بە کوژراو و بریندارەوە، هەبوە و، تیکرای ئەنگاوتەی جەیش و خەلک گەیشتوتە ٦٠ هەزار. بیگومان شەرەکە قورس بو، بەلام من لام وایە ئەم ژمارەیە راست نەبو. ئەنگاوتەی هەردولا، هی بەعس و کورد، لە مە کەمتر بوە و، صەددام بو پاساودانی ریککەوتننامەی جەزایر ئەم درویەی ئەکرد.

*

روژنامە بلاوەکانی نەمسا: کوریر، کرونین، پریسە، هەندی جار هەوال و دەنگوباسەکانی شەری کوردستانیان بلاو ئەکردەوە. یەکی لە کاربەدەستەکانی تەلەفزیون: «هانز بەندیکت» سەری کوردستانی دا و، بەرنامەیەکی دریژی لە سەر شەری کوردستان ئامادە کرد، لەم بەرنامەیەدا گفتوگوی لە گەل بارزانی، حەبیب محەممەد کەریم، د. مەحمود عوسمان کرد بو. بەندیکت بە هاودەردییەکی قولەوە لەگەل کورد ئەم بەرنامەیەی لە تەلەفزیونی نەمسادا بلاو کردەوە. لە ناو روژنامە ئەلەمانیزمانەکان دا روژنامەی سویسری: «نویە زوریخە تسایتونگ» زورجار وتار و لیدوانی سەنگینی لە سەر کیشەی کورد ئەنوسی.

هیلموت کرامەر، یەکی لە ماموستاکانم، کە دەرسی پەیوەندییەکانی ناودەولەتانی پی ئەوتین، داوای لی کردم: منیش بە باسیک لە سەر کیشەی کورد لەو سمیستەرەدا بابەشی بکەم. لەو سمیستەرەدا کیشەکانی شیلی، ڤییەتنام، فەلەستین، بەرزبونەوەی نرخی نەوت و، کیشەی لەو بابەتانە، باس و لیکولینەوەیان لە سەر ئەکرا. ئەوەی منیش بو بە بەشیکی بەرنامەی ئەو سمیستەرە. لە گەل ماموستاکەم ریک کەوتین باسەکەی من وەلامی ئەم پرسیارانە بداتەوە:

– بوچی شورشی کورد هەمیشە لە عیراق دا ئەتەقیتەوە، لە کاتیک دا

هەلومەرجی ژیانی سیاسی کورد لە عیراق دا باشترە لە هی کوردەکانی تورکیا و ئیران و، ژمارەشیان لەوان کەمترە؟

- ئیران و تورکیا هەردوکیان سەر بە کامپی رۆژئاوان و، هەردوکیان ئەندامی پەیمانی «سنتو» ن و، هەردوکیان کەمایەتییەکی گەورەی کوردیان تی دا ئەژی... بوچی ئیران یارمەتی شورشی کوردەکانی عیراق ئەدا کەچی تورکیا دوژمنایەتی ئەکا؟

- بوچی یەکیتی سوڤیت سیاسەتی خوی بەرامبەر شورشی کورد گوریوە، لەوەی پشتیوانی لی ئەکرد و جاریک بە هوی مەنگولیاوە ویستی بیهاتە بەردەمی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان، کەچی ئیستا بە ئاشکرا یارمەتی عیراق ئەدا دژی کورد؟

- ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بوچی جاران جولانەوەی کوردی بە سور دائەنا کەچی ئیستا پشتیوانی ئەکا؟

هەندی پرسیاری تری لەم بابەتە.

من بە گویرەی بیروبوچونی ئەو کاتەی خوم، باسیکی تیروتەسەلم لە سەر ئامادە کرد و لە کوریکی گەورەدا پیشکەشم کرد. لە ناو گویگرەکان دا خویندکاریکی تورکی تی دا بو، خوی بە چەپ دائەنا. بە توندی بەرپەرچی دامەوە. یەکی لە رەخنەکانی ئەوە بو: «شورش ئەبی کومەل لە قوناغیکی دواکەوتوەوە بیبا بو قوناغیکی پیشکەوتوتر، بەلام ئەمەی ئیوە یاخی بونیکی کونەپەرستانەیە ئەتانباتەوە بو دواوە». ئینجا کەوتە هیرش بو سەر بارزانی. منیش وتم: «کورد ریگای هیمنانەی خەباتی سیاسی بو نەماوەتەوە بویە پەنای بردوتە بەر شورش. کورد ئەیەوی لە ژیانی سیاسی و ئابوری و روشنبیری عیراق دا بەشدار بکری. ئەیەوی لە ولاتەکەی خوی دا ئازادی حیزبایەتی و رۆژنامەوانی و هەلبژاردنی هەبی. ئەیەوی قوتابخانە، نەخوشخانە، ریگاوبان، کارگە... لە کوردستان بکریتەوە... ئەگەر تو ئەمانە بە کونەپەرستی بزانی ئەبی پیشکەوتن چی بی؟» کورەکە دوسەعاتیکی خاپاند.

هەر لەو ماوەیەدا «یەکیتیی خویندکارانی جو» بە دوای کوردیک دا ئەگەرا بون کیشەکەیان بو رون بکاتەوە. رۆژیکیان سەروکەکەیان تەلەفونی بو کردم. ئەو زەمانە منیش لە ژیر تەئسیری پروپاگاندەی عەرەب و فەلەستینییەکان دا بوم. لە هەمو پیوەندییەک لە گەل جو ئەسلەمیمەوە. ویستم خومی لی بدزمەوە. کورەکە هەستی پی کرد وتی: «ئیمە جولەکەی ئەمەساین، ئیسرائیلی نیین». گفتوگوکەمان بەوە تەواو بو بەلینم دایە داواکەی جیبەجی بکەم. کاتیکمان دیاری کرد لە بارەگاکەی خویان کو ببینەوە. بارەگاکەیان نزیک زانستگا بو. لە گەل یەکی لە کوردەکانی سوریا، کە لە هەموان چالاکتر و ئەلمانی باشتر

ئەزانی، لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بوین. ژمارەیەکی زور خویندکاری کور و کچ هات بون. بە گەرمی پیشوازییان کردین. ئەوەی پیویست بو بومان رون کردنەوە. لە کوتایی دا یەکیکیان لی ی پرسین، هەلویستمان لە ئیسرائیل چیە؟ من وەلامم دایەوە: وتم: «ئەمە رەئی خومە: من دژی جولەکە نیم، بەلام لایەنگری فەلەستینییەکانم، لام وایە ئیسرائیل زولمی لە گەلی فەلەستین کردوە». قسەکەی منیان بە ئاسایی وەرگرت. نە کەسیان تورە بو و، نە کەسیشیان وەلامی دامەوە.

*

جەنگی ١٩٧٤ - ١٩٧٥ ی کورد - بەعس ئەگەرچی لە نیوان هیزە چەکدارەکانی کورد و جەیشی عیراقی دا بو، لە سەر ئەرزی کوردستان ئەکرا، لە پیناوی ئامانجە نەتەوەییەکانی گەلی کوردا بو، بەلام لە راستی دا ململانی ی سیاسی - جەنگیی، ئیرانی - عیراقی بو. هیزەکانی کورد بە چەک و ئیمکانیاتی ئیرانی ئەجەنگان و بەعس بە چەکی روسی و ئیمکانیاتی نەوتی کەرکوک. لەم ململانی یەدا عیراق بالادەستی بە سەر کوردا و، ئیران بالادەستی بە سەر عیراق دا هەبو.

ئیران دەسکەلای گوشاری کوردی - عیراقی بەدەستەوە بو، کە نەک هەر گوشاریکی توند بو لە سەر ژیانی ئابوری، سیاسی، کومەلایەتی.. بەلکو هەرەشەیەکی راستەقینە بو لە دەسەلاتی بەعس و یەکیتی ئەرزی عیراق و ئاسایشی نەتەوەی عەرەب.

لە بەرامبەر ئەمەدا عیراق دەسکەلایەکی هاوتای ئەمەی دژی ئیران بەدەستەوە نەبو. ئەگەرچی رژیمی شا رژیمیکی ناخوشەویست بو لە ناو ئیران دا، بەشیکی زوری خەلکی ئیران دژی بون، چەندین تاقمی ئوپوزیسیونی چەپ و راست لە ئەورووپاو لە عیراق دا هەبون، هەر لە ئوپوزیسیونی دینییەوە وەکو ئیمام خومەینی، تاسەر ئوپوزیسیونی دیموکراتی و کومونیستی و نەتەوەیی. بەلام لەو سەردەمەدا نە لە ناو ئیران دا ئوپوزیسیون هیشتا توانیبوی زەمینەی بەرەنگاری کاریگەر و راپەرین خوش بکا، وە نە ئەو ئوپوزیسیونەی لە عیراق کوبوبونەوە قورساییەکی ئەوتویان هەبو کە هاوسەنگی ئوپوزیسیونی کوردی عیراق بکەن لە ئیران دا.

لەو سەودایەدا کە ئیران و عیراق ئەبو بیکەن بو ئەوەی بگەنە یەک، ئیران دەسکەلایەکی گوشاری کاریگەری لە ناو عیراق دا هەبو ئەیتوانی بیگوریتەوە لەگەل عیراق، بەلام بەعس جگە لە ئەرزی عیراق و ناوبانگی سیاسی خوی شتیکی تری نەبو لە بەرامبەر ئەو گوشارەدا بیدا بە ئیران. بەم پی یە صەددام ئەبو مل بدا بو شا، خواستە کونەکانی لە شەطولعەرەب بە جی بهینی بو ئەوەی ئەویش دەس لە یارمەتیدانی کورد

هەلگری.

*

لە گەرمەی شەری کورد - بەعس دا، هەولدانی ئاشکرا و ژیرەژیر هەبو بو ریکخستنەوەی ئیران و عیراق. روژنامە ناسراوەکانی دنیا و، دەزگاکانی راگەیاندن هەوال و دەنگوباسی ئەم هەولانەیان بلاو ئەکردەوە. ئەم هەوالانە لە ریگای نوینەرایەتی دەرەوەی پارتیەوە ئەگەیشتەوە «دەزگای پاراستن» و، لە ریگای ئەوانیشەوە بە بارزانی و سەرکردایەتی پارتی. سامی سنجاری لەو کتیبەدا کە بە ناوی: «طریق الحرکە التحرریە الکردیە: تقییم ثورە ایلول والبرنامج الجدید للحزب الدیمقراطی الکردستانی» وەکو راپورتی سیاسی، لە ئابی ١٩٧٦ دا، داویتی بە کونفرەنسی قیادەی موەقەتە دانی بەوەدا ناوە کە لە کاتی شەردا دەنگوباسی هەولی ژیر بە ژیری ریککەوتنی عیراق و ئیران و، ناوبژی مەلیک حسین و بومدەین و ساداتیان بیستوە.

مامجەلال، کە ئەو دەم، لە قاهیرە ئەژیا، هەوالی نزیک کەوتنەوەی عیراق و ئیرانی بو بارزانی و سەرکردایەتی شورش نوسی بو.

پروفیسوری ئەمەریکایی (بە ریچەلەک ئیرانی)، د. روحوللای رەمەزانی، لە باسەکەی دا لە ژیر ناوی: «تەنگەی هورمز» بە زمانی ئینگلیزی، بە وردی ئەم هەولانەی لە سەرچاوەی باوەرپیکراوەوە گیراوەتەوە و، شی کردونەتەوە. لیرەدا هەندی لەو هەوالانە ئەگیرمەوە. گرنگترینیان ئەمانە بون:

- هەولەکانی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە دوای پیکدادانیکی خویناوی هیزەکانی عیراق و ئیران دا لە ١٠ ی شوباتی ٧٤ دا کە ٦٥ کەس لە هەردولا کوژرا، هەردولا ناوبژی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانیان قەبول کرد بو ئەوەی کیشەکە بە ئاشتی لایەلا بکا. سکرتیری گشتی نوینەری تایبەتی خوی نارد.

لە ٢١ ی مایس دا ڤالدهایم راپورتیکی دا بە ئەنجومەنی ئاسایش ئاگاداری کردن کە هەردولای ناکوکییەکە بە شیوەیەکی سەرەتایی قەبولیان کردوە کە:

أ. هەردولا هیزەکانیان بکیشنەوە سنور.

ب. هیچی تر پەنا نەبەنە بەر کاری دوژمنانە.

ج. پیرەوی سەرەتای گفتوگو بکەن.

لە ٢٨ ی مایس دا ئەنجومەنی ئاسایش موافەقەتی هەردولای بو گفتوگو لە سەر چارەسەری گشتلایەنەی هیمنانەی ناکوکییەکانی پەسند کرد. وەزیرەکانی کاروباری دەرەوەی

هەردو دەولەت لە مانگی تشرینی یەکەم (ئوکتوبەر) دا لە ئەستەمول یەکتریان بینی.
ئەگەرچی ئەم کوبونەوەیە کیشەکانی بە لادا نەخست، بەلام عەبباس عەلی خەلعەتبەری،
وەزیری دەرەوەی ئیران گەشبینی خوی دەربری دەربارەی دەستپیکردنەوەی گفتوگو.

- هەولی سوڤیەتی

لەو سەفەرەدا کە شای ئیران بو یەکیتی سوڤیەتی کرد. پودگورنی لە کوبونەوەی روژی ٢ ی تشرینی دوەم (نوڤەمبەر) ی ١٩٧٤ دا لە سەر کیشەی ئیران - عیراق بەمجورە لە گەل شا دوا بو:

پودگورنی: هەمو گرژییەکی ئاسایشی جیهان لە هەر ناوچەیەک دا بی لەوانە ناوچەی خەلیجی فارس و ئوقیانوسی هیند، جەووی پیوەندی لە هەمو دنیادا ئەشیوینی. گرژی لە پیوەندییەکانی ئیران و عیراق دا بە قازانجی ئاشتی نیە پیمان خوش بو و ئیستاش حەز ئەکەین ناکوکیەکانی عیراق - ئیران لە لایەن خویانەوە لە سەر میزی گفتوگو لایەلا بکری، لایەلا کردنیک لە سەر بنچینەی سەرەتاکانی پیکەوەژیان بە ئاشتی و پیوەندییەکانی دراوسییەتی باش دامەزرا بی.

شا: حەز ئەکەم بلیم ئەگەر عیراقیش لە پیوەندییەکانی دا لە گەل ئیمە هەمان هەلویستی هەوایە کە ئیوەی دراوسی ی گەورە هەتانە و، ئەگەر عیراق ئەنوسایە بە میراتی ئیمپریالی بەریتانیەوە، هیچ کیشەیەکمان لە سەر ئەم مەسەلەیە لە بەین دا نەئەبو. بە هەر حال ئیران بەردەوام ئەبی لە تەقەللاکانی دا بو چارەسەرکردنی ئەم ناکوکییە بە ریگای گفتوگو.

- هەولی ئەمەریکی

کیسینگەر لەو کاتەدا خەریکی مەسەلەی ئیسرائیل و میصر بو ، سوریا بە توندی دژی هەلویستی میصری بو، ئەمەریکاش بو ئەوەی سوریە خەریک بکا بە شتیکی ترەوە نەیپەرژیتە سەر مەسەلەی میصر و ئیسرائیل بە چاکی ئەزانی شورشی کورد لە عیراق دا بکوژیتەوە بو ئەوەی عیراق دەستی بە تال بی بو بەگژاچونی سوریا... بویە ئەمەریکاش بە نهینی هانی ئیرانی دا ناکوکیەکانی خوی لەگەل عیراق بە ئاشتی چارەسەر بکا.

- هەولی مەلیک حسین

شای ئیران سەفەریکی کرد بو ئوردون. مەلیک حسین، شای ئوردون، لەم سەفەرەی دا لە ناو گفتوگوکانی دا، داوای لە شا کرد بو: کیشەی ئیران لە گەل عیراق بە ئاشتی چارەسەر بکا.

لە کـونگرەی سـەرانی عـەرەب دا لە رەباط، صـەددام داوای لە هەندی لە سـەرانی عەرەب کرد بو، بە تایبەتی ئەوانەی پیوەندییان لە گەل ئیران ئاسایی بو، لەوانە: مەلیک حسـین، ئەنوەر سادات، هەواری بومدیەن... هەول بدەن بو ناوبژی لە نیوان ئیران و عیراق دا.

*

ح. ا. مهران، وەرگیری فـارسی کـتـیـبـە ئینگلیزییەکەی فریدون هویدا: «سـقـوط شـاه» بو ئەوەی بەربەرچی قـسـەکـانی هوەیدا بداتەوە، کـە ریککەوتنی (ناوەراسـتی ئیـسـفـەندی ۵۳) ی شـا و صـەددام لە جەزایر بریاری «خـود سـرانە» ی شـا نەبوە، بەلکو ئەنجامی ریککەوتنی ئەمـەریکا و سـوڤیت بوە، بو خوشکردنی زەمینەی ئەم ریککەوتنە لە (ل ۱۵۵) دا کرونولوجییەکی ریک خستوە لیرەدا وەکو خوی ئەی نوسمەوە:

- سـەرەتای ئابانی ۵۳ هینری کـیـسـینگەر هاتە ئیـران. دوای ئەوە یەکـسـەر وەزیرانی کـاروباری دەرەوەی ئیـران و عـیـراق لـە ناو کـوبونەوەکـانی کـومـەلەی گـشـتی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیویورک گفتوگویان لە گەل یەکتری دەس پی کرد.

- کـوتایی ئابان ۵۳ شـا چو بو ئوردون لـەوی لە گـەل طاریق عـەزیز وەزیری ئیعلامی عیراق دانیشت.

- سەرەتای دەی ۵۳ شا چو بو سوڤیت و لە راگەیاندنی هاوبەشی هەردو ولات دا باسی پیویستی ئاشتبونەوەی ئیران و عیراق کرا بو.

- ناوەراسـتی دەی ۵۳ شـا دوبارە چوەوە بو ئوردون و لەویوە چو بو مـیـصـر، ئاژانسـەکـانی هەوالنیری دەربارەی هەردو سـفـەر بلاویان کردەوە کـە شـا حسـین و ئەنوەر سادات ئەیانەوی ناوبژی لە نیوان شا و صەددام دا بکەن.

- سەرەتای بەهمەنی ۵۳ گفـتـوگوی خەلعەتبەری (وەزیری دەرەوەی شا) لە گەل سەعدون حەمادی (وەزیری دەرەوەی عـیراق، کـە ئەیانوت لە هەمو عـیـراقـیـیـەکـانی تر لە زمانی شا تی ئەگات) لە شاری ئەستەمول دەستی پی کرد، یەکسەر دوای ئەوەش صەددام چو بو ئوردون.

- سـەرەتای ئیـسـفـەندی ۵۳ شـا لە سـەفـەری رابواردنی خـوی دا بو سـویـسـرە گفـتـوگویەکی دریژی لە گەل هینری کیـسینگەر و جوزیف سیسکو (یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمـەریکا) کـرد و، دوای گـەرانەوەی بو ئیـران یەکـسـەر چو بو جـەزایر تـا لە کـونفـرەنسی سـەرانی ئوپیک دا بەشدار بی. لەم سەفـەرەدا بو لە نیـوان ئەو و صـەددام دا ریککەوتننامەی ناسراوی ۱۹۷۵ ی جەزائیر ئیمزا کرا.

*

صەددام نائومید بو لەوەی بە شەر شورشی کورد بکوژێنێتەوە. وەکو هەرەشەی کرد بو، دوای سالێک شەری سەرنەکەوتو ئینجا ڕێگای سیاسی، واتە ڕێگای ڕازی کردنی ئیرانی گرت.

پێش ئەوەی ئەم دو دەولەتە ڕێک بکەون، سادات کە سامی سنجاری، بە نوێنەرایەتی بارزانی لە قاهیرە دی، هەوالی بو بارزانی نارد کە بەم نزیکانە هەردو دەولەت پێک دێن، چاکتر وایە کورد بە زویی مشوری خوی بخوات. هەڤکەلیش هەمان قسەی بە سامی وت بو لە قاهیرە، تەنانەت لێ ی پرسی بو: «ئەگەر ئیران و عێراق پێک هاتن، ئێوە چی ئەکەن؟». سامی لە وەلام دا وت بوی: «بەوپەری توانامانەوە درێژە بە شەر ئەدەین». سامی دوای ئاشبەتال بە سال و نیوێک لە ڕاپورتەکەی کە بە ناوی قیادە موقەتەوە نوسیویتی، هەندی لەم ڕازەی درکاندوە. بەلام هەڤکەل هەرزو لەو گفتوگویەدا کە دوای ئاشبەتال لە تاران لە گەل بارزانی کردی، ئەم وریاکردنەوە پێش وەختەی بە بیر هینابوەوە.

سەروکی جەزائیری بومەدین پەیوەندی لەگەل عێراق و ئیران کرد، پێشنیاری دانوستانی ڕوبەڕوی کرد بو هەردو لایان لە جەزائیر لە کاتی کوبونەوەی سەرانی ئوپێک، صەددام وەکو لە: «آراء ومواقف» دا ڕونی کردوتەوە، سەرکردایەتی بەعس ئەمەی بە «هەلێکی ڕەخساو دانا بو ڕزگارکردنی ئاسایشی عێراق و، یەکێتی نیشتیمانی و، ئاسایشی جەیشی عێراق .. لە سەر ئەو بنچینەیە سەرکردایەتی حیزب و دەولەت بڕیاری دا لەگەل ئیران دانوستان قبول بکا و خەتی تالویگ وەکو خەتی سنوری شط العرب قبول بکا، بەرامبەر بە کشانەوەی ئیران لەو ئەرزانەی لەسەردەمەکانی پێشودا داگیری کردوە... وە هەروەها واز بهێنی لە یارمەتیدانی سپایی و هی تری ئەو تاقمە نوکەرە هەلگەراوەیەی سەروی نیشتیمان»

*

ئاشبەتال

لە کوتایی حەفتاکان دا، لە یەکی ژمارەکانی خولی یەکەمی گوڤاری «کومەلە» دا ڕوداوەکانی ڕوژانی ئاشبەتالم بە درێژی نوسیوە. لەوەدا پشتم بە گێرانەوەی دەیان شایەتی ئاگادار بەست بو. لەبەر ئەوەی ئەو ژمارەیەی کومەلەم دەس نەکەوت لێرەدا دوبارە بینوسمەوە، لە بەر گرنگی ئەم کارەساتە، وا بە کورتی کرونولوجی ڕوداوەکانی ئەو چەند ڕوژە لێرەدا تومار ئەکەم.

٦ ی مارت   له ٤ - ٦ مارتی ١٩٧٥ کوبونەوەی سەرانی ئۆپیک له جەزائیر بەسترا. هەواری بومەدیەن که میوانداری کوبونەوەکەی ئەکرد بو لابەلا کردنی ناکوکیەکانی عیراق و ئیران کەوتبوە ناوێژی. شای ئیران و صەددام حسین دو جار کوبونەوە بە ئامادە بونی بومەدیەن. له دوایین دانیشتنی سەرانی ئوپیک بومەدیەن له ناو سەرسورمانی ئەندامانی کوبونەوەکەدا ووتی: « خوشحالم پیتان رابگەیەنم که روژی رابردو ریکەوتنیکی گشتی بو له نیوان دوو ولاتی برا ئیران و عیراق دا بو کوتایی هینان بە ناکوکیەکانیان»

روژی ٦ مارتی ١٩٧٥ ریکەوتنەکە بەم شیوەیە بلاو کرایەوە :

«اثناء انعقاد مؤتمر القمة للدول الاعضاء فی منظمة الاوبیك فی عاصمة الجزائر وبمبادرة الرئیس هواری بومدین، تقابل مرتین صاحب الجلالة شاه ایران والسید صدام حسین نائب رئیس مجلس قیادة الثورة واجریا محادثات مطولة حول العلاقات بین العراق وایران وقد اتسمت هذه المحادثات التی جرت بحضور الرئیس هواری بومدین ببدیع الصراحة الکاملة و بإرادة مخلصة من الطرفین للوصول الی حل نهائی دائم لجمیع المشاکل القائمة بین بلدیهما وتطبیقا لمبادئ سلامة التراب وحرمة الحدود وعدم التدخل بالشؤون الداخلیة قرر الطرفان السامیان المتعاقدان:

اولا: اجراء تخطیط نهائی لحدودهما البریة بناء علی بروتوکول القسطنطینیة لسنة ١٩١٣ ومحاضر لجنة تحدید الحدود لسنة ١٩١٤.

ثانیا: تحدید حدودهم النهریة حسب خط تالوك.

ثالثا: بناء علی هذا سیعید الطرفان الامن والثقة المتبادلة علی طول حدودهما المشترکة ویلتزمان من ثم علی اجراء رقابة مشددة وفعالة علی حدودهما المشترکة وذلك من اجل وضع حد نهائی لکل التسللات ذات الطابع التخریبی من حیث اتت.

رابعا: کما اتفق الطرفان علی اعتبار هذه الترتیبات المشار الیها اعلاه کعناصر لاتتجزء لحل شامل وبالتالی فإن ای مساس بإحدی مقوماتها یتنافی بطبیعة الحال مع روح اتفاق الجزائر و سیبقی الطرفان علی اتصال دائم مع الرئیس هواری بومدین الذی سیقدم عند الحاجة معونة الجزائر الاخویة من اجل تطبیق هذه القرارات ...

*

ریکەوتنی شا - صەددام ئەگەر چی ناوی کوردی نەهینا بو بەلام سەودایەکی ئیرانی - عیراقی بو له سەر بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد. کوبونەوەی شا و صەددام لەگەل یەکتری و ریکەوتنەکەیان، بو بەرزانی و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد روداویکی کتوپری چاوەری نەکراو بو، ئەوانیش وەکو خەلکی تر له دەزگاکانی راگەیاندنی جیهانیەوە

بیستیان. هەلبەت پیشتر دەزگاکانی راگەیاندن هەوالی پیوەندی و گفتوگوی ژیر بەژیری نوینەرانی عیراقی و ئیرانیان بلاو ئەکردەوە، ئەم هەوالانە ئەگەیشتنەوە بارزانی، لە سەرچاوەی تایبەتی خویشیەوە دەنگوباسی لەو بابەتەی پی گەیشت بو، بەلام بارزانی بروای وابو کە ناکوکیەکانی شاو صەددام لەوە قولترە بتوانن ریک بکەون. لەبەرئەوە ئەو هەوالانەی بە هەند نەئەگرت.

۹ ی مارت   ریککەوتنی جەزائیری شا - صەددام پشیویەکی زوری لە ناو بنەمالەی بارزانی و سەرکردایەتی پارتی و لە سەرانسەری کوردستان دا دروست کرد. زوریان ئەگریان و، نەیانئەزانی چی بکەن. مەلا مستەفا لە کوردستانەوە چوە تاران. لەوی چاوەروانی گەرانەوە و بینینی شای ئەکرد.

۱۲ ی مارت   بارزانی لە گەل د. مەحمود و موحسین دزەیی بران بو دیدەنی شا. لەم دیدارەدا سەروکی ساواک جەنەرال نەصیری یش بەشدار بو. پاش ئەوەی بارزانی دەستی شا ماچ ئەکا، شا ریگای دانیشتنیان ئەدا و، دەس ئەکا بە قسە و ئەلی:

«دەولەتانی عەرەبی لەم سەردەمەدا بونەتە هیزیکی گەورەی ئەوتو لە دنیادا کە ناکری پشتگوی بخرین، قازانجی ئیران لەوەدایە کە ناکوکیەکانی خوی لەگەل ئەوان بەلادا بخات و لەگەلیان ریک بکەوی. بەم ریکەوتنە ئیمە توانیمان ناکوکیەکانی خومان لەگەل عیراق کە ٤٢ سالە نەمانتوانی بو لایەلا بکەین، بە جوری بە لادا بخەین کە ئیمە ئەمانویست.

ئیوەش خوتان ئازادن لەوەدا چی ئەکەن:

- دینە ئیران ولاتی خوتانە وەکو هاوولاتی ئیرانی رەفتارتان لە گەل ئەکەین.
- ئەگەرینەوە عیراق بەلینم لە صەددام وەرگرتوە کەستان نەکوژی.
- دریژە بەشەر ئەدەن ئارەزوی خوتانە، بەلام من ئیتر سنور لە یارمەتیدانی جەنگیی دائەخەم...»

مەلا مستەفا وت بوی:

«ئیمە میللەتی توین. مادەم تو لە ریککەوتنەکە رازیت و قازانجی ئیرانی تی دایە کە دایکی ئیمەشە، ئیمەش هیچمان لە سەری نیە. ئیمە لە ژیر فەرمانی ئیوەداین بلی بچن ئەمرین و بلی بژین ئەژین. ئیمە دلسوزی ئیوە بوین و، دلسوزی ئیوەین و، دلسوزی ئیوە ئەمینینەوە...»

تەنیا قسەی موحسین دزەیی لەو دانیشتنەدا کرد بوی، ئەوە بوە لە شای پرسی بو: «من کاتی کە سەفیری عیراق بوم لە پراگ بەردەوام راپورتم بو ئەنوسیت، ئاخو

گەیشتوە یا نە؟» شا دلنیای کرد بو کە راپورتەکانی پی گەیشتوە.

«نیو ستەیتمان» لە ژمارەی ١١ی ئەپریلی ٧٥ دا هەوالی ئەم دیدەنییەی بە کورتی گیرا بوەوە و نوسی بوی: شای ئیران بارزانی خستە بەردەم هەلبژاردنی ١ی لە ٣ ریگا: خوبەدەستەوەدانی عیراق، دریژە پیدانی بەرەنگاری بی پشتیوانی، هینانی خەلکەکەی بو ئیران.

١٣ ی مارت   بارزانی گەرایەوە کوردستان. خەلک هەمو چاوەروانی ئەوە بون بارزانی چی ئەلی. کوبونەوەکانی بارەگای بارزانی: (مەلا مستەفا، ئیدریس، مەسعود) و مەکتەبی سیاسی: (حەبیب محەممەد کەریم، د. مەحمود عوسمان، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، صالح یوسفی) و کومیتەی ناوەندی و سەرکردەکانی شورشەکە، بو لیدوان لە هەلومەرجی نوی، دستی پی کرد.

١٤ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا.

١٥ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا.

١٦ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا. مەکتەبی سیاسی بروسکەیەکی بو سەرکردایەتی بەعس لی دا. ئامادەیی خوی دەربری بو چارەسەرکردنی کیشەکە بە گفتوگو و، ناردنی نوینەری بو ئەو مەبەستە.

١٧ ی مارت   حیزبی بەعس داواکەی مەکتەبی سیاسی بو گفتوگو رەت کردەوە. لە بەیانیک دا کە واع (وکالە الانباء العراقیە) بلاوی کردەوە، داوای خوبەدەستەوەدانی بی قەید و شەرتی لی کردن.

١٨ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا.

١٩ ی مارت   بریار درا ئاشبەتال بکری. ئەمە یەکی بو لە گەورەترین کارەساتەکانی میژوی نوی ی کورد. مەینەتییەکی نەتەوەیی وای بە سەر کورد هینا هەتا ئیستاش شوینەوارەکانی ساریژ نەبون.

بە دریژایی ئەم کوبونەوانە دو رەئی هەبون: یەکیکیان، لای وا بو مادەم عیراق و ئیران ریک کەوتون کورد بە تەنیا بەرگری پی ناکری و، ئەوی تریان، لای وابو سەرەرای هەمو کەموکوری و ناتەواوییەک بەرگری ئەکری و ئەبی دریژە بە بەرگری بدری.

بو ئەوەی خەلک ئەوروژی و، کارەکانی بی دەردیسەر ئەنجام بدا، بارزانی رەئی خوی دەربارەی ئاشبەتال بە ئاشکرا دەرنەئەبری. لەم ماوەیەدا خەریکی گویزانەوەی سامان و دارایی و بەلگە و نامە و، رانە مەر و رەوە ئەسپەکانی بو. بی گیروگرفت هەمویان گواستەوە دیوی ئیران. کە ئەوەی تەواو کرد، ئینجا رەئی خوی بە ئاشکرا دەربری کەوا:

موئامەرەیەکی دەولی لە کایەدایە بو لە ناوبردنی کورد، بویە ئەبی کورد موقامەت نەکا و ئەگینا ئیبادە ئەبی و، ئەبی بکشیتەوە ئیران و، چاوەروانی هەلومەرجیکی دەولی باشتر بکا.

.۲ ی مارت بارەگای بارزانی بروسکەی بو هەمو فەرمانەدەی هیزەکان لی دا واز لە شەر بهینن. چەکەکان بشکینن و تەقەمەنی و دەبوکانیان بتەقیننەوە و، بچن بو ئیران. لەو کاتەوە کادر و پیشمەرگەکانی پارتی لە نارەزایی دا ئەم بریارەیان ناو نا «ئاشبەتال» و، وەکو زاراویکی سیاسی کەوتە سەر زمانی خەلک و بلاو بوەوە. ئەوسا یەکیتی هیشتا دانەمەزرا بو.

لە روژانی ۱۹ تا ۲٦ ی مارت کوتایی بە شورشەکە هات و، زوری ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی و کومیتەی ناوەندی خەریکی ساخ کردنەوەی کەلوپەلی فروشگاکانی شورش بون. پیشمەرگە و کادر و فەرماندە و بەرپرسەکانی پارتی بە کومەل چونە ئیران یا خویان بە دەست کاربەدەستانی عیراقەوە دا.

*

کە ئاشبەتال بو، ئەم حیزب و ریکخراوانە، لە کوردستان دا هەبون:

- پدک، کە گەورەترین ریکخراوی سیاسی کوردستانی عیراق بو، سەرکردایەتی شورشەکەی ئەکرد، بە روخانی شورشەکە هەمو لق و ریکخراو و ریکخستنەکانی ئەمیش هەرەسیان هینا و، هەلوەشان.

- حشع، چەند سالی پیشتر بوبو بە دو پارچەوە:

لوجنەی مەرکەزی، هیزی سەرەکی حیزبەکە بو، یەکیتیی سوڤیت پشتیوانی لی ئەکرد، هاوبەشی بەعس بو لە حوکمی عیراق و، لە وەزارەت و جەبهەدا. هەندی کەرتی چەکداری دروست کرد بو، دژی شورش و پیشمەرگەکانی لە هەندی جی بە گویرەی ئەو توانا کەمەی هەیان بو بەشداری شەر ئەبون.

قیادەی مەرکەزی، پاش لیدانی چەند جار لە لایەن بەعس و گوشاری پارتی لاواز بوبو، هەندی بنکە و پیشمەرگەی هەبو لە ناوچەکانی شورش دا، بەلام شورش و سەرکردایەتی شورش لە توانای هیزیکی وا لاواز و کەم نفوز دا نەبو. ئەمانیش بە کومەل گەرانەوە عیراق.

- کاژیک، ریکخستنیکی بچوک بو، ئەندامە ناسراوەکانی خویان خزاند بوە ناو بارەگای بارزانی و پارتی و، چارەنوسی خویان بە بنەمالەی بارزانیەوە بەست بو. ناوبانگی سیاسییان باش نەبو، سەرکردایەتی و هیزیکی ئەوتویان نەبو بتوانی سەرکردایەتی شورش

بگریتە ئەستو.

- کومەلە، ریکخستنیکی پچوک بو، بەلام کادر و ئەندامی باشی پی گەیاند بو، خوی ئاشکرا نەکرد بو، لە بەر ئەوە وەکو حیزبی سیاسی خەلک نەیان ئەناسی. زوری سەرکردە و ئەندامە پیشکەوتوەکانی چوبونە ریزی شورشەکەوە. ریزەکانی کومەلەش لە بەر یەک ترازا بو. کە ئاشبەتال بو لە پیش دا بە هیوای مانەوە و، دریژەدان بون بە شورش، بو ئەو مەبەستە پیوەندیبیان لە گەل قیادەی مەرکەزی و، سەرانی کاژیک و، هەندی لە فەرماندەکانی پیشمەرگە کرد بو، کەسیکی ئەوتو بە دەنگیانەوە نەهات بو. ئەمانیش نائومید بوبون و بە کومەل گەرانەوە بو عیراق.

*

تەلەفزیونی عیراق ریپورتاجی دریژی لە سەر هەرەسهینانی شورشەکە و، خوبەدەستەوەدانی بە کومەلی پیشمەرگە پیشان ئەدا. پیشمەرگەکان بە بی چەک لە دەوری لەگەنیک خواردن لە ناو مەعسکەری جەیش دا دانیشت بون نانیان ئەخوارد. سەربازی عیراقی دەورەی دابون و، تفەنگەکانیان، وەکو داری سوتاندن، لیژنە کرد بون. ئاژانسی دەنگوباسی عیراقی (واع) ئەم ریپورتاجانەی بە سەر دەزگاکانی راگەیاندن دا لە سەرانسەری جیهان دا بلاو ئەکردەوە. ئەوانیش: بە تایبەتی دەزگای تەلەفزیون و روژنامەکان، هەندی بەشیان، بە لیدوانەوە، لی بلاو ئەکردەوە. من ئەم دیمەنانەم لە تەلەفزیونی نەمساوە ئەدی. لە پیش دا دلم بروایی نەئەدا باوەر بکەم، لام وابو ئەمەش فیلی پروپاگەندەی سەرکردایەتی بەعسە. بەلام بە زویی دەرکەوت کارساتەکە لەوەش سامناکتر بو.

بارزانی خوی و بنەمالەکەی و بەشیکی عەشیرەتەکەی و بەشیکی هیزەکەی لەگەلی کشانەوە ئیران، خوی و بنەمالەکەی و سەد کەس لە لیپرسراوەکانی جولانەوەکەیان لە گەرەکیکی شاری کەرەج لە نزیک تاران جی کردەوە، ئەوانی تریش کە لە پیش دا لە ۱۵ . هەزار کەس زیاتر بون، هەمویان بەسەر شارەکانی ئیران دا دور لە کوردستان دابەش کرد.

شتیکی سەیرە، هیچکام لە بەشدارانی جولانەوەی کورد بیرەوەریبەکانی خویان نەنوسیوەتەوە. زور لە روداوەکان وەکو «مەتەل» ماونەتەوە و، هەندیکی بە تەواوی کویر بونەوە، مەگەر لە پاشەروژدا بەشیکی ئەم نهینیانە لە ئارشیفی دەزگا «موخابەراتیبەکان» دا بدوزرینەوە. لەم روەوە د. محمود عەلی عوسمان شایانی ریزلینانیکی تایبەتیە، چونکە دوای ئاشبەتال هەندی لەم باسە گرنگانەی بو رای گشتی کورد ئاشکرا کرد، ئەگینا ئەوانیش وەکو زور روداوی تر بزر ئەبو. بەلام ئەویش لە وی دا بریبەوە.

نوســەری ئەمــەریکایی (بە رەچــەڵەک لوبنانی): «ئەدمــون غــەریب»، نامــەی دکتۆراکەی لە سەر جوڵانەوەی کورد نوسیوە. ئەو کاتەی مەلا مستەفا لە واشینتۆن بو، هەوڵێکی زوری لە گەڵ دا بو بو ئەوەی بیرەوەرییەکانی پی بگیڕێتەوە و، لە سەر کاسێت توماری بکا، ئەمیش بیکا بە کتێبێکی سەربەخو. بارزانی رازی نەبو بو.

*

لەبەینی بارزانی و شـادا هیچ جـورە ڕێکەوتنێکی سـیـاسی یا قـانونی نەبو کـە جوری هاوکارییان دژی حکومـەتی عیـراق ڕێک بخات، وە ئیلتیزامی هەردولایان بەرامـبەر بە یەکـتـری دیاری بکات. تەنانەت ئەگـەر ڕێککەوتنێکی لەو بابەتەش لە نێـوان گـەلێکی بچـوکی بێ دەوڵەتی وەکـو کورد و، دەوڵەتێکی گـەورەی خاوەن مێژوویەکی درێژ لە دەس بڕین دا وەکـو ئێران هەبوایە، تاچ رادەیەک ئەبێ بەرامـبەری و بەجێـبەجێنانی بەڵێنی تێدا بێ؟

ئێران لە ساڵانی ۱۹۷۰ - ۱۹۷٤ کاتێ کە هێشتا دانوستان لە نێوان بارزانی و بەعس دا بەردەوام بو، هەمـیـشـە خـەریکی تێکدانی هەوڵی چارەسـەرکـردنی بە ئاشـتی مـەسـەلەی کـورد بو، هانی بارزانی ئەدا بو هەڵگیرسـانەوەی شـەر، بەڵێنی پشـتـیـوانی و یارمـەتی پی ئەدا، توانی سەرلەنوێ لە شـەڕیەوە بگلێنێ، کەچی کاتێ عیـراق ئامـادەیی دەربڕی خـواسـتـەکـانی بەجێ بێنێ، لەگـەڵی ڕێک کـەوت و دەسـتی لە بزوتنەوەی کـورد هەڵگرت، هەرچەندە ئەمە لە لای هەندێ کـسـایەتی ئێرانی وەکـو سیاسی ناسراو «فەریدون هویدا» لە (ل ١٥٤-١٥٥) کـتـیـبی: «سقـوط شـاه» دا بە «عـهـد شکنی» و، مـێژونوسی ناسراو «منوچهر پارسادوست» لە کتێبی: «ریشەهای تاریخی اختلافات عراق و ایران» دا بە «شکـسـتی سـەنگینی... ئەخـلاقی» ئێرانی دائەنێن، بەڵام ئەمە چی لە مـەینەتی کـورد کەم ئەکاتەوە.

ئێرانییەکان قـسـەیەکی مشهوریان هەیە ئەڵێ: «سیاست پدر و مادر ندارد» واتە: سیاسـەت دایک و باوکی نیە، ئەمە بە جورێکی سادە هەمان ناوەروکی قـسـە ئینگلیزییـەکـە دەرئەبڕی کە ئەڵێ: «لە سیاسـەت دا دوستی هەتا سەر و، دوژمنی هەتا سەر نیـە، بەڵکو قازانجی هەتا سەر هەیە».

شـا خوی لە گفـتـوگـویەکی روژنامـەوانی دا دوای چەن هەفـتـەیەک لەگـەڵ هەیکەل رونی ئەکـاتەوە بو جێـبـەجێ کـردنی سـیـاسـەتی دەرەوەی خـوی کـەڵک لە چ دەسـکەلایەک وەرئەگری. ئەم گفـتـوگـویە کاتێ خوی لە روژنامـەی «کەیهان» ی تارانی دا بڵاو کرایەوە. هەیکەلیش لە گوشە بە ناوبانگەکەی دا: «بصراحە» کە هەفتانە بو «الاهرام» ی ئەنوسی و،

دوای ئەوەیشەوە بۆ چەندین ڕۆژنامەی ئوردنی و کوێتی و لوبنانی، هەر لەو کاتەدا بڵاو کردەوە.

لە بەر ئەوەی دەقە عەرەبییەکەی چەند جاری بڵاو بوتەوە و، هەیکەل لە کتێبەکەی دا: «زیارە جدیدە للتاریخ» سەر لە نوێ بڵاوی کردوتەوە. زۆر خوێندەواری کورد عەرەبییەکەیان دیوە. من لێرەدا تێکستە فارسییەکەی وەکو ئەوسا لە ژمارەی ڕۆژی ١٥ ی سەپتەمبەری ١٩٧٥ (٢٤ی شەهریوەری ٥٤) ی ڕۆژنامەی «کیهان» ی تارانی دا وەرم گرتوە ئەنوسمەوە. دەقە عەرەبییەکەی ئەگەر جیاوازیەکی هەبێ لە گەڵ دەقە فارسیەکەدا تەنها لە دارشتنەکەیدایەتی ئەگینا ناوەروکی هەردوکیان وەکو یەکە:

شاهنشاه فرمودند: میپرسیم به قسمت سوم سوال شما «داستان ما با انقلاب کرد» باید صریحا به شما بگویم: آری ما به انقلاب کرد کمک کردیم و در دوره اخیر ما قدرت عملی در پشت سر آن بودیم و وقتی حمایت خودرا از آن پس گرفتیم آنچەرا کە میبایست اتفاق بیفتد اتفاق افتاد. میخواهم برای شما روشن کنم کە ما انقلاب کردرا اختراع نکردیم بلکە ما آنرا یک حقیقت موجود یافتیم. سال های طولانی رژیم های حاکم بر عراق با ما دشمنی میورزیدند حملات خصمانە و دشمنی آشکار نشان می دادند. خرابکاران از مرزهای ما می گذشتند و گاهی اوقات برخوردهای مسلحانە روی میداد انقلاب کرد فرصتی یافت و ما از آن بهرەگیری کردیم، آیا ما در واقع میخواهیم یک مشکل کرد بوجود بیاوریم؟ طبیعتا خیر باید بدانید کە ما دارای اقلیت کرد بزرگی هستیم بطوریکە یادآوری شد رژیمهای حاکم در عراق سالهای طولانی با ایران دشمنی میورزیدند آیا حق نداشتیم باین روش آنها جواب بدهیم؟ و از فرصتی اگر بدست آید استفاده کنیم؟ آری بە انقلاب کرد علیە حکومت بغداد کمک کردیم و این اقدام ما پاسخی بود بە اقداماتی کە علیە ایران کردە بودند. وقتی ما معتقد بە کاری باشیم کە انجام دادەایم چرا پردە پوشی کنیم؟ انها از دشمنی با ما دست برداشتند ما نیز چنین کردیم آیا میدانید جا دادن پناهندگان کرد از عراق تا بحال برای ما ٣٠٠ میلیون دلار خرج برداشتە است؟ باوجود این آیا غیر از این میتوانستیم کاری انجام بدهیم؟»

کاتی خوی لە یەکەم ژمارەی «ریبازی نوی» دا لە وتاریکی دریژدا لە سەر «ریککەوتنی جەزایر و هاوچارەنوسی نەتەوەی کورد» لەم قسانەی شا دواوم.

*

ماوەی نێوانخوشی ئێرانی - عێراقی

دوایەدوای ریکەوتنەکەی جەزائیر وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق سەعدون

حەمادی و وەزیری کاروباری دەرەوەی ئیران عەبباس عەلی خەلعەتبەری بە ئامادەبونی وەزیری کاروباری دەرەوەی جەزائیر عەبدولعەزیز بوتەفلیقە چەن ریکەوتنیکیان ئیمزا کرد، لەناو ئەوانەدا ئەوی بو بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عیراق و لە ئیران گرنگ بو «پروتوکولی ئاسایشی سنور بو».

صەددام خویشی سەردانی شای کرد لە تاران بو جیگیر کردنی ریکەوتنەکەیان.

ئیران و عیراق سنورەکانی خویان قایم کرد، ئیران ئاگاداری کوردەکانی عیراقی کرد کە نابی چالاکی سیاسی بنوینن. کاتیک گومانی لە هەندیکیان کرد کە خەریکی خو ریکخستنەوەن ساواک گرتنی. هەروەها عیراقیش ئاگاداری ئیرانیەکانی کرد کە نابی چالاکی دژی ئیران بکەن. هەردو دەولەت کومیتەی هاوکاری یان دروست کرد.

*

ئاشتبونەوەی عیراق و ئیران جەزرەبەیەکی کاریگەری لە کورد دا. بەعس ئەو هەلەی قوستەوە بو جی بەجی کردنی پلانەکانی تەهجیر و تەرحیل و تەعریب و تەبعیس، جولانەوەی کوردی لاواز کرد. بەلام ریگە بو کنەکردنی شینەیی ئوپوزیسیونی دینیی ئیران کرایەوە. لەوە پیش بە هوی گرژی پەیوەندیانەوە، ریگەی زیارەتی شوینە پیروزەکانی عیراق لە شیعەکانی ئیران گیرا بو. لە دوای ریکەوتنی جەزائیر هاتوچوکردنی هاوولاتیانی هەردو دەولەت بو یەکتری ئاسان بو. پیشەوای ئوپوزیسیونی دینیی ئیران، ئیمام خومەینی لە ١٩٦٤ وە لە نەجەف دانیشت بو، پەیوەندی لەگەل لایەنگر و شاگردەکانی کز و کەم بو.

هیلین کارەر دانکوس، یەکی لە شامزایانی کاروباری بلوکی روژهەلات لەم بارەیەوە نوسی بوی: «موخالەفەتی رابەرانی دینی کە ماوەیەک بە هوی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی شاوە بیدەنگ بو بو، لە سالی ١٩٧٥ بیدار بوەوە، واتە کاتی کە ریکەوتنی ئیران و عیراق ریگەی بە زائیرانی ئیرانی ئەدا سەردانی شوینە پیروزەکانی بکەن و لەگەرانەوەدا پەیام و شریتەکانی خومەینیان لەگەل خویان ئەبردەوە. جوریکی تازە لە شورش، واتە «شورش بە هوی شریتەوە» سەری هەل دا».

*

مەلا مستەفاو گفتوگوی روژنامەوانی

ئەودەمی مەلا مستەفا بە پەنابەری لە کەرەج جیگیر بوبو. ئەوی خویندومەتەوە دیومە دو گفتوگوی روژنامەوانی کرد: یەکیکیان لە گەل «ئەمیری طاهیری» نوسەری روژنامەی «کیهان» ی تارانی و، ئەوی تریان لە گەل روژنامەوانی میسری بە ناوبانگ

«محەممەد حەسەنەین هەیکەل».

خوزگە یەکێکی شارەزا هەمو گفتوگۆکانی مەلا مستەفای لە گەڵ ڕۆژنامەوانەکان، لە دوای گەڕانەوەیەوە لە سۆڤیەت بۆ کوردستانی عێراق (١٩٥٨) تا کۆچی دوایی لە واشینتۆن (١٩٧٩) کۆ ئەکردەوە و، بە بیلایەنی و بە پیوانەی زانستی لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر ئەکرد بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتنی «ئەقلیەتی سیاسی» بە ناوبانگترین و بە تەمەنترین سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد.

گفتوگۆ ڕۆژنامەوانیەکانی مەلا مستەفا ٣ جۆرن:

١. ئەو گفتوگۆیانەی کەسی سێهەم وەکو تەرجومان لە بەینی مەلا مستەفا و ڕۆژنامەوانەکەدا بوە. وەڵامەکانی بارزانی لە لایەن کابرای تەرجومانەوە بژار کراوە لە قسەی «هەڵەق مەڵەق» و، رازێنراوەتەوە. نمونەی ئەمەش گفتوگۆکانیتی لە گەڵ ڕۆژنامەوانی بەریتانی «دەیڤید ئادەمسن» نوسەری کتێبی: «شەڕی کورد» و، ڕۆژنامەوانی ئەمەریکایی «دانا ئادەم شمیت» نوسەری کتێبی: «گەشتی بە ناو پیاوە ئازاکان دا» و، ڕۆژنامەوانی فەرەنسی «ئیریک ڕولو» نوسەری ڕۆژنامەی «لیموند دیپلوماتیک»...

٢. ئەو گفتوگۆیانەی پرسیار و وەڵامەکانی بە نوسین ئامادە کراون. ئەم گفتوگۆیانەش بە زۆری ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی وەکو ئیبراهیم ئەحمەد، مامجەلال، حەبیب کەریم، د. مەحمود عوسمان، سامی سنجاری و، دارا توفیق بۆیان هونیوەتەوە و، بۆیان ڕێک خستوە. نمونەی ئەمەش گفتوگۆکانیتی لە گەڵ ڕۆژنامەکانی «خەبات» و «التاخی»...

هەمو یادداشت و بیرخەرەوەکانیشی هەر ئەوان بۆیان نوسیوە.

٣. ئەو گفتوگۆیانەی ڕاستەوخۆ خۆی لە گەڵ ڕۆژنامەوانی عەرەب و فارس و کورد کردویەتی. بۆ ئەم گفتوگۆیانە بارزانی پێویستی بە کەسی سێهەم، واتە تەرجومان، نەبوە، ئەوەی لە دڵی دا بوە بە ئارەزوی خۆی و بە زمانەکەی خۆی وەڵامی داوەتەوە.

جۆری سێهەمی گفتوگۆکانی گرنگییەکی زۆریان هەیە چونکە قسەی ڕاستەقینەی «بێ ڕوتوش و دەسکاری» خۆیەتی. نمونەی ئەمەش ئەم دو گفتوگۆیەیە لە گەڵ «ئەمیری طاهیری» و «هەیکەل» و، چەند گفتوگۆیەکی پێشوتری لە گەڵ گۆڤاری «روز الیوسف» ی قاهیرەیی و، «ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست» ی میسری.

ئەمیری طاهیری گفتوگۆکەی خۆی بە فارسی لە ڕۆژنامەی «کیهان» و «رستاخیز» ی تارانی دا و، بە عەرەبی لە ژمارەی ٣٨٠ ی ڕۆژانی ١ - ١٧ ئاباری ١٩٧٥ ی حەفتەنامەی «الاخاء» تارانی دا بلاو کردەوە. لیرەدا دەقی فارسی گفتوگۆکە وەکو لە

ژمارەی ڕۆژی ۱۰ ی مایسی ۱۹۷۵ ی «کیهان هوائی» دا بلاو کراوەتەوە، وەکو خوی بەبی هیچ دەستکاریەک تەنانەت لە فاریزە و نوقتەدا، تەنوسمەوە. تەنها شت کە لەم لاپردوە مانشیتەکانیتی:

«قسمتی از مصاحبه اختصاصی امیر طاهری سردبیر کیهان با ملامصطفی بارزانی

ملامصطفی بارزانی، ۷۳ ساله، که شاید قدیمی ترین و معروفترین رهبر جنگ های پارتیزانی در جهان است، با این تاکید نشان داد که فصلی مهم از تاریخ عراق، فصلی پر از ماجراهای خونین، برای همیشه بسته شده است.

بارزانی اکنون به همراه خانواده اش در نزدیکی تهران زندگی میکند. هفته پیش که به دیدار او رفتم بسیار شادمان و سر حال بنظر میرسید. هنگامی که از پایان جنگ در شمال عراق سخن می گفت و پایان زندگی سیاسی و نظامی خود را اعلام میکرد، کوچکترین اثری از تلخی یا تاسف در لحن او دیده نمیشد.

ملا که اکنون لباس های محلی کردی را کنار گذارده و کت و شلوار می پوشد و کراوات میزند در سراسر دیدار ۹۵ دقیقه ای ما مکرر در مکرر تاکید میکرد: من یک بنده ناچیز خداوند بزرگ هستم. همه چیز از قبل در کتاب سرنوشت امده است و بندگان را از ان گریزی نیست.

بارزانی گفت: هرگز به اندازه امروز احساس تندرستی و ارامش نکرده ام. اینده را نمی توانم پیش بینی کنم اما میتوانم بگویم که حالا فکر نمی کنم هرگز به عراق برگردم.

بارزانی افزود که قبلا هیچ اطلاعی از توافق ایران و عراق در الجزایر نداشت اما از این توافق پشتیبانی میکند زیرا صلاح ملت ایران را در بر دارد. هرچه خیر ایران را بهمراه داشته باشد مورد موافقت همه کردهاست.

در جریان یک سال نبرد، هیچ کشوری جز ایران به کردها کمک نکرد. بارزانی گفت: انها که یکباره کردها کشف کرده اند و برای ما اشک تمساح میریزند قصدی جز حمله تبلیغاتی علیه ایران ندارند. بعضی ها برای ما صدقه میفرستادند اما هرگز کمک جدی نمی کردند. مقداری پتو و مقداری دارو... همین، مسخره است و ما خودمان را مدیون هیچ کشوری بجز ایران نمیدانیم.

شورشی کهنسال که از دو ماه پیش سیگار را ترک کرده است و اکنون پیپ می کند ادامه داد:

همه ما از انچه ایران برایمان کرده است و می کند سپاسگزاریم. ما در ایران زیر

سایه شاهنشاه، رهبر تمامی اریائی نژادها، به احترام و اسودگی زندگی میکنیم.

کردهای عراق اکنون چه باید بکنند؟ بارزانی در پاسخ به این پرسش گفت: من اینجا هستم و انها در انجا. همه چیز به خود انها بستگی دارد. من دیگر یک رهبر نیستم و به شما اطمینان میدهم که هرگز دوباره یک رهبر نخواهم شد. من تمام شده ام، مطلقا تمام شده ام، ارزویم این است که نامم از تاریخ محو شود اما شما روزنامه نگاران نمی گذارید.

بارزانی شدیدا به بعضی عناصر کرد عراقی که از خارج علیه ایران اظهاراتی کرده اند، تاخت و گفت: ان ها انسان نیستند، کرد نیستند، مرد نیستند.

درباره یکی از انها، عصمت شریف وانلی، بارزانی گفت: او خودش را فروخته است، او یک هیولاست به صورت انسان.

بارزانی در حالیکه مشتانش را گره کرده بود افزود: کسی که این طور عمل میکند و خود را به یک سفارت خارجی میفروشد مسلمان نیست. خداوند همه موجودات بی شرف از این نوع را مجازات خواهد فرمود.

رهبر پیشین کردهای عراقی هم چنین به تلخی از کمونیست ها یاد کرد و ان ها را مسئول کشتار در شمال عراق خواند، کمونیست ها به گفته ملا: دشمنان اسلام هستند و از هر وسیله ای برای انداختن مسلمانان بجان یکدیگر استفاده میکنند.

ملا که چشمهائی با هوش و ذهنی دقیق دارد، گفت: به اعتقاد من اکثریت کردهای عراقی طرفدار پایان دادن به جنگ بودند. عراق نزدیک به سه ملیون کرد دارد که تنها ۱۰۰ هزار نفر انها خارج از عراق بسر میبرند.

اکثریت این صد هزار نفر در ایران هستند و چند صد روشنفکر کرد نیز در اروپا زندگی میکنند.

ملا گزارش های مربوط به درخواست پناهندگی او و پسرش ادریس را از ایالات متحده و سویس تکذیب کرد و گفت: همه اینها دروغ محض است ما نمی خواهیم ایران را ترک کنیم و از خارجی ها گدائی کنیم.

بارزانی به یاد اورد که در گذشته او را «ملای سرخ» می خواندند و گفت: این لغت را دشمنان درست کردند. من همواره مخالف کمونیسم بودم زیرا مسلمان هستم. در میان همکاران من حتی یک کمونیست وجود نداشت یا اگر وجود داشت جرئت نمیکرد دستش را رو کند.

ملا دست کم ۲۰ سال جوانتر از سن اش بنظر میرسد، کوتاه قدتر از انست که

انتظار میرود، اما بسیار تنومند است و شانه های پهن دارد. با انکه رژیم غذائی ندارد از بزرگی شکم در رنج نیست، میگوید: هرگز واقعا بیمار نشده ام. دکترهایم میگویند که حالم کاملا خوب است. او همان زمینه و برنامه های زندگی را که در روستای دیلمان، مرکز فرماندهی اش در کردستان عراق، داشت ادامه میدهد - با این تفاوت که در اقامتگاه اش در نزدیکی تهران سخن از جنگ و تصمیم های جنگی روزانه در میان نیست.»

مەلا مستەفا لەم گفتوگۆیاندا خۆی بە گەوج و نەزان پیشان ئەدا و، قسەی وای ئەکرد لە نرخی خۆی زۆر دائەبەزاند. تەنیا مەبەستی ئەوە بو شا و ساواک دلنیا بکات. مەلا مستەفا تەمەنێکی درێژی بە سەر برد بو نەئەبو ئەوەندە گوێ بداتە پاشماوەی ژیانی خۆی، سەرەرای ئەوەش بارزانی لەو کاتەدا پیاوێکی ناسراو و بەرێز بو لە دنیادا، ناوی خرابوە دەلیلی کەسایەتیە جیهانیەکانی لە پاڵەتی: «فیشەر فیلت ئالمانیاخ» وە، شا بە ئاسانی نەیئەتوانی ئازاری بدا یا تەنگی پێ هەلچنێ. هەرکەسێکی شارەزا گفتوگۆکانی بارزانی لە گەل رۆژنامەوانەکای بیگانە و، نامەکانی کە بو کاربەدەستانی ئینگلیز و سالانی دوایی تەمەنی بو شای ئێران و، دیمیرێلی سەرۆکوەزیرانی تورکیا و، کارتەری سەرۆکی ئەمەریکای... نوسیوە، بخوێنێتەوە و، بە وردی شی بکاتەوە ، بوی دەرئەکەوی کە: مەلا مستەفا لە ئاستی هاوولاتی کوردا خۆی چەند بە زل ئەزانی و، دلرەق و بێ بەزەیی و زوردار بو، کەچی لە ئاستی بیگانەدا خۆی چەند بە پچوک و خزمەتکار و ملکەچ دائەنا.

هەیکەل گفتوگۆکەی خۆی رۆژی ٦ ی ئەیلول (سەپتەمبەر) ی ١٩٧٥ لە ژێر سەرناوی «مقابلە مع صقر عجوز من کردستان» دا بلاو کردەوە. هەیکەل ئەوسا لە ئەهرام نەمابو. وتارە حەفتەییەکانی لە چەند رۆژنامەیەکی ئوردونی، کویتی و لوبنانی دا لە یەک رۆژدا چاپ ئەکرا. هەیکەل ئەم گفتوگۆیەی لە هیچکام لە کتیبەکانی دا بلاو نەکردەوە.

دلنیا نیم لەوەی ئەمیری طاهیری قسەکانی بارزانی وەکو خۆی نوسی بو یا شیواند بوی، بەلام هەیکەل لەوانە نەبو قسەی بارزانی بگۆری، هیچ دەسکەوتێکی لەوەدا نەبو، کەسیش زۆری لێ نەکرد بو. ئەگەر یەکێ ناوەرۆکی هەردو گفتوگۆ لە گەل یەکتری بەراورد بکا ئەبینی زۆر جیاواز نین.

هەیکەل گفتوگۆکەی بە هەندێ سەرنج و بیروبۆچونی خۆی تەواو ئەکا. لەوێ دا ئامۆژگاری دەسەلاتدارانی عێراق ئەکا سەبارەت بە جۆری رەفتاریان لە گەل کورد و مافەکانی. ئەگەر صەددام ئامۆژگارییەکانی هەیکەلی لە گوێ بگرتایە و، بە جێ ی بهێنایە، لەوانە بو پێویست نەکا کورد جارێکی تر پەنا بەرێتەوە بەر چەک.

هەیکەل بیری بارزانی ئەخاتەوە کە بە نوێنەرەکەی دا کاتی خۆی هەواڵی بۆ نارد ئێران و عێراق پێک دێن، مشوورێکی خۆی بخوا، بۆچی هیچی نەکرد؟

بارزانی ئەلی: ئیرادەی خوا بو.

ئەم وەلامە چیرۆکێکی کۆنی بە بیر هێنامەوە. هولاکو کە بەغدای گرت لە خواجە نەصیرەدینی طوسی پرسی: ئەگەر خەلیفە بکوژری راستە دنیا ژێروژەبەر ئەبی؟ طوسی ئەلی: ئەم هەمو صەحابەیەی پێغەمبەر لەتوێت کران هیچ نەقەوما ئەبی بە کوشتنی ئەم بۆچی دنیا ژێروژەبەر بێ؟

هولاکو خەلیفەی گرت و، بە زۆر گەنجینەی سەدان ساڵی بنەماڵەی عەبباسی پێ دەرهێنا. گەنجینەکەیان پڕ بو لە خشل و دەفری زێرین. هولاکو خەلیفەی لە قەفەزێکا دانا بو. خەلیفە برسی بو داوای خواردنی کرد. هولاکو فەرمانی دا لە سەر سینییەکی زێر ژەمی خواردنی گەورە لە زێر و گەوهەر و مرواری... برازێننەوە و بوی بەن. بویان برد و لەبەردەمی دا دایان نا بیخوات.

خەلیفە وتی: ئەمە ناخوری.

هولاکو ئینجا لی ی پرسی: مادام ناخوری کە هەواڵت زانی من لەشکرم ساز داوە بێمە سەرت، بۆچی ئەم زێرەت نەکرد بە دراو بیدەی بە موچەی مانگانەی سەربازەکانت و بیانیریتە سەر ئاوی جەیحون رێگەم پێ بگرن؟

خەلیفە وتی: ئیرادەی خوا بو.

هولاکو پرسی: باشە کە من ئێرانم گرت و لە بەغدا نزیک کەوتمەوە بۆچی ئەم زێرەت نەتوانەوە بیکەی بە دەروازەی شاری بەغدا بو ئەوەی من نەتوانم بیگرم؟

خەلیفە وتی: ئیرادەی خوا بو.

هولاکو وتی: مادەم وایە ئیرادەی خوایە منیش تو بکوژم.

لە باوەری مەغول دا نەئەبو خوێنی گەورەپیاوان برژێتە سەر ئەرز. لە بەرئەوە فەرمانی دا لباد لە خەلیفەوە بپیچن و بیسونەوە و هەلی گلوفن هەتا ئەمری.

بارزانی ئەگەر درێژەی بە بەرەنگاریی بدایە بێگومان ئەبو بە سەرکردەیەکی سیاسی و پێشمەرگەیی ئەفسانەیی بەرێز لە هەمو دنیادا. بەلام ناشیەتالی کرد، ئەمیش هەمان بەهانەکەی خەلیفەی هێناوەتەوە. هەرچەندە چارەنوسی شەخسی بارزانی لە هی خەلیفە بەختیارتر بو، چونکە بەردەستی صەددام نەکەوت، ئەویش بە پێ ی ئیرادەی خوا بیفلیقێنیتەوە، بەلکو خۆی لە ئەمەریکا بە دەردی خوا مرد، بەلام چارەنوسی بارزانی وەکو پێشەوای سیاسی و، سەرکردەی عەسکەری کورد لە هی خەلیفە باشتر نەبو.

*

**دامەزراندنی یەکیتی**

لە رۆژانی ئاشبەتال دا ئاژانسەکانی دەنگوباس بلاویان کردەوە عەلی عەسکەری و چەند کەسیکی تر بریاریان داوە دریژە بە شۆرش بدەن. ئەم هەواڵە بۆ من هەم مایەی دڵخۆشیی بو، هەم سەیر نەبو. عەلی عەسکەری ئەوەندەی من ئەمناسی کاری وای لە دەس ئەهات. زۆری پی نەچو دەرکەوت هەواڵەکە راست نیە. کاک عەلی چو بوە ئیران.

«کۆمەڵە» ریکخستنیکی پتەوی دامەزراند بو. من زۆرتر دلم بەوە خۆش بو کە کۆمەڵە ئەرکی دریژە پیدانی بەرەنگاریی ئەگریتە ئەستو. زۆرجار باسی ئەوەمان کرد بو کە بورجوازییەتی کورد ناتوانی هەتا سەر دریژە بە خەبات بدا، لە قوناغیک دا رائەوەستی، ئەوسا ئیتر سەرە دیتە سەر کۆمەڵە دریژە بە خەبات بدا تا سەرکەوتن. من لام وابو ئەو قوناغە هاتوتە پیشەوە. کۆمەڵەش ئەرکی میژوویی خوی ئەبینی. بە تایبەتی وەکو بویان باس کرد بوم کادری باشی پی گەیاند بو، سەرکردەی ناسراوی وەکو مامجەلالیشی لە پشت بو. بەلام ئەمیش نەبو.

د. کەمال فوئاد دوای بوردومانی قەلادزی گەرابوەوە بو ئەلمانیا. ناوبەناو تەلەفونمان بو یەکتری ئەکرد و نامەمان ئەگورییەوە. رۆژانی ئاشبەتال زۆر جار تەلەفونمان لە گەڵ یەکتری ئەکرد، هەروەها لە گەڵ زۆر لەوانەی ئەمناسین. هەمومان لامان وابو کە پیویستە ئیمەش لە دەرەوە خومان ریک بخەینەوە، بو ئەوەی ئەگەر لە ولات بەرەنگاریی دەستی پی کردەوە، یا ریکخراویکی نوی دامەزرا، ئیمەش هاوکاری بکەین، بە تایبەتی لقی ئەوروپای پارتی وەکو هەمو دەزگاکانی تری شورشەکە هەلوەشا و، لە کار کەوت بو. لە ماوەیەکی کورت دا زۆر کەس، لە زۆر ولاتی جیاواز، بون بە هاودەنگ و هاوبیرمان.

مامجەلال کەوت بوە جموجول. ئەو ماوەیە لە قاهیرە، بیروت، دیمەشق، تەرابلوس هاتوچوی ئەکرد. لە بیروتەوە هەواڵ بلاو کرایەوە کە مامجەلال خوی بو گەرانەوە ئامادە ئەکات. مامجەلال دوستایەتی لە گەڵ کەمال فوئاد و لە گەڵ من بە هیز بو. دوستایەتی من لە گەڵ مامجەلال ئەگەرایەوە بو سالی ١٩٦١، بو ئەو کاتەی لیپرسراوی لقی سلیمانی پارتی بو. چەند جاری تەلەفونی بو کردم و نامەی بو ناردم، هەواڵ و دەنگوباسەکانی پی ئەگەیاندم و، بیرو بوچونەکانی خوی بو رون ئەکردمەوە، منیش بیروبوچونەکانی خومم بو باس ئەکرد. داوای لی کردم خوم ئامادە بکەم بو بەشداری لەو ریکخراوە تازەیەدا کە خەریکی دامەزراندنیتی و، بو گەرانەوە بو ولات. ئەگەرچی ماوەیەکی دریژ بو من لە کوردستان دور بوم بەلام «ئیلتیزامی ئەخلاقی و ئەدەبی» بە کۆمەڵە و بە مامجەلالیەوە

پەست بوم، بە جوانم نەئەزانی لە ژێری دەرچم. یەکسەر وتم: کەی داوات کردم بە سەر چاو ئامادەم.

ئەم قسەیەی من لای هەندێ کەس سەیر بو. لەو هەلومەرجە سەختەدا کە زور کەس بە ئاواتەوە بون بگەنە ئەورووپا، من لە ئەورووپا جیگیر بوبوم، لە دوا قوناغی تەواو کردنی خوێندنی دکتورادا بوم، دەس لە هەمو شت هەلبگرم و ملی ڕیگای هات و نەهات بگرم بەرەو کوردستانی ژێر هەرەسی ئاشبەتال. ڕاستی بریارێکی وەها دژوار، هەمو کەس بە ئاسانی نەی ئەسەلماند، بگرە هەندێ کەس بە فشەیان ئەزانی.

جارێکیان لە وەلامی نامەیەکی دا، بو ئەوەی دلنیای بکەم لەوەی من هەر لە سەر پەلینە کونەکەی خوم ماوم، سەرەتای نامەکەم بەم شیعرەی «سالم» دەس پی کرد:

ئەی قیبلەی مورادم ئاخو بە ڕوژگاران

جاری لە کەس ئەپرسی حالی غەریبی تاران

بەو سوێندەکەی کە خواردم: من هەر ئەوەم کە دیوتم،

حاشا بکەم فەراموش، میثاق و عەهدی جاران!

لە دیری دوەمی بەیتی یەکەم دا وشەی «تاران» م گوری بو بە «شاران».

پەلینم دایە هەر کاری بو دەسپیکردنەوەی شورش دەس پی بکەن، من واز لە هەمو شتێکی خوم ئەهێنم لە ڤییەننا و، لە گەلیان ئەبم. بەلام ئەو ماوەیە من ئازادی هاتوچوم نەبو. پاسپورتەکەم عیراقی بو. سەفارەت بویان تازە نەکرد بومەوە. نەمئەتوانی هاتوچو بکەم. لە ڤییەننا گیرم خوارد بو.

مامجەلال لە سەرەتادا ڕەئی وابو کە هەمو تیکوشەرانی کورد لە چەپەوە بو ڕاست لە یەک ڕیکخراوی فراوان دا یەک بخرین. بو ئەم مەبەستە پیوەندی لە گەل زور کەس کرد بو بە تایبەتی لە گەل ئەو ئەندامانەی کومیتەی ناوەندی پارتی کە هاتبونە دەرەوە، لە گەل ئەوانەی نوێنەری بارزانی بون. ئەم بیرە سەری نەگرت.

د. فوئاد مەعصوم نوێنەری بارزانی بو لە قاهیرە. لە گەل مامجەلال پیوەندی باش بو. ئەویش لە گەل مامجەلال هاوبیر بو کە ڕیکخراوێکی نوی دروست بکری بو درێژەپیدانی خەبات.

عادل موراد و عەبدورەزاق میرزا عەزیز لە ئیرانەوە چوبون بو سوریا بو لای مامجەلال. عادل سەروکی یەکیتیی قوتابیانی کوردستان و عەبدورەزاق ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەتی یەکیتیی لاوان بو.

---

(١) مامجەلال کومیتەیەکی پیک هینا بو لە: خوی، د. فوئاد مەعصوم، عادل موراد،

عەبدورەزاق فەیلی، کەمال فوئاد، عومەر شێخموس و، من بو سەرکردایەتی ڕێکخراوێکی تازە کە درێژە بە خەباتی سیاسی - چەکدار بدا. ناو لەم کومیتەیە نرا بو «دەستەی دامەزرێنەری یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان» و یەکەمین بەیانی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی بە عەرەبی، لە شام پاش باس کردنی لە گەڵ د. فوئاد و عادل و عەبدورەزاق، لە ٧٥/٥/٢٢ دا نوسی بو و، بلاو کرد بوەوە و، بو کەمال فوئادیشیان نارد بو لە ئەورووپا بلاوی بکاتەوە. ئەویش دوای ئەوەی هەندێ دەسکاری تێ دا کرد بو لە ٧٥/٦/١ دا بلاوی کردەوە. من ئەوسا هێشتا لە ئیفنفنا نەجولا بوم، لە بەر ئەوە لە دارشتنی بیرەکانی ئەم بەیانەدا بەشدار نەبوم.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە سوریا ئەم بەیانەیان بلاو کردەوە. ئەم بەیانە لە سەرانسەری دنیا بە زمانی جیاواز چاپ و بلاو کرابوە لەوانە: ئینگلیزی، ئەلمانی، فارسی. کەمال بورقای ئەوسا لە تورکیا مانگنامەی «ئوزگوپرلک یولو» ی دەرئەکرد. ئەویش دەقی بەیانەکەی بە تورکی بلاو کرد بوەوە.

ئەگەرچی نائومێدی و سەرلێشێوان و بێ ورەیی کوردی داگرت بو، بەلام ڕاگەیاندنی ئەم بەیانە دەنگدانەوەیەکی زور گەورەی هەبو لە کوردستان دا.

ئیمەش: کەمال فوئاد و عومەر شێخموس و من لە ئەورووپا کەوتینە دروست کردنی ڕێکخستنی ئەورووپا. لە ئەورووپاش کومیتەیەکمان پێک هێنا بە ناوی «دەستەی دامەزرێنەر» بو سەرپەرشتی دامەزراندن و چالاکی یەکیتی. زەمینەی سیاسی لە بار بو لە ماوەیەکی زور کورت دا لە زوری ولاتانی ئەورووپا ڕێکخستنی فراوان دامەزرا. مامجەلال و هەڤالانی سوریا کەوتنە پێوەندی لە گەل کادرە ناسراوەکانی جولانەوەی کورد لە ئێران و لە عێراق. مامجەلال نامەیەکی بو بارزانی نوسی بو دەربارەی دامەزراندنی ئەم ڕێکخستنە نوێ یە و، دلنیای کرد بو لەوەی کە نەک دژی بارزانی نابێ بەلکو بە چاوی سەرکردەی جولانەوەی کورد سەیری ئەکاو، بو پشتیوانی ئەبێ لەو هەر هەنگاوێ بنێ.

*

ئاشبەتال تێکوشەرانی کوردی هەژاند بو. سەر لێ شێوان و نائومێدی و بەرچاوتاریکیی هەمو لایەکی داگرت بو. چەند کەسێ لە کاربەدەستە زلەکانی پارتی بێ ئەوەی هیچ بیانویەکیان هەبێ تەسلیمی عێراق بونەوە. سالح یوسفی، ئەندامی مەکتەبی سیاسی، هەر زو لە گەلالەوە گەرابوە بو عێراق، هەروەها عەبدولی سوران و، صدیق ئەمین کە ئەندامی کومیتەی ناوەندی بون. حەبیب محەممەد کەریم، سکرتێری پارتی، لە قاهیرە بو، ئەویش لەوێوە خوی تەسلیم بە عێراق کردەوە. دارا توفیق، لە بێروت بو،

لەویوە رویشتنەوە بو بەغدا. چەند کەسیکی تریش لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و، فەرماندەی هیز و بەتالیونەکان، تەسلیم بونەوە. وە نەبی ئەمانە بەرنامە یا پلانیکیان هەبوبی، بەلکو لە ئەنجامی نائومیدی و روخان دا تەسلیم بونەوە. ئەوانی تریشیان لە ئیران خەریکی ریکخستن و داپینکردنی ژیانی خویان بون. هەرسەکە ئەوەندە گەورە و کاریگەر بو زور کەس لایان وابو ئیتر جولانەوەی کورد تەواو. بەعس و هاوکارە کوردەکانیان لە پایەتی عەزیز عەقراوی برەویان بەم بوچونە ئەدا و ئەیانوت: «مەسەلەی کورد، هیچ نەبی لەم قوناغەدا تەواو، حەوالەی نەوەکانی داهاتو کراوە».

لە ئیران، مەلا مستەفا ئەیویست زورترین ژمارەی خەلک لە دەوری خوی بهیلیتەوە. هەر جارە قسەیەکی ئەکرد. جاریک ئەیوت: «زەرفی دەولی خراپە، ئەبی چاوەروانی زەرفیکی دەولی باش بکەین» و، جاریک ئەیوت: «کاری من تەواو ئیتر من سەرکردەی کورد نیم» و، جاریکی تریش ئەیوت: «ئیستا ئومیدم لە جاران بە هیزترە و، بەمزوانە بە هیزیکی گەورەترەوە ئەگەریینەوە کوردستان و ئەمسال تری ی رەش لە حاجی ئومەران ئەخوین». ئیرانیش خەریکی بلاوە پی کردن و جیگیر کردنی پەنابەرانی کورد بو لە دەرەوەی ناوچە کوردنشینەکان.

عیراق چەند جاری نوینەرانی خوی نارد بو ناو پەنابەرانی کورد بو ئەوەی قانعیان بکا بگەرینەوە عیراق. زوریشیان قانع کرد و گەرانەوە.

لە نەغەدە تاقمی لە کادرەکانی پارتی، لە هەردو بالی مەلایی و جەلالی، لەوانە: عەلی عەسکەری، عومەر مستەفا، تایەری عەلی والی، رەسول مامەند، عەلی هەژار، کاردو گەلالی... چەند جاری لە ناو خویان دا کوبونەوە، بو لیکدانەوەی هەلومەرجی سیاسی کوردستان و، دانانی نەخشەی کاری داهاتو. ئەمانە لایان وابو سەرکردایەتی بارزانی بەو ریبازە سیاسیە چەوتەی لە چەند سالی رابردودا گرت بوی، جولانەوەی کوردی توشی هەلدیران کردوە. ریکخستنەوەی پارتی لە سەر بنچینەیەکی پیشکەوتو، بە دوستایەتی لە گەل بەعس و، بەشداری لە داوودەزگای حوکمی زاتی دا ئەگری هەندی لە دەسکەوتەکانی کورد بپاریزری.

کاربەدەستانی بەعس لە سەرەتادا بەلینیان پی دان. بەو هیوایەوە بە کومەل گەرانەوە عیراق. لە عیراق بە گەرمی پیشوازییان لی کردن. بەلام بەعس هیچکام لە بەلینەکانی بە جی نەهینا. پاش ماوەیەکی کورت چالاکی سیاسی لی قەدەغە کردن و، لە کوردستان دوری خستنەوە، هەریەکەیانی بە وەزیفەیەکی حکومەتی نارد بو جیگایەکی خواروی عیراق.

بەلام ئەمان کە لە ئێران قسەیان کرد بو بە یەک، لە عیراقیش لە ناو خویان دا ئەو پەیوەندییەیان پاراست و، ڕێکخستنێکیان پێک هێنا، سەرەتا بە چاولێکەری «الحرکە التصحیحیە» کەی بەعس لە سوریا، ئەمانیش ناویان لە خویان نا «بزوتنەوەی ڕاستکردنەوە»، گوایە چەوتی و لادانە سیاسییەکانی پارتی ڕاست ئەکەنەوە. چەندین کەسی تریش، لەوانە: سالح یوسفی بو بو بە هاوبیر و هاودەنگیان. سەرەنجام ناوی خویان کرد بە: «بزوتنەوەی سوشیالیستی دیموکراتی کوردستان»

*

کوردی سەرانسەری کوردستان بە هاودەردییەکی قولەوە سەیری ڕوداوەکانی کوردستانی عیراقیان ئەکرد و، هەمویان بە مەینەتی خویان ئەزانی. زوری سیاسەییەکانی دەرەوەیان ئامادە بون هەرچییەکیان لە دەس بێ بیکەن بو هەلساندنەوەی جولانەوەی کورد لە عیراق دا. هەندێکیشیان بە کردەوە بەشدار بون. لە ناو کوردەکانی ئێران دا حەسەنی قازی و محەممەدی موهتەدی لە هەمویان زیاتر بە پەروش بون. حەسەن بلاوکراوە گرنگەکانی یەکێتی کرد بە فارسی و بلاوی کردنەوە. ئەمەش بو ناسینی یەکێتی لە ناو ئێرانییەکان دا بایەخێکی تایبەتی هەبو.

*

چەند مانگێ دوای ئاشبەتال نوری ئەحمەد طەها گەیشتە فیەننا. کاک نوری لە تارانەوە چو بوە دیمەشق و، لە دیمەشقەوە هات بو بو فیەننا، بو ئەوەی بچێ بو ئەلمانیای ڕوژئاوا بو لای کورە گەورەکەی: ئاسو.

کاک نوری لە تێکوشەرە دێرینەکانی ڕێگای کوردایەتی بو. کە جمهوریەتی مەهاباد دامەزرا ئەم ئەفسەرێکی تازە دەرچو بو لە جەیشی عیراق دا. چوە مەهاباد بو ئەوەی لە ڕیزی سوپای کوردستان دا خزمەت بکا. یەکێ بو لە دامەزرینەرەکانی «پارتی دیموکراتی کورد». دوای ڕوخانی جمهوریەتی مەهاباد، لە گەڵ بارزانی چو بو تاران بو گفتوگو لە گەڵ ئێرانیەکان. لەوێ هەندێ هەلویستی ئازایانەی نواند بو. بارزانی لە بەر ئەوە ڕیزی لێ ئەگرت. دوای ڕویشتنی بارزانی بو سوڤیەت ئەم گەرایەوە کوردستان. چەند سالێ لە زیندان دا مایەوە. لە زیندان دا بە هەلویستی ئازایانە بە ناوبانگ بو. دوای بەربونی درێژەی بەکاری سیاسی دا لە کومیتەی ناوەندی پارتی دا. لە سەر چالاکی سیاسی چەند جارێکی تر خرایەوە زیندان، بە تایبەتی دوای خوپیشاندانەکانی کرا لە دژی دەستدرێژی ٣ قولی بو سەر میصر و، بو ناشتنی تەرمی شێخ مەحمود.

دوای ١٤ ی تەمموزی ٥٨ گێرایانەوە بو جەیش. وەزیفەیەکی ئیداری پچوکیان

دابویه له شوێنێکی دووری کوردستان، بەلام هەر ئەندامی کومیتەی ناوەندی پارتی مابووەوە. ئینجا خوی خانەنشین کرد و، خەریکی کاری حیزبایەتی بو.

له دەسپێکردنی شورشی ئەیلول دا کاک نوری پێشمەرگەی ناوشاری دامەزراند و، خوی راستەوخو سەرپەرشتی چالاکیەکانی ئەکرد. له ناکوکیەکانی نێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانی دا، سەرەتا له گەل مەکتەبی سیاسی بو، دوایی بەلای مەلا مستەفادا کەوت و، زوری نەبرد خوی له ژیانی حیزبی کەنارەگیر کرد.

له تەقەللا سەرنەکەوتوەکەی عەبدولغەنی ئەلراوی دا بو گورینی حوکمی حیزبی بەعس کاک نوریش ئیتیهام کرا. لەو ساوە چوە ناوچەی ناوپردان له نزیک بارەگای بارزانی دانیشت.

کاک نوری له ژیانی سیاسی خوی دا هەستی بە «غبن» ئەکرد، له بەر ئەوە له هیچ شوێن و له هیچ موناسەبەتێک دا دەمی خوی نەئەگرت. رەخنەی ئەگرت، پلاری ئەهاویشت و، توانجی لەم و لەو ئەگرت. قسەی «گالتە» و «جیددی» تێکەلاو ئەکرد. له دەربرینی بیرورا و هەلوێستەکانی له هیچ نەئەترسا و، له هیچ نەئەپونگایەوە. دوای ۱۱ ی ئازار جارێک ئەچێتە لای بارزانی و شیعرە بە ناوبانگەکەی خالیصی بو ئەخوێنێتەوە، کە ئەگاتە ئەم بەیتەی:

لە لای تو وەک یەکن، بی فەرقن لە خزمەت تو،
شەهین و حاجی لەقلەق، شێر و رێوی، مورشید و جانی!

کاک نوری وت بوی: «سالی ۱۹۲۰ شەهین و حاجی لەقلەق، شێر و رێوی، مورشید و جانی، وەکو یەک وا بون. سالی ۱۹۷۰ دوای ۵۰ سال ئەبی خەبات بکەین بو ئەوەی وەکو یەکیان لی بێتەوە، چونکە ئێستا حاجی لەقلەق بە سەر شەهین و، رێوی بە سەر شێر و، جانی بە سەر مورشیدا زال بوە...»

له سەر ئەم قسانە چارەی خوی له لای زور له کاربەدەستەکانی پارتی و شورش قورس کرد بو. حەزیان له چارەی نەئەکرد و بویان تێ ئەچاند. بەلام گوی ی نەئەدایە و، له قسەکانی نەئەکەوت.

مالی «ئەحمەدی طەها» له کونەوە له بەرخانەقا نیشتەجی بون. ئاسیاو و دراوسی ی کونی مالی ئیمە بون. ماوەیەک مالی ئیمە و مالی کاک نوری دەرگامان بە دەرگای یەکتریەوە بو بە تایبەتی له ناوەراستی پەنجاکان دا. کە ئەهاتنە سەر مالەکەیان بو گرتنی زور جار کەلوپەلی نهێنی له مالی ئیمە ئەشاردەوە.

من له منالیەوە کاک نوریم له نزیکەوە ئەناسی. رێزێکی تایبەتی له لای من

هەبو. ئەو یەکێ بو لەوانەی کاریان تێ کردم تێکەڵاوی کاری سیاسی بم.

کاک نوری زور لە ڤییەننا نەمایەوە. چوە ئەڵمانیای روژئاوا. منالەکانی لە سلێمانی بە جێ هێشت بو. لە ئەڵمانیا خوی پێ نەگیرا گەرایەوە عێراق. لە کورەوەکەدا کوچی دوایی کرد.

*

هێشتا کاک نوری لە ڤییەننا بو، شازاد صائیب بو گەشتوگەران لە گەڵ هاوسەرەکەی و منالەکانی لە مانگی ئابی ٧٥ دا هاتن بو ئەوروپا. شازاد لە ٧٤ دا نەچوبوە ریزی شورشەوە. هاتوچو بو ئەو ئاسانتر بو لە چاو ئەوانەدا کە چوبونە ناو پێشمەرگەوە. هاورییانی کومەڵە رایان سپارد بو «استطلاع» ی هەلومەرجی دەرەوە بکا بزانی چیمان بە دەستەوەیە. لە لەندەن مامجەلالی دی بو. بە درێژی قسەیان کرد بو. هەندێ راسپاردەی پێ وت بو بە سەرکردایەتی کومەڵەی بڵێ. هاتە ڤییەنناش. لەو دەوروبەرەدا ژمارەیەکی زوری تێکوشەرانی کوردستان بە تەمای ئەوە بون سەرەتای کار لە دەرەوە دەس پێ بکات. چەندین نامەی لەم بابەتەم لە هاوری و دوستەکانمەوە بو ئەهات.

شازاد، لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی بو. خوێندکارێکی چالاکی ریزی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و، پارتی دیموکراتی کوردستان بو لە زانستگای بەغداد و، دوایتر کەسایەتییەکی ناسراوی بەرێز و، پارێزەرێکی سەرکەوتو بو. هاوری یەکی نزیک و گیانی بە گیانی سەردەمی خوێندن و کاری سیاسی و روژنامەوانی منیش بو.

پێکەوە هەفتەنامەی «رزگاری» مان دەرکرد بو. پێکەوە لەو گروپەدا کارمان کرد بو کە بیری دامەزراندنی کومەڵەیان چەسپاند و، پێکەوە هەندێ لە ناوکەکانیمان رێکخست بو. هەندێ کێشەی خوبەخو هاتە پێشەوە، ئێمە وامان بە قازانجی رێکخراوە تازەکە زانی، خومان لە مەسئولیەتی سەرکردایەتی بکێشینەوە. لەو گروپەی ئێمە هەندێک دور کەوتنەوە، زوربەیان وەکو ئەندام لە ریزەکانی کومەڵەدا درێژەیان بە کار دا، شازاد یەکێ لەوانە بو. من چوم بو ڤییەننا، بە کردەوە منیش دور کەوتمەوە.

لە گەڵ هەڵگیرسانەوەی شەری کوردستان دا ساڵی ٧٤ سەرکردایەتی کومەڵە و زوری کادرە پێشکەوتوەکانی و ئەندامەکانی چونە ریزی شورشەوە، هەرکەسەیان بە گوێرەی ئەو کارەی پێیان سپارد بو، بە دڵسوزی کارەکانی خوی ئەنجام ئەدا. لە روژانی هەرسهێنانی شورشەکەدا، لە پێش دا بە تەمای مانەوە و، رێکخستنی بەرەنگاری بون و، پەیوەندییان لە گەڵ زور کەس کرد بو، بەلام کە ئەبینن هەرسەکە بەمان ناگیرێتەوە ئەمانیش بە کومەڵ گەرانەوە بو عێراق. هەوڵیان دا ریزەکانی خویان، کە بە هوی لە یەک

دابڕان و چونه ریزی پیشمەرگەوە شیوا بو، سەر لەنوی ریک بخەنەوە.
شازاد هەلومەرجی ولاتی بە وردی بو باس کردم و منیش بیرووبوچونەکانی خومم بو باس کرد. گەراینەوە کوردستان و، قسەو باسەکان و، بیرووبوچونەکانی ئیمەی بو باس کرد بون.
دوای ئەویش لە روژانی بەستنی کونگرەی خویندکاران دا لە بەرلین، فەرەیدون عەبدولقادر بە نهینی هات بو. ماوەیەکی زور کورت مابوەوە. من نەمبینی چونکە درەنگ ئیزای ئەلمانیایان دامی، بەلام لە گەل مامجەلال یەکتریان دی بو. راسپاردە و پیشنیاری سەرکردایەتی کومەلەی هینا بو. مامجەلالیش راسپاردەکانی خوی پی دا نارد بوەوە بو سەرکردایەتی کومەلە.
گرنگترین راسپاردەکانی مامجەلال بو سەرکردایەتی کومەلە ئەمانە بو:
١. دەستەی دامەزرینەری یەکیتی لە ولات دابمەزرینن. تیکەلاو بی لە ئەندامانی کومەلە و کەسایەتی ناسراوی نیشتمانیی و دیموکرات. ناوی هەندی کەسیشی دیاری کرد بو قسەیان لە گەل بکەن.
٢. پەیوەندی لە گەل کادرە پیشمەرگەییەکانی شورشی ئەیلول بکەن. ریکخراوی پیشمەرگەیان لی پیک بهینن و، ئامادەیان بکەن بو دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکدار.
٣. لە هیچ حالەتیک دا نابی کوردستان بە جی بهیلن. لە کاتی لیقەومان و ئاشکرا بون دا خویان بشارنەوە یان بچنە شاخ.
ئیمە دلیکمان بە ریکخستنەکەی کومەلە خوش بو. هیوایەکی زورمان لە سەر هەلچنی بو. بەلام روداوەکانی کوردستان کاری لە سەر کومەلەش کرد بو. ناکوکی لە ریزەکانیان دا تەقاند بوەوە. تاقمیکی ریکخستنەکانی خوارەوەی کومەلە دژی سەرکردایەتیەکەی راوەستا بون، بە ئاشکرا کەوت بونە جموجول و موهاتەرات و دامەزراندنی ریکخستنی تازە. سەرکردایەتی هەرچەند هەولی دابو بە ریگایەکی ئوسولی چارەی ناکوکییەکان بکا، کەلکی نەبو. سەرەنجام، بو ئەوەی لەو ئاژاوەیە دەربچن و ریکخستن لە لیدان بپاریزن، بریار ئەدەن برون بو ئیران بو ئەوەی لەویوە بچن بو سوریا.
سەرکردایەتی کومەلە بزر بون. ئیمە وامان زانی راسپاردەکانی مامجەلالیان جیبەجی کردوە و، خویان شاردوتەوە. تومەز چون بو ئیران و لەوی: شەهابی شیخ نوری سکرتیری ریکخستنەکە و، فەرەیدون عەبدولقادر، جەعفەر عەبدولواحید، عومەری سەید عەلی، عەلی محەمەد عەسکەری (عەلی پچکول)، ئەرسەلان بایز، ئاوات زەکی عەبدولغەفور گیراون. ئیمە بەمەمان نەئەزانی. پاش چەند حەفتەیەک کە حکومەتی ئیران

له پێنجوین تەسلیمی حکومەتی عیراقی کردنەوە، ئینجا زانیمان. بو ئیمە ئەمە رووداوێکی چاوەڕێ نەکراو بو. بەشێ لە هیواکانی داروخانین. ڕێکخستنەکانی کومەڵە کەوتنە بەر هێرشی ڕاونان و گرتن. هەندێکی گیرا و هەندێکی خوی شاردەوە.

لە ئەورووپا هەمڵەیەکی گەورە ساز کرا بو ئازاد کردنیان. چەندین بەیاننامەیان بە زمانی جیاجیا لە سەر بڵاو کرایەوە. «ئەمنستی ئینتەرناشناڵ» مەسەلەکەی گرتنە ئەستو.

*

لە ١٤ ی ئابی ٧٥ دا عیسمەت شەریف وانلی بەیانێکی بە عەرەبی بو «دەوڵەکانی گەلی کورد» بڵاو کردەوە نوسی بوی کە بە دەعوەتی حکومەتی عیراق لە گەڵ چەند کەسایەتیبەکی تردا ئەچی بو گفتوگو لە گەڵ کاربەدەستانی عیراقی بو داپێنکردنی مافەکانی گەلی کورد.

بەعس لە دنیادا زوری پروپاگاندە کرد بو دەربارەی سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد و، جیبەجی کردنی قانونی حوکمی زاتی. عیسمەت و ئەوانیشی دەعوەت کرد بو بە چاوی خویان دەسکەوتەکانی کورد ببینن.

عیسمەت لە کوردەکانی سوریا بو. لە سەرەتای پەنجاکانەوە لە سویسرە نیشتەجی بو. یەکی بو لە دامەزرینەرەکانی «کومەڵەی خوێندکاران» و ماوەیەکی درێژ سەروکی بو. لە کونگرەی «یەکیتیی خوێندکارانی جیهان» دا کە ساڵی ١٩٦٠ لە بەغدا بەسترا، لە گەڵ سەروکی «یەکیتیی قوتابیانی عیراق» بو بە کیشەیان لە سەر مەسەلەی کورد. ئەم رووداوە ئەوسا لە لایەن پارتی و روژنامەی «خەبات» ەوە کە بە عەرەبی لە بەغدا دەرئەچو زوری باس کرا. بەم هویەوە عیسمەت ناوبانگی دەرکرد. کە شوڕش لە کوردستانی عیراق دا هەڵگیرسا، عیسمەت یەکی بو لە «کومیتەی پاراستنی مافەکانی گەلی کورد» و، دوایی بو بە نوێنەری بارزانی و قسەکەری شوڕش. ماوەیەکی درێژ بەم ناوەوە پیوەندی لە گەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا ئەکرد. لە سەرەتای حەفتاکان دا کە پارتی دەزگای نوێنەرایەتی خوی لە ئەورووپا دامەزراند، ئیتر عیسمەت دەورێکی گرنگی لەم دەزگایەدا نەما، بەڵام هیشتا کەسایەتیبەکی ناسراو بو لە ناو کور و کومەڵە سیاسییەکان و، لای دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

ئەم بەیانەی عیسمەت لای زور کەس و لا سەیر بو، یەکەمیان، چونکە ئەوەی بە مەلا مستەفا و سەد هەزار پێشمەرگە نەسێنرا بو، چون بەم لە بەعس وەرئەگیری. دووەمیان، لەو کاتەدا کورد بە دەس حوکمی بەعسەوە توشی کارەساتیکی نەتەوەیی بوبو، عیراق ئەیویست ڕووی دزێوی خوی بشارێتەوە. کورد ئەبو بچن بە گژی دا و، ڕیسوای

بکەن نەک یارمەتی بدەن.

عیصمەت گوێ ی نەدایە لومە و ئامۆژگاری هیچ کەس و لایەک و، وەفدێکی پێک هینا لە: «شەریف بو مەعزە»، کە یەکی بو لە سەرکردەکانی شورشی جەزائیر. «جان کلود لوتی»، لە «یەکیتیی جیهانیی مافی مروڤ» و، یوسف پەری، کە قەشەیەکی کوردی عیراق بو.

ئەم وەفدە لە ١٨ ئاب دا گەیشتنە عیراق و، گەشتەکەیان تا ٦ ئەیلول درێژەی کیشا. دوای ئەوە گەرانەوە ئەورووپا.

لە ٧٥/١١/١٧ دا عیصمەت راپورتێکی درێژی لە سەر گەشتەکەیان بلاو کردەوە. باسی سەردانەکەیانی بو شارەکانی کەرکوک، هەولیر، دهوک، سلیمانی، موسل و بەعقوبە، هەروەها خانەقین، قەلادزە، پێنگرد، ئاکری.. و بینینی کاربەدەستانی حکومەتیی و حیزبیی لەم شارانە و، گفتوگوکانیان لە گەل سەران و وەزیرەکانی بەعس: طاریق عەزیز، نەعیم حەداد، زەید حەیدەر، مونذیر شاوی... بە درێژی گیرا بوەوە.

لە راپورتەکەی دا لایەنە سلبی و ئیجابییەکانی سیاسەتی بەعسی لە کوردستان دا باس کرد بو. ناسینی کورد لە دەستور دا وەکو نەتەوەیەکی سەرەکی و، سەلماندنی مافی ئوتونومی و، ریزگرتنی مافی نەتەوایەتی لە ناوچەی ئوتونومی دا و، ریفورمی کومەلایەتی لە ژیانی جوتیار و کریکاری کوردستان دا وەکو شتی ئیجابی و، تەعجیر و تەعریب و، ریز نەگرتنی مافی نەتەوایەتی لە دەرەوەی ناوچەی ئوتونومی و، ناتەواوییەکی قانونی حوکمی زاتی.. وەکو شتی سلبی ژمارد بو.

لە راپورتەکەی دا دەسپیکردنەوەی خەباتی چەکداری بە کاریکی چەوت و لە کردن نەهاتو دانا بو.

پی ئەچی بینینەکانی عیصمەت لە گەل چاوەروانییەکانی جوت نەبوبن، ئەمە بە راپورتەکەیەوە دیارە. دوای ئەوەش چەند بەیانیکی تری دەرکرد و، چەند گفتوگویەکی روژنامەوانی کرد. لە سەر ئەمە بەعس زور تورە بو. ناردیان بو کوشتنی. بە ناوی میوانداری دوستانەوە چونە لای و بەر گوللەیان دا. کابرای بکوژ وایزانی بو عیصمەت تەواو بوە لە بەر ئەوە بە جی ی هیشت بو. گەیەنرایە نەخوشخانە و لە مردن رزگاری بو.

*

سالی ٧٤ ماوەی پاسپورتەکەم تەواو بوبو. سەفارەت بویان درێژ نەکردمەوە داوایان نەکرد بگەریمەوە عیراق لەوی درێژی بکەمەوە. لە گەل تیشکانی شورش و، دەرچونی لیبوردنی گشتی، حکومەتی عیراق بریاری دا پاسپورتی ئیمەمانانیش درێژ بکەنەوە. چوم

بو سەفارەت بە کابرای «استعلامات» م وت: «ئەمەوی پاسپورتەکەم تازە بکەمەوە بەلکو یەکی لە کاربەدەستان ببینم» کابرا شەلپکی نەمسایی بو لەوی کاری ئەکرد. ناوەکەمی پرسی. ناوی خومم پی وت. تەلەفونی بو کونسول کرد. دەسبەجی داوای کردم بو لای خوی.

زور بە گەرمی پیشوازی کردم وتی: «کاکە! ناوی تو زورجار ئەبیستم، بەلام هیچ جاری خوت نابینم، زورم پیخوشە هاتی و بینیمیت». خیزانیکی عیراقی، پی ئەچو بو گەشتوگەران هاتبن، میوانی بون. روی کردە ئەوان، بە پیکەنینیکی سەرکەوتوانەوە وتی: «ئەمە لە برا کوردەکانمانە، زوری کار کردوە لە دژی ئیمە». من نەچو بوم بو شەر لە سەری نەرویشتم. پاش هەندی مسوجامەلە و قاوە خواردنەوە، وتی: «ئەزانم ئیشت هەیە بویە هاتوی» وتم: «بەلی» وتی: «ئەتەوی پاسپورتەکەت تازە بکەیتەوە؟» وتم: «بەلی» وتی: «راستە تەعلیمات لەو بارەیەوە دەرچوە، پر بەدل حەزم ئەکرد ئیشەکەت جیبەجی بکەم، بەلام تازە کردنەوەی پاسپورتەکەی تو لە دەسەلاتی من دا نیە. ئەبی پرسی بەغدا بکەم. بەلینت ئەدەمی بە باشی لە سەرت بنوسم». منیش سوپاسم کرد. ئینجا وتی: «کاکە! لیرە بە دواوە چی ئەکەی؟» وتم: «هیچ ناکەم. خەریکی خویندن ئەبم». بە پیکەنینەوە وتی: «ئەقلم نابری ئارام دابنیشی!» وتم: «مەلا مستەفا دانیشت و سەد هەزار چەکدار وازیان هینا، ئیمەمانان لە دەرەوە ئەتوانین چی بکەین؟». لام وابو قسەکەی بە گوی دا چو. وتی: «ئەوبەری دو هەفتەی پی ئەچی وەلامەکەی دیتەوە. بە تەلەفون ئاگادارت ئەکەم یان خوت سەرمان لی بدە»

دوهەفتە تی پەری وەلامی نەهاتەوە. چەند جاری بە تەلەفون لیم پرسین خەبەری نەبو. نائومید بوم. نامەم بو چەند کومەلەیەکی جوتیاری نوسی بو بو کاری ئاژەلداری. لە هەندیکیانەوە وەلامی وەرگرتنم بو هاتەوە. لە گوندیکی پچوک لە ناوچەی «شتایەرمارک» لای کابرایەکی خاوەن گاوگوتال کاریکم دوزییەوە. کارەکەم لە چیای بەناوبانگی «ئالپ» بو.

«کارخوی» کەم ٤٢ مانگای هەبو. ئەو ماوەیە شارەزاییەکی زورباشم پەیدا کرد لە سەر ژیانی جوتیارانی نەمسا و، جوری راگرتن و پەروەردەکردنی گویرەکە، چیل، گای ئەوروپایی. گەوری ولاخەکانی ئەوان ریکوپیکتر دروست کرا بو لە خانوی ئەوسای زور لە ئاغاکانی لای ئیمە.

چوار هەفتە مامەوە لە سەفارەتەوە هەوالم بو هات کارەکەم جیبەجی بوە. وازم لە کارەکەم هینا و بەکسەر گەرامەوە بو ڤیەننا، پاسپورتەکەم تازە کردەوە. هەر لەو ماوەیەدا

کونگرەی خوێندکاران لە بەرلین ئەبەسترا. مامجەلالیش ئامادە ئەبو. ئەبو منیش بچم.

*

چەند گەنجێکی باسک حوکمی ئیعدام درا بون. فرانکو لە نەخوشخانە کەوت بو لە سەر مردن بو. حوکمی ئیعدامی ئەوانە لە دنیادا زور بە خراپ دەنگی دابوەوە. زور کەسایەتی ناسراو و حیزب و ڕیکخراو داوایان لە فرانکو کرد بیانبەخشی و، لە چەند شاری ئەوروپا خوپیشاندانی نارەزایی ساز کرا، لەوانە شاری ڤییەننا. فرانکو گوی ی نەدایە رای گشتی جیهان. لە سەر نەریتی کونی ئیسپانی ئیعدامی کردن، برپرەی پشتیان شکاندن. فرانکو وەکو دیکتاتوریکی خوینریژ زور بەدناو بو، بەم کارەی بەدناوتر بو.

پاش ماوەیەکی کورت لەم روداوە فرانکو مرد. صەددام حسین، ئەوسا، جیگری سەروکی «مجلس قیادە الثورە» بو. بو بەشداری پرسەکەی چو بو بو سەفارەتی ئیسپانی. لە دەفتەری تەشریفات دا چەند دیریکی لە ستایشی فرانکودا نوسی بو، وەکو شاسواری ولاتەکەی و، دوستی هەرە نزیکی عەرەب و، شتی لەم بابەتە. لە کاتی ئەم نوسینەدا وینەی صەددامیان گرت بو. روخساری صەددام لە کاتی نوسینەکەدا بە تەنیشت وینەی فرانکو وە، وەکو ئەوەی پیکەوە بن، دەرچو بو. روژنامەکانی عیراق ئەم وینەیەیان لە لاپەرەی یەکەم دا لە گەڵ تەعلیقەکەی صەددام بلاو کرد بوەوە.

ئیمەش ئەم وینەیەمان وەرگرت و تەعلیقەکەی صەددامان کرد بە ئینگلیزی و ئەلمانی و، لە ژیر سەرناوی هاوتای «الطیور علی اشکالها تقع» چاپ کردەوە. زور بە بلاوی دابەشمان کرد.

بەیانییەک بانگیان کردم بو وەلامدانەوەی تەلەفون. فەلاح حەسەن مەطرود بو. فەلاح موچەخوریکی دیپلومات بو لە سەفارەتی عیراقی. زور بە تورەییەوە وتی: «تو بە کونسولت نەوت ئیتر هیچ ناکەم، چوی بو کونگرەی خوێندکاران قەیناکا، ئەمە چیە کردوتانە؟ بوچی ناوبانگی ولاتەکەی خوتان خراپ ئەکەن؟» من ئەمزانی مەبەستی چیە بەلام ویستم خومی لی هەڵە بکەم. وتم: «من هیچم نەکردوە ناوبانگی ولاتەکەمی پی خراپ ببی. نازانم تو باسی چی ئەکەی؟» دیسان بە تورەییەوە وتی: «دلنیام ئەزانی باسی چی ئەکەم.. بوچی ئەوەتان لە سەر السید النائب نوسیوە؟». منیش بیئاگایی خومم پیشان دا. ئەو هەر لە سەری رویشت وتی: « کەسیکی کە شتی وا ناکا تو نەبی. من دلنیام ئیشی تویە. قسە بە حکومەت ئەلین، قسە بە حیزب ئەلین، قسە بە هەر کەس ئەلین قەیناکا جگە لەو. بوچی ئیوە دوست و دوژمنی خوتان ناناسن؟ ئەگەر کورد لە عیراق دا یەک دوستی هەبی صەددام حسینە...» من ئیتر قسەکەم پی بری وتم: «ئەگەر

صەددام حسین دوستی کورد بی، کورد ئیتر پیویستی بە دوژمن نیەا» کابرای تایەن زیاتر تورە بو وتی: «ئیمەش شت لە سەر جەلال تالەبانی بلاو ئەکەینەوە. ئەنوسین: جەلال روژی عەمیلی ئیران بوە، روژی عەمیلی عیراق بوە، روژی عەمیلی لیبیا و، روژی عەمیلی سوریایە...» خەریک بو گفتوگوکەمان زیاتر توندوتیژ بی لە بەر ئەوە ویستم بیبرمەوە وتم: «بی منەت بن چیتان لە دەس دی بیکەن. حەز ئەکەی کەمینی بو دابنین» تەلەفونەکەم بە رودا داخستەوە.

ئەوسا ئەوقسەیەی ئەم پیاوەم دەربارەی صەددام بە هەند نەگرت.

*

کونگرەی کومەلەی خویندکاران

سەروک و سکرتیر و زوری ئەندامەکانی «دەستەی بەریوەبەری کومەلەی خویندکاران» ئەندامی پارتی بون. هەندیکیان کاریان بو «دەزگای پاراستن» ئەکرد. ئەمیش وەکو هەمو دەزگاکانی تری سەر بە شورش لە ئەنجامی ئاشبەتال دا توشی ئیفلیجی بو بو. بو ئەوەی لەو حالە دەربی و بکەویتەوە چالاکی ئەبو «کونگرەی حەڤدەهەم» ببەستی. لە پیش بەستنی کونگرەکەدا طاریق عەقراوی، سەروکی کومەلە، چو بو ئیران بو ئەوەی دوا ئاموژگاری لە مالی بارزانی وەربگری و، لە دەوروبەری کونگرەکەدا گەرایەوە.

ئەندامانی خویندکاران لە هەمو ولاتەکانەوە بانگ کران بو بەرلینی روژئاوا، شوینی بەستنی کونگرە. روژی دەسپیکردنی ٧٥/٨/٢٦ کە ئەندامەکان چو بون بو هولی کوبونەوە، سەیریان کرد بو وینەیەکی زور گەورەی مەلا مستەفا بە دیواری سەکوی بەردەمی هولەکەدا هەلواسراوە، دەستەی بەریوەبەر لە بەردەمی دا دانیشتون. ئەمە نارەزاییەکی زوری لە ناو هولەکەدا خولقاند بو. داوا کرا بو وینەکە دابگرن. ئەوانیش سور بون لە سەر هیشتنەوەی. زوری ئەندامەکان هولەکەیان بە جی هیشت بو. کونگرەکە تیکچو و، کوبونەوەکانی دواخرا.

من ئەو روژە لەوی نەبوم چونکە ڤیزای ئەلمانیام درەنگ پی گەیشت بو. کە من گەیشتم لە پشتی پەردەوە گفتوگوی لایەلا ئەکرا بو دوزینەوەی چارەیەکی مامناوەنجی کە هەمو بەشدارەکان پی ی رازی بن.

سالانی تر من بو هیچ کونگرەیەکی نەچوبوم. ئەمجارەیان لە بەر تاسکی هەلومەرجی سیاسی لە سەر داوای یەکیتی چوم. مامجەلال و کەمال فوئاد و عومەر شیخموس هات بون.

ئیمە: ئەوانەی یەکیتی، رەشبیمان وابو کونگرە بە یەکگرتویی بمینیتەوە و،

ریبازێکی پێشکەوتنخوازانە بگری و، نوێنەرانی هەر چوار بەشەکەی کوردستانی تێ دابێ. هیچ بیسانوێەکی بەجێ مان نەشەدی بو تێکدانی کونگرە و، لەتکردنی کومەلەی خوێندکاران. بە تایبەتی ئەتوانرا بە هەلبژاردنی ئازاد دەستەی بەرێوەبەر لە دەس پارتی دەربهێنری.

هەندێ لە کوردەکانی ئێران کە سەر بە حیزبی دیموکراتی کوردستان بون لەو روەوە زور توندرەو بون. تەنانەت ئەمیری قازی، کە وەکو دەمراستی کوردەکانی ئێران ئەدوا، بە راشکاوی ئەیوت: «ئێمە ئامادە نین لە ژێر یەک سەقف دا لە گەل لایەنگرانی بارزانی دابنیشین. ئەوانە سەر بە ساواکن. هەوالەکانی ئێمە بە ساواک ئەگەیەنن».

چارەیەکی کاتی دوزرایەوە. دەستەیەکی تێکەلاو دانرا بو بەرێوە بردنی کونگرە تا هەلبژاردنی گشتی. چوینە هولەکەوە. ئەمیر کامەران بەدرخان هات بو ئەوەی وەکو میوانی کونگرە بەشداری بکا. ئەمیری قازی هەستا بە نارەزاییەوە هەندێ قسەی کرد و، وتی کونگرە پر بوە لە پیاوی گومانلێکراو لە بەرئەوە جێگای ئێمەی تێ دا نەماوەتەوە. لە هولی کوبونەوە چوە دەرەوە و، کوردەکانی ئێران و، هەندێکی تورکیاش بە دوای دا رویشتن. ئێمەش بە ناچاری لە گەلیان دەرچوین. ئەمیری قازی ئەوەندە باسی ئەوەی ئەکرد کە ئەوان ئامادە نین لە ژێر یەک «سەقف» دا لە گەل لایەنگرانی بارزانی دابنیشن ناویان نا بون: «ئاغایانی سەقفی».

ئەم کونگرەیە، یەکەمین روداوی سیاسی گرنگ بو دوای ئاشبەتال، بەلام چەند شتێکی بە رونی دەرخست:

– سەرەرای ئەو مەینەتیە نەتەوایەتییەی بنەمالەی بارزانی بە سەر گەلی کوردیان هینا بو، هێشتا ژمارەیەکی زور لایەنگری دلسوزیان هەبو، لە هەمو هەنگاوێکی باش و خراپی دا کوێرانە دوای ئەکەوتن.

– بارزانی، بە پێچەوانەی ئەوەی ئیدیعای ئەکرد کە دەوری تەواو بوە، سەرلەنوێ کەوت بوەوە خو کوکردنەوە بو ئەوەی جارێکی تر دەس بگرێتەوە بە سەر جولانەوەی کوردا. لایەنگرەکانی خوی هاویشتەوە مەیدان. هەر لەو ماوەیەدا یەکەمین بەیانیان دەربارەی ئاشبەتال بە ناوی لقی ئەوروپای پارتییەوە بلاو کردەوە.

– بنەمالەی بارزانی تەجرەوبەیان لە رابوردو وەرنەگرت بو، هەمو جوری لە «پلورالیزم» یان رەت ئەکردەوە و، وەکو جاران سور بون لە سەر سەپاندنی «سەروکایەتی بارزانی» و «پارتی پێشرەو» بە سەر جولانەوەی کوردا. بو جێبەجێ کردنی ئەمەش سلیان لە هیچ جورە «حەرام و حەلال» یکی سیاسی نەئەکردەوە.

ئیمە هەولیکی زورمان دا کومەلەی خویندکاران لەت نەبی، بەلام سەرەنجام بو رازی کردنی کوردەکانی ئیران ئیمەش: لایەنگرانی یەکیتی جیا بوینەوە. کونگرەیەکی جیاوازیان بەست. کومیتەیەکی ئامادە کردنیان دامەزراند. پاش چەند مانگی «کومەلەی خویندکارانی کورد لە دەرەوەی ولات» یان پیک هینا. هەردو کومەلە دەوریکی ئەوتویان نەما لە ئەوروپا. لایەنگرانی دیموکرات وەکو گەرم بون بو لەت کردنی کومەلە، ئەوەندە گەرم نەبون بو یەکگرتنی کومەلەی نوی و بو بەشداری لە چالاکییەکانی دا.

*

فاروقی مەلا مستەفا، ئامۆزای فوئادی مەلا مەحمود و، ئاسیاوی لە میژینەی منیش بو. بە هوی بیروباوەری سیاسییەوە لە گەل یەک کوک و تەبا نەبوین. ئەو لە سەردەمی خویندنی ساناوییەوە لە گەل حشع بو، منیش لە گەل پارتی بوم. لە گەل ئەوەش دا دوستایەتیمان هەر هەبو.

کە حشع بو بە دو بەشەوە و، عەزیز ئەلحاج جیا بوەوە و، «القیادە المرکزیە للحزب الشیوعی العراقی» پیک هینا. فاروق و هەندی لە هاوریکانی دایانە پال عەزیز حاج. دوایی عەزیز گیرا و، خیانەتی لە هاوریکانی کرد و، هاتە سەر تەلەفزیون پەشیمانی لە رابوردوی خوی دەربری. پاشماوەکەی قیادەی مەرکەزی دریژەیان بە کارەکانی خویان دا. ئیبراهیم عەللاوی رابەری کردن. ئیبراهیم چو بوە سوریا و، فاروق مەسئولی بنکە و پیشمەرگە و ریکخستنەکانی کوردستانیان بو لە ناو کیلەکان دائەنیشت.

روژانی ئاشبەتال، ئەمیش لە گەل سەرکردەکانی کومەلە قسەی کرد بو، هاوکاری بکەن بو مانەوە و بەرەنگاری. پاشان بویان دەرکەوت بو ئەم کارەیان پی ناکری، ئەوانیش لە گەل لیشاوی خەلک دا گەرا بونەوە بو عیراق. کاربەدەستان، لەوانە غانم عەبدولجەلیل، لە گەل فاروق و هاوریکانی قسەیان کرد بو: کە حیزبەکەی ئەوانیش لە وەزارەت و بەرەدا بەشداری بکەن. ئەمان خویان لەو مەسەلەیە دزی بوەوە بە بیانوی ئەوەی مەسئولەکانیان لە دەرەوەیە. ریگایان بەو و بە هاورییەکی تری: عەنفان چلمیران، دابو بچنە دەرەوەی عیراق، بو ئەوەی قسە لە گەل هاوریکانیان بکەن، بە تایبەتی لە گەل ئیبراهیم عەللاوی.

فاروق لە گەشتەکەی دا بو ئەوروپا گەیشتە ڤییەننا. چەند روژی مایەوە. بە تیر و تەسەلی لە سەر هەلومەرجی کوردستان دواین و، من باسی بەرنامەی کاری داهاتوی یەکیتیم بو کرد. لە گەل فوئاد زوری لە گەل خەریک بوین لە ڤییەننا بمینیتەوە و، نەچیتەوە بەر چەقوی بەعس، تا ئیمەش دەس پی ئەکەینەوە، ئەوسا پیکەوە ئەگەریینەوە کوردستان. فاروق ملی نەدا و سور بو لە سەر گەرانەوەی بو عیراق. بیانوەکەشی ئەوە بو،

کە ئیلتیزامی هەیە و، بەلێنی داوە بە هاوڕێکانی بگەڕێتەوە لایان، ئەگەر نەگەڕێتەوە لەوانەیە بەعس ئازاریان بدات. فاروق ئەیئەزانی چارەنوسی چی ئەبێ و بەعس چۆن ڕەفتاری لە گەڵ ئەکا، لە گەڵ ئەوەش دا گەڕایەوە بۆ عیراق. بێگومان ئەمە هەڵویستێکی جوامێرانە و ئازایانە بو.

عەللاوی و حیزبەکەی ئەندامی «التجمع الوطني العراقي» بون. عەللاوی دوای ئاشبەتاڵ ڕەئی وابو: لە بەر ئەوەی جولانەوەی نیشتمانی و دیموکراتی لە عیراق دا زەرەری زوری لی کەوتوە و، کادری زوری لە دەس داوە و، لە بەرامبەر داوودەزگای بەعس دا لاواز بوە، هێزە سیاسیەکان بو ئەوەی پارێزگاری ڕێکخستنەکانیان و کادرەکانیان بکەن بە هیوای هەلێکی لە بار، جاری چالاکی خویان ڕابگرن. ئیبراهیم عەللاوی مالی لە دیمەشقەوە گوێزایەوە بو لەندەن. قیادەی مەرکەزی چالاکی خوی ڕاگرت، حیزبی بەعسیش وازی لی هێنان.

لە شام دەستەیەک لە کادرەکانیان بە مە ڕازی نەبون. ڕێکخراوێکی نوی یان پێک هێنا و بڵاو کراوەیەکیان بە ناوی «وحدە القاعدە» وە دەر ئەکرد. عادل عبدالمهدی «ابو امل» ڕیبەریی ئەکردن. لەو کوردانەی لە گەڵیان بون: فاضلی مەلا مەحمود و، سامی شورش.

*

تا ئاشبەتاڵ پەنابەری کوردی عیراق لە ئەوروپا و ئەمەریکا نەبو. یا ئەگەر بویی زور بە دەگمەن بو. کوردەکانی دەرەوە توشی گیروگرفتی پاسپورت و گەڕانەوە و هاتوچو ئەبون. بەلام هەمو گفتوگویەک جوری لە چارەسەر کردنی ئەم کیشانەی بە سەرا ئەهات.

ئاشبەتاڵ مەینەتیبەکی نەتەوایەتی گەورەی بە سەر کوردا هێنا. سەدان هەزار کوردی عیراقی دەربەدەر بون. زوریان ڕویان کردە ئیران. ئیران جیگای کردنەوە بەلام نەیهێشت لە ناوچە کوردنشینەکان دا بمیننەوە. دابەشی کردن بە سەر ئوستانەکانی دەرەوەی کوردستان دا. دوای ماوەیەک هەر کەسێکیش بیتوانیایە ولاتێکی تر بو خوی هەلبژیری ڕیگایان لی نەئەگرت ماوەیان ئەدا بڕوات. هەندی ولاتی ئەورووپی بڕیاریان دا یەکی ١٠٠ خیزانی کورد بە پەنابەری سیاسی وەربگرن لەوانە: نەمسا، هولەندە، سوید.

نەمسا تەجروبەیەکی زوری هەبو لە مەسەلەی پەنادانی سیاسی دا. دوای ڕوداوەکانی دوبچیک سەدان هەزار چیکوسلوفاکی ڕویان کرد بوە نەمسا. لە بەهاری ٧٦ دا لە تارانەوە ١٠٠ کەس، هەندێکیان خیزاندار و هەندێکیان سەلت، لە سەر حسابی نەمسا گوێزرانەوە بو نەمسە. هەمویان لە ئوردوگایەکی پەنابەریی نزیک ڤیەننا دانان.

ئیمەمانان کە خومان پەنابەری سیاسی نەبوین نەمان ئەزانی مافەکانی پەنابەر، بە تایبەتی موچەو خانو... چیە. لەو روەوە ئیمە نەمانئەتوانی هیچ رینماییەکیان بکەین. خویان بە شێنەیی شارەزای ژیانی پەنابەری بون.

زوری پێ نەچو سامی سنجاری هاتە ئەوروپا بو گەشتێکی سیاسی. لەو گەشتەدا سەردانی نەمسای کرد و، سەری پەنابەرەکانیشی دا. پەنابەرەکان ئەوان خویان هەلیان بژارد بون. هەندێکیان ئەندامی کومیتەی ناوەندی «قیادە موقەتە» بون. بەلام کە گەیشتنە ئەوروپا ژمارەیەکی زوری ئەندامەکانیان لێیان جیا بونەوە.

زاراوەکانی پەنابردنی سیاسی و هیجرەت هێشتا لە ناو کوردا ئاشنا نەبو. لە ئەدەبی سیاسی کوردی دا بلاو نەبوبو. دەولەتەکانی دەسەلاتداری کوردستانیش ریگای هیجرەتی کوردیان نەئەدا. هەر لە قوتابخانە «ادب المهجر» ی عەرەبەکانی لوبنانمان خوێند بو. دوای ئاشبەتال شەپولی پەنابەری سیاسی بو ئەوروپا و ئەمەریکا دەستی پێ کرد. راستییەکەی ئەمە «هیجرەت» بو نەک «پەنابردن». زور لەوانەی بە ناوی پەنابەری سیاسی گەیشتنە ئەوروپا و ئەمەریکا، ئەیانتوانی لە عیراق بژین بەلام ئەوانە ئەیانەویست لە ولاتێکی ترا، کە هەلومەرجی سیاسی و ئابوری و کومەلایەتی و روشنبیری... ژیان باشتر و خوشتر بێ دابمەزرین، ئەگینا مەترسی راستەقینە لە سەر ژیانیان نەبو، بگرە هەندێکیان فریان بە سەر کاروباری سیاسییەوە نەبو.

نەریتی «چونە دەرەوە» ئیتر لە ناو کوردستانی عیراق دا داهات و بو بە باو.

*

لە نیسانی ٧٦ دا کوبونەوەیەکی دەستەی دامەزرینەرمان لە ڤییەننا کرد. لەم کوبونەوەیەدا: مامجەلال، کەمال فوئاد، عومەر شێخموس، عادل موراد، فوئاد مەعصوم و، من بەشدار بوین. عەبدورەزاق نەیتوانی بەشدار بێت.

---

بو ئەوەی جوری بیرکردنەوەی ئەوسای هەندی لە سەرکردەکانی یەکێتی پیشان بدەم

---

لیرەدا ئەم نمونەیە ئەگێرمەوە:

یەکێ لەو باسانەی لەم کوبونەوەیەدا کرا، باسی جولانی دیپلوماسی بو بو تازەکردنەوەی پەیوەندی لە گەل حکومەتان، پارلەمان، حیزبەکان و، دەزگاکانی راگەیاندنی دنیا. هەر لەم بوارەدا پرسیاریان لەمن کرد وەکو نمونە لە نەمسا چی بکری باشە؟ منیش وتم: لە نەمسا دو پارتیی گەورەی لێ یە سوسیال دیموکرات و گەل کە ناوبەناو حوکم ئەگرنە دەس. ئیستا سوسیال دیموکرات لە سەرکارن. کرایسکی رابەریانە. گەل ئوپوسیونن. جگە لەمان چەند پارتییەکی تر هەیە لەوان پچوکترن وەکو حیزبی ئازادیخواز

که تاوانبار ئەکرین بەوەی کونە نازییەکانی تیا کوبونەوە. ئەوانیش نوینەریان لە پارلەمان دا هەیە. پارتی کومونیستی سەر بە یەکیتی سوڤیت و دو ریکخراوی پچوکی ماوییەکان و تروتسکییەکانیش هەیە کە نوینەریان لە پارلەمان دا نیە. ئەمە نەخشەی دابەشبونی سیاسی ئەم ولاتەیە. ئەگەر بمانەوی جولانی سیاسی دەس پی بکەین ئەبی لە پارتی دەسەلاتدارەوە دەس پی بکەین تا ئەگاتە سەر ئەوانی تر.

دەزگای راگەیاندنی ئەم ولاتەش جگە لە رادیو و تەلەفزیون ۳ روژنامەی گەورەیان هەیە: کوریر، کرونین، پریسە...

کەمال فوئاد، کە خوی بە مارکسی ئەئەزانی و ماوەیەکی دریژ لە ئەوروپا ژیا بو، لە ناو سەرکردایەتی یەکیتی یش دا بە «معتدل» داترا بو، هەلی دابو، بە زمانە گالتەجارییەکەی خوی کەوتە قسە وتی: «سوسیال دیموکرات» لە یەکەمین جەنگی جیهانییەوە لینین «جەواب» ی داون. «پارتی گەل» سەر بە کارتیل و تریستەکانن. هەر لایەک پیوەندی لە گەل «پارتی ئازادیخوازەکان» بکا ئابروی ئەچی. «پارتی کومونیست» تا لە سوڤیتەوە فەرمانی بو دەرنەچی قسەشیان لە گەل بکەین کەلکی نیە. «ماوییەکان» و «تروتسکییەکان» یش وەکو شیخ رەزا ئەلی: «ئەولادی ئەم عەسرەن» کەلکی هیچیان پیوە نیە».

بەمجورە بە کورتی هەمویانی فت کرد.

منیش وتم: «ئەگەر وابی لە نەمسا کەس نامینیتەوە قسەیان لە گەل بکەین پیرەژن و سەگەکانیان نەبی». نەمسا بە هوی ئەوەی لە دوەمین جەنگی جیهانیی دا ژمارەیەکی زور لە پیاوەکانی کوژرا بو، رادەی پیرەژن زور زیاتر بو لە پیرەمیرد.

لەو سەفەرەدا مامجەلال ژمارەیەکی باش لە کاربەدەست و سیاسی و روژنامەوانی نەمسایی بینی. رادیو و تەلەفزیون گفتوگوی کورتیان لە گەل مامجەلال بلاو کردەوە، روژنامەکانیش هەندی ستونیان دەربارەی قسەکانی نوسی. هەروەها لە گەل سامی و هەندی لە بەرپرسەکانی ق م دانیشت بو ئاساییکردنەوەی نیوانی ق م و یەکیتی. بەلام کوبونەوەکە هیچی لی سەوز نەبو.

*

ئەو شوینەی من لی ی ئەژیام جگە لەوەی «خانوی خویندکاران» بو ئوتیلیکی پچکولەشی هەبو بو خزم و میوانی خویندکارەکان. جەماعەت لەوی دابەزی بون. کوبونەوەکانمان لە جیگایەکی تر ئەکرد. دوستیکی ئیرانی فلاتەکەی خوی بو چول کرد بوین. لە گەرمەی قسەکردن دا بوین. یەکی لە زەنگی مالەکەی دا. دەرگامان کردەوە

کچێک بۆ وتی: «من دانیشتوی ئەو فلاتەی تەنیشت ئێوەم. خوێندکاری زانستگای پزیشکیم. خەریکی دەرس خوێندنم. چەند رۆژێکی تر تاقیکردنەوەیەکی گرنگم هەیە. دەنگتان زۆر بەرزە. تکایە بە دەنگی نزم بدوێن». وتمان: باشە. درێژەمان بە کۆبونەوەکان دا. پاش ماوەیەکی تر تەلەفونی بۆ کردین دیسان داوای لێ کردین بە دەنگی نزم قسە بکەین. وا دیار بو ئێمە راهاتبوین بە دەنگی بەرز قسە بکەین داواکانی کچی تایەن کەلکی نەبو. دواجار هاتەوە سەرمان وتی: «ئەگەر بێدەنگ نەبن تەلەفون بۆ پۆلیس ئەکەم ئەلێم تاقمی تیروریست لە فلاتەکەی تەنیشتا من خەریکی دانانی پلانی کارێکی تیرۆریستین!»

ئێوارەیەکیان لە گەڵ د. فوئاد چوین بۆ گەران. لەو کاتەدا تازە فلیمی بە ناوبانگی «ئەمانویل» لە سینەماکان پیشان ئەدرا. پێکەوە چوین بۆ سەیری ئەم فلیمە. لە سالۆنی بلیت بڕین دا بە رێکەوت توشی کونسولی عیراق بوین. ئەویش ئەچو بۆ سەیری هەمان فلیم. چاکوچونی لە گەڵ من کرد ئەیزانی جەماعەت لە ڤیەننان. پرسی: «ئەوە مامجەلالە لە گەڵت؟». وتم: «نەخێر». وتی: «کەواتە د. فوئادە». وا دیار بو بە قەڵەوی دا ناسیبوەوە.

*

د. کەمال خۆشناو لە «بەلگراد» ی پایتەختی «یوگوسلاڤیا» وە تەلەفونی بۆ کردم کە هاتوتە دەرەوە و، ئەیەوێ من ببینێ. حەزم کرد بێتە ڤیەننا نەیئەتوانی. لە بەر ئەوە من چوم بۆ لای. کە زانستگای سلێمانی کرابوە د. کەمال خۆشناو لەوێ دامەزرا. پێشتر ناسیاویمان هەبو بەڵام کە هاتە سلێمانی دوستایەتییەکمان بە هێزتر بو. لە یەکگرتنەوەی هەردو باڵەکەی پارتی دا بو بە ئەندامی لقی سلێمانی و، لە گەڵ هەڵگیرسانەوەی شەڕدا چوە ریزی پێشمەرگەوە.

عیراق بۆ هاندانی زاناکان یا وەکو خۆی پێ ی ئەوتن: «اصحاب الكفاءات» ی عیراق هەندێ «ئیمتیازی» تەرخان کرد بو. یەکێ لەو ئیمتیازانە ئەوەبو رێگای ئەدان لە ئەوروپا ئوتومبیل و کەلوپەلی ناوماڵ بکڕن و بێ گومرگ بیهێننەوە بۆ عیراق. د. کەمال خۆشناو کە زەمانێک «عەمید» ی کاروباری خوێندکاران بو لە زانستگای سلێمانی ئەیتوانی کەلک لەم ئیمتیازە وەربگرێ. بەو بیانوەوە هات بوە دەرەوە. لە کوردستان قسەی لە گەڵ کاک شەهاب کرد بو. کاک شەهاب پێی وت بو لە دەرەوە قسە لە گەڵ ئێمە بکات و هەر رێوشوێنێکمان پیشان دا بە قسەمان بکا.

لە رۆژانی ئاشبەتاڵ دا کە هێرشی جەیش بۆ سەر ناوچەی سەیدصادق دەستی پێ

کرد، کاک کەمال ئەندامی لقی سلیمانی پارتی بو، پیش دەسپیکردنی هیرشەکە، لە گەل فەتاح ئاغا و، کومەلیکی تر لە مەسئولەکانی شورش چو بون بو ئەو ناوچەیە. هیرشەکە گەیشتە سەریان. حەمەی سەید عەلی حافظ، یەکی لە فەرماندەکانی هیزەکە، بو ئەوەی بە زیندویەتی نەکەویتە بەردەستی دوژمن خوی کوشت و، ئەوانی تر بە نارەحەتییەکی زور لە گەمارۆی جەیش دەرباز بون. کەمال لەم شەرەدا قاچی بریندار بو بو. کە هاتە بەلگراد هیشتا بە تەواوی چاک نەبوبوەوە و ئەشەلی.

چوم بو بەلگراد. لە گەل د. کەمال یەکمان گرتەوە و چەند روژی پیکەوە بوین. گفتوگوی تەواومان کرد. پیشتر من لە گەل هەندی لە ئەندامانی دەستەی دامەزرینەر قسەم کرد بو کە چی بکات، بگەریتەوە یا بمینیتەوە؟ ئەگەر بمینیتەوە چی بکات؟ رشیان وابو: نەگەریتەوە بو عیراق. هەول بدا جاری لە دەرەوە بمینیتەوە. ئەگەر بتوانی بو دابینکردنی ژیانی کاریک بدوزیتەوە، تا بزانین روداوەکان بەرەو کوی ئەرون.

د. کەمال نەگەرایەوە بو عیراق. خویندنی کشتوکالی لە زانستگای بەغداد و خویندنی دکتورای لە یوگوسلاڤیا تەواو کرد بو. کاری لە لای کومپانیەکی یوگوسلاڤی دوزیەوە. کارەکەی لە لیبیا بو. د. کەمال چوە سەر کارەکەی لە لیبیا تا کاتی داوا کرا بو سوریا و دوایی بو کوردستان.

هەر لەم سەفەرەدا بە هەلم زانی بو پیکهینانی ریکخراوەکانی یەکیتی لە ناو خویندکارە کوردەکان دا سەردانی زوری کومارەکانی یوگوسلاڤیام کرد، لە «زەگریب» وە دەستم پی کرد، تا «سکوپیا» ی پایتەختی «مەکەدونیا».

*

پیش ئەوەی ڤییەننا بە جی بهیلم بو خواحافیزی سەردانی هەندی ماموستا و ناسیاوم کرد. لە ناو ئەوانەدا «هیلموت کرامەر». پیم وت: «هاتوم بو خواحافیزی. ئەگەریمەوە بو کوردستان». وتی: «بوچی ئەگەریتەوە؟». وتم: «ئەچین شورش هەلئەگیرسینینەوە». سەیری بە قسەکەم هات. دەستی برد بو لای لاجانگی و پەنجەکانی یادا. ئەمە نیشانەی تیکچون و شیتی بو. وتم: «نا من تیک نەچوم بەلام ئیمە سەر بە دو جیهانی جیاوازین لە یەکتری تی ناگەین. لای ئیوە ئازادی ئەوەندە زورە گەیشتوتە رادەی داوشین «دیکلیناسیون: انحطاط»، کەچی لای ئیمە هیچ جورە ئازادییەک نیە. لای ئیوە پارە ئەوەندە زورە گەیشتوتە رادەی ئاوسان «ئینفلاسیون: تضخم» کەچی لای ئیمە پارە نیە. لای ئیوە پیشەسازی ئەوەندە زورە گەیشتوتە رادەی پیسبونی ژینگە «پولیوشن: تلوث البیئە» کەچی لای ئیمە هیشتا پیشەسازی نیە. لە بەر ئەوە زەحمەتە لە من تی

بکەی». ئیتر خواحافیزیم لی کرد. تا ئیستاش دلنیا نیم لەوەی: بۆچوونەکەی ئەو راست بو
کە منی بە گەوج ئەزانی، یان کارەکەی من کە چوم بو بەشداری لە دەسپیکردنەوەی شورش
دا.

*

# شام: مەکۆی خۆسازدان

*

ڕۆژی ٧٥/١٢/١٣ بو یەکەمین جار لە ڤییەنناوە بە فڕوکە چوم بو دیمەشق.

دەستەی دامەزرێنەر، جگە لە عومەرشێخموس کە کوردی سوریا بو تەیئەتوانی ئامادە بی، ئەندامەکانی تر: مامجەلال، د. فوئاد مەعصوم، د. کەمال فوئاد، عادل موراد، عەبدورەزاق میرزا و، من، هەمو لە دیمەشق خڕ بوبونەوە.

مونذیر نەقشبەندی هاوڕێ ی عادل موراد بو ئەویش لە تارانەوە هات بو، عەلی سنجاریش لە شام نیشتەجێ بو بو، هەردوکیان بە تەما بون ببنە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر.

جگە لە مان، لەو ماوەیەدا چەندین کوردی عیراقی گەیشت بونە سوریا:

سەلامی مەلا ئەحمەد، عارف شێخ کەریم، ئەنوەر شاکەلی، ئیبراهیم عەزو، ئیبراهیم عەبد عەلی، ئەندامی کومەلە بون، دوای دەس پی کردنی هێرشی گرتنی ئەندامانی کومەلە لە عیراقەوە هات بون.

حەسەن خوشناو، سەید کەریم کەریم، جەمال ئەحمەد بەنا، عەبدوللا خوشناو، وەلید نەقشبەندی، فوئاد عومەر، قەرەنی جەمیل، عومەر عوسمان (زەعیم عەلی)، سەردار ئەبوبەکر، عەلی مستەفا، ڕائید عەزیز، ئەنوەری ئەمین میسری.. ئەفسەر بون و، حسین بابەشیخ، بۆزی، مستەفا خوخی، حسەن نەرمو، عەباس شەبەک، سامان گەرمیانی، عادل شوکر، داود محەممەد عەلی... لە ئیرانەوە هات بون.

ئەمانە و، زوری تریش، بە ڕێگای جیاجیا گەیشت بونە سوریا. هەندێک بە پاسپورتی عیراقی و، هەندێک بە «پەروانەی عوبور» ی ئیرانی و، هەندی بە پی، بەلام هەمو لە دەوری یەکیتی کوبوبونەوە، هەندێکیان لە قامیشلی بون و، هەندێکیان لە دیمەشق. هەمویان هات بون، بە قسەی خویان، بە نیازی بەشداری کردن لە دەسپیکردنەوەی شورش دا.

کوبونەوەکان تەواو بون. ئەو مەسەلانەی پەیوست بون باس کران و، ڕێوشوێنی کاری داهاتو دانرا. هیشتا کاتی گەڕانەوەی نیشتمان نەهات بو، منیش هیشتا هەندی وردە کارم لە ڤییەننا مابو. دوای ئەوەی لە گەل هەمو ئەوانەی لە سوریا کوبوبونەوە ئاشنایەتی و ئاسیاویم پەیدا کرد، پاش چەند حەفتەیەک گەڕامەوە ڤییەننا، بە هیوای ئەوەی لە

ماوەیەکی کورت دا دیسان بیمەوە شام.

*

دوای ئەو شالاوەی دەزگا ئەمنییەکانی بەعس بو سەر ریکخستنەکانی کومەلەی کرد، ریزەکانی پشیوییەکی زوریان تی کەوت بو. سەرکردایەتی و، کومیتەی ریکخستنی شارەکانی نەما بو. بەلام هەندی لە کادر و ئەندامەکانی بەر دەس نەکەوت بون خویان شارد بوەوە و، هەندیکیشی هەر ئاشکرا نەبو بون.

هەندی لەو ئەندام و کادرانەی لەم شالاوە دەرباز بوبون، هەولیان دا ریکخستنەکە بگرنەوە، بەلام هەندی لەوانەش گیران و، کارەکەیان سەری نەگرت.

شاسوار جەلال، کە دوایی بە «کاک ئارام» ناوی دەرکرد، لەوانە بو بەر دەس نەکەوت بو، خوی شارد بوەوە. شاسوار لە سەرەتاوە یەکی بو لە ئەندامە چالاکەکانی کومەلە و، شارەزای ریکخستن و، زوری ئەندامەکانی بو، هەر زو هەولیکی زوری دا بو گرتنەوەی پاشماوەی ریکخستنەکە و، ریکخستنەوەی. ئەوسا ریکخستنی کومەلە هەر پاریزگایەکی بە هەریمیک دانا بو. لە هەر پاریزگایەک یەکیکی دیاری کرد بو، لەوانە: سالار (نەجمەدین عەزیز) لە سلیمانی، عادل (ئازاد هەورامی) لە کەرکوک، مەلا بەختیار (حیکمەت محەممەد کەریم) لە خانەقین، عەبدورەزاق لە هەولیر. پیکەوە کومیتەیەکیان پیک هینا بو بو سەرکردایەتی کومەلە و ناویان نا بو: «کومیتەی هەریمەکان». عەبدورەزاق پاش ماوەیەک لە گەلیان تیک چو بو، هاوکاری لە گەل نەکرد بون، بەلام سەرپەرشتی ئەو ریکخراوانەی کرد بو کە ناسی بونی.

ئەم کومیتەیە چەند کاریکی گرنگیان ئەنجام دا:

١. ئەندامەکانی کومەلەیان ریک خستەوە، لە گەل زوری ئەوانەی خویان شارد بوەوە و، ئەوانەی ئاشکرا نەبوبون، پەیوەندییان دروست کرد و، هەمو ئەو شانە و خەتانەیان پیکەوە گری دایەوە کە ما بون و، کومیتەیان لە شارەکان دا دامەزراندەوە و، کەوتنە راکیشانی تیکوشەرانی تازە.

٢. پەیوەندییان لە گەل چەندین ئەفسەری شورشگیر و کادری پیشمەرگایەتی دروست کرد و، داوایان لی کرد بون خویان ئامادە بکەن بو چونە شاخ.

٣. پەیوەندییان لە گەل دەستەی دامەزرینەری یەکیتی لە دەرەوە بە تایبەتی لە گەل مامجەلال دروست کرد.

جگە لە ئەندامانی کومیتەی هەریمەکان، چەند کەسیکی تریش هاوکاری زور و کاریگەریان کرد بون بو بەجیهینانی ئەرکەکانیان، لەوانە: جەمال عەلی مەعروف

«جەمالەرەش»، جەمال تایەر، شازاد صائیب، ئیبراهیم ئەحمەد، عەزیز مەحمود...

جەمال عەلی مارف (جەمالە رەش) و، ئیبراهیم ئەحمەد هەر یەکەی جاریک هاتن بو سوریا نامەی کومەلەیان هینا و، عوسمانی مام برایم چەند جاری هات بو عەممان.

*

سوریا و عیراق ئەگەرچی هەردوکیان لە ژیر دەسەلاتی حیزبی بەعس دا بون، بەلام هەر لە سەرەتاوە ناکوک، بەلکو بە خوینی سەری یەکتری تینو بون.

هەندی لەو عیراقیانەی چوبونە سوریا ریکخراویکی «بەرەیی»ان دامەزراند بو بە ناوی «التجمع الوطنی العراقی: توع».

ئەو حیزب و ریکخراوانەی لە «توع» دا کو بوبونەوە بریتی بون لە مانە:

- حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادە قطر العراق. احمد العزاوی و باقر یاسین

- الحرکە العربیە الاشتراکیە.

عبدالالە النصراوی، جواد الدوش، عونی قلمچی.

- الحزب الشیوعی العراقی (القیادە المرکزیە)

ابراهیم علاوی

- الحزب الاشتراکی

رشید محسن، مهدر الویس.

- موتمر القومیین

ایاد سعید ثابت

هیچ ریکخراویکی کوردی لە توع دا نەبو. لە پیش ئاشبەتال دا، توع لە گەل بارزانی و سەرکردایەتی پارتی نیوانی باش بو، بەلام پارتی تیکەلاوی نەبوبو. رەنگە هوی یەکەمی ئەوە بوبی کە توع چەپ و عەرەبپەرست و دوژمنی ئیسرائیل و ئەمەریکا بو. ئەوەش لە گەل تیگەیشتنی بارزانی نەئەگونجا. هوی دوەمیشی رەنگە ئەوە بوبی، بارزانی و پارتی خویان لە توع زور بە زلتر ئەزانی. ئەوان حوکمرانی ناوچەیەکی فراوان و، خاوەنی لەشکریکی گەورە بون، لە کاتیک دا توع پەنابەر بون لە ولاتیکی تر.

یەکیتی دوای ئەوەی سوریای کرد بە مەلبەندی سەرکردایەتی خوی ئەبو هەلویستی خوی لە توع رون بکاتەوە. سوریا بو یەکیتی پیویست بو. مانەوەی یەکیتی لە سوریا و، راپەراندنی کارەکانی، وەکو مامجەلال ئەیوت: بەند بو لە سەر ئەوەی یەکیتی ببیتە ئەندامی «توع». بەلام ئەندامیتی یەکیتی لە توع دا، یەکیتی ئەخستە ژیر باری چەند

ئیلتیزامیکی سیاسی گرانەوە، لەوانە:

١. ئەبو شورشی کورد بەشی بی لە شورشی عیراق و، دروشمەکانی شورشیکی عیراقی بەرز بکاتەوە و، یەکیتی لە ژیر ئالای توع دا شورش بکا.

٢. ئەبو یەکیتی روخاندنی ریژیم بکاتە ئامانج و دروشمی سەرەکی خوی.

٣. ئەبو یەکیتی تا روخاندنی رژیمی عیراقی دریژە بە خەبات بدا و، هیچ جورە سازین و چارەیەکی مامناوەنجی قەبول نەکا.

لە کوبونەوەیەکی «دەستەی دامەزرینەر» دا ئەم باسە خرایە بەر لیکولینەوە و هەلسەنگاندن و دەنگدان. عادل موراد و من دەنگمان نەدا بو ئەندامەتی توع. من رەئیم وابو: یەکیتی نەچیتە ژیر باری هیچ ئیلتیزامیکی سیاسیەوە و، خوی نەبەستیتەوە بە هیچ ریکخراویکی ترەوە، بو ئەوەی ئازادی جولانی هەبی. بە زورایەتی دەنگی دەستەی دامەزرینەر یەکیتی بریاری دا ببی بە ئەندامی توع. لە گەل توع کەوتە گفتوگو، زور مسەلەی گرنگی پی سەلماند:

- پروگرامی توع دەستکاری کرا، مافەکانی کورد رونتر و فراوانتر خرایە ناوی.

- توع بەلینی دا کە ئیمکانیاتی مادی و مەعنەوی بو شورشی کورد دابین بکەن و، شورشەکە گەشە پی بدەن بو شورشیکی عیراقی لە روی: سەرکردایەتی و بەشداری و مەیدانی کارەوە.

- توع بەلینی دا کە هاوزەمان لە گەل دەسپیکردنەوەی خەباتی چەکداردا لە کوردستان ئەوانیش لە ناوەراست و خوارووی عیراق دا چالاکی شورشگیرانە دەس پی بکەن.

بارەگاکەی توع لە نزیک «الجسر الابیض» بو بو بە شوینی کوبونەوەی عیراقیەکان. بە روژ لەوی یەکتریان ئەدی و قسە و باسیان ئەکرد. سەرکردەکانی بەعس لە بارەگای قیادەی قەومی دەوامیان ئەکرد، هاتوچوی توع یان نەئەکرد. سەرکردەی هەندی لە حیزبەکانی تر وەکو: رشید محسن، مهدر الویس (ابو عروبە) لە قاهیرە بون، چاروبار ئەهاتن بو دیمەشق. ئەوەی بە زوری لەوی دەوامی ئەکرد: جواد الدوش (ابو شوقی) و، عونی قلمچی (ابو عمر) بون.

*

## راپورتی پایک

ئوتیس پایک نوینەری نیویورک بو لە کونگریسی ئەمەریکادا. کرا بە سەروکی کومیتەیەک بو لیکولینەوە لە جموجولە نهینییەکانی «سیا». لە بەر ئەوە کومیتەکە و راپورتەکەی ئامادەیان کرد بو بە ناوی «پایک» ەوە ناویان دەرکردوە.

ئەم کومیتەیە لە ٣ مەسەلەیان کولی بوەوە یەکیکیان پیوەندی ئەمەریکا و کورد بو. روژی ٧٦/١/١٩ راپورتەکەیان دا بە کونگریس. چەند نهینییەکیان ئاشکرا کرد بو، بلاوکردنەوەی بو ناوبانگی ئەمەریکا خراپ بو، لە بەر ئەوە سیا و بەریوبەرایەتی ئەمەریکی، تەنانەت سەروک فورد، هەولیکی زوریان دا بو هیشتنەوەی بە نهینی، بەلام دانەیەکی ئەم راپورتە گەیشتە دەس روژنامەوانەکانی گوڤاری «دەنگی لادی: ڤیلیج ڤویس» و، لە ٧٦/٢/٢٣ دا بلاوی کردەوە.

ئەم راپورتە میژوی پەیوەندی بارزانی - ئەمەریکا لە سەرەتای دامەزرانیەوە تا کاتی ئاشبەتال ئەگیریتەوە. ئەمەریکییەکان مەسەلەی کوردیان بە «کارتی یاری» ناوبردوە. راپورتەکە ئەیگیریتەوە چون ئەم کارتەیان بە کارهیناوە بو تەنگاو کردنی عیراق، کاتی عیراق دوژمنایەتی ئیرانی شای ئەکرد و، کاتی عیراق دژی لیک جیا کردنەوەی هیزەکانی عەرەب و ئیسرائیل بو، وە چون ئەم کارتەیان لە کار خست بو ئەوەی عیراق دەستی بەتال بی بو دوژمنایەتی سوریا، چونکە سوریا لەو کاتەدا دژی رەوتی ئاشتی بو لە گەل ئیسرائیل.

ئەم راپورتە لە دنیادا دەنگی دایەوە. یەکیتی کاتی خوی دانەیەکی دەس کەوت، وەریگیرایە سەر عەرەبی و، لە «الشرارە» دا وتاریکی لە سەر نوسی. بەلام هەیکەل لە وتارەکانی دا چەند جاری باسی کرد وەکو نمونەیەک لە سەر جوری کاری کیسینگەر لە بەریوەبردنی ململانی دا. هەروەها "(ل١٣٦ - ١٤١) ی کتیبەکەی : «والحل والحرب» ی بو ئەم باسە تەرخان کردوە و، نوقتە سەرەکییەکانی بە وردی وەرگرتوە.

کاتیک گلەیی لە کیسینگەر کرا لە سەر ئەم رەفتارەی لە گەل کورد وتی: «سەودای ژیرەژیر کاری تەبشیری نیە». مەبەستی ئەوە بو لە پیلانگیران و کاری جاسوسی دا گوی نادریتە بەهاکانی رەوشت و دین.

*

دوای ئەوەی لە هەلبژاردنی گشتی دا لە تورکیا «جمهوریەت خلق پارتی سی» بە ریبەری «بولەند ئەجەویت» هاتە سەر کار، «لیبوردنی گشتی» بو هەمو بەند و هەلاتوە سیاسییەکان دەرکرد. گیراوەکانی کورد بەربون و، ئەوانەی لە دەرەوە بون گەرانەوە تورکیا. جوری لە ئازادی سیاسی لە سەرانسەری تورکیادا بلاو بوەوە. جولانەوەی نەتەوەیی کورد بوژایەوە و، گەشەکردنیکی گەورەی بە خویەوە بینی. نەخشەی سیاسی ناو کوردستانی تورکیا لەو کاتەدا بەمجورە بو:

- کادرەکانی حیزبەکەی د. شڤان سەرلەنوی حیزبەکەیان بە ناوی «پارتی

دیموکراتی کوردستان لە تورکیا » ڕێک خستەوە، بۆ داپۆشینی چالاکی حیزبەکەیان ڕێکخراوێکی قانونییان بە ناوی: «د د ک د » دامەزراند. ئەم ڕێکخراوە لە سەرانسەری کوردستان دا پەرەی سەند و، لقی یانەی قانونیی دامەزراند. عەلی چەتین، ئەحمەد قارلی، نەجمەدین بیوک قەیا، عەلی شێر، عەبدولحافظ، موحەرەم، سەعید، محەممەد عەلی، زەروک.. لە سەرکردە چالاکەکانیان بون.

ئەم حیزبە، بە قسەی خۆی، پارتی پێشڕەوی مارکسی - لینینی دائەمەزراند و، خۆی ئامادە ئەکرد لە داوارۆژدا شۆڕش لە کوردستانی تورکیا بەرپا بکا. لە ناو لاوان و ڕوشنبیرانی چەپی ناوشارەکان دا نفوزی پەیدا کرد بو.

- کادرەکانی حیزبەکەی سەعید ئالچی پش سەر لەنوی حیزبەکەیان بە ناوی: «پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا » ڕێک خستەوە و، لە ناو ڕوشنبیرانی کۆنەپارێزی شارەکان و سەرانی عەشائیر دا، نفوزی پەیدا کرد. دەرویشی سەعدو و، عەلی دیلەر لە سەرکردە چالاکەکانیان بون.

- بنکەیەکی بلاوکردنەوە بە ناوی «کۆمال» دامەزرا و، گۆڤاری «ڕزگاری» بە تورکی بلاو ئەکردەوە. ئەم گۆڤارەش هەندەی ڕوشنبیر و لاوی لی کۆبوەوە و، ڕێکخراوێکیان بە ناوی ڕزگاری دامەزراند. مومتاز قوتان و، خەدیجە بەشار لە چالاکەکانیان بون.

- بنکەیەکی تری بلاوکردنەوە گوڤاری تورکی «ئوزگورلک یولو: ڕێگای ئازادی» بلاو کردەوە ئەمیش هەندی ڕوشنبیر و لاوی شارەکانی لی کۆبوەوە و، ڕێکخراوێکیان پێک هینا. دوایی بو بە ناوکی «پارتی سوسیالیستی کوردستانی تورکیا». ئەم ڕێکخراوە زور بە توندی لایەنگری یەکیتیی سوڤیت بو. کەمال بورقای ڕێبەریان بو.

- چەند کەسێکی تر بنکەیەکی تریان دامەزراند بە ناوی «کاوە». ئەمیش بو بە تاقمیکی سیاسی.

جگە لەم ڕێکخراوە نهێنییە ناقانونییانە، هەمو حیزبە گەورەکانی تورکیا وەکو: «جمهوریەت خەلق پارتی سی» بە ڕیبەری بولەند ئەجەوید. «عەدالەت پارتی سی» بە ڕیبەری سولەیمان دەمیرل. «میللی سەلامەت پارتی سی» بە ڕیبەری نەجمەدین ئەربەقان. تەنانەت حیزبە نەتەوەییە فاشیستەکەی: «میللەتچی حەرەکەت پارتی سی» بە ڕیبەری تورکەش، لە کوردستان دا جموجولێکی زور و، ئەندام و لایەنگری زوریان هەبو.

کە یەکیتی دامەزرا، هەولێکی زوری زوبەزوی دا بو دامەزراندنی بناغەی دوستایەتی لە گەل هەمو ئەو ڕێکخراوانە. یەکیتی ڕێکخراوێکی تازە و نەناسراو بو لە

کوردستانی تورکیا. مامجەلال ناسراو بو، ئەویش بە هوی پروپاگاندەی پارتیەوە ناوی زور بە خراپی رویشت بو. هەر لە سەرەتاوە هەندی لەم ریکخراوانە بە هوی ناوی مامجەلالەوە لە یەکیتی کەوتنە سلەمینەوە.

کە ق م دامەزرا، کوردستانی تورکیای کرد بە مەیدانی سەرەکی چالاکیەکانی خوی و، هەندی لە بەرپرس و کادرەکانی خوی ناردە ئەوی. زور بە زویی دوستایەتی خوی لە گەل دوستەکانی تازە کردەوە. حیزبەکەی دەرویشی سەعدو و عەلی دینلەر وەکو لقی ق م لە تورکیا کەوتە گەر. هەمو چالاکیەکانی خوی تەرخان کرد بو دوژمنایەتی یەکیتی. بە «تاپپ و رونیو» بلاوکراوەیەکی تورکییان بە ناوی: «خەبات» دەرئەکرد، هەمو بابەتەکانی جنیو بو بە مامجەلال و هیرش بو بو سەر یەکیتی. یەکیتی یان بە «جاشی ۷٦» ناو ئەبرد. سەرانی عەشیرەتەکانی سنوریان لە یەکیتی تیژ کرد بو.

د. شڤان، ئەو کاتەی لە ناوچەی زاخو ژیا بو، هەندی وتار و بابەتی لە سەر کوردستانی عیراق نوسی بو، بو رازی کردنی بارزانی و پارتی، زور بە توندی هیرشی کرد بوە سەر مامجەلال و بە خیانەت تاوانباری کرد بو، لەم ماوەیەدا رزگاری ئەو وتارانەی شڤانی سەرلەنوی بلاو کردەوە.

حیزبیکی ماوی لە تورکیا دامەزرا بو، روژنامەی «ئایدنلک» یان دەر ئەکرد. ئەم روژنامەیە زور جار وتاری خراپی لە سەر یەکیتی ئەنوسی و، یەکیتی بە نوکەری سوڤیت دائەنا. لە وتارەکانی دا جوری لە جاسوسی بو حکومەتی تورکیا ئەکرد. ریگاکانی هاتوچوی کادرەکانی یەکیتی و، شوینی مانەوەیان و، ناوی دوستەکانی ئاشکرا ئەکرد.

یەکیتی، لە ناو ریکخراوەکانی تورکیادا، بە تەنیا لە گەل «پ د ک ت - بالی شڤان» توانی دوستایەتی دابمەزرینی. ئەمەش چەند هویەکی هەبو:

۱. بارزانی، «د. شڤان»، ریبەری حیزبەکەیان و، دو لە کادرەکانی سەرکردایەتی: «بروسک» و «چەکو» ی بە تاوانی کوشتنی «سەعید ئیلچی» ، ریبەری بالەکەی تری «پ د ک ت» کوشت بو. بنکەکانی کوردستانی عیراقیان داخست بون. کادر و ئەندامەکانیان توشی گرتن و راو نان و سەرگەردانی بو بون. بەم هویەوە حەزیان لە چارەی بارزانی نەبو.

۲. لە شەرەکانی ۷٤ دا بارزانی پشتیوانی سوڤیتی و، حیزبە شیوعیەکانی دنیای لە دەس دابو. دوای ئاشبەتالیش پەنای بو ئیران برد بو، دوایش چو بوە ئەمریکا. بارزانی بە کونەپەرست و دوستی ئەمریکا ناسرا بو، لە کاتیک دا یەکیتی بە چەپ و دوستی سوڤیت.

۳. یەکیتی یارمەتی زوری ئەم حیزبەی ئەدا. ژمارەیەکی زور چەکی دایە.

چەردەیەک پارەی بو ژیانی کـادرەکـانی و چالاکی حـیـزبەکـەیان تەرخـان کـرد بو. بە ریکخراوە فـەلسـتـینیـیـەکانی ناساند، کە ئەوسا لە لای جولانەوەکانی چەپی تورکیا وەکو قیبلەی موسولمانەکان سەیر ئەکران.

د د ک د کە چەتری قانونیی ئەم حیزبە بو زور بە خیرایی پەرەی سەند، بەلام لە ناو گوندەکان و، سەرانی عـەشـیـرەتەکان دا دەسەلات و نفوزیکی ئەوتوی نەبو، بە تایبەتی لەو ناوچانەدا کە یەکیتی پیویستی پی ی هەبو.

د د ک د زوری پی ناخـوش بو یەکـیـتی لە گـەل هیچ ریکخـراویکی تر و هیچ لایەن و کـەسایەتیـیـەکی تر پەیوەندی دابمەزرینی، بەلکو هەندی جار هەرەشەیان ئەکرد کە ئەگەر یەکـیـتی کاری وا بکا، ئەوا ئەوان «دانوسـتـان» ی خـویان لە گەل یەکـیـتی «قـوت» ئەکەن!

لە گـــەل ئەوەش دا هەولی زور درا بو ئەوەی لە گـــەل هەمـــویان پـیـــوەندی باش دابمەزرینی، تەنانەت دەرویشی سەعدو «دەعوەت» کرا بو سوریا و، زوری قسە لە گەل کرا بی سود بو. لە گەل کەمال بورقای کە ئەو زەمانە لە ئەنقەرە بو پەیوەندیمان کرد. منیش لە گـەرانەوەم دا چوم بو لای و، مـامـجـەلالیش لە گـەرانەوەی دا سـەردانی کـرد. «پارتی سوسیالیست» ئەوسا لاواز بو، لە ناو دیهات دا نفوزی نەبو.

لە ناو یەکیتی دا ئیمە لامان وابو:

١. گرنگیی کوردستانی تورکیا بو کورد وەکو گرنگیی میصر وایە بو عەرەب.

٢. ئەو هەلسانەوەیەی لە کوردستانی تورکیا دەستی پی کردوە ئەبی پشتیوانی بی قەیدوشەرت بکری بی ئەوەی گوی بدریتە ئەوەی ئەوان هەلویستیان لە یەکیتی چیە و چونە.

٣. ئەبی جولانەوەی سیاسی کوردستانی تورکیا بە بی دەستیوەردان و کویخایەتی گەشە بکات.

لە بەر ئەوە بە هیچ جوری یەکیتی خوی لە کاروباری سیاسی کوردستانی تورکیا هەلنەئەقورتاند، تەنانەت دژایەتی ئەوحیزبانەشی نەئەکرد کە دژایەتی یەکیتیان ئەکرد و، ئامادە بو یارمەتییان پیشکەش بکا.

*

کاری فیکری

بو یەکیتی کاری راگەیاندن و فیکری شتیکی گرنگ بو چونکە ریکخراویکی تازە دامەزراو بو، رابردوی دور و ناسراوی نەبو، جەماوەری خوی هەبی لی ی کو بینەوە. ئەوەی

ئەندامانی یەکێتی بە یەکەوە ئەبەستەوە: کوردایەتی، بیروباوەری پێشکەوتنخوازی، هەلگیرساندنەوەی شورش، بەدیهێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد بو... ئەمانە بیری بەرز و پاک بون، تیکوشەرانی کورد خویان لە پێناودا بەخت ئەکرد.

یەکەمین بەیاننامەی یەکێتی، ئەوەبو بە بونەی دامەزراندنی یەکێتیەوە لە ٧٥/٥/٢٢ دا لە شام و، لە ٧٥/٦/١ دا لە ئەوروپا بلاو کرایەوە. ئەم بەیانە لە رادیوی دیمەشقەوە خوێندرا بوەوە. لە کوردستان دا بە چاکی دەنگی دا بوەوە. پێش ئەوەی هیچ ئەندام و کادری لە کوردستان کار بو دروستکردنی رێکخستنی یەکێتی بکات، ئەم بەیانە دوست و لایەنگری بو پەیدا کرد بو. بەیانەکە مامجەلال بە عەرەبی نوسی بوی. وەرگیردرایە سەر چەند زمانێکی تر: عومەر شێخموس کردی بە ئینگلیزی و کمال فوئاد بە ئەلمانی و، حەسەنی قازی بە فارسی. بە هەزاران دانەی لی بلاو کرایەوە.

بە دوای ئەمەدا نامیلکەیەک لە ژیر سەرناوی «الاتحاد الوطنی الکردستانی لماذا؟» بلاو کرایەوە. ئەم نامیلکەیەش مامجەلال بە عەرەبی نوسی بوی. ئارام لە کوردستان کردی بە کوردی. پارتی تا ئیستاش وا ئیدیعا ئەکا کە یەکێتی بو لە ناو بردنی پارتی دامەزراوە و، ئەم نامیلکەیە ئەکات بە بەلگە. گوایە لەم نامیلکەیەدا نوسراوە: «ناکوکی سەرەکی یەکێتی لە گەل پارتیە و، پارتی دوژمنی سەرەکی یەکێتی و کوردە». راستیەکەی ئەوە واهیمەی سەرانی پارتیە ئەگینا شتی وا لەم نامیلکەیەدا نیە. یەکێتی توشی دوژمنایەتی و، ناکوکی خویناوی بو لە گەل پارتی، بەلام هەرگیز پارتی بە ناکوکی سەرەکی و دوژمنی سەرەکی نەزانیوە، هەمیشە رژیمی بەعسی بە دوژمنی سەرەکی خوی و کورد داناوە. من ئەمەم لە وتاریک دا لە ژیر سەرناوی: «باری ئیستای گەلەکەمان و رێکخستنی ی ن ک» دا لە یەکەمین ژمارەی «ریبازی نوی» دا رون کردوتەوە.

پیویست بو یەکێتی ئورگان، یان وەکو ئەلین: «زمان حال» ی هەبی، بو ئەوەی بیروبوچونەکانی بە خەلک بناسینی و، هەلویستی خوی لە روداوەکان دیاری بکا. بریار درا بە عەرەبی «الشرارە» و بە کوردی «ریبازی نوی» بلاو بکریتەوە.

یەکەم ژمارەی «الشرارە» لە تشرینی دوەمی ١٩٧٥ دا دەر چو.

وتارەکانی ژمارەی یەکەم بریتی بو لە:

- هذه الجریدە
- نداء الی الامە العربیە المجیدە
- حملە الاعدامات الجماعیە مستمرە فی العراق
- من اجل جمعیە کردستانیە تقدمیە للطلبە الاکراد فی اوروبا

- المراه الكرديه تواصل نضالها
- من الذى اقترح ميثاق امن الخليج

ئەم هەوال و کورتە تەعلیقانەشی تی دا بو:

- التجمع الوطنى يبارك الاتحاد الوطنى الكردستانى
- لماذا لا تذكر الصحافه العراقيه اسم القوات الايرانيه الغازيه فى الخليج
- على طريق اتفاقيه اذار الخيانيه: اعتراف الدكتاتوريه العراقيه بحكم السلطان قابوس
- حقيقه صارخه: حكم ذاتى كارتونى على الطريقه التكريتيه
- اليس السكوت عن جرائم التشريد والتهجير الجماعيه بحق الشعب الكردى خيانه وطنيه ايها الساده المسؤلون الاكراد؟
- الاتحاد الوطنى الكردستانى يشكر التجمع الوطنى العراقى

هەروەها «البيان الاول للاتحاد الوطنى الكردستانى» و «بيان اتحاد الشبيبه الديمقراطى الكردستانى واتحاد طلبه كردستان: النصر لشعبنا العراقى والاندحار للفاشيه وتحالفاتها الرجعيه» لەم ژمارەیەدا دوبارە بڵاو کراوەتەوە. بە خوێندەوارانیشی ڕاگەیاند بو کە بەو نزیکانە «ریبازی نوی» بە کوردی بڵاو ئەبیتەوە.

زوری وتارەکانی مامجەلال نوسی بوی. لە چاپخانەکەی «القیادە القومیە» لە شام چاپ کرا.

دوەم ژمارەی «الشرارە» لە کانونی دوەمی ١٩٧٦ دا بڵاو کرایەوە.

وتارەکانی ژمارەی دوەم بریتی بو لە:

- عام جديد من النضال والفداء
- الاستقلاليه والاعتماد على الجماهير الشعبيه سبيلنا لتخليص القضيه الكرديه من اللعبه الدوليه
- التهجير الجماعى مظهر واضح للعنصريه الفاشيه
- واقع الحقوق الثقافيه للشعب الكردى فى العراق
- اسس الحكم فى العراق
- لماذا التراجع؟

زوری وتارەکانی ئەم ژمارەیەش مامجەلال نوسی بوی.

ئەمانویست «ریبازی نوی» دەر بکەین. ئەمە دو کوسپی لە بەردەم دا بو: یەکەمیان، هونەری بو. لە شام هیچ چاپخانەیەکی لی نەبو پیتی کوردی هەبی تا

رۆژنامــەکــەی لی چاپ بکەین. دوەمــیــان، ســیــاسی بو، بو چاپی رۆژنامــەیەکی وا لە چاپخانەیەکی ئەهلی دا ئەبو موافەقەتی چەند داوودەزگای حکومەتی وەربگیری. تا ئەوسا لە سوریا نوسینی کوردی چاپ نەکرا بو.

بریارمان دا رۆژنامەکە لە لوبنان چاپ بکەین. عارفی شیخ کەریم مسودەکانی لە گەل خوی برد و لە بیروت چاپی کرد و هینایەوە.

ژمــارەی یەکــەمــی «ریــبــازی نوی» لە کــانونی دوەمی ۱۹۷٦ دا بلاو کــرایەوە. وتارەکانی بریتی بون لە:

- سەروتار
- چیای لالەش بە شورشیەکان ناگویزریتەوە
- ریکەوتنی صەدام و شا لە جەزایر و مەسەلەی هاوچارەنوسیی نەتەوەی کورد
- باری ئیستای گەلەکەمان و ریکخستنی ی ن ک

جگە لە سەروتارەکەی کە مامجەلال نوسیبویتی، وتارەکانی تری هەموی من نوسی بوم. دوای چەند حەفتەیەک ژمارەی دوەمیشمان چاپ کرد. ئەم ژمارەیەیان لە شام چاپ کرا. ئەویش سەروتارەکەی مامجەلال و ئەوی تری من نوسیبومە.

جگە لە هەردو ئورگان، چەند بەیان و نامیلکەیەکیش بلاو کرایەوە. لەوانە بەیانیک بە عەرەبی بە بونەی چواردەهەمین یادی هەلگیرسانی شورشی ئەیلولەوە و، نامیلکەیەک بە ناونیشانی «باری ئیستای خەباتمان». ئەمە راپورتیکە مامجەلال لە کوبونەوەیەکی «دەستەی دامەزرینەر» دا خویندیەوە. پاش هەلسەنگاندن و هەندی ئالوگوری کەم بلاو کرایەوە.

«ریــبــازی نوی» لە ئەوروپا باش بلاو ئەکــرایەوە، بەلام زور بە کــەمــی و زور بە زەحمەت ئەگەیشتە کوردستان. منیش خەریکی ئامادە کردنی خوم و پیشمەرگەکان بوم بو گەرانەوە بو کوردستان. کاتیکی ئەوتوم نەمابو بو ریبازی نوی. رۆژنامەکە وەستا. تا دوای ســەرکەوتنی شــورشی ئیــران، لە کــوردســتان دەزگــای راگەیاندن سەرلەنوی دەستی کــرد بە بلاوکردنەوەی.

«الشــراره» هەر بەردەوام بو لە دەرچون. دەرچونی بلاوکــراوەیەکی عــەرەبی زور پیــویســت بو، بو گەیاندنی بیروبوچونەکانی یەکیتی بە دنیای عــەرەب. زوری وتارەکــانی الشراره مامجەلال ئەینوسی و د. فوئاد مەعصوم سەرپەرشتی چاپەکەی ئەکرد. منیش چەند وتاریکم بو نوسی. هەندیکیان بە عەرەبی و، هەندیکیشیان بە کوردی د. فوئاد کردونی بە عــەرەبی. دوای گــەرانەوەی مــامــجــەلال بو کــوردســتــان ئەویش راوەســتــا، ئەویش دوای سەرکەوتنی شورشی ئیران لە کوردستان دیسان بلاو کرایەوە.

*

هەرکەس بلاو کراوەکانی یەکێتی بخوێنێتەوە ئەبینی توندڕەوی زاڵە بە سەری دا. ناوی «الشرارە» لە ناوی ئۆرگانەکەی لینین و، قسە نەستەقەکەی ژێریشی: «ومن الشرارە یندلع اللهیب» لە ماوتسی تونگ وەرگیرا بو. ناوەڕۆکی باسەکانیش پڕن لە بابەتی دوژمنایەتی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و سەهیونیزم... ئەمەش نابی بە دابڕاوی لە ڕوداوەکانی ئەو زەمانە سەیری بکری.

یەکەم، بە هوی کارەساتەکەی جەزائیرەوە، ڕەدفعلێکی بەهێز دژی ئەمەریکا و ئیران لە لای هەمو کورد دروست بوبو. هەمو کەس ئەم دوهێزەیان بە پیلانگێر و دوژمنی کورد دائەنا.

دوەم، ئیمەش: خومان پیشینەی فیکریمان مارکسی و چەپ بو. بەسترا بوینەوە بە کومەڵەوە. هەندی لەو بوچونانە «قەناعەتی فیکری» بون لە لامان. بیری چەپ ئەوەندە برەوی هەبو، تاقمی وەکو قم یش بون بە مارکسی. لەم ڕوەوە لە «طریق الحرکە التحرریە الکردیە» دا نوسی بویان: «واخیرا ولیس اخرا نعتمد فی وضع سیاستنا الجدیدة علی الدراسة العلمیة فی ضوء الماركسیة اللینینیة لوضع الشعب الكردی المضطهد والامة الكردیة المجزاة والشعب العراقی المقید وطبیعة السلطة الفاشیة...»

*

بیرمان لەوە کرد بوەوە بو ئەوەی ئازادی زورترمان هەبی و، کەمتر پیویستیمان بە سوریا بی، بنکەیەک لە لوبنان دابمەزرینین. لوبنان لاوازترین وڵاتی عەرەبی بو، تا ڕادەیەکیش دیموکراسی و، ئازادی بیر و کاری سیاسی تی دا بو. ڕیکخراوە فەلەستینیەکان لاوازی لوبنانیان بە هەل زانی بارەگا و بنکە و لەشکر و جبەخانەکانیان لەوی کو کردەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی سوریا و میصر ڕیگای چالاکی فیدائیان نەئەدان و، ئوردونیش لە «ئەیلولی ڕەش» دا بە شەر دەری کرد بون.

مامجەلال نیوانی لە گەل سەرانی فەلەستینی خوش بو. دوستایەتی لە گەل عەرەفات و، جورج حەبەش و، نایف حەواتمە هەبو. لەو ڕیگایەوە یەکیتی یش پیوەندی لە گەل دامەزراند بون. بەلینیان دابو یارمەتی یەکیتی بدەن بە: چەک و، مەشق پی کردنی کادر و پیشمەرگەکانی. ئامادەش بون یارمەتی یەکیتی بدەن بنکەی پیشمەرگایەتی لە لوبنان دابمەزرینی.

شەری ناوخو لە لوبنان تا ئەهات گەرمتر ئەبو. وازمان لە بیری کردنەوەی بنکەی پیشمەرگایەتی هینا. هەمو لایەنەکان، هەر یەکەیان بە جوری، لە شەرەوە گلا بون.

ترسابن ئیمش، بی ئەوەی هیچ قازانجیکی گەلەکەمان لەو شەڕەدا هەبێ، تیوە بگلیێن.
بۆ یەکەمین جار من سالی ۱۹۷۰ بە دەم ڕیگاوە بۆ قاهیرە سەردانیکی چەند ڕۆژەی بیروتم کرد بو. ئەمجارەیان لە دیمەشقەوە چەند جاری بۆ گەران و سەیران و کتیب سەردانی لوبنانم کردەوە. شەڕی ناوخۆ لوبنانی ئەڤاری و، ئەو وڵاتە خۆشەی سەردەمیک لە چاو هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست دا ئەمینترین مەلبەند و، ناوەندی ڕۆژنامەوانی و، بازرگانی و، توریزم و، نمونەی ئازادی سیاسی و فیکری بو، بو بو بە ئوردوگایەکی گەورەی دوژمنایەتی و مەرگ. دەیان هەزار لوبنانی لە تاو شەڕی ناوخۆ هەلات بون بۆ سوریا.

*

لیبیەکان بەلێنیان بە مامجەلال دابو، بەردەوام یارمەتی یەکیتی بدەن بە: پارە و چەک. ئەودەم هیشتا خەباتی چەکدار لە کوردستان دەستی پی نەکرد بووەوە. لیبیەکان مانگانە چەردەیەک پارەیان بۆ یارمەتیدانی بارەگا و کادر و پیشمەرگەکانی یەکیتی لە سوریا تەرخان کرد بو. هەمو مانگی پارەکەیان ئەناردە سەر حسابیک لە لوبنان. مامجەلال باوەڕیکی بەهیزی بە مونذیر نەقشبەندی هەبو، چەند جاری ئەوی نارد بۆ وەرگرتن و هینانەوەی بۆ سوریا.
لیبیەکان کاتی خۆی بەو شەرتە یارمەتی یەکیتیان ئەدا عیراق پی نەزانی. کەچی پاش ماوەیەکی کەم عیراق بەمەی زانی، لیبیەکان بە گلەیی و تورەبونەوە وت بویان: عیراق ژمارەی «چەکەکانی بانک» بشی زانی بو. لە سەر ئەمە یارمەتیدانی لیبی ماوەیەک ڕاگیرا و، کوسپی تی کەوت.
کەس گومانی لە مونذیر نەئەکرد. مونذیر وریا و چالاک و گەرموگور بو. سوریەکان پوستەیەکی سەفارەتی عیراقیان لە فرۆکەخانەی بیروت گرت، لە ناو «هەمانەی دیپلۆماسی» دا بۆ بەغدایان ئەنارد. لە ناو هەمانەکەدا هەندی ڕاپورتی تی دا بو لە سەر چالاکییەکانی موعارەضە لە سوریا. وەکو لیکۆلینەوە دەری خست مونذیر نوسی بونی. مونذیر بە نهینی لە گەڵ موخابەراتی عیراق پەیوەندی هەبو، هەر ئەویش مەسەلەی یارمەتی لیبیای بۆ موخابەراتی عیراقی ئاشکرا کرد بو.

*

لە کۆنەوە لە شام «جالیە» یەکی کوردی لی یە. ئەمانە بە یەک جار و لە یەک سەردەم دا نەچونەتە شام. بەلکو پچر پچر و لە زەمانی جیاجیادا کۆچیان کردوە بۆ ئەوی. هەندی لە کوردەکان هیشتا پاریزگاری ڕیچەلەکی خۆیان کردوە و، هەندیکی تریشی لە

ناو کـومـەڵی شـامی دا تواونەتەوە. ئەو کـاتەی ئیـمـە لە شـام بویـن دەیان هەزار کـورد لە جەزیرە و ناوچەکانی ترەوە بو کریکاری هات بون بو شام.

پاش تیشکانی شورشـەکانی کورد لە تورکیا پولیک لە روشنبیرەکانی پەریوەی سوریا بون. لە شام و ناوچەی جزیرە جیگیر بون. حیزبی «خویبون» یان پیک هینا و، یەکی لە مـەلبەندەکانی چالاکیـیان حەسـەکە بو. کە شورشی ئاگری داخ هەلگیرسا، ئەمو ئەمـانیش لە ناوچەکـانی سـیـوەرەک، مـاردین، جزیرە... دەس بکەن بە چالاکی چەکـدار. فەرەنسییەکان پییـان زانین و، لە سنور دوریان خستنەوە. جەلادەت بەدرخان، دوای ئەوەی لە کـاری سیـاسی - حیـزبی کەنارەگیـری کـرد، خوی بو زمـان و ئەدەب تەرخان کـرد. لە سەرەتای سییەکانەوە دەستی کرد بە بلاوکردنەوەی گوڤاری کرمانجی - فـەرەنسی «هاوار» و، چەندین نامیلکە و کتیبی دەربارەی زمان و ئەدەبی کورد بلاو کردەوە. لە چلەکان دا بە هاوکاری کـامـەرانی برای و، چەند کـەسـیکی تر «ستیـر» و «روژانو» یان بلاو کردوتەوە. دەستەیەکی باش نوسـەر و شاعیـری کورد پی گەیشتن، لەوانە: عوسـمـان صـەبری، قەدری جان، جگەرخوین، رشـید کورد. نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، دوای سەربەخویی سوریا، ئەم مافەیان بە کـورد رەوا نەدی. نەیانهیشت هیچ نوسینیکی کوردی بلاو ببیتەوە و، چالاکی روشنبیری، سیاسی، کومەلایەتییان لی قەدەغە کردن.

جولانەوەیەکی سیاسی ئەوتو لە ناو کوردەکانی سوریادا نەما تا سالی ١٩٥٦ کە «پارتی دیموکراتی کورد» دامەزرا. ئەویش دوای «وحدە» ی سوریا لە گەڵ میصر کەوتە بەر هیرش و پەلامار و، دواییتریش پارچە پارچە بو.

چەند گەورەپیـاویکی کورد لە شام نیژراون، لەوانە: صـەلاحەدینی ئەییوبی، مەولانا خالیدی شارەزوری، بەدرخان بەگی میری بوتان... لە یەکـەمین سـەفـەرم دا بو شام لە گەڵ د. کـەمـال فوئاد، سەردانی گوری صـەلاحەدینم لە نزیک «جامع الاموی» و گوری مـەولانا خالیـدم لە «قـاسیـون» کرد. گوری بەدرخـان بەگـمـان بو نەدوزرایەوە. لە زور کـەسـیـشـمـان پرسی پی یان نەشەزانی.

*

ئەجو سـەردانی زور لە کوردە ناودارەکانی شامی ئەکرد. هەندی لە مانە لە تورکیا لە دایک بوبون و هەر لەویش خـویند بویان و گـەورە بوبون، بەلام بە هوی تیـشکـانی شـورشـەکـانی کـوردەوە پەریوەی سوریا و، جیگیـر بوبون. ئەوانە هەرچەندە پیـوەندییـەکی ئەوتویان بە کـوردسـتـانی تورکـیـا و ریکخـراوەکـانی و، تەنانەت بە بنەمـالە و خیزانەکانیشیانەوە نەما بو، بەلام ناستالجیا «حنین» یکی قولیان بو کوردستانی تورکیا

هەر مابو. بە پەروشەوە تەعقیبی هەواڵەکانیان ئەکرد و، بە خوشیەوە لە بوژانەوەی جولانەوەی کوردیان ئەروانی. ریزیکی تایبەتییان لە نەجو ئەنا.

جاریکیان نەجو لە گەڵ خوی بردمی بو سەردانی مەمدوح سەلیم بەگ لە فلاتەکەی خوی دا. مەمدوح بەگ لە تیکوشەرەکانی بیستەکانی ئەم سەدەیە بو. لە پیش یەکەمین جەنگی جیهانییەوە بەشداریی لە چالاکی سیاسی و روژنامەوانی و کومەلایەتی کوردا کرد بو. دوای جەنگ یەکی بو لە چالاکەکانی جولانەوەی کورد. لە گەڵ چەند هاورییەکی «پارتی دیموکراتی کورد» یان دامەزراندوە. چەندین یادداشتیان دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد داوە بە نوینەرانی هاوپەیمانەکان و، خویان گفتوگویان لە گەڵ کردون. گوڤاری، دوایتر جەریدەی، تورکی - کوردی «ژین» ی بە هاوکاری لە گەڵ هەمزە مەکسی لە ئستەمول بلاو کردوتەوە. دوای هاتنی مستەفا کەمال، ئەمیش وەکو تیکوشەرەکانی تری کورد دەربەدەر بوە. سەرەنجام لە سوریا گیرسا بوەوە. لە دامەزراندنی «خویبون» دا هاوبەش بوبو.

ئەوکاتەی لە گەڵ نەجو چوین بو لای، مەمدوح بەگ پیر بوبو، بەلام هیشتا قسەکانی ریکوپیک بون. وینەیەکی سولتان عەبدولحەمیدی لە ژورەکەدا هەلواسی بو. دەرەنگ ژنی هینا بو، هاوسەرەکەی کورد نەبو، منالیشی نەبو.

مەمدوح بەگ جگە لەوەی ریزیکی زوری نەجوی گرت کومەلی چاپکراوی بە نرخی بە دیاری پیشکەش کرد، لەوانە هەندی لە ژمارەکانی «ژین» و «کوردستان» و «هاوار» و «روژانو» و چەند بەرگیک لە کتیبە میژوییەکانی سەردەمی عوسمانی. پیم سەیر بو، مەسعود محەممەد بە ناوی «کوری زانیاری کورد» ەوە، هەلکوت هەلکوت چو بو شام بو سەردانی مەمدوح بەگ و چەند کەسیکی تر، کەچی هیچی لە مانە تەنانەت فوتوکوپیەکانیشی نەداوە.

*

ی ن ک لە کاتی دامەزراندنی دا سوریای کرد بە بنکەی سەرکردایەتی و شوینی خوریکخستن و، مەشق پی کردنی هەندی لە کادر و پیشمەرگەکانی و، چاپ و بلاو کردنەوەی ئورگان و بەیاننامەکانی. راستیەکەی ئەگەر دامەزراندنی یەکیتی و، هەلگیرساندنەوەی شورش دوای ئاشبەتال، بە سەروەرییەکی گەورە لە میژوی کوردا حساب بکری، ئەبی لەم سەروەرییەدا کورد بە ریز لی نانەوە چاکەی سوریا، بە تایبەتی هی سەروک حافظ ئەسەدی، لە بەر چاو بی. ئەمە خو وبیتی و نوکەری نەبیت چیە ...

لە روژانی ئاشبەتال دا ژمارەیەکی زور لە پیشمەرگەکانی خەلکی شنکار، ...

تەلەعفەر، زەمار، زاخو کە سەر بە عەشیرەتەکانی کوچەر، میران، گەرگەری، سندی، گولی، تەی، باتوا، یەزیدی و لە هێزەکانی تەلەعفەر، سنجار و، زاخو بون ... هات بونە ناو سوریاوە. زوریان خزم و ناسیاوی خویان لە ناو کوردەکانی سوریادا هەبو. کاربەدەستانی سوریش کارئاسانییان بو کرد بون و ریگەیان لی نەگرت بون. یەکیەتی هەندی لە کادرەکانی خوی تەرخان کرد بو سازدان و ریکخستنەوەیان. بە زوری لە گوندەکانی قامیشلی و دیرکی و حەسەکە نیشتەجی بون.

ئەم ناوچەیە هاوسنور بو لە گەڵ عیراق و تورکیا. لەوی وە ئەتوانرا دزە بکری بو زاخو و شەنگار و گوندەکانی ناوچەکە. هەروەها ئەتوانرا دزە بکری بو ناو تورکیا و لەویوە دزە بکری بو ناو کوردستانی عیراق.

کاربەدەستانی عیراق بەر لە روداوەکانی سالی ٧٤ و لە کاتی شەرەکانی ٧٤ دا و دوای هەرەسی جولانەوەکەش ناوچەکەی تەعجیر و تەعریب کرد بو. گوندەکانی سنوری هەمو راگویزا بو. زورایەتی کوردەکانی شەنگار و دەوروبەری راگویزا بو بو ئوردوگای زورەملی و شارەکانی تر. «ربیە» ی زوری لە سەر سنور دانا بو. ریگا و شوینە گرنگەکانی بە مین چاند بو. چیای بیخەیری زور بە توندی گرت بو. هیزیکی زوری جەیشی لە ناوچەکەدا بلاو کرد بوەوە.

ی ن ک لە چوارچیوەی ئەو پلانە گشتییەدا کە دای نا بو، بو دروست کردنی مەفرەزەی بچوکی بلاوی بە چەندایەتی کەم و بە چونایەتی باش، لە سوریاش خەریکی سازدان و ریکخستنی هەندی مەفرەزە بو. ئەو کونە پیشمەرگانەی ئامادە بون ببنەوە بە پیشمەرگە زوری ریکخستنەوە، هەندی دەورەی تەدریبی لە موعەسکەرەکانی شام بو کردنەوە، لە چەند مەفرەزەیەک دا ریکی خست بون. لایەنگرانی بنەماڵەی بارزانی کە دوایی تر بە ناوی قیادەی موەقەتەوە کەوتنە کار کردن، زور بە توندی کەوتنە دوژمنایەتی ی ن ک. هەولیان ئەدا خەلکیان لی بەدگومان بکەن و پیشمەرگە و لایەنگرەکانیان لی هەڵ بگیرنەوە، لە ناو خەلک دا پروپاگاندەی خراپیان دژی ینک و سەرکردە و کادرەکانیان بلاو ئەکردەوە. تەنانەت هەندی کەسیان خزا بونە دەزگا ئەمنییەکانی سوریا و تورکیاوە بو پاراستنی خویان و ئازار دانی لایەنگرانی ینک و بەدگومان کردنی ئەو دەزگایانە لە چالاکییەکانیان.

لەگەڵ هەمو ئەوانەدا روژبەروژ ریکخستنی ینک پەرەی ئەسەند و لایەنگری زورتر ئەبون. لە ناو کوردستانیش دا دائەمەزرا.

*

بەعس، راگویزانی کوردی کرد بو بە یەکی لە پایە سەرەکییەکانی ستراتیجی کوردیی خوی. دوای ئاشبەتال بە پەلە کەوتنە جیبەجی کردنی. ئەمەیان لای روژنامەوانەکانی بیگانەش نەئەشاردەوە. طاریق عەزیز چەند جاری بە ئاشکرا باسی ئەمەی بو ئەکردن و کەلکەکانی راگویزانی بو ئەژماردن.

صەددام حسین، لە کوبونەوەیەک دا لە ۲۱ ی ئابی ۱۹۷٦ دا لە کوشکی «المجلس الوطنی» لە گەل ئەندامانی «اللجنه العلیا للجبهه الوطنیه والقومیه التقدمیه وسکرتاریه الجبهه وکل لجان الجبهه فی المحافظات»، ستراتیجی خوی بەرامبەر بە کورد رون کردەوە و، بە راشکاوی و بی پیچوپەنا مەسەلەی راگویزانی ناوچەکانی سنوری بە قولایی ۲۰ کیلومەتر و، بلاو کردنەوەی جەیشی لە کوردستان دا باس کرد. لەم وتارەدا وتی:

«لقد قلت فی اجتماع المجلس التشریعی لمنطقة الحکم الذاتی: عندما تکون هناك استحالتان: استحالة مادیة و استحالة مبدئیة وروحیة، استحالة مادیة تمنع الانفصال، واستحالة مبدئیة وروحیة فی الوجدان وفی العقل وفی الایمان من قبل الغالبیة العظمی من ابناء شعبنا الکردی ومن قبل کل العراقیین، عندها لا یمکن ان یحصل ما یسیء الی وحدة شعبنا وارضنا. الا ان عدم ضبط الموازنة، وحصول میل لحساب ای من العاملین اللذین اشرنا الیهما علی حساب العامل الاخر، بای ظرف وفی ای عمل، سیلحق بمسیرتنا اضرارا فادحة، وعلی هذا الاساس، اذا ما تصور ای منا انه اذا عمل علی خلق الاستحالة المادیة وحدها متصورا انه سیخلق وحدة المصیر داخل الشعب العراقی، فان حکمه سیکون خاسرا بالتاکید، لان هذا لیس هو الرکن الوحید الذی یستند علیه عملنا وسیاساتنا، وعندما ننظر الی المسالة نظرة غیر عملیة وغیر موضوعیة وغیر سیاسیة ونتصور ان المسالة تحل ضمن الحکم المبدئی والعقلی المجرد دون ان نعمل علی خلق الرکائز المادیة والموضوعیة لجعل الانفصال عملیة مستحیلة، نکون بذلك قد اعطینا الفرصة الواسعة للاستعمار لان یعبث بوحدة شعبنا....

یجب ان تکون القوی المضادة، ومن بینها القوی الراغبة فی الانفصال، والساعیة الیه امام استحالتین: استحالة مبدئیة ووجدانیة، بمعنی ان یؤمن شعبنا فی کردستان بان مصیره مرتبط نهائیا بوحدة تراب العراق ووحدة شعبه، ویقتنع به قناعة عقلیة ویربط کل اهدافه وامالە فی هذا الاطار، واستحالة مادیة موازیة لها توجدها التدابیر القانونیة والسیاسیة والاقتصادیة وحتی العسکریة التی تتخذها الدولة والتوازن بین هذا وذاك یجب ان تحکمه المبادئ. ان ایا من الاستحالتین وحدها، لایمکن ان یلغی دور العمل المضاد فی منطقة

كردستان للحكم الذاتي. ان من يتصور بانه من خلال التعامل بالمبادئ المجردة فقط يلغي فرص العمل المضاد في كردستان، لا يمكن بتصوره هذا ان يخدم وحدة العراق بل انه يقود شعبنا الى نتائج منحرفة. كما ان التصور الذي ينطلق من ان الاجراءات السياسية والعسكرية والاقتصادية وما يماثلها تلغي وحدها فرص العمل المضاد وتلغي نزعة الانفصال، فان هذا التصور منحرف ايضا لان هذا الجانب وحده لا يمكن ان يلغي هذه الفرص.. ان ما يلغي فرص العمل المضاد هو المبادئ والتدابير المتصلة بالمبادئ التي تجعل شعبنا في منطقة الحكم الذاتي يؤمن بان الناس والقيادة في بغداد، انما هم جزء منه، وانهم يسعون من اجله، ويريدون له الخير، ويعملون من اجل قضيته القومية كما يعمل هو، اضافة الى ذلك، لابد من استكمال بعض المستلزمات الاخرى مثل ضبط الحدود، والترحيل من الحدود بعمق عشرين كيلومتر، لكي لا يحدث تسلل، وايجاد اجهزة لتقصي المعلومات والنزعات الشريرة، وابقاء جيش في المنطقة وتوزيعه على شكل معسكرات معينة وشق الطرق في الجبال..الخ»

راگویزان كاری بو كه مەترسییەكی گەورەی بو سەر پاشەروژی كورد دروست ئەكرد.

*

له كوبونەوەیەكی دەستەی دامەزرینەردا له شام باسی دارشتنی پروگرام و پیرەوی ناوخوی یەكیتی كرا. جگه له عومەر شیخموس هەمو ئەندامەكان بەشدار بون له باسەكانی دا. بابەته سەرەكییەكانی دیاری كرا و، دارشتنەوەی به كوردی به من سپیردرا. بیگومان پروگرام و پیرەوی ناوخو گرنگییەكی گەورەیان هەیە، پروگرام: ریبازی سیاسی ریكخراوەكه بو چارەسەركردنی كیشەكانی كومەل و، پیرەوی ناوخو: ژیانی ناو ریكخراوەكه ریك ئەخات. لیرەدا سەر له نوی ئەیان نوسمەوە:

بەرنامه

یەكیتیی نیشتمانیی كوردستان خەبات ئەكات بو:

یەكەم - عیراقی دیموكرات

أ. رزگار كردنی عیراق له كوت و زنجیر و پەیوەندییەكانی كولونیالیزمی نوی و له ریژیمی دیكتاتوری دوژمن به گەل و هینانه سەر كاری حكومەتیكی دیموكراتی ئیئتیلافی له نوینەرانی پارتییه سیاسییه پیشكەوتوەكان و چینەكانی گەل و نەتەوە سەرەكی و پچوكەكانی عیراق، تا ولات له ماوەیەكی كورت دا بگویزیتەوە ژیانیكی ئاسایی دیموكرات، كه هەمو سەربەستییه دیموكراتییەكان بو گەل دابین بكا: سەربەستیی

هەلبژاردن، نوسین، فەرهەنگ، دامەزراندنی پارتی، نەقابە، کومەلانی جوتیاران، ریکخراوە دیموکراتیەکانی لاوان، قوتابیان، ماموستایان، ئافرەتان، مافی کوبونەوە، خوپیشاندان و مانگرتن.

ب. پیکهینانی ئەنجومەنیکی نیشتمانی لە ریگەی هەلبژاردنی ئازاد و راستەوخو و نهینییەوە لە لایەن کومەلانی خەلکی عیراقەوە، بو دانانی دەستوری ولات و دارشتنی بناغەی حوکمی دیموکراتی و سەلماندنی ئوتونومی.

ج. بەشدار بونی کورد و نەتەوە پچوکەکان لە ئورگانە ناوەندییەکان دا بە پی ی ژمارەیان.

د. گەراندنەوەی دانیشتوانی ئەسلیی ئەو ناوچانەی لە شوینەکانی خویان بە زور دەرکراون.

هـ. بەرەللا کردنی هەمو گیراوە سیاسیەکان و گیرانەوەیان لە گەل هەمو ئەوانەی لە سەر بیروباوەری پیشکەوتوانە لە کار دەرکراون بو سەر کار و فەرمانەکانی خویان.

و. لابردنی هەمو ئەو یاسایانەی بە گیانی فاشیستی و بیروباوەری کونەپەرستانە دانراون، وە هەلوەشاندنەوەی هەمو ئەو ریککەوتنە ناودەولەتی یانەی کە بە پیچەوانەی ئازادیی گەلەوە کراون.

ز. هەلبژاردنی شارەوانییەکان و دەزگاکانی بەریوە بردن، راستەوخو لە لایەن هاوولاتییانەوە.

دووەم - کوردستانی ئوتونوم *

أ. پیکهینانی هەریمی کوردستانی ئوتونوم لە ناوچەکانی: شەنگار، زمار، سمیل، دهوک، شیخان، تلکیف، بەعشیقە، لیواکانی هەولیر، کەرکوک، سلیمانی و، قەزاکانی خانەقین و مەندەلی.

ب. دەزگاکانی ئوتونومی جگە لە کاروباری پاراستنی ولات، پەیوەندییەکانی دەرەوە، دارایی گشتی کە بە دەس دەزگای ناوەندییەوە ئەبن، هەمو دەسەلاتیکی تری ئەبی.

ج. دەزگای ئوتونومی ئازادییە دیموکراتییەکان بو گەل دابین ئەکات.

د. دانیشتوانی کوردستان، لە ١٨ سالییەوە بەرەو ژور، بە ریگەیەکی ئازاد و نهینی و راستەوخو ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان هەل ئەبژیرن.

هـ. ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان دەزگایەکی بەریوە بردن بو هەلسوراندنی کاروباری هەریمی ئوتونومی کوردستان هەلئەبژیری و، باوەری ئەداتی یا لی ی

ئەسپێنێتەوە.

و. هێزەکانی پولیس، ئەمن، پاسەوانی سنور و پێشمەرگە، ئەبەسترێن بە دەزگای بەڕێوەبردنی ئوتونومییەوە.

ز. بودجەی ئوتونومی پێک دێ لە باجە ناوچەییان و دەرامەتی پرۆژەکانی ئابوری تایبەتی هەرێمەکە و ئەو بەشەی بودجەی گشتیی عیراق کە بە پێ ی ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی ئوتونومی لە چاو هی هەمو عیراق دا دیاری ئەکرێت.

ح. تەئمین کردنی ژیانی خێزانی شەهید و پەککەوتو و لیقەوماوانی شۆڕشی کوردستان و پاراستنی مافەکانی ئەوان و هەمو ئەوانەی بەشداری شۆڕش ئەبن و زەرەریان لێ ئەکەوێ.

ط. هەمو کوردێکی نیشتمانپەروەر بوی هەیە بێتە هەرێمی ئوتونومی کوردستانەوە و کار بکات.

سێیەم - مافی ئاسوری، تورکومان و کلدان

أ. بو ئەوەی لە ناو چوارچێوەی کوردستانی ئوتونوم دا سەربەستیی بە کار هێنان و گەشە پێدانی مافی نەتەوەیی و فەرهەنگیی ئاسوری، تورکومان، کلدان تەئمین بکرێ، بە پێ ی ژمارەیان لە چاو دانیشتوانی هەرێمەکەدا نوێنەریان ئەبێ لە ئەنجومەنی نیشتمانی و دەزگای بەڕێوەبردنی کوردستان دا.

ب. لەو شوێنانەدا کە زورایەتیی دانیشتوانن مافی دامەزراندنی دەزگای تایبەتی خوبەڕێوەبەردنیان هەبێ.

ج. هەمو ئەوانەی دەربەدەر کراون مافی گەڕانەوەیان هەبێ بو هەرێمی کوردستان.

چوارەم - گەشەپێدانی لادێ

أ. چاکردنی بنەرەتیی کشتوکاڵ بە پشت بەستن بە جەماوەری جوتیاران بە جورێکی ئەوتو کە رەگوریشەی پەیوەندییە دەرەبەگی و خێلەکییەکان دەربهێنێ و ئەرز و ئازادی بو جوتیاران تەئمین بکا و ببێتە هوی خەملین و گەشەکردنی لادێ و ژیانی لادێییەکان و ماکیناوی کردنی کشتوکاڵ و پرۆژەکانی ئاڵودان.

ب. دامەزراندنی ئارایی کشتوکاڵی، ئاژەڵی، پیشەسازی بو دروستکردنی مەڵبەندی ئاوەدان و عەسریی ژیان بە کوکردنەوەی چەند گوندێکی پچوک، وە یان دانیشتوانی ناوچەیەک لە دەوری پرۆژەیەکی سەرەکی.

ج. باشکردنی ژیانی شوان و گاوان و خاوەن ئاژەڵەکان و پاراستن و پەروەردە کردن و گەشەپێدانی ئاژەڵ و وڵسات و دیاریکردنی شوێنی کوکردنەوە و لەوەڕاندنیان، چاکردنی

چونایەتی و زورکردنیان، وە دامەزراندنی پیشەسازیی ئاژەلی و پەرەپیدانی خزمەتی بەیتالی.

د. دانانی پلانیکی دریژخایەن بو بین کردنەوەی گوند و شاروچکەکانی کوردستان بە شیوەیەکی وا کە لە گەل پیویستییەکانی ژیانی مروڤی ئەم سەردەمە و تەئمین کردنی خانو و بەرە بو هەمو کەس و جوانی سروشت و ئاووهەوای کوردستان بگونجی.

هـ. بەستنی گوند و شارەکانی کوردستان بە یەکترییەوە لە ریگەی دروستکردنی توری ریگاوبانی ئاسن و ئاسفالت و ریگەی هەواییەوە.

پینجەم - بە دەسهینان و چەسپاندن و گەشەپیدانی سەربەخویی ئابوریی نیشتمانی

أ. بە تەواوی رزگار کردنی سامانی پەترولی عیراق لە چنگ کومپانیا ئیمپریالیستییەکان بە هەلهینجان و پالاوتن و گواستنەوە و فروشتنەوە، دامەزراندنی پیشەسازی پیترو - کیماوی و، پەیرەوی کردنی سیاسەتیکی نیشتمانیی دوربین لە هەلهینجان و فروشتنی پەترول دا کە بە تەواوی بگونجی لە گەل نەخشەی دریژخایەنی گەشەپیدانی ئابوری و کومەلایەتی و فەرهەنگی دا.

ب. نەتەوەیی کردنی بازرگانیی دەرەوە و چاودیری کردنی بازرگانی ناوەوەی ولات و گەشەپیدانی دەزگاکانی بەشی گشتی.

ج. گەشەپیدان و فراوانکردنی بەشی گشتی لە پیشەسازی و دروستکردن و بازرگانی و بانقەکانا لە گەل هاندانی بەشی تایبەتی لە پیشەسازی و پروژە بەرهەم هینەکان دا.

د. دانانی پلانیکی دریژخایەن بو پیشەساز کردنی کوردستان لە ریگەی دامەزراندنی پیشەسازیی کشتوکالی و ئاژەلی و پەرەپیدانی پیشەسازی پەترولی و پیترو - کیماوی و بەهرەوەرگرتن لەو مەعدەنانەی هەن بو دامەزراندنی پیشەسازی قورس و ئەوانەی بو گەشەپیدانی ولات پیویستن.

هـ. دامەزراندنی ئیستگای بەرهەم هینانی وزەی کارەبا لە گوی ئستیلە دەستکرد و تاڤگە سروشتییەکان دا بو کارەباوی کردنی سەرانسەری ولات.

شەشەم - پەیوەندیی نیشتمانی و نەتەوەیی و جیهانی

بو سەرکەوتنی بزوتنەوەی شورشگیرانەی کوردستان لە دارشتنی پەیوەندییە نیشتمانیی و نەتەوەیی و جیهانییەکان دا ی ن ک بە رەچاو کردنی سەربەخویون، دەس وەر نەدانە کاروباری یەکتری، گورینەوەی بیرورا، ئالوگوری یارمەتی و ئالیکاری، خەبات ئەکات بو:

أ. پیکهینانی یەکگرتنی ریزەکانی گەلی کوردستانی عیراق، یەکگرتنی کریکاران و جوتیاران، بورجوازیی پچوک و بورجوازیی نیشتمانیی پیشکەوتو، یەکگرتنی تاقم و پیلە پیشکەوتوە جیاجیاکان لە یەکیتییەکی نیشتمانیی پیشکەوتوی دژ بە ئیمپریالیزم و کونەپەرستی، دژی دەربەدەر کردنی کورد و بە عەرەب کردنی کوردستان، بو بەدیهینانی ئامانجەکانی شورشی نیشتمانیی دیموکرات.

ب. پیکهینانی بەرەی یەکگرتوی هەمو پارتی و ریکخراو و تاقم و کەسی پیشکەوتو و دیموکرات و مارکسیە لینینیەکانی عیراق لە پیناوی روخاندنی حوکمی فاشیستی و هینانە سەر کاری حکومەتیکی دیموکراتی ئینتیلافی، کە دیموکراسی بو عیراق و ئوتونومی بو کوردستان جیبەجی بکات.

ج. پیکهینانی هاوکاری پتەو لە گەل بەشەکانی تری بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا لە پیناوی بەدەسهینانی مافی چارەنوسی دا.

د. پیکەوە گری دانی خەباتی رزگاریخوازانەی خەلکی کوردستان و بزوتنەوەی رزگاریخواز و شورشگیرانەی عەرەب، فارس، تورک، ئازەری، بلوچ و گەلەکانی تر بو شکاندن و دەرکردنی ئیمپریالیزم و زایونیزم و روخاندنی حوکمی چینە کونەپەرستەکانی ناوچەکە، تەواو کردنی سەربەخویی نیشتمانیی سیاسی و ئابوری، وە گەشە پیدانی دیموکراسی لە روژهەلات دا.

هـ. پیکەوە گری دانی بزوتنەوەی خەلکی کوردستان لە گەل بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلانی دنیای سییەم، بزوتنەوەی شورشگیرانەی چینی کریکاری ولاتانی سەرمایەدار و دەولەتە سوشیالیستەکان دا.

## حەوتەم - گەشەکردنی کومەلأیەتی

### أ. ئافرەت

١. رزگار کردنی ئافرەت لە کوت و زنجیرەکانی کونەپەرستیی سەدەکانی ناوەراست و تەئمین کردنی مافی سیاسی، ئابوری و کومەلایەتی یان و یەکسانی تەواو و هاوبەشی یان لە گەل پیاودا، وە دانانی یاسای تەوتو کە مافەکانی ئافرەت لە کارکردن، خویندن، شوکردن، جیابونەوە و میرات دا بپاریزی.

٢. داهینکردنی سەربەستیی دیموکراتی بو بە هیزکردنی بزوتنەوەی ئافرەتان و خستنە گەریان بو گەشەپیدانی کومەلایەتی و سیاسی و ئابوری ولات.

٣. پاراستنی مافی دایک و منال، تەئمینکردنی بە خیو کردنیان و چاودیریکردنی دایکە کارکەرەکان.

٤. تەئمینکردنی کار، یا موچەی بیکاری بو هەمو هاوولاتییەکی ژن و پیاو، وە تەئمینکردنی موچەی خانەنشینی و بە سالا چون و پەک کەوتنیان.

ب. کریکار ←

١. پاراستنی مافی کریکارانی شار و لادی، برینەوەی موچەیەکی گونجاو لە گەل چونایەتی کارەکەیان کە لایەنی کەمی ژیانیکی ئاسودەیان بو تەئمین بکات.

٢. دیاریکردنی ماوەی کارکردنی روژانە بە ٧ سەعات.

٣. تەئمینکردنی مافی دامەزراندنی نەقابە و جوش دانی بزوتنەوەی کریکاران تا دەوری میژویی خوی ببینیت لە ژیانی سیاسی، کومەلایەتی و ئابوری ولات دا.

٤. تەئمینکردنی مافی مانگرتن و خوپیشاندان.

٥. چاک کردنی شەرتەکانی کارکردن و پاراستنی کریکاران لە نەخوشی و مەترسییەکانی کار.

ج. تەندروستی ←

١. زیادکردنی تیمارخانە و نەخوشخانە و دابەشکردنی دکتور و برینپیچ بە سەر ناوچەکان دا، بە پی ی پیویستی ناوچەکان و ژمارەی دانیشتوانیان.

٢. پاراستنی تەندروستی گەل بە تەئمینکردنی تیماریی خورایی و لە ناوبردنی نەخوشییە بلاوەکان.

٣. کردنەوەی خویندنگا و کولیجی پزیشکی بو ئامادەکردنی کادری پیویست.

٤. بایەخدان بە هاوینەهوار و شوینەکانی حەسانەوە بو کومەلانی خەلک.

٥. پاراستنی پاک و خاوینیی مەلبەندی ژیان.

هەشتەم - گەشەپیدانی خویندن و پەروەردە ✱

أ. بە زورکردنی خویندن لە پلەی سەرەتایی دا و ئامادەکردنی ئەو مەرجانەی پیویستن بو ئەوەی هەمو منالیک بتوانیت لە کاتی خوی دا بچیتە خویندنگا.

ب. بە کوردی کردنی خویندن لە هەمو پلەکان دا لە هەریمی کوردستان و پاراستنی مافی نەتەوە بچوکەکان (ئاسوری، تورکومان، کلدان...) لە خویندن دا بە زمانی خویان.

ج. کردنەوەی خویندنگای پیگەیاندنی ماموستایان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دا.

د. فراوان کردن و گەشەپیدانی زانستگای سلیمانی وەکو زانستگایەکی تایبەتی هەریمی کوردستان و بەستنەوەی بە دەزگاکانی ئوتونومییەوە و بایەخدانیکی تایبەتی بە

زمان و ئەدەب و مێژو و فەرهەنگی کورد تیای دا.

هـ. خوێندنی زمان، ئەدەب و مێژوی عەرەب لە هەمو پلەکانی خوێندنی هەرێمی کوردستان دا. وە هەروەها خوێندنی زمان و ئەدەب و مێژوی کورد لە خوێندنگاکانی ناوچەکانی تری عێراق لە پێناوی بەهێزکردنی گیانی برایەتی لە نێوان هەردو نەتەوەی کورد و عەرەب دا.

و. پاک کردنەوەی پایەتەکانی خوێندن لە بیروباوەڕی شوڤێنی و کۆنەپەرستی و ناراست و پەروەردە کردنی قوتابی بە گیانی پێشکەوتنخوازی و برایەتی گەلان و دوژمنایەتی ئیمپریالیزم ، زایۆنیزم و کۆنەپەرستی.

ز. دامەزراندنی ئاکادیمیی زانستی کوردی لە کوردستان، لە کەسانی زانا و شارەزای نیشتمانپەروەر بو سەرپەرشتی کردنی نوسینەوەی مێژوی زمان و ئەدەب و بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی خەلکی کوردستان و ساخ کردنەوە و چەسپاندنی زاراوە زانستیەکان بە کوردی و دانانی شێوەیەکی یەکگرتو بو نوسینی زمانی کوردی.

ح. گەشەپێدانی یەکێتیی نوسەرانی کورد و کومەلی روشنبیرانی کورد و گواستنەوەی بارەگاکانیان بو پایتەختی هەرێمی ئوتونومی و تەشمینکردنی سەربەستیی بیرکردنەوە و نوسین و هەلبژاردنیان.

ط. دانانی ئیستگای رادیو و تەلەفزیونی کوردستان لە ژێر چاودێری دەزگاکانی ئوتونومی دا.

ی. پایەخدان بە سامانی نەتەوەیی هونەری و ئەدەبی و ژیاندنەوە و گەشەپێدانی لا پێشکەوتوەکەی فولکلور و هونەری گەل.

ک. پایەخدان بە هونەری موسیقا و گورانی و وەرزش، وە گەشە پێدانیان بو خزمەتی گەل.

ل. دامەزراندنی دەزگای نوی ی ئوتوی چاپەمەنی لە کوردستان دا کە بتوانێت پیویستییەکانی هەرێمەکە پر بکاتەوە لە روی چاپ و بلاو کردنەوە بە زمانەکانی کوردی و ئاسوری و تورکومانی.

بیرە بنەرەتییەکانی حکومەتی ئیئتیلافی و، چەسپاندنی سەربەخویی ئابوری و، ریکخستنی پیوەندییە نیشتمانی و نەتەوەیی و جیهانییەکان هی مامجەلال و... پایەتەکانی پلورالیزمی سیاسی و فیکری و نەتەوەیی و، گەشەپێدانی لادی و کومەلایەتی هی من و... گەشەپێدانی خوێندن و پەروەردە هی کەمال فواد و فوئاد مەعصوم بو..

وارشتنەوەی ماددەکانی بەرنامە و پەیرەوی ناوخۆ بە کوردی بە من سپێردرا. مامجەلال بە عەرەبی پێشەکییەکی درێژی بۆ نوسی. د. فوئاد مەعصوم بەرنامە و پەیرەوی ناوخۆی کرد بە عەرەبی و، منیش پێشەکییەکەم کرد بە کورد. لە مانگی ئەیلولی ١٩٧٦ دا بڵاو کرایەوە.

*

دەسپێکردنەوەی خەباتی چەکدار: «خطه رزگاری»

مامجەلال پێوەندی لە گەڵ کاک ئارام لە کۆمەڵە و، عومەر مستەفا و عەلی عەسکەری لە بزوتنەوە و، د. خالید سەعید و چەندین کەسی تر دامەزراند بو. بە نامە ئالوگۆری بیروڕای لە گەڵ ئەکردن. یەکێ لەو مەسەلانەی باسی ئەکرا: جۆری دەسپێکردنەوەی خەباتی چەکدار بو.

بۆ ئەم مەبەستە مامجەلال چەندین کۆبونەوەی لە گەڵ ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر و، ئەفسەرەکان و، کادرەکانی تر کرد بو. ڕۆژی ٧٦/٥/١٩ منیش بە یەکجاری ڤییەننام بە جێ هێشت و بە فڕۆکە چومەوە شام، بۆ ئەوەی لەو کارەدا بەشدار بم.

لە زنجیرەی ئەو کۆبونەوانەدا، ڕۆژی ٢٣ - ١٩٧٦/٥/٢٤ کۆبونەوەیەکی ترمان لە شام کرد، عەلی سنجاری و مونذیر نەقشبەندی یش ئامادە بون. مامجەلال پرۆژەیەکی ئامادە کرد بو، لەم کۆبونەوەیەدا باس کرا و، پاش زیادکردنی هەندێ بابەت پەسند کرا. هەروەها بڕیار درا یەکەمین وەجبەی پێشمەرگە ڕەوانەی کوردستان بکرێنەوە و، نامە بۆ هەمو ڕێکخستنەکانی ناو وڵات بنێردرێ کە ئیتر دەس بکەن بە ناردنی مەفرەزەکان بۆ شاخ.

پرۆژەکەی مامجەلال:

اسم الخطة: رزگاری

الهدف: اشعال الثورة مجددا فی کردستان تمهیدا لثورة عراقیة (عربیة - کردیة) تستهدف الدیمقراطیة للعراق والحکم الذاتی الحقیقی لکردستان العراق.

المبادیء الاساسیة:

١. الثورة عمل جماهیری تعتمد علی الجماهیر، لذلك فان مهمتنا الرئیسیة هی استنهاض وتنظیم وتوعیة وقیادة الجماهیر الشعبیة ومراعاة مبدا الاعتماد علی النفس، علی الشعب وطاقاته الخلاقة ومراعاة قواعد حرب الانصار العصریة تمهیدا لتحویلها الی حرب الشعب الثوریة.

٢. الالتحام الکفاحی مع القوی الثوریة العربیة (الممثلة للجماهیر الکادحة) المؤمنة

بحق الشعب الكردى فى تقرير المصير اولا ومن ثم مع القوى الوطنية والتقدمية الاخرى.

التلاحم الكفاحى فى ساحة النضال الفعلى هو الاساس والجوهر والتجمع الوطنى العراقى هو الاطار الوطنى العام.

٣. الالتحام الكفاحى مع القوى التقدمية الكردستانية فى ايران وتركيا والاستعداد لمختلف الاحتمالات باعتبار كردستان وطننا المجزأ وباعتبار ان استنهاض جماهيرها وتنظيمها وتوعيتها هو مهمة مشتركة لجميع الاحزاب الكردستانية التقدمية.

قواعد العمل: *

١. ايجاد وحدات مسلحة صغيرة ومتحركة تتألف من خيرة العناصر الثورية، الواعية والشجاعة، مهمتها الرئيسية فى المرحلة الراهنة هى: الدعاية السياسية، التوعية، التنظيم، التحريض الجماهيرى، رفع معنويات الناس، وحماية الكوادر والعناصر الثورية الهاربة من المدن.

٢. تتجنب هذه الوحدات قدر المستطاع الاصطدام بالقوات المسلحة للعدو حتى تحين اللحظة المناسبة وتدق ساعة الانتفاضة العامة.

٣. تنتقل العناصر الواعية والمقدامة الباسلة الموجودة فى الخارج الى الداخل تدريجيا، وتخلق لها قواعد سرية ومتنقلة، وتوجد ارتباطات واتصالات بالمنظمات الموجودة وتساعد على تنظيم الجماهير حيث لا يوجد تنظيم.

٤. يؤلف الرفاق - فى الداخل - وحدات مسلحة تقوم بنفس المهام فى مختلف انحاء البلاد، وتأمر تنظيمات الداخل رفاقها والعناصر الثورية القريبة منها بالامتناع عن اطاعة اوامر الحكومة بنقلها الى خارج المنطقة بل تلتجأ الى الجبال لنفس الغرض.

٥. ارسال الاسلحة والذخيرة الى الداخل لتوزيعها على الرفاق وخزنها فى اماكن سرية ومخفية.

٦. ايجاد قيادة مركزية موحدة لقيادة وتنسيق فعاليات الوحدات المسلحة فى مختلف المناطق مع مراعاة مبد اللامركزية فى حرب الانصار فى التنفيذ والتكتيك والمركزية فى الخطة العامة والستراتيجية.

٧. تشغيل الاذاعة وتوفير اجهزة لاسلكية واستحصال بعض انواع الاسلحة كالصواريخ المعادية للدروع والطائرات.

بعض المستلزمات الاخر:

١. توفير دعم خارجى سياسى ودعائى - مادى و معنوى.

٢. توفير مقدار من الاموال والذخيرة تكفى لمدة سنة لحرب انصار محدودة ومتحركة.

٣. ضمان مساندة قوى عربية (بعثية وناصرية) على الاقل، فضلا عن التلاحم الجدى مع القوى الثورية العراقية.

المقترحات المضافة:

١. ارسال عناصر قيادية الى الداخل و عنصر الى تركيا.

٢. ارسال بعض اخواننا العرب مع الوجبة الثانية.

٣. السعى لتامين خط الامداد - التموين والذخيرة -

٤. تأمين معيشة الذين يرسلون الى الداخل.

٥. وضع خطة زمنية للوجبات وارسالها الى الوطن.

٦. الانتفاضة يجب ان تعلن وتبدأ من الداخل.

به همان مه‌عنا، مامجه‌لال نامه‌ى بو هه‌مو خه‌ته‌كانى ريكخستنه‌كانى ناو ولات نوسى. داواى لى كردن مه‌فره‌زه‌ى «به چونايه‌تى باش و به چه‌ندايه‌تى كه‌م» بنيرنه شاخ و، تيپى پروپاگانده‌ى سياسى «فرق الدعايه المسلحه» له سه‌رانسه‌رى كوردستان دا پيك بهينن.

سه‌ركردايه‌تى ئه‌م پۆله پيشمه‌رگه‌يه كه بريتى بون له ٣٧ كه‌س و، دابه‌ش كرا بون به سه‌ر ٤ مه‌فره‌زه‌دا، ئه‌بو ئيبراهيم عه‌زيز بيكا. ئيبراهيم له عه‌شيره‌تى گه‌رگه‌رى بو. ده‌رچوى كليه‌ى هه‌ندسه‌ى زانستگاى موسل بو. له سه‌ر حسابى جه‌يش خويند بوى. له سالانى خويندن دا هات بوه ريزى كومه‌له‌وه. كه خويندنى ته‌واو كرد بو به ئه‌فسه‌ر له جه‌يشى عيراق دا، بو ده‌وره‌ى فيربونى ساروخ نيردرا بو سوڤيت و ميصر. گه‌يشت بوه پله‌ى «نقيب مهندس». گه‌نجيكى روشنبير و زيره‌ك و وريا بو. سورانيه‌كى ره‌وان له هاوريكانيه‌وه فير بو بو. روح سوك و قسه خوش و گورجوگول بو. دواى ئاشكرا بونى ريكخستنه‌كانى كومه‌له، ئه‌ميش له گه‌ل ئه‌نوه‌ر شاكه‌لى و ئيبراهيم عه‌بد عه‌لى، له به‌غداوه چوبونه ره‌مادى و به پى له سنور په‌رى بونه‌وه بو سوريا. ئيبراهيم له قاميشلى مابوه بو كارى سياسى و پيشمه‌رگه‌يى له ناو كورده عيراقيه‌كانى ئه‌وى دا.

پيشمه‌رگه‌كانى ئاماده‌كرا بون بو گه‌رانه‌وه، له ناو هيزه‌كه‌ى ئه‌وى دا هه‌لبژيردرا بون و، عيززه‌ت ئيسماعيل شه‌نگارى و، عه‌بدولجه‌بار مه‌لا غه‌نى سندى، عومه‌ر ئيبراهيم ره‌شيد، عه‌بدولره‌حمان حه‌سه‌ن دانرا بون به فه‌رمانده‌ى مه‌فره‌زه‌كانيان. زوريان پيشمه‌رگه يا كادر بون له شورشى ئه‌يلول دا، شاره‌زاى ناوچه‌كانى بادينان و، ئاشناى خه‌لكه‌كه‌ى بون.

مامجه‌لال چو بو قاميشلى بو به‌رى كردنى يه‌كه‌مين وه‌جبه‌ى پيشمه‌رگه‌كان به سه‌ركردايه‌تى ئيبراهيم عه‌زيز به‌ره‌و كوردستان. پيشمه‌رگه‌كان به ورده‌يه‌كى به‌رزه‌وه، كه

ئەتوت ئێچن بو شایی و زەماوەن، خواحافیزییان لە مامجەلال کرد بو.

نەجمەدین بیوکقەیا(نەجو)، کە ئەوسا لە ناو ئیمەدا بە سەلاح ناسراو بو، ئەم پۆلە پیشمەرگەیەی گەیاندەوە کوردستانی عیراق.

*

باسی سەرەتای کارەکانی یەکیتی بی باسی نەجو ناتەواو دەرئەچی.

نەجو سالی ١٩٤٣ لە شاری ئورفای کوردستانی تورکیا لە دایک بوبو. لە سالانی ١٩٦٦-١٩٧١ لە زانکوی ئستەمول خویندکاری زانستگای حقوق بو.

خویندکارانی ناوچە کوردنشینەکانی روژهەلات چەند یانەیەکی کومەلایەتییان لە ئستەمول دامەزراند بو. ئەم یانانە بوبون بە ناوەندی چالاکی سیاسی. هوشی کوردایەتی بوژاندبوە. نەجو یەکی لە هەرە چالاکەکانی ئەم یانەیە بو. ماوەیەک بو بە سەروکی یانە. هەر ئەوسا چوبوە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیاوە.

سالی ٧١ دامەزراوی جەنگیی تورک، بو راگرتنی گەشەکردنی چەپ و سەرکوتکردنی چالاکی کورد، کودەتای کرد و، باری ناناسایی لە تورکیا راگەیاند. ژمارەیەکی زور سیاسی و تیکوشەری تورک و کوردیان گرت. فەرمانی گرتن بو نەجو دەرچو. نەجو چوە کوردستانی عیراق بو لای د. شڤان.

د. شڤان ناوی نهینی د. سەعید قرمزتوپراخ بو. لەو کاتەدا پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا (پ د ک ت) بو بو بە دوبالی چەپ و راست. بالی چەپی د. شڤان و، بالی راستی سەعید ئالچی ریبەرییان ئەکرد. بنکەی هەردوکیان لە کوردستانی عیراق بو. بارزانی بو رازی کردنی تورک سەعید ئالچی کوشت و، بە سەر د. شڤانی دا هینا. ئەو بیانوەوە شڤانیشی کوشت. هەردو سکرتیر کوژران. نەجو و، زور لە تیکوشەرانی تری کوردستانی تورکیا ئاوارە بون. نەجو بو چیکوسلوڤاکیا و، لەویوە چو بو سوید بو بە پەنابەری سیاسی. سالی ٧٤ هەلبژاردن لە تورکیا بو. حکومەتی تورک «لیبوردنی گشتی» بو هەمو ئەوانە دەرکرد کە لەبەر هوی سیاسی گیرا بون یا هەلات بون. نەجو گەرایەوە بو تورکیا. لە گەل هاوریکانی کەوتنە ریکخستنەوەی پارتی. ریکخراویکی قانونی ئاشکرایان بە ناوی دەدەکادە وەکو چەتر بو حیزبەکەیان دروست کرد. نەجو دیسان لە ریزی هەرە چالاکەکانی حیزبە نهینییەکەو ریکخراوە قانونییەکەش بو. هەرزو دیسان فەرمانی گرتنی بو دەرچو.

یەکیتی لە دوای دامەزرانی لە گەل هەمو حیزب و ریکخراوە سیاسیەکانی سەرانسەری کوردستان پیوەندی کرد بو. لەوانە ریکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی

تورکیا. نەجو بە نوینەرایەتی حیزبەکەیان هاتە سوریا. ئەوسا حیزبەکەیان سکرتاریەتیکی ۳ کسی هەبو ئەم یەکیکیان بو.

ناوچە سنورییەکانی کوردستانی تورکیا گرنگیەکی ژیانییان بو یەکیتی هەبو. یەکی لەو پاسانەی کە لەگەل ئەم حیزبەو زور لە ریکخراوەکانی تر کرا هاوکاری سیاسی و، یارمەتیدانی تیکوشەرانی یەکیتی بو گەرانەوە بو کوردستانی عیراق.

هاوکاری نیوان هەردولا بە زویی دامەزرا و بە هیز بو. سەرکردایەتی حیزب، وای ئیدیعا ئەکرد، کە خوی بو شورش ئامادە ئەکا. یەکیتی زور لە پیویستییەکانی بو دابین کردن. ئەوسا ئەوان بوبون بە ریکخراویکی سیاسی گەورەو فراوان. لە پیشەوە بە گەرمی هاوکاری یەکیتییان ئەکرد و، نەجویان تەرخان کرد بو پیوەندی لە گەل یەکیتی. لە دوایی دا خاو بونەوە، خویان لە هەمو جورە هاوکارییەک ئەدزییەوە ئەترسان، وەکو خویان ئەیانوت: یەکیتی تروشی «تەلەکە» یان بکا و، حیزبەکەیان پیش وەخت بەر هیرشی دەزگاکانی تورک بکەوی.

نەجو زورجار ئەهات بو سوریا. چەند جاریکیش بو کاری حیزبەکەی خویان چو بو لوبنان. ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی بە ریبەری ئەم چونەوە بو کوردستان. منیش لە گەل نەجو چوم بو تورکیاو لە دیاربەکر لە یەکتری جیابوینەوە. نەجو لە گەل حەسەن خوشناو چون بو ئەستەمول بو پیشوازی و هینانەوەی مامجەلال بو کوردستان. چەندین وەجبە چەکی لە سوریاوە بە ناو تورکیا گەیاندە دست یەکیتی. کوردیکی راستگو، جوامیر، تیگەیشتو و، هەتا بلی ی ئازاو لە خوبوردو بو. لە گەل سەرکردایەتی حیزبەکەی سەبارەت بە هەلویستی لە یەکیتی و خوئامادەکردن بو شورش و هەندی مەسەلەی تر تیکچو. ئەیتوانی بەشیکی گەورەی ریکخستنەکە لە گەل خوی جیا بکاتەوە. ئیمە لامان وابو تازە خەریکە کوردایەتی لە تورکیا ئەبوژیتەوە. ئەو حیزبە هەلویستی هەرچونی بی لە ئیمە، ئیمە بە چاکی نازانین ریزەکانی تیک بچی. روداوەکانی تورکیا راستیی هەلسەنگاندنەکانی نەجوی سەلماند. نەجو لە دوای کودەتاکەی سالی ۸۱ گیرا و، لە روژی ۲۲ی ئوکتوبەری ۱۹۸٤ دا لە زیندانی دیاربەکر کوشتیان. نەجو کادریکی خاوەن تەجروبەی بە نرخ بو بو کوردستانی تورکیا. مەخابن بەو جورە لە ناوەختا کوژرا..

نەجو بیرەوەرییەکانی خوی نوسیوەتەوە. لە ناو بیرەوەرییەکانی دا بەشیکی زوری بو یەکیتی و قەم تەرخان کردوە. روداوەکانی زور بە وردی نوسیوە، بیروڕای خوی بە رونی لە سەر دەربریون. کە ئەهات بو شام بە زوری میوانی من ئەبو. بەلام نەمئەزانی بیرەوەرییەکانی تومار ئەکا.

نەجمو لە یادداشتەکانی دا سەفەری ری ی هات و نەهاتەی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی و، دوایيتر کوژرانیانی بە دریژی گیراوەتەوە.
لە کوردستانیش ئیتر دەستیان کرد بە ناردنی مەفرەزە و چونە شاخ.

*

نامەکانی لە د. خالیدەوە ئەهات، هەروەها نامەکانی کاک ئارام هەمویان پی یان لە سەر دەسپیکردنەوەی خەباتی چەکدار دائەگرت. د. خالید لە نامەیەکی دا نوسی بوی: «دواکەوتن بە قازانجی دوژمنە، کاتی دەسپیکردن هاتوە...» نامەکان رەنگە لە ئارشیفەکەی مامجەلال دا مابن. لە راستی دا ئیمەش هەمو خومان بو دەسپیکردنەوەی خەباتی چەکدار ئامادە ئەکرد و، من خوم هەر بو ئەو مەبەستە هات بوم بو سوریا.
لە شام چەند کوبونەوەیەک کرا بو جور و کاتی دەسپیکردنەوە. مامجەلال کوبونەوەکانی ریک ئەخست، ئیمەش: د. فوئاد مەعصوم، عەبدورەزاق فەیلی، عادل موراد، مونذیر نەقشبەندی، عەلی سنجاری و، من بەشداریمان ئەکرد.
لە جزیرە چەند مەفرەزەیەک ئامادە کرابون بو گەرانەوە. عەلی سنجاری لە کوبونەوەکان دا هەمیشە پی ی لە سەر ئەوە دائەگرت کە یان ئەو مەفرەزانە نەگەرینەوە بو کوردستان، یان ئەگەر گەرانەوە ئەبی خویان لە ق م بپاریزن و، زور وریا بن، چونکە بە هەمو تواناپەکیانەوە لی یان ئەدەن.
ئەوسا ئیمە باوەرمان نەئەکرد پنەمالەی بارزانی زات بکا چەکدار بنیریتە سەر پیشمەرگە، یا ئەگەر بیەوی دوای ئەو ئاشبەتالەی ئەوان کردویانە کەسانی هەبن بە قسەیان بکەن و، پیشمەرگەیان بو بکوژن. بوچونەکەی عەلی سنجاری لە شارەزایی و ئاگادارییەوە بو، بوچونەکەی ئیمە لە خوشباوەرییەوە بو.
مامجەلال نامەی بو کومەلە و بو خالید سەعید و عەلی عەسکەری نوسی کە دەس بکەن بە ناردنی مەفرەزەکان بو شاخ. لە سوریاشەوە چەند مەفرەزەیەک ئەنیرن بو بادینان. بە تەما بوین ئەوان ناوچەی سوران ئاوا بکەنەوە، ئیمەش بادینان و، بەمجورە هەردو لا یەک بگرینەوە.
سەرەتای مانگی حوزەیران مەفرەزەکانی بادینان بە هوی نەجمو وە بەرەو کوردستان بە ری کەوتن. د. خالید و کومەلەش بە دریژایی مانگەکانی حوزەیران تا مانگی تشرینی دوەم خەریکی ریکخستن و ناردنی مەفرەزەکان بون. دەیان مەفرەزە لە سەرانسەری کوردستان دا بلاو بونەوە.
لە دروستکردنی هیزی پیشمەرگەدا بە دو جوری جیاواز کاریان ئەکرد:

سەرانی کومەلە، پەیوەندییان لە گەل ئەفسـەرە گەنجەکان کرد بو. پیشـمەرگەکانیان بە زوری لە خەلکی شارەکان دروست ئەکرد و ئەیان ناردن بو دەرەوە.

سەرانی بزوتنەوە، دانیشتوانی لادیکان و عەشائیریان ساز ئەدا و، پاش ئەوەی کە خویان چونە شاخ، هیزی چەکداریان لی پیک هینان.

زوری نەخایاند سەدان کەس لە کەسانی ناوداری عەشائیر هاتنە ریزی پیشمەرگەوە. بایزی هەباس ئاغاو کویخاکانی ئاکو، بالەکیان، عەلی حەسەن ئاغا و کویخاکانی مەنگور، مامەش، دولی جافەتی، شەپکایەتی، بە کومەل هاتنە ریزی پیشـمەرگەوە. هیزیکی گەورەیان پیک هینا. دەیان بارەگایان دانا. مەفرەزەکانی کومەلە لە چاو ئەوان دا بو بون بە کەمایەتی.

یەکیتی بە بونەی دەسپیکردنەوەی خەباتی چەکدارەوە بەیانیکی بە ناونیشانی «النصر للثورە العراقیە المندلعە فی جبال کردستان» بلاو کردەوە. بەیانەکە مامجەلال نوسی بوی. لەو کاتەدا من لە دیرکی بوم.

ئەمـە پەژارەی بو قم و بو بەعس دروست کـرد. هەردولایان بە خـو کـەوتن قم بو تیکدانی و، بەعس بو کوژاندنەوەی.

قم لە تەهرانەوە جەوهەر نامیق و کەریم سنجارییان بو ناوچە سنورییەکانی تورکیا و، محمد قادر (کەمال کەرکوکی)، شیرکوی شیخ عەلی سەرگەلو، فاضیل جەلال (عادل) یان ناردە ناوچەکانی سوران. کاری سەرەکییان تیکدانی شورشەکە بو.

کەمال و شیرکو و فاضیل، بە پارە و مەسئولیەت، سەدان کەسیان هەلگیرایەوە و، هەندی ناوچەیان بە تەواوی تیک دا. چەندین کـەسی وەکو فـەقی سمایلی باخیان، ستاری سەعید خەلەف، عەبدولەلیکیان هەلگیرایەوە و، لە هەمان کات دا دەستیان ئازاد کردن چون لە گەل خەلک رەفتار ئەکەن بیکەن. بەمەش خەریک بو چارەی پیشمەرگەی نوی بە تەواوی لە بەرچاوی خەلک ناشیرین و دزیو بکەن.

جەوهەر نامیق و کەریم سنجارییش، مەفرەزەکانی بادینانیان تەفروتونا کرد.

حیزبی بەعسیش، بە ئاشبەتال ئەوەندە بایی بوبو، لای وابو جاریکی تر شورشی کورد نابیتەوە. لە سەرەتادا مـەسـەلەکەی بە هەند نەگرت. تەنانەت صـەددام جاریکیان لە باسی گفتوگو دا لە گەل مامجەلال بە جورج حەبەشی وت بو: «جەلال دارخورما لە سەری ئەرویی بەلام جاریکی تر ناتوانی حەوت کەس بنیریتە شاخ».

لە حوزەیرانی ٧٦ موە تا مارتی ٧٧ جەیشی عیـراق هیچ لەشکرکیشـییەکی ئەوتوی نەکرد و، هیچ پەلاماریکی گرنگی پیشـمەرگە و بنکەکانی نەدا. پیشـمەرگەش

هیشتا له قوناغی خوسازدان دا بو له بەر ئەوە خوی له پەلاماردانی هیزەکانی حکومەت لا نەدا.

سەرکردایەتی بەعس له پیش بەهاردا بە چەند حەفتەیەک کەوتە خوسازدان و دانانی نەخشەی پەلاماردان. ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی راسپیردرا شورشی ئەمجارەی کورد بکوژینیتەوە.

*

کیشەی ق م

کە ی ن ک دامەزرا ئەوسا بارزانی و سەرانی پارتی له تیهران بون. بارزانی له چەند جیگا بە ئاشکراو بە نهینی ئەیوت: دەوری ئەو تەواو بوە. زەرفی دەولی خراپە. کورد ناتوانی و نابی هیچ بکا.

پارتی هیچ چالاکیەکی نەمابو. بەشی له ئەندامەکانی کومیتەی ناوەندی و، سکرتیری حیزب، گەرابونەوە عیراق. هەندیکی تریشیان له تیران بون. ئاشبەتال بوشاییەکی سیاسی گەورەی له جولانەوەی کوردا دروست کرد بو. کە یەکیتی دامەزرا ئاسویەکی روشنی بو تیکوشەرانی کورد کردەوە. زوری پی نەچو یەکیتی پەرەی سەند. ریکخستنی له سەرانسەری ئەوروپا دامەزراند. بەشیکی زوری ئەوانەی پەنایان برد بوە بەر سوریا ریکخران. پیوەندی له گەل هەندی له کادرە چالاکەکانی له ئیران بون دامەزران. هەندی له ئەفسەر و کادرە سیاسیەکان له ئیرانەوە بە فروکەو هەندیکیان بە پی بە ناو تورکیادا هاتنە سوریا.

جموجولی یەکیتی ساواکی سلەماندەوە. ترسان ئەو بوشاییە سیاسیەی بە ئاشبەتالی بارزانی و سەرانی پارتی دروست بوە، بە ریکخراویکی چەپی دژی ئیران پر ببیتەوە. بە تایبەتی یەکیتی له سەرەتاوە بە هیرش بو سەر شا و رژیمی ئیرانی دەستی پی کرد. بارزانیش ئەترسا سەرکردایەتی له دەس دەربهینری. چەند جاری ئیدریس هەوالی بو مامجەلال و سەرکردایەتی یەکیتی ئەنارد: «کە ئەگەر شورشیان پی نەکری، شورشیان پی تیک نەدری» داوای له سەرانی یەکیتی ئەکرد جموجول نەکەن.

بنەمالەی بارزانی بە هاوکاری ساواک کەوتنەوە خوریکخستنەوە.

یەکەمین چالاکیان ئەوەبو له دەورو بەری گرتنی کونگرەی کومەلەی خویندکاران دا طارق عەقراویان بە پارە و بەیانەوە ناردەوە بو ئەوروپا. طاریق له گەل خوی مسودەی بەیانیکی کالوکرچی هینابو بە ناوی «ولقی دەرەوە» ی پارتیەوە بە عەرەبی نوسرابو. هوی شکستی شورشی کوردی گیرابوەوە بو «عامیلی جوغرافی مەشئوم». دوای ئەوە ئیتر

بنەماڵەی بارزانی بە ناوی قم دوە کەوتە چالاکی. تیهران ریگای سامی دا بیتە ئەورووپا سەرپەرشتی ریکخستنەوەی پارتی بکا. سامی بە موافەقەتی بنەماڵەی بارزانی سەرکردایەتیەکی بو پارتی دروست کرد بو بە ناوی قم دوە بریتی بو: لە ئیدریس و مەسعود، جەوهەر نامیق، عارف تەیفور، کەریم سنجاری، محەمەد حەمە رەزا، ئازاد خەفاف، ئازاد بەرواری، غازی زیباری، وریا سەعاتچی، فاضیل جەلال، ئەورەحمان بیداوی، کمال کەرکوکی، شیرکوی شیخ عەلی...

ئەمانەیان دابەش کرد هەندیکیان بو تورکیا، هەندیکیان بو ئەورووپاو، هەندیکیان بو کوردستانی عیراق. ئەرکی سەرەکیهان دوژمنایەتی یەکیتی و تیکدانی کارەکانی یان وردتر وەکو ئیدریس وتبوی: «تیکدانی شورش بو مادەم خویان پیهان ناکری».

راستیەکەشی قم گیروگرفتیکی راستەقینەو گەورەی بو یەکیتی دروست کرد بو لە هی عیراق و تیهران و تورکیا گەورەتر بو. ئەمان بە ناوی پارتی پیشرەو و هەلگیرساندنەوەی شورشەوە کاریان ئەکرد و، ناوبانگی بارزانی و پارتی و شورشی کوردیان بەکار ئەهینا بو دوژمنایەتی یەکیتی.

١. جەنگی پروپاگاندەیان دژی یەکیتی و سەرکردەکانی بە تایبەتی مامجەلال دەس پی کرد.

٢. لە سەر سنوری تورکیا کەوتنە چالاکییەکی زور بو هاندانی عەشیرەتەکانی ئەوی دژی یەکیتی و، بو ریبرین لە هاتوچوی تەتەر و پیشمەرگەکانی یەکیتی.

٣. باوەرپیکراوانی خویان ناردە ناو ریزی پیشمەرگە و ریکخستنی یەکیتی بو کلور کردن و تیکدانی لە ناوەوە.

٤. ئەندامەکانیان فیر کرد بو بی شەرم و شورەیی هاوکاری لە گەل دەزگا موخابەراتییەکانی ناوچەکە: ساواک، میت، موخابەراتی سوری.. بکەن بو پاراستنی خویان و زماندان لە ئەندام و دوستەکانی یەکیتی.

٥. هەلگیرانەوەی کادر و پیشمەرگەی یەکیتی لە کوردستان بە پارە و پلەی مسئولیەت و، ئازادکردنی دەستیان بو ئەوەی چییان بوی بیکەن.

٦. راسپاردنی کادرە عەسکەرییەکانیان بو درستکردنی مەفرەزەی تایبەتی سەر بە ئیستیخباراتی عەسکەری عیراق بو راوی پیشمەرگە.

سوریا بو یەکیتی گرنگییەکی زوری هەبو. بنکەی کوبونەوەی کادر و پیشمەرگەکانی دەرەوەی بو. سەرچاوەی چەک و تەقەمەنی بو. جیگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئورگان و بلاوکراوەکانی بو. بەلام لە بەر ئەوەی سنوری عیراق و سوریا

وا نامەیەکم بە هوی ئیوەوە بو کاک ئیدریس و کاک مسعود هنارد هیوام وایە پی یان بگەیەنیت و ئومیدیشم زورە کە ئیوەش هوی چاکە و خیر بن لە نیوان دا.
بە راستی رەفتار و کرداری تاقمی کەریم سنجاری و جەوهەر نامیق لە تورکیا گەیشتوتە رادەیەک چیکە خومان پی ناگیری لە عاستیان دا. ئەمە شەری براکوژیە. ئەمە ئیملاتی حەربە لە سەرمان.
ئیمە ئەمانەوی دژی بەغدا شەر بکەین، شورش بکەینەوە، بویە هەمو کوردیکی دلسوز ئەبی یارمەتیمان بدات. ئەوەی کوسپ بخاتە ئەم ریگەیە، بەربەرەکانی بکات، هەر تەنها خزمەتی ئەم پلانە ئیمپریالیستیە - شوڤینیە ئەکات کە شورشەکەی دوایی پی هینا.
جا هیوام وایە کە توش لە گەل کاک مسعود قسە بکەیت کەوا: خیلافی سیاسی ئیواغمان نەکەنەوە شەری براکوژە، یا بە ریگەی سیاسی، ریگەی نوسین و رەخنە و، پەنا بردنە بەر جەماهیری گەل لایەلا بکەین. ئەم جورە کردەوانە کە راستەوخو بە یارمەتی تورکیە و لە بەر چاوی کاربەدەستانی تورانی ئەکریت ریسواکردنی زوری تی ناچیت، بەلام ئیمە نامانەوی بگاتە ئەم رادەیە بویە تکای زورم هەیە لە سەرەتاوە چارسەری ئەم مسئلەیە بکەن بە مەنع کردنی تاقمەکەی تورکیا لە بەرهەلست کردنی هاتوچوی خەلک بو لامان، لە ماوە دان بە پەناهەندەکانی دین بو لامان لە ئیرانەوە، لە بەرەللا کردنی ئەوانەی گرتویانن، لە ریگە نەگرتن لەوانەی هاتوچوی لای ئیمە ئەکەن لە بادینانەوە. چونکە ئەمە دەوری ژەندرمەی تورکی و شورتەی عیراقە.
بو میژو، بو دواروژ، ئەم نامەیەتان پیشکەش ئەکەم وە ئەتانخەمە رو لە گەل مسئولییەتی میژویی دا.

هەر خوش بن — برای دلسوزتان

مام جەلال

- نامەی دوەم:

١٩٧٦/٨/١٤

برایانی بەریز: کاک ئیدریس و کاک مسعود

سلاویکی گەرم

هیوام وایە ساغ و سەلامەت بن.

لەم زروفە نالەبارەدا کە گەلەکەمان پی ی دا تی پەر ئەبیت زور بە پیویستم زانی

لەم ڕاستییانەی خوارەوە ئاگادارتان بکەم وە بتانخەمە بەردەم مەسئولییەتی مێژوویی خۆتان.

دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی گەلەکەمان و هێنانەوە جۆش و خرۆشی هێزەکانی شۆڕشی کوردستان بوو. لە پاش ماوەیەکی، لە چاو خۆی دا کەم، توانرا کە خۆ سازدان بۆ دەستکردنەوە بە شەڕی پارتیزانی و بەشێوەی نوێ بگاتە ڕادەیەک بتوانرێت سەدان پێشمەرگە ئامادە بکرێن لە وڵات داو، سەدانیش لە دەرەوە. ئەوانەی دەرەوە زووتر بۆ یارمەتی دان و یارمەتی گەیاندن بە هەڤالانی ناوەوەیە، ئەگینا شۆڕش وەک هەمو جۆرە خەباتێکی تر هەر لە وڵات ئەکرێ.

هەڵسانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەم فەرمانە مێژووییەی خۆی جێگەی بایەخی هەمو دڵسۆزێکی کورد و کوردستانە وە لە لایەن زۆربەی زۆری گەلەکەمانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێ ئەکرێت، بە تایبەتی سەبارەت بەو دواهێنانە بێ جێ و ڕێ یەی سەرکردایەتی شۆڕش بە خەباتی سیاسی و عەسکەری هێنا، هەروەک لە ئازاری ٧٥ بە تصریحاتی تەلەفزیونی و صحفی جەنابی بارزانی بۆ ڕۆژنامەی ڕستاخیز بە سەربەستی دەرتان بڕی. جا لەم کاتەدا دو مەسەلە خۆیان قوت ئەکەنەوە لە بەرامبەرمان دا:

یەکەمیان، ئەمەیە کە هەمو هێز و تاقم و کوردێک ئەبێ هەڵوێستی خۆی دیار و ئاشکرا کات بەرامبەر بەم هەوڵەی تاقمێک لە ڕوڵە جوامێرە لە خۆبوردووەکانی کوردستان ئەیدەن دژی حوکمی فاشیستی بەغداد و ئەو پلانە ئیمپریالیستیەی دژی کوردایەتی گێردرا. ئەوانەی یارمەتی ئەم خەباتە تازەیە ئەدەن دڵسۆز و کوردپەروەرن و، ئەوانەی دژی ئەوەستن، دژی کوردایەتی ئەوەستن، دژی ژیاندنەوەی شۆڕش و بەربەرەکانی «تعریب و تشرید» ی گەلەکەمان و لە ناوبردنی کوردایەتی ئەوەستن، لە ڕیزی حوکمی بەغداد و پلانە ئیمپریالیستیەکەدان.

دوەمیان، ئەمە کە پەیوەندی نێوان ئێوە و یەکێتیی نیشتمانی چۆن ئەبێت؟

هەروەک لە سەرەتاوە بە نامە بۆ کاک مەسعود نوسراوە و چەندین جار بە زار و بە ڕاسپاردەش عەرزتان کراوە ئێمە لایەنگری یەکێتیی ڕیزەکانی گەلی کوردین لە سەر بناغەیەکی: نیشتمانیی و پێشکەوتو دژی ئیمپریالیزم و فاشیست و صەهیونیەتی ئیسرائیلی و سەنتۆ و هێزە کۆنەپەرستەکانی خۆماڵی. وە زۆر هەوڵیشمان لە گەڵ ئێوە داوە. ئێستەش بەم نامەیە بە ناوی یەکێتیی نیشتمانییەوە عەرزتان ئەکەم کە:

١. بۆ هاوکاری سیاسی هەر تەنها یەک تاکە شەرتمان هەیە ئەویش پچڕاندنی

---

پەیوەندییە لە گەڵ ئیمپریالیزم (بە تایبەتی ئەمەریکا) و صەهیونیەتی ئیسرائیلی و سەنتۆ. واتە یەکگرتنێکی نیشتمانی و پێشکەوتوی کوردایەتی مان گەرەکە و بەس.

٢. بو هاوکاری له کوری شەری پیشمەرگانەدا کە دەستمان داوەتی ئیمە ئامادەین له گەل هەمو کەس و هیز و تاقم و حیزبیک هاوکاری بکەین کە ئامادەی هاوکاری بیت، بەو شەرتەی رازی بیت لە سەر پروگرامی (التجمع الوطنی العراقی) کە خەباتەکە لە ژیر ئالاکەی دا ئەکریت.

برایانی بەریزا

ئەوەی جیگەی داخە ئیوە تا ئیستا وەرامی هیچ نامەیەک یا وتاریکی ئیمەتان نەداوەتەوە بە شیوەیەکی سیاسییانە و ئاشکرا. بەلکو وەرامەکەتان بریتی بو لە پروپاگاندەیەکی شەڕەوی زور توندوتیژ دژی یەکیتیی نیشتمانی بەگشتی و دژی شەخسی من بە تایبەتی.

ب. ناردنی تاقمیک کەس لە (پاراستن) بو تورکیە تاکو بە هاوکاری لە گەل پولیسی تورک و موخابەراتی تورکی هەرچی ئەتوانن دژی شورشی کوریەی کوردایەتی لە کوردستانی عیراق دا بیکەن وە بو بلاوکردنەوەی هەمو جورە پروپاگاندەیەکی نارەوا دژی یەکیتیی نیشتمانی.

ئیستە تاقمەکەی کە لە تورکیان بە ئاشکرا و بە بەرچاوی سلطاتی تورکیەوە بە دەوری: مەنع کردنی خەلک لە هاتن بو سوریە لە ئیرانەوە، هەلئەسن، مەنع کردنی پیشمەرگەی کوردستانی سەر بە یەکیتی لە چونەوە عیراق، وە یان پەیوەندی کردنەوەیان لە گەل براکانیان لە سوریە، گرتن و راونانی ئەو مەفرەزانەی هاتوچو ئەکەن لە نیوان سوریە و عیراق دا.

بیگومان ئەم کارەش راستەوخو بە پیچەوانەی کوردایەتی و خزمەت کردنە بە دوژمنەکانی، بویە هیوامان وایە بە ئەمری ئیوە نەبیت و بە ئاگاداری ئیوە نەکرا بیت.

نمونەیەکی زیندوی ئەم کارە گرتنی ٨ هەڤالی چەکداری هیزی پیشمەرگەی کوردستانە کە لە بادینانەوە ئەهاتنەوە بو سوریە بە کاری گرنگ. وە ئەشکەنجە دان و ئەزیەت دانیان بە شیوەیەکی درندانە. ئەم رووداوە لە ٧/١٦ دا لە دی یەکی قشوریەیان قەوماوە.

- ناردنی عەناسیری پاراستن بو ناو ریزەکانی یەکیتیی نیشتمانی لە سوریە بو گیرەشیوینی کردن وە تیک دانی ریزەکانی و دەنگوباس گەیاندن بە دوژمنانی گەلەکەمان. بویە تەلیم دوژمنانی گەلەکەمان - نەک هەر بە ئیوە چونکە خوتان ئەزانن کە پاراستن لە سەر دەستی موخابەراتی ئیسرائیلی و جیهانی تر تەدریب کراوە بویە دور نیە بگرە و زور نزیکە نوکەرانی ئیمپریالیزم و ئیسرائیلی تی دا خزا بیت وە خەبەر بە دوژمنانی گەلەکەمان

بکەینن.

برایانی بەریز!

ریگەی خەبات و شورش لە کەس نەگیراوە و کەسیش ناتوانی بیگریت. ئەگەر ئیوە ئەتانەوی شورش بکەنەوە خو ئەوا دەستی پی بکەنەوە و، ئیمە هیچ ریگەمان لە ئیوە نەگرتوە. ئەگەر تاقمەکەی ئیوە لە تورکیە گەرەکیانە شورش بکەنەوە فەرمو با بیکەنەوە و ئیمەش هیچ کوسپمان بو دروست نەکردون، تەنانەت ئەمانەی لە سوریەوە گەرەکیانە بچنە لایان ئیمە لە کوبونەوەی گشتی داوایان لی ئەکەین بچن و یارمەتیشیان ئەدەین بررن بو لایان وەک یارمەتی بورهانی برای جەوهەر نامیق مان دا.

برایانی بەریز!

ئەو کردەوانەی تاقمەکەی ئیوە لە تورکیە لای ئیمە ئیعتیبار کراوە بە اعلانی حرب لە سەرمان واتە دەستکردنەوە بە شەری براکوژی لە دوای راکردن لە شەرکردن لە گەڵ دوژمنان بویە داواتان لی ئەکەین هەلویستی خوتان بە رونی و ئاشکرا دەربرن: گەر ئەم کارە بە ئەمری ئیوەیە ئەوا ئوبالی شەری براکوژە ئەکەویتە ئەستوتان، ئەگەر بە ئەمری ئیوە نیە ئەوا ئەبی دەستبەجی (حدیکی جدی) یان بو دانین و ئەمریان بدەنی کە برایانی ئیمە بەرەڵلا کەن وە واز بینن بە نیهانی لە هەلسان بە دەوری ژەندرمەیی لە گرتن و مەنع کردنی خەلک لە هاتوچون بو لای ئیمە. ئەگینا یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان ناچار ئەبیت هەلسیت بە واجبی مقدسی (دفاع عن النفس) و ئاشکرا کردنی ئەم راستیە بو گەلەکەمان لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستانی عیراق و بو رەئی گشتی روژهەلات و دنیا.

ئەم نامەیە تکایەکی دلسوزانەی برایانەیە بو بەربەستی کردنی هەلگیرساندنی شەری براکوژە لە ناومان دا بو ئەوەیە کە ئەو خیلافە سیاسیانەی نیوان هەردولا بخریتە قالبی سیاسی و دیمانی خوی بە شیوەی رەخنە و رەخنە لە خو گرتن و حواری علنی لە بەرچاوی جەماوەری گەلەکەمان بکریت، نەک بە شیوەی بە گژ یەکا چونی عەسکەری و یەکتر کوشتن و هەولدان بو ئیغتیال کردنی سەرکردەکانی هەردولا.

برایانی بەریز!

هیوام وایە نامەکەم بخەنە چوارچیوەی سیاسی خویەوە نە پارانەوە و نەیە هەرەشەی ندەنە قەلەم، بە گفتوگویەکی صریح و بی پیچوپەنای بدەنە قەلەم.

دیسان بانگی ویجدانتان ئەکەم کە دەسکەوتی گەلەکەمان، دەسکەوتی شورشی کوریە و تازەمان، بخەنە سەر هەمو شتیکی تایبەتی. فەرمون بو یەکیتییەکی نیشتمانی پیشکەوتو لە نیوان هەمو هیزەکانی کوردستان و عیراق دا، فەرمون بو هاریکارییەکی

جدی بو ژیاندنەوەی شورش و خەبات دژی حوکمی فاشیستی بەغدا، شان بە شانی هەمو هیزە پیشکەوتوەکانی عیراق، فەرمون بو برایەتی نەوەکا بو شەری براکوژە.

بە هیوای وەرامیکی نوسراو لیتانەوە بە خواتان ئەسپیرم

براتان جەلال تالەبانی

ئاگادرای: لە دوای سەری مانگەوە خومان بە سەربەست ئەزانین لە وەرامدانەوەی رەفتاری تاقمەکەی کەریم سنجاری - جەوهەر نامیق لە تورکیە بە هەمو شیوەیەکی سیاسی، دیعائی،... و هتد. بویە تکایە هەرچی ئەیکەن پیش ئەو ماوەیە بیت.

*

لە جزیرە

چەندین هەزار کوردی عیراق بە تایبەتی خەلکی دهوک، زاخو، تەلعەفەر، سمیل، شەنگار، شیخان دوای ئاشبەتال رویان کردبوە سوریا. ئیلە کوردەکان لەو ناوچەیەدا لە هەر ۳ لای سنوردا لە کونەوە لە گەل یەک پیوەندییان هەیە. لە سەردەمی میرایەتی جزیرەدا، هەندی لە ناوچە کوردنشینەکانی سەر سنوری ئیستای سوریا و عیراق تا شەنگار بەشی بوە لە قەلەمرەوی میری بوتان.

ئەوانەی پەری بونەوە سوریا بە زوری لە گوندەکانی جزیرە دانیشت بون. زوریان لە ناو خزم و ئیلەکانی خویان دا جیگیر بوبون. زوریان بە خیزانەوە هات بون. هەندیکیان پیشمەرگە و هەندیکیان هاوولاتی بون. سوریا ریگای لی نەگرتبون، بەلام وەزعی قانونییان دیاری نەکرا بو. بە «پەنابەری سیاسی» دانەنرا بون. دەزگایەک هەبو بە ناوی «مکتب شوون العراق» سەر بە حیزبی بەعس ئەو سەرپەرشتی ئەکردن. کاغەزی هاتوچوی ئەدانی.

*

د. مەحمود عەلی عوسمان یەکی بو لەوانەی بە دلسوزی خزمەتی شورش و مەلا مستەفای کرد بو، لە سەر ئاشبەتال لە مەلا جیا بوەوە. ئەو کاتەی لە تیهران بو لە گەل مامجەلال نامەیان ئالوگور ئەکرد و بە تەلەفون قسەیان ئەکرد. پاش ماوەیەک بە مالەوە هاتە دیمەشق. شەمسەدین موفتی و عەدنان موفتی و قادر جەباری پشی لە گەل هات. ئەمان خویان دەستەیەکی هاوبیرو باوەر بون. د. مەحمود ئامادەیی خوی دەربری بیتە ناو یەکیتییەوە، بەلام ئەیوت لە بەر ئەوەی ئیلتیزامی لە گەل شەمسەدین و قادر هەیە ناتوانی دەستیان لی هەلبگری و، خوی بە تەنیا بیت. لە ناو دەستەی دامەزرینەر و هەندی لە کادرانی دەرەوەشتودا هەبون حەزیان لە چارەی شەمسەدین نەئەکرد و، قادریشیان بە

پیاویکی بەدناو ئەزانی. ئەم تاقمەیان هان ئەدا بینە ناو یەکیتییەوە.
د. محمود بە هاوکاری لە گەل هاوریکانی «اللجنه التحضریه للحزب الدیمقراطی الکردستانی» یان دروست کرد، بەو هیوایەی کادر و ئەندامەکانی پارتی لە خویان کو بکەنەوە و، سەرلەنوی پارتی ریک بخەنەوە.
یەکی لە کارە هەرە گرنگ و میژوییەکانی ئەم کومیتەیە بلاو کردنەوەی نامیلکەیەک بو بە ناوی «تقییم مسیره الثوره الکردیه وانهیارها والدروس والعبر المستخلصه منها» و، بلاوکردنەوەی حسابی داهات و خەرجی شورش و، پارەی پاشەکەوت کراو بو. تا ئەوسا کەس نەیئەزانی لە کوبونەوەی شا - بارزانی دا چی وتراوە و، حسابی جولانەوەکە چون بوە.
بنەمالەی بارزانی زور بە خو کەوتن. قیادەی موەقەتەیان دامەزران. پارتی بو بو بە حیزبی ئەم بنەمالەیە، کادرو ئەندامەکانی پارتی لە ق م کوبونەوە و، کەسیکی ئەوتو لە د. محمود و کومیتەی ئامادەکردن کو نەبوەوە.

*

دوای گەرانەوەی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی بو کوردستان ئەبو من بچم بو ناوچەی جزیرە و، وەجبەی دومەمی پیشمەرگەکان بنیرمەوە بو کوردستان. لە وی من «دیرکی» م هەلبژارد بو شوینی مانەوم.
دیرکی ناحیەیەکی بچوکی ناوچەی جزیرەیە. زوری ئەو پیشمەرگانەی یەکیتی ریکی خست بون لە دیرک و گوندەکانی دەوروبەری دانیشت بون. دیرک کەوتوتە ناوچەی ۳ سنوری عیراق و تورکیا و سوریا. لە نزیک ئەوی چەمی فیشخابور تیکەلاوی روباری دیجلە ئەبی. ناوچەیەکی دەشتاییە. چاندنی دانەویلە بەروبومی سەرەکییانە. ئاژەلداریش ئەکەن. حکومەتی سوری ناوی دیرکی کرد بو بە «مالکیە» هەروەها ناوی کوردی هەمو گوندەکانی گوری بو بە ناوی عەرەبی.
چند مانگی بو چوبومە دیرک. لەوی بارەگایەکم دانا بو. هەندی لە پیشمەرگە سورانییەکانیش لەوی بون. لەوەش چند مەبەستیکم هەبو:
- شارەزای پیشمەرگەکان ببم و بیانناسم.
- ئەویمان کرد بو بە بنکەی گویزانەوەی چەک لە ناو تورکیاوە بو سەر سنوری عیراق.
- ریگای هاتوچو بو ناو عیراق بدوزمەوە.
قم دەوریکی زور خراپیان هەبو لە تیکدانی ریزەکانی پیشمەرگەکان و، تەنانەت لە

رەفتاری سپاسپیان دا. فیری هەلاتن و تفەنگ فراندن و دوورویی و دوزمانیی و جاسوسیان ئەکردن. ئەیانویست گومان و بی بروایی لە ناو ریزەکانمانا بلاو بکەنەوە.

*

بارەگاکەمان لە دیرکی خانویەکی لە قور دروستکراو بو، لە کولانیکی قیرتاو نەکراودا. دیرکی شاریکی پچوکی دواکەوتوی پشت گوی خراو بو. چەردەیەکی زور چەکی جوراوجور و، مین و، تی ئین تی، تی دا هەلگیرا بو. ئەترسام، دەستی تیکدان، ئاگر لە خانوەکەمان بەر بدات یا شتی بتەقینیتەوە و، مالەکەمان ئاگر بگری و، ببیتە هوی تەقاندنەوەی هەمو گەرەکەکە. ناوچەکە زور نزیک بو لە عیراقەوە. قیادەی مووەقەتەش کنەی لە هیزەکەمان دا کرد بو. ناو بە ناو پیشمەرگەمان رایان ئەکرد بو تورکیا و چەکیان ئەفراندین. لە بەر ئەوە بو ئیشکی مالەکە ناچار بوم زور بە وریایی پیشمەرگە هەلبژیرم و، تەنیا ئەوانەم دائەنا کە زور لی یان دلنیا بوم.

بارەگاکەمان دو کەسی خوشی لی بو، نمونەی دو کەسایەتی جیاواز بون: مامە زەبیا و یونس. مامە زەبیا دیان و، بە ریچەلەک تیاری بو. ماوەیەکی دریژ پیشمەرگایەتی کرد بو. خواردنی بو دروست ئەکردین. یونس خوشناو بو خەلکی شەقلاوە بو. ژمارەیەکی زور رادیو شکاوی کو کرد بوەوە، گوایە پارچەکانی بە کار ئەهینان بو چاکردنی رادیو و ریکوردەری تر. بی ئەشچو هیچ شارەزاییەکی، لەم پیشەیەدا، هەبوبی. زور رادیوی خراپ کرد. جەماعەت کەرستەیەکیان دەس کەوت بو خویانی پیوە خەریک بکەن. یونسیان هەلئەدا و لە گەل مامە زەبیا بە شەریان ئەدان.

لە منالیمەوە حەزم لە پەروەردەکردنی گول و، راگرتنی مەل و، گیان لە بەر، ئەکرد. ئەمانە لەو سەرگەرمیبیانەی من بون، کاتی بیکاری و بەتالیم پی بەسەر ئەبرد و، حەسانەوەی دوای ماندبونیان پی ئەبەخشیم. لە حەلەب چەند کەویکی تورم کری و، لە گەل خوم بردمەوە بو بارەگاکەی دیرکی و، لەوی دامنان بە هیوای ئەوەی بە شینەیی کەویان بکەم. بو کاریکی پیویست ئەبو بچم بو قامیشلی. کەوەکانم بە یەکی لە پیشمەرگاکان سپارد تا خوم ئەگەریمەوە ئاگای لیان بی. چەند روژی لە قامیشلی گیر بوم. کە گەرامەوە کەوەکان نەما بون. پرسیم: «چییان لی هاتوە؟» وتیان: «پشیلە خواردویەتی».

زورم پی ناخوش بو بەو هەمو پیشمەرگەیە نەیانتوانی بو چەند کەوی لە پشیلە بپاریزن. زوری لە سەر رویشتم و، زورم توانج و تەشەر لی دان. سەرەنجام یەکیکیان درکاندی کە پشیلە کەوەکانی نەخوارد بو، بەلکو کوریک سەری بری بون، ناوی رەئوف بو. زور زیاترم پی ناخوش بو، چونکە: یەکەم، نائەمینی و بی زەوقی رەئوفی ئەگەیاند و،

دوەم، شاردنەوەی رووداوەکانی ناو ماڵەکە لە من، بە رەفتارێکی نا دروستم ئەزانی.

رەئوف خەڵکی دوبزی لای کەرکوک بو لە ئێرانەوە هات بو. بو هەندی کاروبار ناردمانە ناوچەی هەکاری لە تورکیا. لە دێ یەک مایەوە و، ئیتر لەوێ جێگیر بو.

لە گەڵ خوم جوتێ پێڵاوی شاخەوانی ئەمسایم برد بو. چەرمەکەی ئەستور بو، ناوبەناو پێویستی بە چەورکردن هەبو. تەوپێکی کرێمم لە تاقێکی ژوورەکەم دا دانا بو. پاشماوەیەک دەسم لێ دا خەریک بو تەواو ئەبو. بە لامەوە سەیر بو چونکە خوم بەکارم نەهێنا بو. پرسیم: «کێ بەکاری هێناوە؟». لە پێش دا کەس نەچوە ژێری. دوایی حەسەن خوی دانی پێ دا نا کە ئەو بە کاری هێناوە. تومەز هەمو جار کە ریشی تاشی بو بەو کرێمە دەموچاوی چەور کرد بو.

حەسەن خەڵکی کەرکوک بو لە ئێرانەوە هات بو. ئەویش چو بۆ ئەوروپا دانیشت.

عارف لە شام بێ تاقەت بو بو ماوەیەک هاتە دیرکی بای باڵی خوی بدات. شەوێک دایان نابو بە ئیشکگر. کاتی سەرەی گەیشت بویە، چی لە گەڵی خەریک بو بون لە خەو هەستێ ماوەی دیاریکراوی خوی ئیشک بگرێ، هەڵنەستا بو، وت بوی: «هەڵناستم پێویستم بە خەو هەیە». هاورێکانی ئەوەندەیان سەر کردە سەری، سەری خوی هەڵگرت، لە پێش دا چوە خەلیج و، سەرەنجام لە سوید گیرسایەوە.

*

لە ناو ئاوارەکانی جەزیرەدا تاقمێکی زور یەزیدییان تێ دا بو، پلە و پایەی کومەلایەتی و دینییان جیاواز بو، وەکو: شێخ، قەوال، فەقیر...

شێخ حسێن، خوێندەوارێکی روشنبیر و، سیاسیەکی کوردپەروەر و، نەجیب، کوری بابەشێخ بو. لە ناو یەزیدییەکان دا «میر» خاوەنی دەسەلاتی دنیایی و، «بابەشێخ» خاوەنی دەسەلاتی دینییە. لە مەسەلە دینییەکان دا بابەشێخ «فتوا» ئەدا و، راست و ناراست دیاری ئەکا، تەنانەت ئەتوانی یەزیدی لە دین دەر بکا.

جگە لە شێخ حسێن چەند شێخێکی تری لێ بو، لەوانە: شێخ خەلەف. خەلەف لەو سەردەمەدا کە بەعسییەکان گێچەڵیان بە کوردەکانی شەنگال ئەکرد و، ئەیانویست رایان بگوێزن، لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی پارتی بو لە سنجار بو، لەو هەرایەدا قایمقامی سنجار کوژرا. لەم رووداوەدا شێخ خەلەف تاوانبار کرا بو. شێخ خەلەف ئەگەرچی نەخوێندەوار بو، بەڵام پیاوێکی نوکتەبازی وریا و، شارەزای کاروباری دینیی خویان و ناوچەکەیان بو.

یەزدین، حەسەن نەرمو، خودیدە پسی، قاسم ملکو... لە پیاوە ناسراوەکانیان بون.

له سەر یەزیدییەکان کتیب و وتار زور نوسراوە.

عوسمانیەکان بە هاندان و فتوای مەلاکان زور جار لەشکریان ناردوتە سەریان، جگە لەوەی بە شەیتانپەرستی و، کافری تاوانباریان کردون، شتیکی تریان لە سەر نەنوسیون.

ئەم کەمایەتییە دینییە سەرنجی هەندی لە نوسەر و گەریدە ئەوروپاییەکانی راکیشاوە. سەردانی ناوچەکانیان کردون و، شتیان لە سەر نوسیون. کتیبەکەی «لایارد» بە ئینگلیزی لەسەر «کەلاوەکانی نەینەوا» هەندی وینەی دەسکردی جوانی یەزیدییەکان و شوینە پیروزەکانی تی دایە.

لە سییەکانی ئەم سەدەیەوە بە عەرەبی چەندین وتار و کتیبیان لە سەر نوسراوە، لە ناو ئەواندا هەردو میژونوسی عیراقی: «السید عبدالرزاق الحسنی» و «المحامی عباس العزاوی» دو کتیبیان لە سەر نوسیون و، چەند جاری دەسکارییان تی دا کردوە و، چاپ کراونەتەوە.

شاکیر فەتاح، ماوەیەک لە ناویان دا ژیا بو، ئەویش بە کوردی کتیبیکی لە سەر نوسیون. پیش ئەوەی بلاوی بکاتەوە چەند بەشیکی بو ئیمە نارد لە «رزگاری» دا بە زنجیرە بلاومان کردەوە.

یەزیدییەکان خویان هیچیان لە سەر خویان نەنوسیوە.

تا ئیستاش لیکولینەوەیەکی زانستی بیلایەن و تیروتەسەلیان لە سەر نەنوسراوە، لە بەر ئەوە زور بابەتی دینیی و کومەلایەتییان، هیشتا وەکو مەتەل ماوەتەوە و، هەریەکە بە جوری لی یان ئەدوی.

بو من هەلیکی باش رەخسا بو هەندی لە زانیارییە کونەکانی لە سەر یەزیدی خویند بومەوە تاقی بکەمەوە و، هەندی شتی نوی یان لی فیر بیم. سەرەتا سلیان لی ئەکردمەوە. منیان بە «کومەلە» ئەناسی و، پیش منیش نمونەیەکی خراپی کومەلەیان دی بو. وایان ئەزانی منیش لەو تیپەم. زوری پی نەچو سلەکەیانم رەواندنەوە. بوین بە دوست و ئاشنا. بی سلەمینەوە گفتوگومان ئەکرد و، بە راشکاوی وەلامی پرسیارەکانیان ئەدامەوە و، هەندی لە بیرورا دینییەکانی خویان بو رون ئەکردمەوە.

---

یەزیدییەکان بە خویان ئەلین: «میللەت» و بە دینەکەیان ئەلین: «ئولی ئیزدی». خویان بە میللەتی هەلبژیردراوی یەزدان ئەزانن، چونکە لایان وایە مروڤایەتی هەموی لە نەوەی «ئادەم و حەوا» ن، بە تەنیا ئەوان لە «ئادەم» کەوتونەتەوە. بە کرمانجییەکی رەوان ئەدوین و، لایان وایە لە روژی قیامەت دا خوا و فریشتەکانی بە کرمانجی لە گەل مروڤ

ئەدوین و، هەر کەسی ئەم زمانە نەزانێ ناچێتە بەهەشت. نوێژ و بەیتە دینییەکانیان هەموی بە کرمانجییە.

«ئولی ئیزدی» بێگومان دینێکی کۆن و سەربەخۆیی، تایبەت بوە بە کورد. بە تێپەڕینی زەمان و لە ئەنجامی تێکەڵاویبان لە گەڵ دینەکانی دراوسێیان هەندێ باوەڕ و نەریت و زاراویان لێ وەرگرتون، بەڵام ئەمە کاری نەکردوتە سەر باوەڕە بنەڕەتییەکانیان.

ئاینەکان بە گوێرەی «خواپەرستی» دابەش ئەکرێن بۆ یەک خوایی «مونو ثاییزم» و، دوخوایی «دوالیزم» و، چەند خوایی «پولی ثاییزم»:

- یونانییەکان باوەڕیان بە هەبونی «چەند خوا» هەبوە، وەکو خوای جوانی، خوای شەڕ، خوای باران، خوای دەریا...

- زەردەشتییەکان باوەڕیان بە هەبونی «دوخوا» هەبوە، خوای چاکە «ئاهورامەزدا» و، خوای خراپە «ئەهریمەن».

- جو و، مەسیحی و، موسوڵمان باوەڕیان بە هەبونی «خوای تاک و تەنیا» هەبوە و، لایان وابوە ئەوانەی دوخوا یا زیادتر ئەپەرستن موشریک و کافرن.

زۆر کەس وا ئەزانن یەزیدییەکان ئەچنە خانەی «دوخواپەرستەکان» ەوە. هەندێ لە روشنبیرانی یەزیدی بەش خۆیان بە پاشماوەی زەردەشتییەکان دائەنێن. بەڵام ئەوەی من لەو ماوەیەدا لێ یان تێ گەیشتم: یەزیدییەکان باوەڕیان بە «ئیزەد»، واتە خوای تاک و تەنیا هەیە. «مەلەک تاوس» کە موسوڵمانەکان بە «شەیتان» و، هەندێکی تر بە خوای شەڕی زەردەشتییەکان «ئەهریمەن» ی دائەنێن «ئیزەد» یا «خودێ» نیە بەڵکو «فریشتە: مەلایکەت» ە، بەڵام فریشتەیەکە پایەیەکی تایبەتی لای یەزدان هەیە، چونکە ئەم لە روناکی دروست بوە نەک لە قوڕ.

یەزیدییەکان بە درێژایی مێژو قوربانیی زۆرلێکراوی ئازادی دین و ویژدان بون. زۆر جار کەوتونەتە بەر پەلاماری بێ بەزەییانەی ئوردوی تورک و، حوکمڕانەکانی دەوروپشتیان. وەکو دەماودەم بۆیان باس کردوم ٣٢ جار «فەرمان» بۆ لە ناوبردنیان دەرچوە. فەرمان وشەیەک بوە بە مەعنای: «ئەمری سوڵتان و گەورە کاربەدەستەکانی عوسمانی»، بەڵام لە زمانی ئەمان دا «ڕابونی فەرمان» واتە قەتلوعام، یا بە زمانی ئەم زەمانە «جینوساید» چونکە هەمو جار فەرمانەکان بۆ لە ناوبردنی یەزیدی و تاڵانکردن و وێرانکردنی ئاواییەکانیان بوە. بە هۆی ئەم هەمو پەلامارەی خۆیان و شوێنە پیرۆزەکانیانەوە، هیچ بەڵگەیەکی نوسراویان نەماوە. کتێبە پیرۆزەکانیان: «جیلوە» و «مەسحەفی رەش» لای خۆیان نەماوە و، ئەوی دەس ئەوروپاییەکانیش کەوتوە جێگای

باوەڕ نیە. باوەڕە دینییەکانیان ئەوەیە کە لە سنگی «باپەشیخ» و «قەواڵ»ەکانیان دا پارێزراوە.

«قەواڵ» کە لە وشەی «قەول» داتاشراوە، بەو کەسانە ئەڵێن کە بەیتە دینییەکانی ئولی ئیزدییان لە بەرە و، لە موناسەبەتە دینییەکان دا بە گۆرانیەوە بۆیان ئەگێڕنەوە. قەوالەکانی سەردەمی زو نەخوێندەوار بون. یەکێ لە بەیتە دینییە گرنگەکان: «بەیتی ئافراندن» واتە «سفر الخليقە» یە کە باسی دروستبونی گەردون ئەگێڕێتەوە لە باری سەرنجی دینییانەوە. بەیتی تریان زۆرە. بەیتەکانیان سادەن و، لە سەر ئەفسانە دامەزراون.

زۆرم مەبەست بو تێرمینۆلۆجی تایبەتی ئولی ئیزدی ساغ بکەمەوە و، لە گەڵ زاراوە ناسراوەکانی تیۆلۆجی و سۆسیۆلۆجی بەراوردیان بکەم. شتێکی ئەوتوم گیر نەکەوت، چونکە زۆری زاراوە کرمانجییەکان فەوتاون و لە بیر چونەتەوە، ئەوی ما بو کەمێکی زۆر کەم بو، بەڵام وەکو «مفهوم» و «معنی» باسی ئەکەن.

یەکێ لەو باسانەی ئەمەویست بچمە بنجوبناونی و، زاراوەکانی وەربگرم «تناسخ» بو. «تناسخ» کە لای کاکەیی «ئەهلی هەق» پێ ی ئەڵێن: «دونادون» لای ئەمان زاراوێکی تایبەتی نیە. کەچی لە بنەرەتی باوەڕە دینیەکانیانە. عبدالرزاق الحسنی باسی ٤ جۆر «دونادون» ئەکا: «نسخ، فسخ، رسخ، مسخ»، بە واتای چونی گیانی کەسی کە ئەمرێ، بە گوێرەی کردەوە باش یا خراپەکانی، بو ناو لەشی کەسێکی تر، یان ئەچێتە ناو لەشی حەیوان، یان ئەبێ بە نەبات، یا جەماد.. ئەم باوەڕەیان لە لا هەیە، بەڵام بە وشە و زاراوێ تایبەتی دیارییان نەکردوە.

احمد العزاوي، ئەندامی «قیادەی قەومی» و «ئەمین سری قیادەی قوطری عیراق»، لە تەقینەوەیەک دا لە شام کوژرا. بەعسییەکان لە قامیشلی پرسەیان بو دانا بو. لە گەڵ چەند کەسێکی تر، لەوانە هەندێ یەزیدی، چوین بو پرسەکە. لەوێ بە دەنگێکی نزم لە شیخ خەلەفم پرسی: «گیانی ئەم کابرایە چوتە چیەوە؟». بێ سێبودو وتی: «کوچک»، واتە سەگ. دیارە سەگ لای خەڵکی ئەم ناوچانە گلاو و سوک و چەپەڵە.

ئولی ئیزدی دینێکە لە سەر بنچینەی چینایەتی دابەش بون. چینەکان: میر، شیخ، قەواڵ، فەقیر، داخراون. بە میر، کە بەرزترینیانە دەس پێ ئەکا، بە فەقیر، کەمترینیانە دوایی دێ. یەکێکی چینی خوارەوتر هەرچی بکا ناتوانێ هەڵکشێ بو چینێکی لە خوی بەرەوژورتر، هەمیشە لە ناو سنوری چینەکەی خوی دا ئەمێنێتەوە و، بوی نیە ژن لە چینی سەروی خوی بهێنێ.

لە ناو یەزیدی دا «کریف» ڕێزێکی تایبەتی هەیە. دو خێزان یا دو بنەماڵە کە

خزمایەتییان نیەو ئەیانەوێ بێن بە دوست و هاوپەیمانی یەکتری، ئەبن بە «کریف».

ئەم دو لایە وا ریک ئەکەون لە ئاهەنگی «خەتەنە» ی کورەکەدا ئامادە ئەبێ، پیاوێکی لای یەکەم منالی پیاوی لای دوەم ئەکاتە باوەشی و، خەتەنەی ئەکەن. یەمە ئیتر ئەبن بە «کریف» ی یەکتری، لە خوشی و ناخوشی و، شایی و شیوەنی یەکتری دا، هاوبەش ئەبن. تەنانەت لە شەری خیلایەتی دا لە سەر یەکتری ئەکەنەوە.

یەزیدی بوی هەیە لە گەل موسولمان، مەسیحی و، جو، ببیتە «کریف»، بەلام بوی نیە لە غەیری یەزیدی ژن بهینی.

یەزیدییەکان ریزیکی تایبەتی بو گەورەکانیان قایل بون و، پیرەوی پایەی چینایەتییان ئەکردن. میری یەزیدییەکان، تەحسین بەگ، لە حەفتاکان دا چو بوە ناو شورشەوە و، دوای ئاشبەتال چو بوە ئەوروپا. ئەو ماوەیەی من لە جەزیرە بوم، سەردانیکی یەزیدیەکانی جەزیرەی کرد. وەکو کەسیکی پیروز رەفتاریان لە گەل ئەکرد. دەست یا چاکەتەکەیان ماچ ئەکرد. تەنانەت لە کاتی داکەندن و لە پی کردنی پیلاوەکانی دا، یەکی بە ئارەزوی خوی لە بەردەمی دا دائەنیشت، قاچی بە پیلاوەکانەوە ئەگرتە باوەش بو کردنەوە و بەستنەوەی قەیتانەکانی. هەندی لە یەزیدیەکان لە بەر دابینکردنی گوزەرانیان بو بون بە بەعسی. بەعس لی ی قەدەغە کرد بون دەستی تەحسین بەگ ماچ بکەن. ئەوانیش بە دزییەوە دەستیان ماچ ئەکرد.

هەندی رەوشتیان هەیە بی ئەچی خویان پیوە گرت بی و، لی یان بوبی بە نەریت، ئەگینا هیچ تەفسیریکی دینیی ئەوتویان بوی نیە. بو نمونە: سمیل ناتاشن، هەندیکیان ئەگریجە بەرئەدەنەوە، کاهو ناخون، خویان لە رەنگی شین ئەپاریزن... شیخ خەلەف و بنەمالەکەی گوشتی کەلەشیریان نەئەخوارد، هەرچەند کەلەشیری دەس بکەوتایە بو منی ئەنارد.

ئەوەندەی من ناسیمن و، تیکەلاویان بوم، نمونەی پیاوی جوامیر و رەوشت بەرز و سەر راست بون.

*

عەبدورەزاق فەیلی سەرپەرشتی ریکخستنەوەی کوردە عیراقییەکانی قامیشلی ئەکرد. هەر لەو نزیکانە پاش گیرانی هەندی لە ئەندامەکانی کومەلە لە بەغدا ئیبراهیم عەزو، ئەنوەر شاکەلی و ئیبراهیم عەبد عەلی کە هەرسیکیان ئەندامی کومەلە بون و فەرمانی گرتنیان دەرچوبو، بە پی لە سنور پەرینەوە و، گەیشتنە سوریا.

سەرکردایەتی یەکیتی کومیتەیەکی پیک هینا بو لە قامیشلی بو سەرپەرشتی

ریکخستنی ئەوانەی بە ئەندامەتی یان بو پیشمەرگایەتی ئەهاتنە ریزی یەکیتییەوە. سوریا کارئاسانی زوری بو چالاکییەکانی یەکیتی ئەکرد. دەورەیەکی جەنگیی بو ئەفسەرەکان و، چەند دەورەیەکی بو پیشمەرگەکان کردەوە.

*

ناوچەی جزیرە دریژبونەوەی جوگرافی جزیرەی بوتانە و، بەشیک بوە لە قەلەمرەوی ئەوان. سەردەمیکی دریژ مەلبەندی هاتوچوی ئیلە رەوەندەکان بوە و، بە دەگمەن ئاوایی تی دا بوە. دوای یەکەمین جەنگی جیهانی کە سوریا لە ئیمپراتوریەتی عوسمانی جیا کرایەوە، هیلی ئاسنین کرایە سنوری هەردو ولات. ئەم سنورە چەندین شار و ئاوایی و ئیل و بنەمالەی، بی هیچ ئیعتیباریکی ئینسانی، کردوتە دوبەش. شارەکانی: نسیبین - قامیشلی، جیلانپنار - سەریکانی (راس العین) لەوانەن.

*

کابرایەک بە ناوی «محمد طلب هلال» کتیبیکی لە سەر ناوچەی جەزیرە نوسی بو. کوردەکانی سوریا، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەرەوە ئەژیان، هەرای زوریان لە دژی کرد، روژنامەی حیزبە کوردییەکان، لەوانە «خەبات»، وتاریان لە سەر نوسی بو. «عیسمەت شەریف» یش نامیلکەیەکی بە ئینگلیزی بو بەرپەرچدانەوەی نوسی بو. مەسەلەی «الحزام العربی» و «الحزام الاخضر» و تەعریبی ناوچە کوردنشینەکانی جەزیرە، بو بو بە پەژارەی راستەقینەیان و، ئەم کتیبەیان ئەکرد بە شایەت و بەلگە. دانەیەکم لە کتیبی تایبەتی پەیدا کرد و، کەوتمە خویندنەوە و تاووتوی کردنی. لیرەدا بیر و پیشنیارە بنەرەتییەکانی ئەگیرمەوە.

ناوی کتیبەکە:

«دراسة عن محافظة الجزيرة: من النواحي القومية، الاجتماعية، السياسية»

ناوی نوسەرەکەی:

الملازم الاول محمد طلب هلال رئيس الشعبة السياسية بالحسكة

ساڵ و شوینی چاپی لە سەر نیە، بەلام لە ١٩٦٣/١١/١٢دا لە نوسینەوەی بوتەوە. بە سەر یەکەوە ١٥٦ لاپەرەیە.

لە (المقدمە) دا باسی ئەهونی سەرچاوەی پیویست ئەکا، لە بەر ئەوە نوسینەکەی لە سەر بنچینەی تەجروبەی خوی و کەسانی تر نوسیوە و، باسی گرنگیی پاککردنەوەی نەتەوەیی ناوچەکە ئەکا لە تاقمی نەعەرەب بە تایبەتی پاش دوزینەوەی نەوت لە رومەیلان و قەرەچوخ.

له (المدخل) دا (ل ١ تا ٢) به داخەوه لەوه ئەدوێ کە کاپرایەکی عەرەب لەو ناوچەیەدا، بە هۆی زۆریی ناکۆکی و تێکەڵاویی رەگەز و نەتەوە و دینی جیاوازەوە، هەست بەوە ناکا لە وڵاتی خۆیایەتی. لە بەر ئەوە داوای پاککردنەوەی ئەکا لە رەگەزی بێگانە.

بەشی یەکەم (ل ٣ تا ٢٥)ی تەرخان کردوە بۆ «سەرنجێکی مێژوویی لە کێشەی کورد» لێرەدا باسی کێشەی کورد ئەکا لە سەرەتاوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم و، کاتی یەکەمین جەنگی جیهانی و، نێوان دو جەنگ. باسی بیری نیشتمانی نەتەوەیی کورد و، کورە جیهانیەکان و ئیمپریالیزم و کورد ئەکا.

لەم بەشەدا ئەیەوێ بیسەلمێنی کورد نەتەوە نیە و نیشتمانی نەتەوەیی نیە. دوژمنانی عەرەب بە تایبەتی ئیمپریالیزم کوردیان خستوتە سەر کەلکەڵەی بیری نەتەوەیی. لە شوێنێک دا ئەڵێ: «واذا یمکننا القول بانه لیس هناك شعب بمعنی الشعب (کردی) ولا امة بکاملها بمعنی الامة الکردیة» ئینجا ئەڵێ: «لا یتعدی الشعب الکردی هذا المجال حیث لا تاریخ لهم ولا حضارة ولا لغة حتی ولا جنس، اللهم الا صفة القوة والبطش والشدة..» «ولیست المشکلة الکردیة الان وقد اخذت فی تنظیم نفسها الا انتفاخ ورمی خبیث نشأ او انشئ فی ناحیة من جسم هذه الامة العربیة ولیس له ای علاج سوی بتره»

بەشی دوەم (ل ٢٦ تا ٤٨) ی گرنگترین بەشەکانی کتێبەکەیە. شوێنی کوردەکانی سوریا دیاری ئەکا و، باسی خێڵەکانیان ئەکا، پێشنیارەکانی خۆی بە دیاری کراوی ئەخاتە بەرچاوی کاربەدەستان بۆ چارسەرکردنی کێشەی کورد.

شوێنی کوردەکانی جزیرە بەم جۆرە دیاری ئەکا:

«یتجمع الاکراد علی طول الشریط الشمالی محاذیا للحدود الترکیة فی محافظة الجزیرة بعمق نحو الجنوب یتراوح بین ١٥ - ٣٥ کیلومتر تقریبا من منطقة راس العین غربا حتی حدود منطقة المالکیة شرقا حیث یتکاثف التجمع هذا فی الامکنة الخصبة بحیث یستعصی علیك ایجاد جیب عربی صغیر فی بعض المناطق وخصوصا فی منطقة المالکیة وقبورالبیض والقامشلی وعامودا ویحتلون اخصب المناطق فی الجزیرة واکثرها امطارا حیث تتراوح نسبة الامطار فی منطقة المالکیة والقامشلی بین ٤٠٠ - ٥٠٠ مم مطری حسب خریطة الامطار.»

کە باسی خێڵە کوردەکانی سوریا ئەکا هەمویان تاوانبار ئەکا بەوەی خەرە بە نیشتمانی نەتەوەیی: کوردستانەوە ئەبێن، پارتی و شیوعین، ئیسلام نین و لە سەر دینی شەیتانن، بەلام بە پێ ی نەخشەی ئیمپریالیزم بۆ هەڵخەڵەتاندنی عەرەب باسی ئیسلامەتی

ئەکەن، هەمویان لە تورکیاوە هاتون و، لەو دیو سنور ئاموزاو خزمیان هەیە و، سنور بە خەتێکی وەهمی دائەنێن. خێلە گرنگەکان وەکو هیلال ژماردونی ئەمانەن:

١. هەڤێرکان. لە قبور البیض و قامیشلی و هەندێکی لە حسەکە جێگیر بون.

٢. دەقوری. لە قامیشلی و عامودە جێگیر بون. نزیکەی ٤ هەزار خێزانن لە ١٢٠ گوندا ئەژین. ئەم خێلە ئەبن بە چەند تیرەیەکەوە گرنگترینیان: گاباره، لە ٣٠ گوندی عامودا ئەژین. کاباکا، لە ٢٠ گوندی عامودا ئەژین. سیدان، لە ٢٠ گوندی عامودا ئەژین.

٣. کیکی. لە درباسیە جێگیر بون. نزیکەی ٣ هەزار خێزانن لە ١٥٠ گوندا ئەژین. ئەم خێلە ئەبن بە چەند تیرەیەکەوە گرنگترینیان: ساروخان، کوسکان، ئومەران، هیسکان، ئیسماعیلانە.

٤. مرسینی. لە قامیشلی جێگیر بون. بەرەوژوری ١ هەزار خێزانن.

٥. ملی. لە راس العین جێگیر بون. نزیکەی ١٥٠٠ خێزانن. ئەبی بە ١٠ تیرەوە گرنگترینیان: خضرکان، کومنشان، تاجریان، دودکان، شیخان، دیدان، مانذان، زیلان...

جگە لەمانە چەند خێلێکی تری کورد ئەژمێری وەکو: بەرازی لە عین العرب و راس العین، کیتکان، شیخان، محەملی لە روژهەلاتی قامیشلی، دورکان، جابیە و حسەنا و میران یا کوچەر.

دیتە سەر ئەوەی لەوەو پیش چون سەیری کوردیان کردوە و، لەمە بە دوا ئەبی چون سەیریان بکەن. لەوەو پیش لایان وا بوە کورد ئەمین و دلسوز و گوێرایەلە و، پەیوەندی دینیی ئیسلام پێکیانەوە ئەبەستێ. بەلام ئیسلام ناتوانی ئیتر ئەو پەیوەندیە رابگری و، «یەهودستان» و «کوردستان» وەکو یەکن.

پاش ئەوەی تیوریە رەگەزپەرستییەکانی دەربارەی پارتی و، ئەوەی تازەی کورد رون ئەکاتەوە و، دەوری هەردو بلوک: روژئاوا و روژهەلات لە دوژمنایەتی عەرەب دا بە هوی جولەکە و کوردەوە باس ئەکا و ئەلێ: «ولم یتفق المعسکرین فی تاریخ صراعهما علی شیء اتفاقهما علی مسرحیتین وعلی الارض العربیة بالذات هی مسرحیة فلسطین و مسرحیة کردستان، کردستان العربیة علی وجه الخصوص.»

هیلال هێرش ئەکاتە سەر کاربەدەستانی میصر، بە تایبەتی ناصر، چونکە کورد بە برای دینیی عەرەب دائەنێن و، داوای چارسەری بە ئاشتی کێشەکەیان ئەکەن و، ئەم بوچونەی ئەوان بە «شعوبی» و «سطحی» دائەنێ، ئینجا دیتە سەر بیروراکانی خوی. لە

بەر گرنگی باسەکە وەکو خوی رایان ئەگویزم. لە ژیر سەرناوی «المقترحات بشان المشكلە الكرديه» ئا نوسیویتی:

١. ان تعمد الدولة الى عمليات التهجير الى الداخل مع التوزيع في الداخل ومع ملاحظة عناصر الخطر اولا فاول. ولا باس ان تكون الخطة ثنائية او ثلاثية السنين تبدا بالعناصر الخطرة لتنتهي الى العناصر الاقل خطورة وهكذا...

٢. سياسة التجهيل: اي عدم انشاء مدارس او معاهد علمية في المنطقة لان هذا اثبت عكس المطلوب بشكل صارخ وقوي...

٣. ان الاكثرية الساحقة من الاكراد المقيمين في الجزيرة يتمتعون بالجنسية التركية. فلا بد لتصحيح السجلات المدنية وهذا يجري الان انما نطلب ان يترتب على ذلك اجلاء كل من لم تثبت جنسيته وتسليمه الى الدولة التابع لها. اضف الى ذلك يجب ان يدرس من تثبت جنسيته دراسة ايضا معقولة وملاحظة كيفية كسب الجنسية لان الجنسية لا تكسب الا بمرسوم جمهوري. فكل جنسية ليست بمرسوم يجب ان تناقش تبقى من تبقى اي الاقل خطرا وتنزع من تنزع عنه الجنسية لنعيده بالتالي الى وطنه.

ثم هناك تنازع الجنسيات فانك تجد احدهم يحمل جنسيتين في ان واحد او قل ثلاث جنسيات. فلا بد والحالة هذه ان يعاد الى جنسيته الاولى وعلى كل حال فالمهم ما يترتب على ذلك الاحصاء والتدقيق من اعمال، حيث يجب ان نقوم فورا عمليات الاجلاء.

٤. سد باب العمل: لابد لنا ايضا مساهمة في الخطة من سد ابواب العمل امام الاكراد حتى نجعلهم في وضع، اولا غير قادر على التحرك وثانيا في وضع غير المستقر المستعد للرحيل في اية لحظة وهذا يجب ان ياخذ به الاصلاح الزراعي اولا في الجزيرة بان لا يوجر ولا يملك اكراد والعناصر العربية كثيرة وموفورة بحمدالله.

٥. شن حملة من الدعاية الواسعة بين العناصر العربية ومركزة على الاكراد بتهيئة العناصر العربية اولا لحساب ما وخلخلة وضع الاكراد. ثانيا بحيث يجعلهم في وضع قلق وغير مستقر.

٦. نزع الصفة الدينية عن مشايخ الدين عند الاكراد وارسال مشايخ بخطة مرسومة عربيا اقحاحا. او نقلهم الى الداخل بدلا من غيرهم. لان مجالسهم ليست مجالس دينية ابدا بل وبدقة العبارة مجالس كردية. فهم لدى دعوتهم الينا لا يرسلون برقيات ضد البرزاني انما يرسلون ضد سفك دماء المسلمين. واي قول هذا القول.

٧. ضرب الاكراد في بعضهم وهذا سهل وقد يكون ميسورا باثارة من يدعون منهم بانهم من اصول عربية على العناصر الخطرة منهم. كما يكشف هذا العمل اوراق من يدعون

بانهم عربا.

٨. اسكان عناصر عربية وقومية فى المناطق الكردية على الحدود فهم حصن المستقبل ورقابة بنفس الوقت على الاكراد ريثما يتم تهجيرهم. ونقترح ان تكون هذه العناصر من شمر لانهم اولا افقر القبائل بالارض وثانيا مضمونين قوميا مئة بالمئة.

٩. جعل الشريط الشمالى للجزيرة منطقة عسكرية كمنطقة الجبهة بحيث توضع فيها قطعات عسكرية مهمتها اسكان العرب واجلاء الاكراد وفق ما ترسم الدولة من خطة.

١٠. انشاء مزارع جماعية للعرب الذين تسكنهم الدولة فى الشريط الشمالى على ان تكون هذه المزارع مدربة ومسلحة عسكريا كالمستعمرات اليهودية على الحدود تماما.

١١. عدم السماح لمن لا يتكلم اللغة العربية بان يمارس حق الانتخاب والترشيح فى المناطق المذكورة.

١٢. منع اعطاء الجنسية السورية مطلقا لمن يريد السكن فى تلك المنطقة مهما كانت جنسيته الاصلية (عدا الجنسية العربية. الخ..

هذا وان هذه المقترحات ليست كافية بل اردنا منها اثارة المسؤولين بحسب خبرتنا لتكون تباشير مشروع خطة جذرية شاملة لتؤخذ للذكرى بعين الاعتبار.

بەشی سێیەم (ل ٤٩ تا ٨٢) تەرخان كراوە بۆ بڵاو كردنەوەی هەندی بەڵگە و، وتاری رۆژنامەكانی جیهان دەربارەی شۆرشی كوردستانی عێراق. بێ ئەجی زۆری بەڵگەكان درۆ بن و دەستكردی خۆیان بێ بە نیازی شێواندنی خواستە سیاسی و كۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییە رەواكانی كورد لە سوریا و، هاندانی نەتەوەپەرستەكانی عەرەب لە كورد.

بەشی چوارەم (ل ٨٢ تا ١٠٩) باسی حیزبە سیاسییەكانی پارێزگای جەزیرە ئەكا. لە ناو ئەو حیزبانەدا باسی پارتی ئەكا. كابرا بە ئەنقەست پارتی دیموكراتی كوردی سوریای تێكەڵاو كردوە لە گەڵ پارتی دیموكراتی كوردستانی عیراق. بەشی لە پرۆگرامی پارتییەكەی عیراقی نوسیوە وەكو ئامانجی پارتییەكەی سوریا.

بەشی پێنجەم (ل ١١٠ تا ١٣٧) شوێنی عەرەب و خێلە عەرەبییەكانی جەزیرە دیاری ئەكا. لەم رووەوە نوسیویتی:

«لقد قررنا فيما مضى بان الشريط الشمالى للجزيرة اهل ومسكون بالاكراد وفق خطة استعمارية قديمة. ومن هذا نفهم ان اماكن ومواطن العشائر العربية هى المناطق الجنوبية من محافظة الجزيرة، حيث تتمركز اكثر العشائر العربية وهى بخطوطها العريضة: شمر فى الشرق، والجبور فى الوسط، والبكارة فى الغرب على سفوح عبدالعزيز وتتراوح بقية العشائر

بين العشائر المذكورة تلك، كطي، والشرابين والحرب وغيرها من بقية العشائر الصغيرة من العرب. اجل انهم موزعون بحسب خريطة الامطار في سوريا في المناطق الجنوبية والتي تتراوح نسبة امطارها بين ١٠٠ - ٢٥٠ مم مطري فمناطق العشائر العربية اذا ليست خصبة عدا ما حول الخابور والسقي وهي قليلة وعدا قرى دهام الهادي وبعض قرى طي فهي على درجة من الخصوبة لا باس بها.»

خيله عەرەبەكانى جەزيرە بەمجورە ئەژمێرى:

١. شەممەر. پێش ٣٠٠ ساڵ لە ناوچەی نەجدی حیجازەوە هاتون و، لە ناوچەکانی بەغداد تا رقە جێگیر بون. ئەبن بە دو تیرەوە: شمر الخرصه لە تەل کوچەک خر بونەتەوە و، شمر الزور لە تەل هدلول دانیشتون.

٢. طەی. لە حیجازەوە هاتون. نزیکەی ١٠ هەزار کەس ئەبن. ئەبن بە چەند تیرەیەکەوە: العساف، الحریث، الجوالە، حرب، راشد، بنی سبعه، الیسار، زبید، البوعاصی، الغنامە، المعامرە، البکارە. لە سەروی روژهەلاتی قامیشلی لە سەر سنوری تورکیا و، بەشیکیان لە مالکیە و، بەشیکیان لە حسەکە جیگیر بون.

٣. شەرابی. لە دیرکی و قامیشلی و حسەکە و راس العین دائەنیشن.

٤. جبور. لە کەناری خابور ٢٠ کیلومەترخوارووی حسەکە ئەژین. دابەش ئەبن بە سەر تیرەکانی: ملحم، سلطان، الهزیم، المحاسن، المحمد، الخوی، الریت، البومهنا، الجحیش، البقە، العلی، البومانع، العامر، البری، البوعمرە، القضاه، الحلیون، البوریاش، البو سلامە.

٥. البکارە. لە بناری چیای عبدالعزیزی سەرو ئەژین.

بو ئەوەی مەترسی کورد نەمینی و، خیلاتی عەرەب زاڵ بی بە سەر ناوچەکەدا، هیلال بو بلاو کردنەوەی خویندەواری پیشنیار ئەکا:

١. احداث اكثر مايمكن من المدارس وعلى مختلف درجاتها وانواعها بين العشائر العربيه وفي مناطقهم التي يعيشون فيها، وتجهيز تلك المدارس بكل ما تحتاجه المدارس الحديثه.

٢. وحدات ارشاديه وتوجيه شعبي يرافق تلك المدارس ويساعدها على نشر الثقافه والعلم.

٣. ارسال اكبر كميه من الشباب العربي ومن الفقراء على وجه الخصوص دون التقيد بالشروط المعروفه الى الخارج للدراسه واكمال الاختصاصات وذلك بخطه مستمره وباعداد كبيره...

٤. فتح معاهد زراعيه عاليه فى الجزيره لابناء العرب مجهزه بكل الوسائل الحديثه لتساعد على ازدهار النهضه الزراعيه وتحسينها.

بو چاککردنی هەلومەرجی مادی بشیان پیشنیار ئەکا:

١. توزيع كل الفائض من الارض فى الجزيره والمشمول بقانون الاصلاح الزراعى على هذه العناصر فقط دون غيرها مطلقا. اذ على الاصلاح الزراعى ان لا يعطى سندات تمليک فى الجزيره الا لهولاء العناصر حتى ولا يوجر الا لهم لانهم السند والدعم والدرع الواقى عندما تتحسن احوالهم فهم امل المستقبل علما ووعيا وقوميا بالنسبه للجزيره.

٢. تقديم المساعدات الفعاله والمجديه بالنسبه للدوله لهولاء العاجله والاجله.

٣. انشاء جمعيات او مزارع جماعيه من تلک العناصر العربيه فقط.

٤. انشاء قرى نموذجيه تشرف عليها الدوله، بكثره وموزعه فى مختلف المناطق العربيه لكى يلحظوا الفارق بين حياتهم السابقه وحياتهم الاحقه ويشجعهم على العمل والجد فيما بعد.

٥. اشعارهم بالدعم الدائم من قبل السلطات المحليه التى كانت سابقا لا تستقبل سوى الشيخ ذو النفوذ. لكى يلحظوا الفارق ايضا ويحسوا بان الدوله هى دولتهم وهم ترسها وحماها. مما يعطيهم شيئا من المعنويات.

٦. فتح ابواب المصارف الزراعيه لهولاء الصغار فقط واغلاقها امام الشعوبيين والمقتدرين من العرب الاغنياء.

٧. وضع خطه عامه بالنسبه لهولاء العناصر العربيه لانقاذهم مما هم فيه تدخل فى موازنه خاصه.

هیلال لای وایە عەقلیەتی عەشائیری عەرەب کوسپیکی گەورەیە بویە داوا ئەکا پەیوەندییە مادی و جیگاییەکانی خیلەکان هەل بوەشینری و، شەممەر و جبور و طەی... لە یەک شوین دا تیەلاو بکرین. زوریش گلەیی لەوە هەیە کە پیوەندی نیوان خیلەکانی کورد و عەرەب لە ناوچەکەدا باش و دوستانەیە.

بەشی شەشەم (ل ١٣٨ تا ١٥٦) دوا بەشی کتیبەکەیە. تەرخانی کردوە بو باسی دین و مەزهەبی دانیشتوانی جەزیرە کە تیکەلاوە لە موسولمان و، مەسیحی کاتولیک و ئەرتودوکس و نەستوری و پروتستانت و، یەزیدی و، لە ئاشوری و ئەرمەن و کلدانی و جو...

سالی ١٩٦٣ حیزبی بەعس بە کودەتایەکی خویناوی لە بەغدا حوکمی گرتە دەس، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت حیزبی بەعس لە سوریاش بە هەمان ریگا حوکمی گرتە

دەس. بەعسییەکان بەمە بایی بون. ئەوپەری توندوتیژییان بەرامبەر دوژمن و ناحەزەکانیان بە کار ئەهینا و، گیانی رەگەزپەرستییان خروشا بو. عیراق و سوریا و میصر گفتوگوی «وەحدە» یان دەس پی کرد. گفتوگوکەیان بە ئەنجام نەگەیشت. کەوتنە دژایەتی ناصر و میصر. کە شەریان دەس پی کردەوە لە دژی کورد، میصر پەسندی نەکرد، بەلام حکومەتی سوریا «لیوای یەرموک» ی بو یارمەتیدانی بەعس نارد بو عیراق. ئەم کتیبە لەو کەشە سیاسییەدا نوسراوە، بە هەمان گیانی رەگەزپەرستانە. بیروبوچونەکانی هیلال پیچەوانەی سەرەتاکانی دیموکراسی و مافی مروڤ و تیدیعا ئاشکراکانی حیزبی بەعسە.

کوردەکانی سوریا ناهەقیان نەبو، ئەم کتیبە ئەیهینا هەرای گەورەتری لە سەر ساز بکرایە و، ئەگەر لە ولاتیک دا بونایە ریزی مافی مروڤی بگرتایە، ئەبو هیلال بدری بە دادگا.

*

سەردانی زور گوند و شاروچکەی ناوچەکەم کرد.

چەند جاری لە گەل هەندی روشنبیر و پیاوی ناسراوی ناوچەکە چوین بو سەیران بو کەناری دیجلە. جاریکیان چوین بو نزیک پردی «بافت». «بافت» شوینەواری پردیکی کونە. وەکو ئەیانوت دوانزە تاقی هەبوە، بە قەد بورجەکانی سال. هەر پایەیەکیشی وینەی یەکی لەو بورجانەی لە سەر بوە. ئەو کاتەی ئیمە چوین شوینەواریکی کەمی چەند تاقیکی مابو. ناوچەکە پوری زوری لی بو.

لە گەل شیخ حسینی بابەشیخ سەردانی بەحرکی و خاتونیەمان کرد لە راستی ناوچەی شەنگار دا. گومیکی خاوین و جوان و دلرفینی لی بو. رەنگیکی شینی قەشەنگی هەبو. دانیشتوانی ناوچەکە یەزیدی بون و، ئاژەلداریان ئەکرد، دالدەی هەندی لە یەزیدییە ئاوارەکانی ئیمەیان دابو.

هەروەها چەند جاری چوم بو سەری کانی، عامودا، درباسیە.

ناوی گوند و شوینەکان بە زوری کوردی بون، حکومەت ناوەکانی گوری بون بە عەرەبی. زورایەتی دانیشتوانی ناوچەکە کوردن و، بە کرمانجییەکی رەوان ئەدوین، بەلام جلوبەرگی عەرەبی لە بەر ئەکەن. ئەمەش خویەکی دیرینەیە نەسەپنراوە بە سەریان دا. زەویوزاری خویان بە دەس خویانەوە بو و، هەندیکیان ئەرزی فراوانیان هەبو. بەرهەمی سەرەکی دانەویلە، بە تایبەتی گەنم، بو. ناوچەیەکی بە پیت و دەولەمەن بو. ئەرزی بەراو و باخیشیان هەبو. لە هەندی جیگاش بیریان هەلکەند بو بو ئاودان. کشتوکال لەوی پیشکەوتوتر بو لە چاو کوردستانی عیراق دا. لە وەرزی هەلگرتنی گەنم دا سەدان شایی

ژنهینان ئەکرا.

نەوت لە جەزیرە دوزرا بوەوە. ئەو ناوچەیەی نەوتەکەیان لی دەرئەهینا ناوچەیەکی دەولەمەندی کشتوکاڵ و کوردنشین بو، ناوی «قەرەچوخ» بو. بیری نەوتەکان و، بوریبەکانی لە ناو ئەرزی جوتیارەکان دا بو. حکومەت داگیری ئەکرد بو. زورجار تراکتور و کومباین لە نزیک بیرەکان کاریان ئەکرد بی ئەوەی دەس بهیننە ریگەیان.

*

سنوری سوریە - تورکیا، ئەگەرچی بە تەلی درکاوی پەرژین کرا بو، بە دریژای هیلی سنور مین یان لی چاند بو، ژمارەیەکی زوری جەندرمەش تەرخان کرا بون بو چاودیری سنورەکە بەلام جموجولی قاچاخچیتی هەر هەبو. لە تورکیاوە: ئاژل، پەتو، پیلاوی لاستیک... یان ئەهینا و، لە سوریاوە: چایی، جگەرە، تفەنگ و فیشەکیان ئەبرد. قاچاخچیە گەورەکان کریکار و کولهەلگریان بە کری ئەگرت کەلوپەلەکانیان لە سنور بپەریننەوە.

قاچاخچیەکان لە گەڵ ئەفسەرەکانی تورک ریک کەوتبون، بە پارە کولەکانیان ئەپەراندەوە. هەندی جار بەرامبەر بە هەر کولیک چەردەیەک پارەیان ئەدا، یان بو چەند سەعاتی سنورەکەیان بە کری ئەگرت و، لەو ماوەیەدا چەندی بیانتوانیایە تی یان ئەپەراند. هەندی جاریش کە بە قاچاخ ئەپەرینەوە، کولهەلگرەکان بە سەر مین دا ئەکەوتن، یا بەر گوللەی جەندرمە ئەکەوتن.

دیجلە لەو ناوچەیەدا پی ی ئەلین: «ئاڤا مەزن» واتە ئاوی گەورە. لە مەبەر و ئەوبەری دیجلە چەند گوندی هەبون، زوریان ناوەکانیان وەکو یەک وا بو. هەندی جار بو پەراندنەوەی یەکی کومەلی لە خەلکی هەردو گوند بە ناوی مەلە و راوەماسیەوە ئەچونە ناو ئاوەکەوە. ئەوەی ئەیویست بپەریتەوە، ئەویش لە گەلیان ئەچو. پاش بلاوە لیکردن لە گەڵ خەلکی دی یەکە ئەچوە وشکایی، پیشتر جلوبەرگیان بو ئامادە کرد بو، جلی لە بەر ئەکرد و، تی یان ئەپەراند.

چەند جاری بوکیان، بە «کەلەک»، لە بەری تورکیاوە ئەهینا بو سوریا، یا لە سوریاوە ئەیانبرد بو تورکیا. بەلام زور جار ئەمەیان بە پارە تەگبیر ئەکرد.

کەلەک بو پەراندنەوەی ئاژەلیش بە کار ئەهێنرا.

*

لیرەو لەوی هەندی گوندی نوی دروست کرا بون، خانوەکانیان لە قور و، هەژارانە دروست کرا بو. بە زوری ئەو جوتیارانە بون کە ئەرزەکانیان بو بو بە ژیر ئاوی بەنداوی

فوراتەوە. بەلام ئەمانە کەمایەتییەکی بچوک بون لە ناوچەکەدا. مەسەلەی تەعریب هەندێکی پێوە نرا بو، بەو قەوارەیە نەبو، کە من بیست بوم.

کوردەکان، ئەوانەی جنسیەی سوریەیان نەبو، گیروگرفتی راستەقینەیان هەبو. بی بەش بون لە مافی خاوەنیێتی زەوی و خانو و، دامەزران لە دائیرەکانی دەولەت دا و، خوێندن لە زانستگاکانی سوریا.

کورد بە دەگمەن لە داوودەزگای حکومەتی و بەڕیوەبەرایەتی دا دائەمەزرێنران، بە تایبەتی لە شوێنی گرنگ دا، کاربەدەست و حوکمرانی ناوچەکە هەمو عەرەبی بەعسی بون.

یەکێ لەو شتانەی بو من لێرە جێگەی سەرسورمان بو، یەکەمین جار بو ئافرەت ببینم «کاری قورس» بکا. ژمارەیەکی زور کچی گەنج و ژن لە سەر جادەی نێوان قامیشلی و دیرک بەردیان ئەکێشا، یان لە کاری جادەکەدا، بە تایبەتی لە قیرتاوەکەی دا، ئیشیان ئەکرد.

*

سالی ۱۹۷۵ - ۱۹۷٦ کوردەکانی سوریا دابەش بوبون بە سەر چەندین حیزب دا، لێرەدا بو ناسینەوەیان ناوی سکرتیرەکانیان ئەهێنم: حەمید دەرویش، کەمالی ئەحمەد ئاغا، صەلاح بەدرەدین، عیصمەت سەیدو، مەلا باقی، عەزیز چەرکەس...

- زوری ئەم حیزبانە ناویان «الحزب الدیمقراطی الکردی» بو. هەندی وشەی وەکو «الیساری» و «التقدمی» و شتی لەم بابەتەیان خست بوە سەری بو ئەوەی لە یەکتری جیا بکرێنەوە.

- ئامانج و بەرنامەی هەمو ئەم حیزبانە لە گەل یەکتری جیاواز نەبو.

- لە سەرەتای دامەزراندنی پارتیەوە بو ئەوەی حکومەتی سوری و نەتەوەپەرستەکانی عەرەب تورە نەبن، وشەی کوردستانی سوریایان بەکار نەهێنا بو.

- هیچ کام لەم حیزبانە، جگە لە صەلاح بەدرەدین کە لە دەرەوەی سوریا بو، دژی رژیمی سوری نەبون، بەلکو پشتیوانییان لە هەمو هەلویست و هەنگاوەکانی ئەکرد، بە تایبەتی لە ناکوکی عەرەبی - ئیسرائیلی و، ناکوکی سوری - عیراقی دا.

- هیچ کام لەم حیزبانە دروشمی قەبەی هەلنەگرت بو، ئامانجی زل و زوری نەبو، داوای مافی هاونیشتمانیتی سوری و یەکسانی و هەندێ مافی روشنبیرییان ئەکرد.

سەرەرای ئەوە، حکومەتی سوری رێگەی هیچ جورە چالاکییەکی سیاسی، روشنبیری، کومەلایەتی نەئەدان. ناوبەناو لی ی ئەگرتن و، بانگی ئەکردن بو لێپرسینەوە و

لیکولینەوە.

روداوەکانی کوردستانی عیراق کاری لەوانیش کرد بو. حیزبەکان بوبون بە دوبەشەوە و، رای گشتی کوردەکانیش بوبو بە دو کەرتەوە.

- حیزبەکان هەندیکیان، وەکو جاران، پشتیوانییان لە بنەمالەی بارزانی ئەکرد و، باوەشیان بو قم کرد بووەوە. تەنانەت حیزبەکەی کەمالی ئەحمەد ئاغا وەکو لقی قم کاری ئەکرد.

- هەندیکی تریشیان وەکو حەمید دەرویش و عیصمەت پشتیوانییان لە یەکیتی ئەکرد.

- صەلاح بەدرەدین، لە لوبنان دائەنیشت، جورە پەیوەندییەکی لە گەل حکومەتی عیراق دروست کرد بو. لایەنی ئوتونومی بەعسی گرت بو. دژی جموجولی حیزبە کوردیەکانی عیراق بو. بەیانیکی دژی بەیانەکەی دەستەی دامەزرینەری یەکیتی دەر کرد بو.

من زوری ئەم جوامیرانەم بەردەوام ئەبینی و، گفتوگومان ئەکرد. شەویک لە گەل کەمالی ئەحمەد ئاغاش دانیشتم. زورمان قسە و باس کرد. جگە لە سەرکردەی حیزبەکان چەند دوستیکی ترم هەبو پیوەندییان لە گەل هیچکام لەو حیزبانە نەبو. جگە لەم حیزبە کوردییانە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی سوریاش لقیان هەبو. حیزبی شیوعی بارەگای ئاشکرایان نەبو.

کوردەکانی سوریا بە گشتی سیاسی بون، یان راستتر بە دوی هەوالەکانی کوردستان دا ئەگەران. بەلام لایان وابو تا کورد لە عیراق یا لە تورکیا بە مافەکانی نەگات، ئەوان هیچ دەسکەوتیکی سیاسی بە دەس ناهینن. لەبەر ئەوە زور بە تەنگ ئەوەوە بون بزانن چارەنوسی کورد لە یەکی لەو دو پارچەیەدا بە چی ئەگات.

لە ناو ئەو کتیبانەدا کە لەو ماوەیە خویندمەوە دیوانی مەلای جزیری بو. ئەم دیوانە مەلایەکی کورد ساغی کرد بووەوە و، بە عەرەبی لیکی دابووەوە و، شیعرە کوردیەکانیشی بە ئیملای عەرەبی نوسی بو، بەلام سەروبوری بو وشە کوردیەکان کرد بو، بە ئاسانی ئەخویندرانەوە. لە سوریا چاپ کرا بو. ساغکردنەوەیەکی چاک و، لیکدانەوەیەکی باش بو. پیشتر تەنیا ئەوەم لە سەر مەلای جزیری و شیعرەکانی خویند بووەوە کە عەلادین سەجادی لە «میژوی ئەدەبی کوردی» دا نوسی بوی، بەلام بە هوی ئەم دیوانەوە شارەزای بیری بەرزی سوفییانەی مەلای جزیری بوم و، زوقم لە شیعرەکانی وەرگرت.

دیوانی شیعری جگەر خوین «کیمە ئەز؟» تازە بە تیپی لاتینی لە لوبنان چاپ

کرا بو. له ناو خویندهوارانی کرمانجی دا جگەرخوین به شاعیریکی گەوره دائەنرا.

«مەم و زین» ی ئەحمەدی خانی تازه له تورکیا به لاتینی و به تەرجومەی تورکیەوه چاپ کرا بو. ئەو کتیبانەی له تورکیا چاپ ئەکران ئەگەیشتنه ناوچەی جەزیره، بەلام من کەلکیکی ئەوتوم لی وەرنەئەگرتن و، تی یان نەئەگەیشتم.

*

سەرەنجامی مەفرەزەکانی بادینان

لیرەدا به کورتی کرونولوجی به سەرهاتی مەفرەزەکانی بادینان ئەنوسمەوه:

۱ ی حوزەیرانی ۱۹۷٦ به بونەی تیپەر بونی ۱ سالەوه به سەر دامەزراندنی یەکیتی دا نقیب مهندس ئیبراهیم عەزو محەممەد (جەبار) فەرماندەی دەسته چەکدارەکانی بادینان بو یەکەمین جار له نزیک روباری هیزل له پشتی زاخو له گەڵ پیشمەرگەکانی تردا یەکی گرتەوه و کو بوەوه بو ریکخستنەوەی مەفرەزەکان و دابەش کردنی کاروفرمان به سەریان دا. ژمارەیان ۳۷ پیشمەرگه بو. بون به چوار مەفرەزه: ئیبراهیم عەزو، عیززەت ئیسماعیل شەنگاری، عومەر ئیبراهیم رشید، جەبار مەلا غەنی سندی، هەریەکەیان فەرماندەی مەفرەزەیەکیان بو.

ئەم ٤ مەفرەزەیه بو جیبەجی کردنی ئەرکەکانیان دابەش بون به سەر ناوچەکانی زاخو، ئامیدی، دهوک و، کەوتنه چالاکی سیاسی، ریکخراوی، پیشمەرگەیی. مژدەی دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکداریان به خەلکی بادینان دا و، پیوەندییان لە گەڵ زور کەس له گوند و شارەکان دامەزراند و، هەندی ناونیشانیان درا بویه بو دامەزراندنی پەیوەندی له گەڵ ریکخراوەکانی کومەله له سلیمانی. له گەڵ ئەوانیش پەیوەندییان دامەزراند بو.

۱۵ ی تەمموزی ۷٦ ئیبراهیم عەزو بو بەری کردنی پیشمەرگەیەکی نەخوش و، ناردنی پوسته دەربارەی ئەنجامی کارەکانیان له گەڵ مەفرەزەکەی چوه گوندی «نیروه» ناوچەی گویی (له قەزای ئولودەره) له کوردستانی تورکیا. پیشتر قم کەوت بونه چاودیری و سوراخی ئەم پیشمەرگانه له ناوچه سنورییەکانی ئولودەره – چەقورجه و، خیله کوردەکانی ئەوی یان لی هان دا بون که هەر کەسیکیان لەو پیشمەرگانه بەر دەس کەوت بیان گرن، چەک و کەلوپەلەکانیان بو ئەوان و، سەریشیان بو قم، چونکه ئەوانه جاشی صەددامن و، به فیتی صەددام ئەیانەوی شورش له بارزانی تیک بدەن!

خەلکی گوندی نیروه به ناوی میوانداریەوه له ناو مالیک دا دایان ئەنین. دەوریان ئەگرن و، به فیل هەمویان چەک ئەکەن و، به گیراوی تەسلیمی لیپرسراوەکانی

قم: هاشم رەمەزان، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق یان ئەکەن.

ماوەیەک بە گیراوی لە گەور و گوفەکانی ناوچەکانی گویی، قەشوری، ئەرتوشی... سوڕاندیانەوە و، قم گوی یان نەدایە نامەکانی مامجەلال و، ناوێژی و هەولەکانی سەرانی د د ک د، سەرەنجام هەموویان کوشتن.

۱ ی ئابی ۷٦ پاش ئەوەی ماوەی چەند هەفتەیەک مەفرەزەکانی بادینان ئاگایان لە فەرماندەکەیان نامینی، جاریکی کە یەک ئەگرنەوە بڕیار ئەدەن: عیززەت ئیسماعیل و عومەر ئیبراهیم بە خویان و مەفرەزەکانیانەوە بچن بو سوراخی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی. جەباری مەلا غەنی و مەفرەزەکەشی لە ناوچەکەدا بمینیتەوە بو درێژەدان بە کارەکانی خوی.

عیززەت و عومەر لە گەڵ مەفرەزەکانیان رو ئەکەنە ناوچەی گویی. دیسان تاقمی لە خەلکی گوندی «رووبوزک» بە ناوی میوانداریەوە تەفرەیان دا بون. دەوریان گرت بون و داوایان لی کرد بون چەک دابنین.

عیززەت ئەکەویتە دواندنیان بە قسەی خوش و نەرم زوریان لە گەڵ خەریک ئەبی لەو بیرە چەوتە پەشیمانیان بکاتەوە. کەلکی نابی. سەرەنجام پی یان ئەڵی: «من چەکم بو ئازادی کوردستان هەلگرتوە، لە ئاشبەتالەکەوە تەمی خواردو بوم، بەلێنم داوە تا کوردستان ئازاد نەبی جاریکی تر بە ساغی چەک بو هیچ کەس و تاقم و لایەک دانانیم، مەگەر بمکوژن ئینجا چەکەکەم ببەن».

ئەبی بە میل راکیشان لەوی دا عیززەت ئەکوژری.

ئینجا لی یان ئەپرسن: «کی مسئولتانە؟»

عومەر ئیبراهیم و، قاسم محەممەد هەلئەستن ئەلین: «دوای ئەو ئیمە مسئولین».

عومەر فەرماندەی مەفرەزە و، قاسم خویندکاری کلیەی هندسەی زانستگای موسل و، رابەری سیاسی مەفرەزەکەیان بو، هەر لە وی دا عومەر و قاسمیش ئەکوژن.

۱۸ پیشمەرگە کە پاشماوەی هەردو مەفرەزەکە بون بە گیراوی بران تەسلیمی بارەگای قم کرا لە گوندی مەرگەهـ لە نزیک ئولودەرە.

۱۵ ی ئابی ۷٦ تاقمی لە چەکدارەکانی قم بە سەرکردایەتی عەبدوللا رەمەزان، مەحمود گویی، یوسف گویی.. پیشمەرگە گیراوەکانی مەفرەزەکانی عیززەت و عومەریان دایە پیش بەرەو ئەشکەوتی «بالی» لە نزیک گوندی مەرگەهـ. هەموویان کوشتن و لاشەکانیان لە ئەشکەوتەکەدا بە جی هیشتن. بە ریکەوت یەکی لە پیشمەرگەکان نامری و، خوی ئەگەیەنیتە مالی یەکی لە دانیشتوانی ناوچەکە، ئەوانیش دالدەیان دابو، تیماریان

کـرد بو، بەلام قم پی ی زانی بو، بو ئەوەی شـوێنەواری تاوانەکـەیان کـوێر بکەنەوە، ئەویشیان بە زۆر لە کابرا سەند و کوشتیان.
.٣ ی ئابی ٧٦ لە کـاتێک دا کـە مـەفـرەزەکـەی جـەبباری مـەلا غـەنی لە سـەر کانیەک لە ناوچەی سندی نزیک زاخو خەریکی چایی لێنان بون، تاقمی لە چەکدارەکانی قم بە سەرکردایەتی محەممەد خالید دەوریان گرتن و دایاننە بەر دەسرێژی گوللە. جەبار و ٣ پێشـمـەرگەی تر لە هاوڕێکانی لەوێ دا کـوژران. ئەورەحمـان حـەسـەن شـەنگاری و ٣ پێشمەرگەی کە لە ئابلوقەکە دەرباز بون و، بەلام کەوتنە داوی جاشێکی عێراقەوە بە ناوی جەعفەر بیسفکی، ئەویش تەسلیمی عیراقی کردن. دوای ماوەیەک لە موسل هەلواسران.
ئەورەحمان لە زیندانی موسلەوە نامەیەکی ئازایانەی بە عەرەبی بو مامجەلال نوسی بو.
بەمجورە مەفرەزەکانی بادینان بە ناکامی لە ناو چون.

*

هاتنی عومەر مستەفا و جەوهەر نامیق بو سوریا

کـاک عومـەر ویستبوی بێتە سوریا. د. خالید تاقمی پێشـمـەرگەی گورجوگولی بالەکایەتی هەلبژارد بو. مانگی تشرینی یەکەمی ٧٦ لە گەل کاک عومەر بە ری کەوتن بو بادینان. چەندی سوراخیان کرد بو هەوالی پێشمەرگەکانی یەکێتیمان نەزانی بو. بە هوی چەند کـەسـێکی خەلکی ناوچەکـە زانی بویان هەندی لە سـەرکردەکـانی قم لە نزیک «چەلی» ن لە تورکیا بە هوی ماجید بەگی سەروکی شارەوانی چەلیوە پەیوەندییان لە گەل کرد بون. کەریم سنجاری و جەوهەر نامیق هاتبون لە جێگایەکی سەرسنور بە ناوی «دولی فەقیران» یەکتریان دی بو. وا رێک کەوت بون کاک عومەر و جەوهەر پێکەوە بێن بو سوریا بو بەلاداخستنی ناکوکییەکان. هەر لەوێوە ئەچنە چەلی و بە ناو تورکیادا هات بون بو جزیرە و، لەوێوە لە سنور پەڕی بونەوە بو ناو سوریا. وەکـو دوایی دەرکـەوت قم لەو ماوەیەدا ئیبراهیم و هاوڕێکانیان کوشت بو.
من لە دیرکی بوم کـە ئەوان گـەیشتن. کـاک عـومـەر دلێری برای و شـێروش و شـالاوی عـەلی عـەسکەری لە گەل خوی هێنا بو. لە دیرکی هاتنە بارەگـاکـەی ئێـمـە. من جەوهەرم نەئەناسی. کاک عومەر وتی: «لە بادینان سوراخی پێشمەرگەکانی یەکێتی مان کـرد، بەلام هیچ هەوالێکیـانمان دەس نەکـەوت». منیش وتم: «وەکـو ئەلێن قم هەمـویانی گـرتوە و قسـە هەیە هەمـویان کوشت بن»، ئینجا دابەزیمـە سەر قم و باسی تاوانەکانیانم کرد. جەوهەر هەلی دایە. کاک عومەر وتی: «ئێمە فلانو پێکەوە هاتین ناکوکییەکان

چارەسەر بکەین». وتم: «کەواتە لەم بپرسە پیشمەرگەکانی بادینانی چی لی کردوە؟». لە گەڵ جەوهەر بو بە دەمەقالێمان. لە دیرک نەمانەوە بە ری کەوتن بو شام.

ئەم پیوەندی لە گەڵ حکومەتی سوریا دامەزراند بو. ئەوانیش وەکو ئیمە ئازادی هاتوچو و کاریان هەبو. لە گەڵ دەزگا موخابەراتییەکان پیوەندی بە هیزیان دروست کرد بو. زورجار هەواڵ و دەنگوباسی دروستکراویان لە سەر ئیمە ئەدا بە دەزگا ئەمنییەکانی سوریا. زورجار کیشەو گیروگرفتیان بو ئیمەو پیشمەرگەو ئەندامەکانمان ئەخولقاند.

*

رێپیوانیکی سەرنەکەوتو

لە گەڵ سەرکردایەتی ولات وەها ریک کەوتبوین ئەوان خەریکی ئاواکردنەوەی ناوچەکانی هەولیر و سلیمانی و کەرکوک بن، ئیمەش هی بادینان. ٤ مەفرەزەی کە لە گەڵ ئیبراهیم عەزو گەرانەوە لە ناوچون. جگە لە بادینان لە هەمو ناوچەکانی تر پیشمەرگە کەوتنە جموجوڵ. بادینان گرنگییەکی جیوپولیتیکی هەبو. سنوری بە تورکیاو سوریاوە بو. ریگای هاتوچوی دنیا بو. ریگای گویزانەوەی چەک بو. نەمانئەتوانی وازی لی بهینین.

لە ناو تورکیا خەلکیکی زورمان ریک خستبو. زوریان لەوانە بون پیش ئاشبەتاڵ پیشمەرگە بون و جیگەی خویان لە تورکیا کرد بوەوە. لە جزیرە، سلوپی، شەرناخ، ئولودەرە، شەمزینان بنکەی سیاسی مان دامەزراندبو. لە زور جیگاش چەکمان حەشار دابو.

یەکی لەوانەی پشتمان پی بەست بو کابرایەکی زاخویی بو بە ناوی «عیصمەت دینو». عیصمەت دوستی خالە بوزی و، ناسیاوی صەبری نەواف بو. ئەوان باوەریان پی کرد بو بە ئیمەشیان بە ناسین دابو. عیصمەت بە خیزان و دەسوپیوەندەکانیەوە لە شوینیکی سنوری عیراق و تورکیا دانیشت بو. چەندین کلاشینکوف و ئارپیجی و تەقەمەنی مان لە لا دانا بو. لە ئولودەرەش ریکخستنمان دروست کرد بو لە ناو کونە پیشمەرگەکانی گویی دا و چەکدارمان کرد بون و چەکی زیادەمان لە لا دانابون.

هیزەکانمان سازدا و، چەند مەفرەزەیەکمان لی دروست کردن. ئەفسەرەکانمان کرد بە فەرماندەیان. دوا هەفتەی مانگی ١١ی ٧٦ ئامادەمان کردن بو جولان. هەمومان نەمانئەتوانی پیکەوە لە سوریا بەری بکەوین. لەبەرئەوە بو دەرباز بون لە سنور کردمان بە ٣ تاقم:

تاقمی یەکەم بە سەرکردایەتی حەسەن خوشناو بە کەلەک لە روباری دیجلە

پەڕینەوە. حەسەن ئەبو بچیتە ناوچەی گوێی و، پێشمەرگەکانی ئەوێ ساز بدا.

تاقمی دووەم بە سەرکردایەتی فوئاد عومەر شەوێک دوای ئەوان بە کەلەک لە ڕووباری دیجلە پەڕینەوە. فوئاد و جەمال ئەبو بچنە ناوچەی سلوپی عیصمەت دینۆ و پێشمەرگەکانی ئامادە بکەن.

تاقمی سێیەم کە عادل موراد و سەید کەریم و سەردار دەلوێی و فەرهاد شاکەلی و منیان لە گەڵ بوو ئەبو شەوی سێیەم ٧٦/١١/٢٤ لە دیجلە بپەڕینەوە، هەر ٣ تاقم لە لای عیصمەت دینۆ یەک بگرینەوە و، لەوێوە بەرەو بادینان بەڕێ بکەوین و، لە بادینان دابەش ببین بە سەر ناوچەکان دا.

ئەو شەوەی ئەبو ئێمە بپەڕینەوە ڕۆژەکەی بارانێکی زۆر باری بوو ئاوی دیجلە هەڵسا بوو. سواری کەلەک بووین لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا کەلەکەوانەکە گەڕایەوە بۆ دواوە. نەیتوانی بمانپەڕێنێتەوە. ئەو شەوە نەمانتوانی بڕوین. بۆ ڕۆژی دایی ناچاربووین لە وشکایییەوە بڕوین هەرچەندە ڕیگاکەمانی دوور ئەخستەوە. شەوەکەی لە تەلبەندی سنوور دەرباز بووین. بەڵام پێشەنگی هێزەکەمان لە گەڵ دەوریەی جەندرمە پێکا هەڵپژان. هەرچۆنێ بوو تێپەڕین. بەڵام نەمانتوانی بگەینە جێگایەکی ئەمین. ڕۆژمان بە گردێکەوە بەسەر برد لە نزیک دێیەک. دامەزراین بۆ شەڕ چونکە هێزی جەندرمە کەوتنە کیومالی ناوچەکە بە دوای ئێمەدا ئەگەڕان. ئێمە ئەوانمان بینی بەڵام ئەوان ئێمەیان نەدی و، خەڵکی گوندەکەش کوردپەروەر بوون، نەک هەر زمانیان لێ نەداین، بەڵکو سەریان لێ تێک دان.

ئێوارە بەڕێ کەوتین بەرەو چیای جودی و لەوێوە بەرەو شوێنی دیاریکراو. کاتێ لە ناوچەکە نزیک کەوتینەوە زانیمان ڕۆژی پێشتر عیصمەت تەسلیمی عێراق بوتەوە. لە گەڵ هێزەکانی حەسەن و فوئاد یەکمان گرتەوە. چەند کەس و مەفرەزەی ئێمە لە بادینییەکان شەو لە ناو هەڵاتن بۆ ناو قم. تومەز پێشتر پێوەندییان لە گەڵ قم هەبوو تەگبیریان بۆ کرد بوو. تەسلیمبوونەوەی عیصمەت، کە بە تەمای ئەو بووین ڕێبەریمان بکا و، ڕاکردنی یەک لە دوای یەکی مەفرەزە بادینییەکان، نائومێدییەکی زۆریان تێ دا بڵاو کردینەوە. لە لایەک جەندرمە بە دوامانا ئەگەڕا، لە لایەکی ترەوە خەڵکی ناوچەکە هاوکارییان لە گەڵ نەئەکردین. تەنانەت خواردنیشیان پێ نەئەفرۆشتین. بۆ خۆپاراستن زۆرمان جێگۆڕکێ کرد. ڕێبەرەکانیشمان گوێی بوون، ئەترسان بە هۆی ئێمەوە تووشی کێشە بین، ئەیان ڕەتاندین و ئەیانویست ماندوومان بکەن بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە. لە هەوارێکمان دا ناوی چەکو بوو هەرگیز ڕێگای وا سەخت و کوورم نەدی بوو. چوینە گوندەکانی شاخ و زیارەت. ئەمانە هەواری میری بۆتان بوون و کاتی خۆی میربەدرخان هاوینانی لەوێ گوزەراندوە. شاخ

گوندێکی زۆر خۆش بو.

عەلی شاخی یەکێ لە ڕێبەرەکانمان بو خەڵکی ئەو گوندە بو. قم پاش ماوەیەکی کورت کوشتیان لە سەر ئەوەی چاوساغی ئیمەی کرد بو. بە جێگایەکا ڕاببوردین ناوی دولی کورتان بو بەرەو گوندی بلکێ. بلکێ لە سەر سنور بو. لە ناو سەرما خومان کرد بە ناو گوندا. خەڵکی گوندەکە بە ناپەدلی جیگایان کردینەوە. هەستمان کرد خۆیان ئامادە ئەکەن لیمان دامەزرێن. بەیانی زو، پیش ئەوەی ئەوان بە خو بکەون، بە وریایی و ڕیکوپیکی کشاینەوە. لام وایە لەبەر زوری ژمارەی ئیمەو وریایی خومان زاتیان نەکرد پەلامارمان بدەن. قم خەڵکی ئەو ناوچانەی لە یەکیتی تیژ کرد بو. کابرایەکیانم دواند، لەم پرسی بوچی دوژمنایەتیمان ئەکەن؟ وتی: «هون لە سەر خەتی سەروک نامەشن!»

من کەوتبومە هەلویستیکی ناڵەبارەوە. هەمو توشی نائومیدی بون. وایان ئەزانی خەلک بە چەپلەریزان پیشوازیمان ئەکەن. کەچی دوژمنایەتیمان ئەکردین. باوەرم وابو بەمجورە تیپەرین بو کوردستانی عیراق ناکری و، لەوە زیاتریش بینینەوە توشی هەمان چارەنوسی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی ئەبین. چوینە شاخی هەرەکول لەوی بریارم دا هیزەکمان هەموی بگەریتەوە سوریا. من و سەید کەریم و حەسەن خوشناو و عەبدوللا خوشناو لییان جیا بوینەوە چوینە گوندی «رەپن» تەنیشت «ئولودەرە» بو ناو گویەکان. گویی دویەش بون. هەندیکیان لە گەل قم و هەندیکیان لە گەل یەکیتی بون. هەندیکیان لە شورشی ئەیلول دا پیشمەرگە بون. زوریان بە کریکاری چوبونە موسل و عەرەبییان ئەزانی. شارەزای بادینان بون و، جوری ژیان و هەلسوکەوتی روژانەیان فیری ژیانی عەسکەری کرد بون. ویستمان لەویوە ریگایەکی تازە بدوزینەوە بو جاریکی تر. سەرکەوتو نەبوین.

یەکی لەو نوکتانەی هەرگیز لە بیرم ناچیتەوە لەم سەفەرەدا گویم لی بو. نیوەشەویکی سەرەتای مانگی کانونی یەکەم لە روباری هیزل ئەپەرینەوە. بو ئەوەی جلەکانمان تەر نەبیت خومان روت کرد بوەوە. هەوا زور سارد بو، ئاوەکەش ساردتر. ژان ئەچوە ئیسقانەوە. چاوساغیکی گویمان هەبو ناوی حەمەرشید بو. کە لە ئاوەکە پەرینەوە دنیا ئەوەندە تاریک بو چاو چاوی نەئەبینی. حەسەن خوشناو بە دەنگیکی بەرز بانگی کرد: «حەمەرشید! حەمەرشید!» .وتم ئاخو ئەبی حەمەرشیدی بوچی بی؟ حەمەرشید هات وتی: «بەلی کاک حەسەن ئەمرکە!». حەسەن زور بە خوین ساردییەوە وتی: «سەیری گونم بکە بزانە نەمەریوە!»

پاش هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، ریگاوبانەکانی، تیگەیشتم گەرانەوەی

بە کـومـەڵ لە کـردن نایەت. ئەبی بیـر لە شـیـوەیەکی تر بکەینەوە. ئیـمـەش بریارمـان دا بگەریینەوە بو سـوریا. چوینە جـبـلاتپنار و بە شـەو بە پارە لەگـەڵ جـەندرمـە لە سنور پەرینەوە بو سەری کانی لە سوریا. دو کەس لە سەرکردەکانی پ د ک ت مان لە گەڵ هات بون. ئەچون بو کوبونەوەی هاوبەشی ئەوان و یەکیتی.

هەرچەندە سـەفـەرەکـەمـان ۳ حـەفـتـە زیاتر دریژەی نەکـیـشـاو، هەمـو بە سـەلامـەتی گەیشتینەوە سوریا. بەلام بە راستی ئەمە تیشکانیکی نەفسی و سیاسی ناخوش بو. بو من تەجـروبەیەکی دەولەمـەن بو بو روژگـاری داهاتوم. هەندی لەوانەی هاوبەشی ئەم ریپـیـوانە سەرنەکەوتوە بون، خەتای منیان ئەگرت و، بە یەکجاری چونە ئەوروپا.

من ئیـتـر نەچومـەوە بو دیرک و، ئومـیـدیکی ئەوتوشم بە کـاری ئەوی نـەمـا. چومـە شام.

*

کەم بژی و، کەڵ بژی!

گیراوەکانی کومەلە: شـەهاب و هاوریکانی، دوای لیکولینەوەیەکی پر لە ئازاردانی چەند مانگە دران بە دادگا. شەهابی شیخ نوری و، جەعـفـەر عەبدولواحید لە سەرکردایەتی کومەلە و، ئەنوەر زوراب لە ریکخستنی بەغداد حوکمی ئیعدام و، ئەوانی تر لە ٥ تا ١٥ سال حوکم دران.

روژی ٧٦/١١/٢١ شـەهاب و جەعـفـەر و ئەنوەر لە سیدارە دران و، تەرمەکانیان برایەوە بو کوردستان. ئەمانە تاقمی یەکەمی تیکوشـەرانی کورد بون لە سیدارە بدرین. بە ئازایەتیـیـەکی بی وینەوە روبەروی دەزگـاکانی لیـکولینەوە و، دادگـا و، هەلواسـین بونەوە. نەریتی ئازایانەی «کەم بژی و، کەڵ بژی» یان بو هاوریکانیان داهینا. بە بونەی هەلواسینی شـەهاب و هاوریکانیەوە کومەلە لە کوردستان بەیانیکی بە کوردی دەرکرد. بەیانەکە کاک ئارام نوسی بوی. لە سوریاش ژمارەیەکی «الشرارە» بو ئەم رووداوە تەرخان کرا.

*

گـەرەکـیـکی شـام نـاوی «حی الاکـراد» بوە. نـاویان گـوری بو بـە «رکن الدین». حـەسـەن خوشناو و سـەید کـەریم و من چەند مـانگی لە فـلاتیک ئەژیاین لـە «رکن الدین» بەرامـبـەر بـە شـاخی قـاسـیـون و، «تاخی کـرمـانج». زور جـار بە پی بـە قـاسـیـون دا هەلئـەگەراین. زوری ئیـواران مـیـوانمان ئەهات. ژیانی روژانەی خومان وا ریک خـسـت بو: سـەید کـەریم خـواردنی دروست ئەکـرد، حـەسـەن مـالەکـەی خاوین ئەکـردەوە، منیش قـاپ و قاچاغم ئەشت و، پیکەوە بازارمـان ئەکرد. لە کـاتی پیـویسـتـیش دا یارمـەتی یەکـتریـمـان

ئەدا. پیکەوە ۳ هاوری ی گیانی بە گیانی و تەبا بوین. شورش عەسکەری یش کەهاتە شام هاتە لای ئیمە، ئەو کاتە هەرزەکاریکی تازە پیگەیشتو بو.

*

جاری یەکەم کە چوم بو شام چەند روژی من لە گەل چەند کەسیکی کەدا پیکەوە لە فلاتیک دا بوین. ماوەیەکیش ئەنوەر شاکەلی لەوی بو. ئەنوەر تازە ناوی خوی گوری بو بو فەرهاد شاکەلی. دیوانیکی شیعری نوسی بو بە تەما بو چاپی بکا. دای بە من بیخوینمەوە و رەئی خومی لە سەر بلیم. من خویندمەوە و بە وردیش خویندمەوە. فەرهاد ئەندامیکی تازە پیگەیشتوی کومەلە بو. بە سەنگ و تەرازوی ئەو کاتە بە روشنبیر لە قەلەم ئەدرا. بەلام لە بیروباوەردا هەتا بلیی توندرەو و کال بو. دژی زوری ئەوانە بو لە دەوری یەکیتی کوبوبونەوە و، بە بورجوازی و دەرەبەگ و بی کەلکی دائەنان. لای وابو دوای گوران تەنیا شاعیر لە کوردا هەلکەوت بی خویەتی.

من هەولیکی زورم لە گەل دا هەندی لەو بیروړا چەوتانەی راست بکەمەوە، بە هیوای ئەوەی ببیتە کادریکی بە کەلکی کومەلە و یەکیتی، بەلام بیرورای لە سەر منیش گورا. بە تایبەتی کە ویستی، بەو جورەی خوی ئەیەوی، پیشەکی بو دیوانەکەی بنوسم، وەکو شاعیری کومەلە و جیگری گوران پیشکەش بە خوینەوارانی بکەم. راستیەکەی بە پیچەوانەی چاوەروانیەکانی ئەوەوە لە من، من ئاموژگاریم کرد، ئەو وەکو گەنجیکی روشنبیر کە سەرەرای کوردی، زمانەکانی عەرەبی و فارسی ئەزانی، باشتر وایە واز لەو شیعرە بی فەرانە بهینی و خوی بە نوسینی شتیکی بە کەلکترەوە خەریک بکا، بە تایبەتی لەو کاتەدا «الشرارە» دەر ئەچو، بە تەمای دەرکردنی «ریبازی نوی» ش بوین.

مەبەستم لەم قسەیە، بیگومان، شکاندنی نرخی ئەو پیاوە نەبو، بەلکو من وەکو بەرپرسیکی گوی لی گیراوی کومەلە و یەکیتی، لە روی دلسوزی و دل پی سوتانەوە ئەمویست ریگایەک پی نیشانی کەسیکی لە خوم کەمتەجروبەتر بدەم، بۆ خوی و بو یەکیتی باشتر و سەرکەوتوتر بی.

دیوانەکەی چاپ کرد و، شیعرەکانیشی هیچ شورشیکیان لە ئەدەبی کوردی دا هەلنەگیرساند.

فەرهاد شاکەلی لە قسەکانی من توشی «خیبە امل» بو، بگرە وەکو ئەلین قوشقی بو. خزیشی ماوەیەک بو توشی سەر لی شیوانی سیاسی بو بو، ئەبویست بە یەکجاری بچی بۆ ئەوروپا، وازی لە یەکیتی و کومەلە هینا، ماوەیەک لە گەل «وحدە القاعدە» و ماوەیەکیش لە گەل «سازمانی ئینقیلابی» کاری کرد، پاشان روی کردە سوید. وازی لە

شیعر هینا، بەلام فیری «موهاتەراتی سیاسی» بو.

*

«زانستگای دیمەشق» هەمو ئەو خویندکارە کوردانەی وەرگرت کە لە ئیران و عیراقەوە هات بون. بیگومان ئەمەش کاریکی نائاسایی بو، «قیادەی قەومی» بە تایبەتی بو یەکیتی جیبەجی کرد. هەر خویندکارە پیشتر لە چ «کلیە» یەک و لە کام «پۆل» بو بو، لە هەمان «کلیە» و «پۆل» وەرگیران. یەکیتی ژیانی هەمویانی دابین کرد بو: موچەی مانگانەی بو بری بونەوە و، کری ی خانوی بو ئەدان.

مامجەلال تەعقیبی خویندکارەکانی کرد بو بۆ ئەوەی بزانی لە خویندن دا چونن، زوریان دەوامیان نەکرد بو. مامجەلال کوبونەوەیەکی لە گەل کردن بو ئەوەی لە گیروگرفتەکانیان بکولیتەوە و، بویان چارسەر بکا.

یەکی لەم خویندکارانە تازە لە عیراقەوە هات بو. دوستی کومەلە بو. لە کلیەی هندسە وەرگیرا بو. ناوی شەمال بو. شەمال لە هیچی کەم نەبو، موچەی مانگانەی ئەوەندەی موچەکەی من بو، پارەی کتیب و کەلوپەلی زانستگاشیان بو دا بو.

مامجەلال لی ی پرسی بو: «گیروگرفتەکانی چیە؟». وتبوی: «گیروگرفتم نیە». پرسی بوی: «ئەی بو دەوام ناکەی؟» شەمال وت بوی: «من ناتوانم لە ولاتیک دا بخوینم کوردی تی دا بچەوسیتەوە. کورد لە سوریا ئەچەوسینریتەوە لە بەر ئەوە منیش تاقەتی خویندنم نیە». شەمال خویندنی تەواو نەکرد و چو بۆ ئەوروپا.

*

عارف تەیفور و وریا سەعاتچی و کەریم سنجاری کەوت بونە هاتوچو بو سوریا.

مامجەلال چو بو لەندەن. مەسعود و سامی بینی بو. یەکی لە مەسەلەکانی باسیان کرد بو لیکولینەوەی هاوبەش بو لە کوشتنی مەفرەزەکانی یەکیتی و، سزادانی بکوژەکان. مەسعود و سامی بیئاگایی خویان لەو رووداوە پیشان دابو. بەلینیان دابو کە ئەگەر لەگەل یەکیتی پیک بین یا پیک نەیەن لەو رووداوە بکولنەوەو سزای تاوانبار بدەن. مامجەلال پروژەیەکی سیاسی پی دابون بو ریککەوتن. پاش دەسکارییەکی کەم قەبولیان کرد بو.

*

جموجولی بنەمالەی بارزانی لە مانگەکانی شوبات و مارتی ۷۷ دا نمونەیەکە لە جوری رەفتاری سیاسیی ئەم بنەمالەیە لە گەل رووداوەکان دا لەوەتی سەرکردایەتی جولانەوەی کوردیان گرتوتە دەس:

– مەلا مستەفا لە واشینتون خەریکی تازەکردنەوەی پیوەندی بو لە گەل

بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکی.
- مەسعود لە شام خەریکی تازەکردنەوەی پەیوەندی بو لە گەڵ سوریا و ڕێکخراوە فەلەستینییەکان.
- ئیدریس لە کەرەج خەریکی سەرپەرشتی چالاکییەکانی ق م بو، کادر و مەفرەزەی ئەناردەوە بو کوردستانی عیراق.
- عوبید و لوقمان لە بەغدا بون. عوبید وەزیر بو لە وەزارەتەکەی بەعس دا.
لێرەدا بە پێویستی ئەزانم کرونولوجی هەندی لە روداوەکان، پشت ئەستور بە بەلگە، بنوسم بو ئەوەی خوێندەوار بتوانی لە گەڵ یەک بەراوردیان بکا و، پێکەوەیان گری بدا. ئەوسا من هەندی لە مانەم ئەئەزانی سالانی دوایی تێیان گەیشتم:
٩ ی شوباتی ٧٧ مەلا مستەفا نامەیەکی درێژ بو کارتەر ئەنوسی دەربارەی هەلومەرجی کوردستان. کارتەر نامەکەی پشت گوێ خست و وەلامی نەدایەوە.
١٤ ی شوبات مەلا مستەفا نامە بو سەناتور و نوێنەرەکانی ئەمەریکا ئەنوسی و، وێنەیەکی نامەکەی بو کارتەری نارد بو، بویان ئەنێری و گلەیی ئەکا کە وەلامی نەدراوەتەوە.
٢٧ شوبات ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی بانگ ئەکات و، دایئەنی بە سەرکردەی فەیلەقی یەک و، کوژاندنەوەی شورشی سەرلەنوی دەس پێ کردوی کوردستانی پێ ئەسپێری. النعیمی لەم رووەوە لە «تجربتی فی القیادە» دا نوسیویتی:
«٣٥٣. لقد کان الوقت مساء من یوم ٢٧ شباط ٩٧٧ وانا مشغول فی احد المؤتمرات الاسبوعیه لمناقشه کراسات التدریب واذا بالتلفون والمتکلم السید رئیس ارکان الجیش حیث طلب حضوری الی دائرته وعند ذهابی الیه ابلغنی ان السید الرئیس القائد یطلب حضوری وقد ذهبنا معا الی دائره السید وزیر الدفاع وبادرنی السید الرئیس القائد انه تم اختیاری قائد فیلق فی الشمال (مع العلم ان الحرکات فی شمال الوطن قد بدأت ثانیه) وقال انی اطلب منک ان تنهی المعرکه بسرعه فقلت له سیدی سابذل کل جهدی من اجل ضرب العصاه ولکن لایمکن لای قائد عسکری ان یحدد موعدا لانهاء حرب عصابات یحرکها الاستعمار وهناک حدود مفتوحه لجاورها دوله لها اطماع فی بلدنا وفی منطقه ملائمه لحرب العصابات»
١ ی مارت سوریا ناکوکی یەکێتی و قم ی پی خوش نەبو. ئەیانزانی ئەوان لە تورکیا نفوز و دەسەلاتیان هەبو، بە بی کرانەوەی ڕێگای تورکیاش یەکێتی ناتوانی پەرە بە چالاکییەکانی بدا. سوریەکان مەسعودیان بانگهێشت بو سوریا. لە ئوتێلی «میریدیان»

میوانداریبیان کرد.

ناوبانگی پارتی له دوای ئاشبهتاڵ زرا بو. له ناو هیزه سیاسیهکانی عیراق و ناوچهکه دا سوک بوبون. مسعود و وهفدهکهیان له ههولی ئهوهدا بون پیوهندی قم نوی بکهنهوه له گهڵ ههمو لایهک. خهریکی گفتوگو بون له گهڵ حکومهتی سوری و، حیزبی بهعس و، «والتجمع الوطنی العراقی» و، حیزبه کوردیبهکانی سوریا و، ریکخراوه فهلهستینییهکان.

مسعود و مامجهلال به دوقولی و، نوینهرایهتی ههردولا له قم: مسعود و کهریم سنجاری و عارف تهیفور و، وریا سهعاتچی و، له یهکیتی مامجهلال و د. فوئاد و، عادل و ، رهزاق و من چهندین جار دانیشتین و سهردانمان کردن. سهرکردایهتی عیراقی بهعس که له سوریا بون ههولیکی زوریان دا ههردولا له یهکتری نزیک بخهنهوه. قم له گهڵ تجمع نهگهیشته ریککهوتن. بهلام ریککهوتنیکی مهیدانیی له گهڵ یهکیتی و حیزبی بهعس ئیمزا کرد. ئهمهش دهقی ریککهوتنهکه:

من اجل تحقيق التعاون العملى فى ميدان العمليات العسكرية واتخاذ الخطوات الكفيلة بتنسيق جهود المقاتلين الثائرين على الحكم الفاشى فى العراق وايصال الاسلحة والاعتدة والمساعدات المالية اليهم وتوفير سائر مستلزمات ديمومة وانتصار الثورة المندلعة فى كردستان العراق باعتبارها جزءا هاما من الثورة العراقية الديمقراطية المناضلة من اجل تحقيق اهداف الشعب العراقى التى يشكل برنامج التجمع الوطنى العراقى ارضية جيدة لها. اتفقت الاطراف الثلاثة على اقرار وتنفيذ الخطوات التالية:

اولا: اعتبار جميع المقاتلين الثائرين على الفاشية فى كردستان العراق بصرف النظر عن انتماءاتهم الحزبية والسياسية جنودا لجيش الثورة العراقية الديمقراطية ومعاملتهم على قدم المساواة من حيث التسليح والتموين والاعتدة وتوفير سائر مستلزمات مواصلة القتال.

ثانيا: تاليف لجان تنسيق ميدانية من ممثلى الاطراف الثلاثة فى مناطق القتال المختلفة لتوحيد جهود الانصار وزجها ضد الفاشية كقوى متحدة ومتضامنة فى القتال وكذلك لحل الخلافات والاشكالات التى تنجم بروح الاخوة الكفاحية ورفقة السلاح فى الجيش الواحد.

ثالثا: الشروع فورا بتاليف لجان التنسيق فى المناطق الضرورية والممرات الهامة حسب مايتفق عليه لتامين ايصال الاسلحة والاعتدة الى المقاتلين على ارض الوطن وكذلك لاعادة المقاتلين الموجودين فى الخارج مع بعضهم لينضموا الى اخوتهم المقاتلين فى الوطن.

رابعا: بذل الجهود المشتركة والانفرادية المنسقة بين الاطراف المشتركة للحصول على الاسلحة المتطورة والاسلحة اللازمة لادامة الثورة بما فيها تشكيل لجنة مشتركة للتفتيش عن

الاسلحة وشرائها وتوحيد الجهود لامداد المقاتلين بها بالسرعة االقصوى.

خامسا: وقف الحملات الاعلامية والكلامية وتوجيه القواعد بروح التعاون والاخوة.

سادسا: يقوم كل طرف من الاطراف الثلاثة بابلاغ قياداته وجهازه المسؤول بمضمون هذا الاتفاق والزامهم بتنفيذه وبذل كل الجهود اللازمة لوضع هذا الاتفاق موضع التطبيق العملي.

عن حزب البعث العربي الاشتراكي

باقر ياسين

عن الحزب الديمقراطي الكردستاني القيادة المؤقتة

مسعود بارزاني

عن الاتحاد الوطني الكردستاني

جلال طالباني ١٩٧٧/٣/١

هەمان رۆژی کە یەکەمین ڕێککەوتن لە نێوان مامجەلال و مەسعودا ئیمزا کرا، ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی بەش گەیشتە کەرکوک، بۆ بارەگای فەیلەقی یەک، بۆ سەرکردایەتی لەشکرکێشییەکانی جەیشی عیراق دژی کورد. پاش چەند ڕۆژی لەشکرکێشیی گەورەی دەس پێ کرد بۆ سەر پێشمەرگەکانی کوردستان و بنکەکانیان. لەم ڕووەوە نوسیویتی:

«لم تكن هناك حفلة توديع ولا حتى توديع للضباط والمراتب لان المطلوب التحاقي بسرعة الى منصبي الجديد قائدا للفيلق الاول في الشمال وهكذا كانت رغبتي دائما هي الالتحاق السريع بعد صدور امر نقلي ولذلك كان سفري للالتحاق يوم ١ اذار ١٩٧٧ حيث وصلت بالطائرة الى قاعدة كركوك الجوية وكان عدد من الضباط قد حضروا لاستقبالي في المطار ووصلت الى مقر الفيلق في معسكر كركوك.»

٣ ی مارت مەلا مستەفا نامەیەکی تری بۆ کارتەر نوسی داوای بینینی ئەکات. لە نامەکەی دا نوسیویتی: «ئەم بینینەی دوایی ئێوە و بینینەکەی جێگری سەرکۆمار ماندیل لە گەڵ ڤلادمیر بوکوفسکی سەرنجی گەورەی ئێوەی لە گەلی زۆرلێکراو و، ئارەزوی ڕاستەقینەی ذیوەی بۆ یارمەتیدانی بۆ پێشەوە چونی «ئازادی و مافی دەربڕین»، بە ئاشکرا دەرخست. ئەم کارە بێگومان وورەی هەمو بەرهەڵستکارانی شورەوی بە هێز کرد. ٣ ملیون گەلی کورد لە عیراق دا کە بە هۆی ڕوداوەکانی پێش و پاش ڕێککەوتنی خیانەتکارانەی جەزائیرەوە لە ٦ ی مارتی ٧٥ دا وورەیان لە دەس داوە، لە هەمو کەسی زیاتر شایانی ئاور لێ دانەوەی ئێوەن. بینینی ئێوە و جێگری سەرکۆمار یارمەتییەکی گەورە ئەبێ بۆ بەرزکردنەوەی وورەیان و هەروەها پشتیوانی لە بار و دوخی ئەوان لە

تاریکترین کاتی میژووی کوردستان دا له لایەن ئیوەوە، یارمەتی ئەدا. به ئومید و خوشبیەکی زورەوە چاوەروانی بینینتانم.»

*

مەسعود داوای له مامجەلال کرد بو: بادینیەکان بگەرینەوە بادینان و، سورانیەکان بگەرینەوە ناوچەی سوران. مامجەلال رەزامەندی پیشان دابو، بەلام به نیمەی نەوت. ئیمە خویشمان پیمان خوش بو بچینە ئەو ناوچەیەی لی ی شارەزا بوین. خومان ئامادە کرد بو گەرانەوە. پیشمەرگەکانی بادینان سازدران به سەرکردایەتی حسین بابەشیخ بگەرینەوە.

مەسعود ستایشی شیخ حسینی کرد بو. بەخوشحالی خوی دەربری بو بەوەی که یەکیتی پیاویکی نەرم و بەریزی وەکو شیخ حسین له بادینان دا ئەنی. بەلینی دابو هەمو جورە هاوکاریەکی له گەل بکەن.

*

## برادۆست: یەکگرتنەوەی براکان

*

بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنەی لە شام بۆ «هاوکاری مەیدانی» لە نێوان مامجەلال و مەسعود بارزانی دا ئیمزا کرا بو، ئەم دو هێزە ئەبو: لە هەمومەڵبەندەکانی کوردستانی عێراق کومیتەی هاوبەش بۆ هاوکاری دابمەزرێنن. ئەبو ڕێ لە یەک نەگرن و یارمەتی یەکتر بدەن.

مانگی نیسانی ۱۹۷۷ خالید سەعید و هەندێ لە پێشمەرگەکانی بالەکایەتی هات بون بۆ هەلگورد و ناوچەی برادۆست. ماوەیەک لەوێ مابونەوە، چاوەڕوانی گەیشتنی هەندێ لە بەرپرس و کادرەکانی ینک یان ئەکرد لە سوریاوە. کاک خالید لە چاوەڕوانی بێتاقەت بو بو ڕۆیشت بو بۆ هەلگورد، بەلام دو مەفرەزەی لە ناوچەکەدا بەجێ هێشت بو. یەکێکیان ئەورەحمان بیشەیی و ئەوی تریان قادر ڕوستایی فەرماندەیان بو. لە گەڵ ئەوان دا جەوهەری براشی دانا بو. هەر لە گەڵ ئەوان دا بو شارەزایی و هاودەنگی پێشمەرگەیەکی جامانسوریان لە گەڵ بو بە ناوی ڕەشید گەردی. ڕەشید لە گەردییەکانی تورکیا بو بەلام لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بو. شارەزاییەکی زۆری لە ئەرز و دانیشتوانی ناوچەکە هەبو. جاروبار لە گەڵ ئەوان ئەگەڕا و جاروبار خۆی بە تەنیا ئەچو بۆ گوندەکانی سەرسنور لە تورکیا.

لە مانگی نیسان دا لە گەڵ شەهید نەجمەدین بیوک قەیا «نەجو» لە قامیشلییەوە چوینە نسیبین و دوایی دیاربەکر. لە دیاربەکر لە گەڵ سەرکردەکانی «پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا» کۆ بوینەوە. باسی هەلومەرجی کوردستان و پلانی کاری داهاتوی یەکێتی م بو کردن. نەجو لە گەڵ سەرکردەکانی پ د ک ت تێک چو بو. لە دیاربەکرەوە بە هۆی ئەوانەوە چوینە وان بۆ مالی عەلی شێر. لەوێش بە ڕێیان کردم بۆ گەوەر «یوک سەکوا» بۆ لای مەلا حەقی. مەلا حەقیش بەرەو ڕوی کوردێکی عێراقی کردمەوە کە لە گوندێکی سەرسنور دانیشت بو، ناوی «موسا» بو.

موسا کوڕێکی خوێندەوار و لە گەردییەکانی هەولێر بو. دوای هەرەس بە مال و خێزانەوە چو بوە ناو گەردییەکانی تورکیا و لە گوندی «بیگور» دانیشت بو. پێشتر تالیب ڕوستەم و خالید سەعید لە گەڵ ئەم کوڕە پێوەندییان دروست کرد بو. بەلێنی هاوکاری دا بو. تالیب سەفەرێکی کورتی بۆ سوریا کرد. زۆر نەمایەوە و گەڕابوە بو

کوردستان. هەردوچار موسای دی بو. بیگور یەکیکە لە گوندەکانی شەمزینان. لە شوینیکی سەخت و عاسی دا بو. پەناگای پەردای زوری لی بو. زور بە زەحمەت دەستی جەندرمەی تورکی نەگەیشتی. لە گەل موسا وا ری کەوت بون کە مالەکەیان و گوندەکە وەکو بنکەیەکی نهینی بو هاتوچو و شاردنەوەی چەک بە کار بهینری. پیشتر بنک بە هوی دەدەقادە وە هەندی تفەنگی نارد بو ئەبو لە بیگور بشاردریتەوە بو ئەو کادر و پیشمەرگانەی لە سوریاوە بە «هویەی مزور» بە ناو تورکیادا ئەگەرانەوە بو کوردستان. چەند تفەنگیکی کەم گەیشت بوە دەست موسا. لە گەل موسا چوینە بیگور. موسا ئاگاداری دەنگوباسی مەفرەزەکانی برادوست و کاک خالید بو. تفەنگیکم بو خوم لی وەرگرت. سەیریکی ناوچەکەمان کرد. لەو شوینانەی کە بە تایبەتی چوم بو سەیر کردنی ئەو چیا و کەورگە سەختە بو کە لە سیپەکان دا خوشەوی خەلیلی لی کوژرا بو.

بە شەو چوینە «کەتینە». کەتینە تەنیا یەک مال بو لە سەر روباری سەرکەم لە بەری تورکیا. خاوەنی مالەکە کابرایەکی بە سالاچوی دەموودان کەل بو. ناوی مەلا عیسا بو. بەلام تا بلیی پیاویکی دلسوز و نەترس و دەس و دل فراوان بو. هەوالی پیشمەرگەکانی ئەزانی لە کوین. من تا ئەو کاتەش کراس و پانتولی جینزم لە پی دا بو. ئەیزانی لە ئەوروپاوە هاتومەتەوە. رادیویەکی ترانسیستەری لە لاوە بو. پرسیاری دەنگوباسی دنیای لی کردم. هەروەها هەوالی بارزانی لی پرسیم. من هەندی قسەی گشتیم بو کرد. مەلا عیسا وتی: «نەتزانیوە لەو بەینەی پیشودا سەروکی ئەمریکا چوتە مەجلیسیکی گەورە مەلا مستەفاشی لی بوە. هەمو مەجلیسەکە لە بەر سەروک هەستا بون مەلا مستەفا نەبی. سەروک زوری پی ناخوش ئەبی لە مەلا مستەفا ئەپرسی ئەلی: «ئەوە بوچی هەمویان لە بەر من هەستان تو نەبی؟». مەلا مستەفا لە وەلام دا ئەلی: «تو هەردو قاچی منت بریوەتەوە چون ئەتوانم لە بەرت هەستم».

چیروکەکەم بەلاوە سەیر و خوش بو. بە لامەوە سەیر بو چونکە تازە بەتازە نامەکانی بارزانیم بو کارتەر خویند بوەوە، بە لاشمەوە خوش بو چونکە تا رادەیەک تی گەیشتم کە فولکلور چون دائەهینری و، خەلکی سادە ئارەزو ئەکەن سەرکردەکانیان چون بن.

هەر لە مالەکەی ئەو نانمان خوارد و تا دەمەوبەیانی نوستین. بەیانی بەر لەوەی دنیا روناک بیتەوە لە گەل مەلا عیسا چوینە سەر ناوەکە. خومان روت کردەوە. پەندە کونەکەی پیشینانم بیر کەوتەوە کە ئەلی: «قنگی رەش و سپی لە بوارا دەرئەکەوی!». لە «بر» یکەوە لە روباری هەستاوی «سەرکەم» پەرینەوە. «بر» لەم ناوچەیەدا و، «بوار» لە

هەندی ناوچەی تر، بەو شوێنانەی ناوەڕوی ڕوبارەکەیان ئەوت کە لە چاو شوێنەکانی تری دا تەنکتر و بەرینتر بو، پیاو لە بەریکیەوە ئەیتوانی بپەریتەوە بۆ بەرەکەی تری. گەیشتمە مەفرەزەکەی ینک لە گوندی «دەریا سور». دەریا سوریش گوندیکی پچوک بو لە سەر ڕوبارەکە لە بەری عیراق. خەلکی هەردو بەر «گەردی» بون.

پیشمەرگەکان دەمی بو چاوەری بون کەسانی لە سوریاوە بگاتە لایان. هەوالی خوشی دەرەوە و مژدەی پەیدا کردنی دوست و پشتیوان و، چەک و پارەیان بو بهینیتەوە. کاک خالیدمان ئاگادار کرد هات و یەکترمان بینی و، دوای ئەوەی چەند ڕوژی بە یەکەوە بوین، گفتوگو و قسەی پیویستمان کرد، ئەو بو کاریکی پیویست چوە دولی لولان و، من لەوی مامەوە. نامەیەکی دریژم دەربارەی هەلومەرجی دەرەوە بو کاک عەلی و هەڤالەکانی تر نوسی.

*

ناوچەی برادوست کەوتوتە نیوان ۳ سنور. لای سەروی هاوسنورە لە گەل شنوی ئیران و لای ڕوژئاوای هاوسنوری شەمزینانی تورکیایە. ناوەندی ئیداری ناوچەکە سیدەکانە کە سەر بە قەزای ڕەواندز و ئەویش سەر بە محافظەی هەولیر بو.

کیوە بەرزەکانی سپیریزی خەبلانی و کیلەشین و دالانپەر لە ئیران و، ڕوباری سەرکەم، کە پیشی ئەلین ڕوباری حاجی بەگ لە تورکیای جیا ئەکاتەوە. زنجیرەی کیوە بەرزەکانی نەقیب و شەکیب بە سەر ڕوبارەکەدا ئەروانن. هیچ ڕیگایەکی قیرتاو یا خاکی ناوچەکەی بە هیچ کام لەم دو ولاتەوە نەئەبەست. لە دیوی شنو جادەیەکی خاکی تا نزیک کیلەشین و لە دیوی شەمزینان جادەیەکی خاکی تا گوندی «ڕوباروک» ئەهات بەلام نەبەسترا بون بە هیچ ڕیگایەکی دیوی برادوستەوە. بە لکو لە دیوی برادوست هیچ ڕیگایەکی قیر یا خاکی تی دا نە کرا بوە وە. ڕیگاکانی هەمو کویرەریگای ولاخ بون. کاروانی هینانوبردنی کەلوپەلی قاچاغ و هاتوچوی میگەل لە نیوان هەر ۳ سنورا بەردەوام بو.

*

ئاژەلداری یەکی بو لە کارە سەرەکییەکانی دانیشتوانی ناوچەکە. لەم ناوەدا چەند تیرەیەک هەبون برادوستیان پیک ئەهینا: ڕەوەندوک، بنجی و، خواکورک.. جگە لەمان هەرکیەکان بو لەوەرخوری ئەهاتن بو کویستانەکانی ئەم ناوچەیە. هەوارەکان لە زور کونەوە دابەش کراون. هەر تیرە و هوز و بنەمالەیەک ئەزانی شوینەکانی کوی یە. وشەی «دەوار» لە ناوچەی سلیمانی دا بو ڕەشمال بە کار ئەهینن بەلام لەم ناوچەیەدا بە ولاخ ئەلین:

«دەوار» و، بە رەشماڵ ئەڵێن: «کۆن». چەند کۆنێک پێکەوە لە شوێنێک دا هەڵئەدەن پێ
یان ئەڵێن «زۆم» و، چەند زۆمێک کە سەر بە یەک تیرەن لە چەند شوێنێکی نزیک لە
یەک هەڵئەدەن پێ یان ئەڵێن «هۆبە».

تام و بۆنی ماست و، کەرە و، دۆ و، پەنیرەکەیان بە هۆی گژوگیای بۆنخۆشی
کوێستانەکانەوە زۆر خۆشە. هەروەها تامی گۆشتەکەشی. بۆ یەکەم جار لە کوردەواری
بینیم پەنیری برژاو بخۆن لیرە بوو. سەلکە پەنیری تازەیان وەکو گۆشت ئەجنی و لە
شیشیان ئەدا و، لە سەر ئاگر دایان ئەنا تا ئەبرژا. خواردنێکی خۆش بوو.

پەنیریان بۆ فرۆشتن دروست ئەکرد و، پەنیری پێستە و، ژاژی و، تەرەماستیان بۆ
زستان بۆ وەرزی برانی شیر هەڵئەگرت. یەکەم جار «تەرەماست» م لەوێ بینی و خوارد.
پاییزان کە ئیتر شیری ئاژەڵ خەست ئەبێتەوە و، بەرەو کەمبوون و بڕان ئەچێ، بەشێکی لە
تەنەکە و گۆزەدا ئەکەن بە ماست و، ڕۆنی قرچاوی خۆماڵی بە سەردا ئەکەن تا چینێکی
ئەستوور دروست ئەکا، لە شوێنێکی فێنک دایان ئەنا. ماستەکە ئەمایەوە، خەست ئەبووەوە
و، تامی زۆر خۆش ئەبوو. لە زستـان دا بە کەوچک سوچێکی ڕۆنەکەیان ئەشکاند و
ماستەکەیان لێ دەرئەهێنا بۆ خواردن. بەم جۆرە ماستەیان ئەوت: «تەرەماست».

ئاژەڵیان لە کوێستانەکان ئەلەوەڕاند. بۆ زستان، بۆ مەڕ گیایان ئەکرد بە «گزرە» و
«گیش» و لە بەردەمی ماڵەکانی خۆیان دا لە شێوەی گومەزدا کەڵەکەیان ئەکرد، پێ یان
ئەوت: «قـوزی». بۆ بزن گەڵا و چرۆی ناسکی بەڕوویان ئەبڕی و لە نێوان دوولقی بەرزی
دارەبەڕوویەک دا دایان ئەنا، پێ یان ئەوت: «گەڵ». جۆتیارە دەوڵەمەندەکان «پاوان» یان
«قەدەغە» یان هەیە، بەشێکە لە لەوەڕگاری ناوچەکە بەڵام خاوەنی ناسراوی هەیە، جگە لە
خاوەنەکەی کەس بۆی نیە داری لێ ببڕێ، یا گەڵی لێ بکا.

شوانەکانی ئەم ناوچەیە هەریەکەی تەورداسێکی کرد بوو بە بەر پشتێنەکەی دا. کە
ئەگەیشتە خەڵفی تازە پێگەیشتوو و، پەلی سەوز و ناسکی دارەکان، تەورداسەکەی
دەرئەهێنا و ئەکەوتە بڕینیان. ئاژەڵەکەی تێ ئەوەڕکا.

زستـان کە بەفری زۆر ئەباری و ئاژەڵ لە «هۆڵ» و «کەوڕ» دا ئەمایەوە گزرەیان
ئەدا بە مەڕەکانیان و چرۆ بە بزنەکانیان. بۆ ئەوەی لە ناو بەفردا نەچەقن و نقوم نەبن،
شتێکیان ئەکرد بە پێڵاوەکانیانەوە پێ یان ئەوت: «لیبان». لیبان لە دار دروست ئەکرا و،
لە کەلەی هێلەک ئەچوو.

هەندێ جار لە پاییزدا کە لەوەڕ کەم ئەبوو «گوێنی» یان بە تەوراس ئەجنی و ئەیان
دا بە بزن. گۆشتی بزنەکەی ئەوەندە تاڵ ئەکرد لە خواردن نەئەهات. ئەبوو بزنەکە چەند ڕۆژێ

داپەستن و ئالیکی ئاسایی بەدرایەتی تا تالی لە گوشتەکەی دا نەشما، ئینجا بە کەلکی کوشتنەوە و خواردن ئەهات.

ناوچەکە بەگشتی، لە گژوگیا و گولی کێوی دا زور دەولەمەندە. گیا بو خواردنی مروڤ، گیا بو لەوەری ئاژەل، گیا و گول بو جوانی و بونخوشی، گیای رەنگ، گیای ئابوری وەکو کەتیرە و گیا سالم، لە ناوچەکەدا زورە.

ژمارەیەکی زور پورە هەنگ شاریان لە کلوری دارە پیرەکان و کونەبەردی شاخەکان دا کرد بو. یەکی لە نەریتەکانی ناوچەکە ئەوە بو: هەر کەس پورە هەنگێکی کێوی ئەدوزیەوە نیشانەی ئەکرد. پارچەیەک دەستەسری پی دا هەلئەواسی، یان بە چەقو نیشانەیەکی لی هەلئەکەند. ئیتر هەرکەس ئەم نیشانەیەی بدیایە ئەیزانی کە یەکیک لە پیش ئەودا دوزیویتیەوە، ئەم دەستی بو نەئەبرد. لە وەرزی دەرهینانی هەنگوین دا ئەچونەوە سەری. بەلام وا بە نەزانی و چاوچنوکی ئەیانبری هەنگەکە بە تەواوی ئەفەوتا.

پیش ئاشبەتال ناوچەکە لە ژیر دەسەلاتی بارزانییەکان دا بوبو. «خودانی بارزان» لە میژ بو راوی کەو و کێویی قەدەغە کرد بو. ئەو بریارە لەم ناوچەیەش دا جیبەجی کرا بو. بە سەدان پولی قەلەبالغی کەوی لی بو. خەلکی ناوچەکە، ئەوسا، نەیانئەتوانی راو بکەن چونکە لە ترسی حکومەت کەس نەیئەویرا تفەنگ ئاشکرا بکات. دیمەنی ئەم پولە کەوانە کە ئەفرین و ئەیانخویند جوانییەکی بی وینەی دابو بە شاخ و شیوەکانی. تاکوتەرا ورچ و نیشانەکانی، ئەبینرا.

*

بیگومان ئەم ناوچەیە لە کونەوە ئاوەدان بوە. لە نزیک ئاوایی «پیریەینان» لیشاوی باران کەندیکی دری بو. چەند گوزەیەکی ساغی، لەو گوزانەی پیش ئیسلام لە سەرانسەری ئەم ناوچەیەدا باو بوە، دەرخست بو. وەکو باسیان کرد لە کوتایی دولی خواکورک دا ئەشکەوتیکی لی بو شوینەواری دیرینەی تی دا بو، «کەیل» یکی میژوییشی لی بو. هەلومەرجی ئەو کاتە ریگایان نەدام سەری هیچکامیان بدەم. بەلام بە ناوبانگترین شوینەواری میژویی لەم ناوچەیەدا «کیلەشین» بو.

«کیلەشین» بەردیکی شینە بالای لە دو مەتر کەمترە چەند نوسینیکی گرنگی لە سەرە ئەگەریتەوە بو چەند سەدەیەک پیش زایین. کورد و خوینەوارەکانی، کاتی خوی، بایەخیان بەم جورە شوینەوارە میژوییانە نەداوە، بەلکو زور شوینەواری بە نرخی لەم بابەتەیان، بە بیانوی ئەوەی هی کافرە یان گاورکردە، لە ناو بردوە. ئەم کیلەش لە دەستدریژی مروڤی کورد دەرباز نەبوە. جیگای چەندین گوللە و بەردی پیوە بو.

٥. مەردارەکان فیری شێوەی نوێ ی برینەوەی خوری بکرێن.

ب. کشتوکاڵ

ناوچەکە بە گشتی شاخاویە، زەوی بۆ کشتوکاڵی دانەویلە کەمە، بەلام ئاووهەوای لە بارە بۆ رەز و باخ. لە لاپاڵی شاخەکان و، لە کەناری جۆگا و چەمەکان ئەتوانری سەدان رەز و باخ ئاوا بکرێتەوە، رەزی: تری ی دێمی و بەراو، باخی: قەیسی، هەرمێ، هەلوژە، قۆخ، هەنجیر، هەنار. لە مانە هەمووی گرنگتر ئەتوانری بە درێژایی شەو و دۆڵەکانی، لە کەناری جۆگا و چەمەکان دا، هەزاران بن داری گوێز برووێنری و، بە خزمەتێکی کەم بەرهەمێکی زۆر ئەدەن. لەم ناوچەیەدا سەموورە دەورێکی گەورەتری لە مەروف هەبوە لە رواندنی داری گوێزدا.

لە ناو لێرەوارەکەدا هەزاران داری قەزوان، کروسک، گوێژ، بەلالوک، چەقالەی تێ دایە، کە ئەکری موتوربە بکرێن بە پستە، هەلوژە، هەرمێ...

ج. پەروەردەکردنی هەنگ

ئەم ناوچەیە لە گوڵ و گژوگیادا زۆر دەوڵەمەندە و، شوێنێکی لە بارە بۆ بە خێو کردنی هەنگ. هەنگوینەکەی زۆر ناياب و شانەکانی سپییە. لە شەمزینان لە دیوی تورکیا و، لە شنۆ لە دیوی ئێران، پەروەردە کردنی هەنگ بە شێوەی نوێ لە سنوقی ئەمریکی دا بۆ بۆ بە باو، بەلام لێرە هێشتا بە شێوەی کۆنی کوردەواری لە «شەلە» ی خۆماڵی دا بە خێویان ئەکرد. زۆر جار توشی نەخۆشی ئەبو و ئەفەوتا.

ئەتوانری چەندین هەنگەلانی گەورە لەم ناوچەیەدا دابمەزرێنری و، هەزاران پورە هەنگی بە شێوەی نوێ لێ بە خێو بکرێ، لە هەمان کات دا پارێزگاری شێوە کۆنەکەش بکرێ. ئەتوانری هەمو ساڵ چەندین تەن جۆری باشی هەنگوین بەرهەم بهێنرێ.

د. توریزم

ناوچەکە، بە درێژایی ساڵ و لە هەمو وەرزەکانی دا، زۆر لە بار بۆ بۆ توریزم.

لە زستان دا بەفرێکی زۆری لێ ئەباری، چەند مانگی ئەمێنێتەوە. چەندین جێگای تێ دایە بۆ یاری زستانە بە تایبەتی خلیسکێنی سەر بەفر «سکی».

لە بەهاردا سەدان کانی دروزنەی لێ ئەتەقی و، گوڵی جۆراوجۆری لێ ئەگەشێتەوە.

بۆ هاوین زۆر جێگای لێ یە دیمەنی جوان و، هەوای فێنک و، ئاوی سازگار و ساردی مشەیە. ئەشێ هەوارگەی توریستی جۆراوجۆری لێ بینا بکرێ.

یەکێ لەو شوێنانەی رەنگە بۆ هەوارگەی توریستی خۆش بێ، هەواری «دێنارە» یە. دێنارە لە نزیکی هەلگوردە، بە لوتکەی شاخێکەوەیە ٣ هەزار مەتر زیاتر لە ئاستی

دەرباوە بەرزە، گ.رایی و گومبکی شینی جوانی لی بە جوگایەکی خوری ساردی لە بەر ئەروا، سەدان جور گژ و گیا و گولی کیوی جوان و بونخوشی لی ئەروی، بە سەر زور ناوچە و چیادا ئەروانی و، چاوئەندازیکی جوان و دلرفینی هەیە.

لەم ناوچەیەدا ئەتوانری چەندین بەنداوی گەورە و پچوک، بو گلدانەوەی ئاوی باران و بەفراو و کانیەکان، لە ناو شیوەکانی دا، بو مەبەستەکانی: ئاودان، بەرهەمهینانی کارەبا و، بو جوانی دروست بکری.

کردنەوەی جادە و ریگاوبان و، راکیشانی کارەبا و، دروستکردنی خانوبەرەی نوی ئەبی شان بە شانی هەنگاوەکانی تر جیبەجی بکری، بی ئەمانە ناوچەکە ناتوانی گەشە بکا لە مەیدانەکانی تردا.

*

دامەزراندنی بنکەی ئەمین

یەکی لە مەرجە سەرەکیەکانی مان و دریژەپیدانی چالاکیەکانی جولانەوەیەکی چەکدار دامەزراندنی بنکەی ئەمینە.

شورشی ئەیلول گیروگرفتی بنکەی ئەمینی نەبو، چونکە هەر لە سەرەتاوە زور شاخ و گوند و ناوچە و شاروچکەی کوردستانی عیراق کەوتە دەس پیشمەرگە و بە ئازادی مایەوە. بنکە و بارەگا و شوینی ژیان و حەسانەوە و زیندان و دەبو و چاپخانە و رادیو ... لی دانرا بو. لە شورشی ئەیلول دا جگە لە دەزگا سەرکردەییەکان، هەمو هیز و بەتالیون و لق و، هەمو لق و ناوچە و ریکخراوەکان بنکەی تایبەتی خویان هەبو، ئارادەیەکیش ئەمین بون. واتە دور بو لە دەسەلات و پەلاماری دوژمنەوە.

دوای هەرەسی شورشی ئەیلول، سەرکردایەتی بەعس پلانیکی عەسکەری، ئەمنی، سیاسی... دانا بو دەس گرتن بە سەر کوردستان و دانیشتوانی دا. ناوچەی ئازاد، یا ناوچەی دەرەوەی ژیر دەسەلاتی بەعس نەما بو. دەسەلاتی بەعس لە هەمو جیگایەک یا هەبو یا ئەی توانی بە ئوتومبیل و بە هالیکوپتەر بە ئاسانی و بە زویی بیگاتی. توری جاسوسی بەهیزی لە هەمو دیهاتەکان دا دامەزراند بو. هەمو موختارەکانی کرد بوە موچە خوری حکومەت و ئەبو هەوال و دەنگوباسی گوندەکەیان بە دەزگا ئەمنییەکان بگەیەنن. لە زور جیگای دور و چەپەک و شاخاوی و سەرسنور بارەگای ریکخستنی حیزبی بەعسیان دامەزراند بو.

بوچونی ی ن ک بو دەس پی کردنەوەی کاری پیشمەرگەیی جیاواز بو لە هی شورشی ئەیلول، بە تایبەتی چونکە هەلومەرجی سیاسی - چەکدار و ریکخراوەیی جیاواز

و تەرازوی هێزی نێوان کورد و بەعس بە تەواوی گۆڕا بو.

ی ن ک لەو قوناغـەدا نەیئەتوانی «بنکەی ئەمین» ی هەبی. هێزەکانی ی ن ک ئەبو دابەش بن بە سەر شوێنە جیاوازەکانی کوردستانی عێراق دا. مەفرەزەی پچوکی ٥ تا ١٠ پێشمەرگەیی بە چەندایەتی کەم و بە چونایەتی باش دروست بکەن. بە هەمو تواناوە ئەبو خۆیان لە شەر و پێکاداتی ڕوبەرو لابدەن. ئەبو شوێن و بارەگای دیار و ئاشکرایان نەبی و هەمیشـە لە گەران و سوران دا بن. بو چەواشـە کـردنی دوژمن ئەبو لە هەمـو شوێنێک هەبن و لە هیچ شوێنێک نەبن. ماوە بە دوژمن نەدەن زەمان و زەمینی شەریان بە سەردا بسەپێنی. مەفرەزەکانی سەرەتا ناویان بە خۆیانەوە بو: تیپی پروپاگاندەی چەکدار «فرق الدعایە المسلحە» ئەرکی ئەمانەش بریتی بو لە: بەرز کردنەوی ورە و زاتی کومەلانی خەلک، دروست کردنی ڕێکخستنی سیاسی، سەرکوت کردنی جاسوس و نوکەرەکانی بەعس.

لە هەندی جێگا پێرەوی ئەم سەرەتایانە نەکرا بو. سەرکردەکانی بزوتنەوە چەندی توانی بویان سەرانی خێل و کوێخـای گوندیان ساز دابو بێن بە پێشمەرگە. هێـزی زلی خێلەکییان لی پێک هێنا بون و بنکەی ئاشکرایان، وەکو سەردەمی شورشی ئەیلول، لە ناوچەکـان دا دامەزراند بو، بە تایبەتی لە ناوچە عـاسی و شاخاوییەکانی دولی جافەتی، شینکایەتی، بالەییـان، مەنگورایەتی و ئاکویەتی... ئەمەش مـاوەی بە هێزەکانی جەیش ئەدا ئاگاداریی تەواو لە سەر ژمارەی پێشمەرگە و چەک و شوێنەکانیان کـو بکەنەوە و، پەلاماریان بدەن.

*

شەر لە گەل کورد بوتە بەشێکی سەرەکی پیشەی ئەفسەرانی جەیشی عێراق. بە هوی ئەم شەرەوە زوریان دەولەمەن بون، دەسەلاتیان پەیدا کرد و، ناویان دەرکرد. شەر لە گەل کورد، کوشتن و سوکایەتی پی کردنی، وێرانکردنی مال و ئاوایییەکانی و تالانکردنی، بو ئەوان لە هەمو شەرێکی تر ئاسانتر بو. کورد کەسی نەبو لە سەری هەل بداتی، خویشی هەرگیز نەیتوانیوە، یا بیری لەوە نەکردوتەوە، سزای تاوانکارەکانیان بدات، لە بەر ئەوە هەر ئەفسەرێکی گەورە تەکلیف کرابی سەرکردایەتی شەری کورد بکا، بە خوشییەوە قوبولی کردوە و، بە پەلە خوی گەیاندوتە کوردستان. لە کوردستانیش هەر خراپەیەکی لە دەستی هات بی دریغی نەکـردوە. قـانونەکـانی عـێـراقی پی شێل کـردوە و، پی ی لە شـەرەفی عـەسکەری خـوی ناوە، بەها بەرز و پیـروزە نەتەوەیی و نیـشـتـمـانیـیـەکـانی تەنانەت خیلایەتییەکانیشی فەراموش ئەکرد، تەنیا بو ئەوەی ئافەرینی سەروی خوی بە دەس بهێنی

و، به زوبی دەولەمەن بوی. بو پاساودانی ئەمەش، ئەوەی ئەکرد به بیانو که ئەم سیاسی نیه و، عسکەری «محترف» و «ئەوامیر» تەنفیز ئەکا.

سەرکردەکانی جەیش هەمیشه له دو لاوه بو کیشەی کورد ئەروانن:

- تەرازوی جەنگیی هیزەکانی جەیش و کورد، ئەگەر ئەوه سەرکەوتو نەبو،
- دەستی بیگانه له کیشەی کوردا.

عیراق له ژمارەی چەکدار و، چەک و، تفاقی جەنگ و، توانای مادیی دا.. به سەر کوردا هەمیشه بالادەس بوه. سەرکردایەتی جەیش، که به گویرەی ئەم بالادەستیه ریوشوینی کوژاندنەوەی جولانەوەکەیان دائەنا و، دوای بەکارهینانی هەمو ریگایەکی عسکەری بویان دەرئەکەوت جولانەوەکەیان پی ناشکی نەنجا، تاوانی ژیرکەوتنی خویان ئەخستە پال بیگانە. بیریان لەوه نەئەکردەوه که هوی هەلگیرسانی جولانەوەکه و دریژه کیشانی و، سەرنەکەوتنی سەرکوتکردنی عسکەری، ئەگەریتەوه بوسیاسەتی چەوتی حکومەتی عیراق بەرامبەر گەلی کورد، نەک بو ستراتیجی جەنگیی و تاکتیکەکانی ئەوان و، دەستی بیگانە.

کاتی ئیسماعیل ئەلنعیمی گەیشتە کەرکوک بو سەرکردایەتی فەیلەقی یەک، نزیکەی ۱۰ فیرقە سەربازی جەیشی عیراق له کوردستان مول درا بو. له کەرکوک فیرقەی ۲ به سەرکردایەتی ل ر سعدالدین عزیز، له هەولیر فیرقەیەک به سەرکردایەتی ع ر عبدالجواد ذنون، له سلیمانی فیرقەیەک، له موسل فیرقەیەک به سەرکردایەتی ع ر حازم برهاوی، له سەرسەنگ «قواتی نەهاوەند» به سەرکردایەتی ع ر عبدالبر النعمە، له زاخو «قواتی ذیقار» به سەرکردایەتی ع ر کریم محمود گرجیە...

ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی، سەرکردەی ئەوسای فەیلەقی یەک، که خوی سەرکردایەتی هیرشەکانی کردوه، له کتیبەکەی دا: «تجربتی فی القیادە» بەمجورە بەرنامەی کارەکانی ئەگیریتەوه:

۳۵۸. لقد طلبت قادة الفرق للحضور الى مؤتمر حدد له يوم معين من اجل العمل بسرعة لضرب العصاة الذين استطاعوا ان يحققوا بعض الانتصارات مؤخرا الامر الذي شجعهم للقيام باعمال واسعة في المنطقة، لقد طلبت من قادة الفرق دراسة كافة الاوضاع في قواطعهم وبيان مقترحاتهم لتطوير العمل ضد العصابات وارسالها الى الفيلق قبل موعد المؤتمر.

۳۵۹. لقد سبق وقاتلت العصاة عندما كنت قائد فرقة ولدي خبرة لاباس بها في قتالهم كما استفدت كثيرا من قتالهم عندما كنت وكيل معاون العمليات حيث كنت في المعركة مباشرة منذ ابتدائها في آذار ۱۹۷٤ وانتهائها في اذار ۱۹۷٥ حيث صدر بيان الجزائر وانهيار

العصاة، ان قضية العصيان فى شمال الوطن اصبحت ملازمة لاوضاع العراق حيث اصبحت كما وصفها السيد الرئيس القائد المهيب الركن صدام حسين فى حينه «ان التمرد ليس قطريا بل دوليا».

لذا فان الصراعات الدولية المتشابكة اخذت تحرك العصيان بما يخدم مصالح الدول الكبرى وستراتيجيتها فى المنطقة الامر الذى يتطلب ان نعرف كيف نتعايش مع هذا الحرب ونضع الحلول الستراتيجية البعيدة المدى للقضاء عليها نهائيا.

ستراتيجية العمل ضد العصاة

٣٦٠. لقد فكرت بوضع ستراتيجية للعمل لتامين الاستقرار فى المنطقة وقد فاتحت القيادة العامة للموافقة على هذه الستراتيجية فحصلت الموافقة على ان يتم العمل بها بمراحل وحسب توفر الامكانيات لذا فقد وضعت ستراتيجية للعمل لاول مرة فى الفيلق وهى:

أ. مسك الحدود بصورة جيدة وحسب خطة مدروسة.

ب. فتح الطرق فى المنطقة الشمالية بشكل واسع مع اعطاء الاسبقيات للمناطق الصعبة والمحتملة للعصيان والطرق الحدودية.

ج. كسب سكان المنطقة الى جانب السلطة الوطنية.

د. الانعاش الاقتصادى للمنطقة وامتصاص البطالة.

تطوير العمل العسكرى فى المنطقة الشمالية

٣٦١. لقد تطور عمل العصابات فى المنطقة فليس من المعقول ان نبقى على اساليبنا السابقة لذا فقد تم التبديل «من مسك الارض» الى «قتل العصاة وملاحقتهم اينما وجدوا على ان نمسك الارض بقدر ما يحتاجه امن القطعات القائمة بالملاحقة».

لذا فقد تم اجراء تبديل رئيسى فى اسلوب مقاتلة العصاة والتحول من الثبوت النسبى الى الحركة المستمرة.

٣٦٢. ان قتال العصابات يحتاج الى قوات كبيرة لمسك الارض وتامين الحماية لكل بقعة فى المنطقة وهذا غير ممكن فكيف يتم تامين القوة المتحركة لمتابعة العصابات وقتلهم؟ لذا تم التفكير بما يلى لتامين القطعات الازمة:

أ. تقليل نسبة القوة التى تمسك الارض وزيادة القوة المتحركة.

ب. ترك بعض المناطق التى تاتى بالدرجة الثانية من الاهمية ومسك المناطق المهمة فقط.

ج. تامين وحدات من المتطوعين الاكراد واستخدامهم فى القتال.

د. زيادة عدد المفارز الخاصة التي ترتبط بمديرية الاستخبارات العسكرية.

هـ. اتباع اسلوب المروحة من قواعد امينة لتعجيز العصاة ومنعهم من تشكيل قواعد لهم.

و. استخدام الطائرات السمتية في النقل والقتال بضرب قواعد العصاة.

ز. هناك ربايا ميتة واخرى حية وان عدد الربايا الحية قليل جدا لذا فان العصاة لا يابهون للربايا الميتة بل انهم يحسبون كل الحسابات للربايا الحية وان مواصفات كل منهما ما يلي:

اولا: الربيئة الحية تتصف بما يلي:

(١). فيها رصد مستمر لمتابعة تحركات العصاة في منطقة نفوذها.

(٢). على الربيئة اقامة علاقات جيدة مع القرى القريبة للاطلاع على تحرك العصابات و اخبار مرجعها بذلك.

(٣). على الربيئة التحرك للسيطرة على منطقة نفوذها ولاتبقى قابعة في موضعها.

(٤). تبتكر وسائل جديدة من اجل ازالة الملل عن منتسبيها.

(٥). بعيدة عن الغفلة والاطمئنان ومنتبهة لما يدور حولها.

ثانيا: الربيئة الميتة تتصف بما يلي:

(١). التقوقع في الموضع وعدم التحرك ولا يخرج منها احد الا في الاجازات والادامة.

(٢). يعرف عنها العدو اكثر مما تعرف عنه.

(٣). لا تخبر مرجعها بالمعلومات التي تحصل عليها لاعتبارها غير مهمة.

(٤). لا تبالي بما يدور حولها من احداث بل عليها مسك جدار الربيئة فقط.

(٥). لا تعرف عن الاهلين في القرى القريبة منها ومشاكلهم واحيانا لا تعرف اسماء القرى نفسها.

(٦). لا تعرف ماذا تفعل بوقت الفراغ القاتل لذا فان معنويات جنودها هابطة لانهم يفكرون بعوائلهم وبموعد وجبة النزول.

*

به گويرەی ئەو ستراتيجەی نعيمی بو دامركاندنەوەی خەباتی چەكداری كورد دای نا بو:

١. لەشكركيشی گەورە و، هيرش بردن بە هيزی زور بو سەر ناوچەی تەسک و

هێزی پچوک دەستی پی کرد. هەندی جار بو یەک هێرش لە ١ فیرقە تا ٤ فیرقەیان بە کار ئەهینا.

٢. لە سنورێکی فراوان دا کەوتنە بەکارهێنانی هالیکوپتەر بو دابەزاندنی هێزی چەکدار لە شوێنی پێویست دا، لە هەمان کات دا بو لێدانی پێشمەرگە کە ئەیان دوزیەوە.

٣. لە سەرانسەری کوردستان دا هەزاران رەبیەیان دامەزراند. هەندی لەم رەبیەیانە لە نێوان ٨٠ - ١٢٠ سەربازی تی دا دانرا بو. ئەمەش بەشێکی زوری جەیشی عیراقی زەمینگیر کرد. بە پێچەوانەی چاوەروانی ئەوانەوە بون بە هێزێکی لە کار کەوتو.

جەیشی عیراق بە تەنیا دژی مروڤی کورد نەبو، بەلکو دژی سروشتی کوردستانیش بو. بە هوی ئەم رەبیەیانەوە هەمو لوتکەی شاخ و گردەکانیان ناشیرین و پیس کرد. بە ملیون «مین» یان چاند و، بە هەزاران دارودەوەنیان لە بن دەرهێنا.

٤. «مدیریە الاستخبارات العسکریە» دەیان «مەفرەزەی تایبەتی» دامەزراند بە تایبەتی لە کونە پێشمەرگەکانی ق م. ئەمانە بە ژمارە کەم بون، بەلام زەلامی در و گورجوگول و پیاوکوژیان تی دا کو کرد بونەوە. بەرامبەر بە کوشتنی هەر پێشمەرگەیەک پارەیان بە پاداش ئەدانی.

٥. سەدان کیلومەتر ریگایان بە ناو شاخ و دولەکان دا راکێشا. ریگاکان بو مەبەستی لەشکرکێشیی جەیش و، پێوەندی نێوان سەربازگە و رەبیەکان دروست کرا بون، خەلک زور کەم کەلکیان لی وەرئەگرت. بەلام ئەمە هەروەکو جولانی جەیشی ئاسان ئەکرد، جولانی پێشمەرگەشی خیراتر ئەکرد و، جیگای لە باری ناتەوەی بوسە و دەسکەوتی بو زورتر کردن.

٦. رەفتاری جەیش لە گەل خەلکی کوردستان درندانە بو. وەکو لەشکرێکی داگیرکەر لە ولاتیکی داگیرکراوی گەلێکی تیشکاودا رەفتاریان ئەکرد. ریزی پیاو ماقول و ریش سپیەکانیان و، ریزی مالی خەلک و مزگەوت و قوتابخانەیان نەئەگرت. کەسوکاری پێشمەرگە، ئەوانەی بەر دەستیان ئەکەوتن، ئەیان گرتن لە زیندان دا گلیان ئەدانەوە تا پێشمەرگەکە تەسلیم ئەبوەوە یان ئەکوژرا. زور جار، بو ئەوەی خویان بە سەرکەوتو پیشان بدەن، ئەعالییان لە باتی پێشمەرگە ئەگرت یان ئەکوشت و، کە لە جیگایەک زەرەریان لی بکەوتایە تولەیان لە دانیشتوان ئەکردەوە.

٧. بەعس درێژەی دا بە راگویزانی گوندەکانی سنور، بو جیبەجی کردنی ئەمەش جەیشی بە کار ئەهینا: بو گەمارودان و داگیر کردنی گوندەکە و، چولکردنی لە خەلک و،

تەقاندنەوە و سوتاندنی خانو و ماڵەکانی.

خەرجیی ستراتیجی تازەی فەیلەقی یەک و، لەشکرکێشییەکانی جەیش زور گران بو، مەگەر هەر ولاتیکی دەولەمەندی خاوەن نەوتی مشەی وەکو عیراق بەرگەی بگری، بیگومان هەر ولاتیکی تری هەزار بوایە زور زو پەکی ئەکەوت. بو نمونە هەر دەقیقەیەک فرینی هالیکوپتەر ۶۰۰ . دیناری عیراقی تی ئەچو، لەم هیرش و لەشکرکێشییانەدا ئەوەندەیان هالیکوپتەر بە کار ئەهینا نەیمی خوی ناوی نا بو: «تاکسی ئەبو خەلیل».

جەیشی عیراق لە کوتایی مانگی مارتەوە هیرشیکی زور فراوانی بو سەر هەمو ناوچەکانی کوردستان دەس پی کرد. هەمو ئەو فیرقانەی لە موسل، بادینان، هەولیر، کەرکوک، سلیمانی مول درا بون بەشدار بون. کەلکیان لە شارەزایی هەمو ئەفسەرە شارەزاکانی جەیش وەرگرت و، پرسیان بە هەندی لە کونە فەرماندەی هیز و بەتالیون و سەرلقی شورشی ئەیلول کرد.

بو یەکەمین جار هالیکوپتەر بو گویزانەوەی سپا و بو شەر لە سنوریکی فراوان دا بە کار هینرا. ئەم تاکتیکە جەنگییە تازەیەیان ناو نا بو: «اسلوب البساط» او «الشبكه». گوایە چون بە «بەرە» یان بە «تور» راوی مەل ئەکری، بەوجورە راوی پیشمەرگەش ئەکەن. ئوسلوبی بیساط بریتی بو لە گویزانەوەی هیزیکی گەورەی سەرباز بە هالیکوپتەر و، دابەزاندنیان لە لوتکە و شوینە بەرز و گرنگەکان و، ریگاکانی دەربازبونی پیشمەرگەدا، ئینجا گەران بە دویان دا تا ئەیان دوزنەوەو ئەیان گرن.

جگە لەم ئوسلوبە، کە شانازییان بە داهینانیەوە ئەکرد، ئوسلوبیکی تری درندانەیان بە کار ئەهینا پی یان ئەوت: «اسلوب الصيد الحر». تاکتیکی «راوی ئازاد» بریتی بو لەوەی هیزی ئاسمانی: فروکەی جەنگیی و هالیکوپتەر، لە ناکاو بە ئاسمانی ناوچە چولکراوەکان، یا ناوچەکانی دوژمن دا، وەکو خویان ناویان لی نا بو، بگەرین. هەرچی زەلام، ولاخ، ئوتومبیل، یا هەر جموجولیکیان بەدی کرد ئاگر بارانی بکەن.

هەندی ئوسلوبی تریشیان بە کار ئەهینا کە لە تەجروبەی سوپاکانی تری دنیاوە وەریان گرت بو، وەکو: ئوسلوبی «المطرقه والسندان»، «الطعم والصيد»، «القنفذ والثعبان»، «الروله».

ئەگەرچی ئەمانە چەندین «کراس» یان لە سەر نوسراوە و، بە وینە و نەخشە و نوسین رون کراونەتەوە، بەلام لیهاتویی جەیشی عیراق زور کەمتر بو لەوەی بتوانی بە ریکوپیکی ئەم تاکتیکە جەنگییانە جیبەجی بکا. جەیشی عیراق لە شەرەکانی دا زورتر پشتی بە زەبروزەنگ، کوشتن و برین، سوتاندن و ویرانکردن، ئەبەست، بە پی ی

سەرەتاکانی: «شەلم کویرم، کەس ناهویرم» و، «سوتاندنی تەر و وشک بە یەکەوە».

هێرشەکانی جەیش لە سەرەتادا هەندێ سەرکەوتنی بە دەس هینا:

– هەمو ئەو ناوچانەی پەلامار ئەدارن ئەگیران و، ئەکەوتنە دەس جەیش.

– هەندێ لە پیشمەرگە و فەرمانددەکانیان، بە تایبەتی ئەوانەی ناوچە خیلەکییەکان کە خیزانەکانیان گیرا بون، تەسلیم بونەوە.

– هەندێ مەفرەزە بەر هیرش کەوتن و، هەندێ پیشمەرگەیان کوژران یان بریندار بون.

بەلام ئەمە گروکەفی بو زو کوژایەوە و، ئیتر پیشمەرگە لە گەلی راهات. هیرشەکانی جەیش لە لای پیشمەرگە بون بە شتیکی ئاسایی چاوەروان کراو. ستراتیجی فەیلەقی یەک بو کوژاندنەوەی شورشەکە سەری نەگرت.

*

هاوزەمان لە گەل لەشکرکیشییەکانی جەیش دا، حیزبی بەعس و داوودەزگا ئەمنییەکانی بو توقاندنی خەلک کەوتنە راونان و گرتن و کوشتن و هەلواسین. لە کەرکوک دەزگایەکی تایبەتییان بو لیکولینەوە دروست کرد بو، چەندین کەسیان بە ئەشکەنجە تێ دا کوشت و، ئەوانەی تریان حەوالەی دادگایەکی روکەش ئەکرد بە زوری حوکمی ئیعدام ئەدران و، لە موسل هەلیان ئەواسین. تەرمەکانیشیان نەئەدایەوە بە کەسوکاریان. کاتی خوی، لە سەر بنچینەی نامەی دەیان کەس لە گیراوەکان، من ریپورتاجیکم لە سەر ئەم دەزگایە نوسیەوە و، لە ژمارە ٣ ی مانگی ئەیلولی ١٩٧٨ ی «هەوالنامەی شورش» دا، بلاوم کردوتەوە. لیرەدا سەرلەنوی وەکو خوی ئەینوسمەوە:

نمونەیەک لە جەهەننەمی فاشیزمی عیراق:

دەزگای تایبەتی لیکولینەوەی کەرکوک

«الهیئه التحقیقیه الخاصه - کرکوک»

یەکیک لە نیشانەکانی فاشیزم لە سەرانسەری دنیادا، پیشیل کردنی سەربەستی ویژدانە، واتە زەوت کردنی مافی ئازادی دەربرینی بیروورای سیاسی، فەلسەفی، کومەلایەتی، دینیی، مەزهەبیی جیا جیایە. فاشیستەکان کە دژی مافی ئازادی بیروباوەری ترن، بە هەمو ریگە و شیوەیەک هەول ئەدەن بو سەپاندنی بیروورا تایبەتییەکانی خویان و لە ناو بردنی بیروراکانی تر بە ئاگر و ئاسن. بو ئەم مەبەستەش چەندین داوودەزگای سەیر و سەمەرەی کوشتن و برین، ئازار و ئەشکەنجە، گرتن و هەلواسین.. ئاشکرا و نهینی دائەمەزرینن، پارەی بی شوماری بو تەرخان ئەکەن، پسپور و

شارەزای ئازاردان و کوشتن پەروەردە ئەکەن و پێی ئەگەیەنن، دەورەی مەشق پێ کردنی تایبەتی یان بۆ ئەکەنەوە لە سەر «هونەری ئەشکەنجە و کوشتن».

فاشیستەکانی عێراق کە گەنجینەیەکی گەورەی کوشت و بڕی ناهەق و چاو هەڵکۆڵین و سەربڕین و سزا و ئازاردانی سەردەمی خەلیفە و ئەمیرە دڵرەق و خوێنڕێژەکانی ئەمەوی و عەبباسی یان بە میرات گرتوە، تەجرووبەی زۆر و زەبەندی فاشیزمی جیهانیشیان لە بەر دەس دایە، هەر لە نازییەکانی ئەڵمانیاوە تاکو فاشیستەکانی ئیتالیا و ئیسپانیا و پورتوغال، تا کوکس کلانی ئەمریکی و سەهیونیستەکانی ئیسرائیل و رەگەزپەرستەکانی رودیسیا و خواروی ئەفریقا... لە مەیدانی بەربەرەکانی و لە ناو بردنی دوژمن و ناحەز و نارەزا و رەخنەگر و هەمو ئەوانەی لە سەر بیروباوەری ئەوان نین، یاخود ئەوانەی بە عورفی ولاتانی پێشکەوتو پێ یان ئەوترێت: ئۆپۆزیسیون «المعارضە»، شارەزایی و پسپۆرییەکی ئەوتویان پەیدا کردوە کە رەنگە ئەوانەی پێش خۆیان بۆر دابێت.

رێکخراوە جیهانییەکان، پارتی و تاقم و پیاوە سیاسیە گەورەکانی دنیا فاشیستەکانی عیراق ئەناسن، رێکخراوی جیهانیی لێبوردن «ئەمنستی ئینتەرناشناڵ» کە خۆی تەرخان کردوە بۆ بەرگری لە مافی ئەوانەی لە سەر ئازادی ویژدان توشی گیرمو کێشە ئەبن، حکومەتی عیراق لە ریزی دەولەتە هەرە فاشیستەکانی دنیادا داناوە، خو جموجوڵی پیاوکوژانە و تیرۆریستیی فاشیستەکانی عیراق لە لوبنان، کوێت، پاریس، لەندەن و پاکستان... لە دنیادا دەنگی داوەتەوە و پێویستی بە زیدە درێژە پێ دان نیە.

لەم ژمارەیەی هەواڵنامەکەمان دا یەکێک لە دەزگا فاشیستیە نهێنیەکانی عێراق ئەخەینە رو، کە لە دەرەوەی ولات کەمتر ناسراوە و، لە ناوەوەی ولاتیش وەکو یەکێک لە قەسابخانەکانی رژێم ناوبانگی دەرکردوە سەبارەت بەوەی رێگەی سەدان تێکۆشەری گەلەکەمانی تێ کەوتوە، دەیان پێشمەرگەی دیلی تێ دا ئازار و ئەشکەنجە دراوە، دەیان قارەمانی وەکو عەبدوللای ئاپشی، وەستا ئەنوەر عەبدورەحمان، عوسمان محەممەد ئەمین گیانی خۆیان تێ دا بەخشیوە بە کورد و کوردستان.

لێرەدا راپۆرتێکتان پێشکەش ئەکەین هەڤاڵێکی تێکۆشەرمان، کە خۆی شایەتێکی ئەم ئەشکەنجەگایە بوە، پاش دەرباز بونی نوسیویەتی، هەروەها هەندێ پارچە لە نامەی ئەو شەهیدانەی بە «هێشە» دا تێ پەربون وەکو بەڵگەیەکی مرۆڤایەتی لە سەر رەفتاری دڕندانەی فاشیستەکانی عیراق لە گەڵ گیراوی سیاسی و پێشمەرگەی دیل دا...

بێ گوێ دانە دەستورە ساختەکە و قانونە درۆینەکانی خۆیشیان، وە بێ گوێ دانە ئەو

پەیمان و پرۆژە جیهانییانەی ئەم جەللادە خوێنڕێژانە بەو پەڕی بێ شەرمییەوە لە گەڵ ئەندامانی تری «کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان» لە مەر مافی مرۆڤ مۆریان کردووە.

*

فاشیستەکانی عیراق چەندین داوودەزگای ئاشکرا و نهێنییان لە سەرانسەری عیراق دا دامەزراندووە بۆ سەرکوتکردنی خەباتی گەلی عیراق بە گشتی و خەباتی گەلی کورد بە تایبەتی.

شتێکی تازە ئاشکرا ناکەین، ئەگەر باسی زیندانەکانی «نگرە السلمان» ، «قصر النهایە»، «الامن العامە»، «معتقل الفضیلیە» و چەندین شوێنی نهێنی جۆربەجۆری تر بخەینەوە یاد، ئەو شوێنە نزم و نسرم و تاریکانەی بوون بە هێلانەی بێسەروبەری هەزاران خەباتکەر لە سەرانسەری عیراق دا و، دیوارەکانیان بۆ بوون بە لاپەڕەی یادگارنامەی بە خوێن ئالکراویان. ئەمە سەرەڕای جەللادخانەکانیان لە بەغداد و موسڵ.

ئێستاش تازەترین دەزگای لە ناوبردن و سەرکوتکردنیان دامەزراندووە بە ناوی «الهیئە التحقیقیە الخاصە» وە، کە لە سەربازگەیەکی سوپایی دایە لە نزیک کانیبەکانی کۆمپانی نەوتی کەرکوک، ئەو شوێنەی خۆیان ئەڵێن: «تایبەتیە بۆ کوردەکانی شیمالا و، بۆ ئەوانەی هاوکاری لە گەڵ پێشمەرگە ئەکەن و یارمەتی ئەدەن».

ئەم دەزگایە وەکو ئوردوگایەک وایە، هەرچی ئەگیری لە لایەن دەزگای «امن» و «استخبارات» ەوە لە شار و قەزا و ناحیەکان، یاخود لە لایەن هێزە چەکدارەکانی ڕەگەزپەرستەکانەوە لە کاتی هێرش و پەلاماری سوپایی دا، پاش لێدان و لێپرسینەوەیەکی سەرپێیی، بۆ ئەم جێگە نهێنیە ئەهێنرێت.

کاتێک جاسوس و چڵکاوخۆر و خۆفرۆشەکان تێکۆشەرێک دەس نیشان ئەکەن، هێزێکی تایبەتی کە پێ ی ئەڵێن: «قوە خاصە» لە دەوروبەری نیوەشەو دا ئەدات بە سەر ماڵەکەی دا و ئەیگرێت، دەس و چاوی ئەبەستنەوە و بەرەو مەڵبەندی امن یا استخبارات ئەیبەن، خۆ ئەگەر لە ڕێگا یان لە کاتی گرتن دا سەرکێشییەک بکات، ئەوا پێشەکی لێدانێکی باشی لێ ئەدرێت. کاتێکیش ئەگاتە استخبارات لەوێ هەر خێرا ئەخرێتە ژووری لێدانەوە، پێش هەمو لێپرسینەوەیەک یەکەو گورژم لێدانی باشی لێ ئەدری بە دار و سوندە، زللە و شەق و بۆکس ئەبێتە تەواوکەری پەردەی یەکەم. پاشان بە چاو بەستراوی ئەبرێتە ژوورێکەوە بۆ لێپرسینەوە، لەوێ هەندێ پرسیاری جۆربەجۆری لێ ئەکرێ، جا ئەگەر لە وەڵامدانەوەیان سەرپێچی کرد و وای وەڵام نەدایەوە وەکو ئەوان ئەیانەوێت، ئەوا دەس ئەکرێتەوە بە لێدانی، تا ئەو شتانەی مەبەستیانە بە زۆر بە سەری دا ئەسەپێنرێت و

فایلیکی نارەوای بۆ ئامادە ئەکریت.

ماوەی مانەوەی گیراو لەم شوینەدا بە پێ ی خوراگرتنی بەندەکە ئەگۆریت لە رۆژیکەوە هەتا شەش مانگ، بە ئازاردانی هەمیشەییەوە، تا ئەو شتانەی ئەیانەوێ لی ی هەل ئەهێنجن.

جۆری لیدان لە دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات دا، چ لە شار و چ لە قەزا و ناحیەکان بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە و نامرۆڤانە ئەکری. بە هیچ جۆریک ناهیلریت بزانریت کە لە کوێ گیراوە و بۆ کوێ ی ئەبەن، هەمو جۆرە پەیوەندییەک لە نیوان بەندەکە و کەسوکاری دا قەدەغەیە.

بەندەکان ئەکرین بە دو بەشەوە: ئەوانەی بە تاوانی ڕیکخستن گیراون، وە ئەوانەی لە سەر هاوکاری لە گەل پێشمەرگە و کاروباری عەسکەری گیراون. بەشی یەکەم راستەوخۆ ئەبرین بۆ «هێنە»، بەشی دوهەمیش بۆ «منظومه استخبارات المنطقه الشماليه».

«منظومه» ش هەر لە سەربازگەی کەرکوک دایە، بریتیە لە خانویەکی گەورەی دو نهوم، چەندین ژوری تی دایە و، کەوتوتە رۆژهەلاتی سەربازگەکەوە.

کاتیک بەندەکە ئەبریت بۆ «منظومه» بە چاو و پەل بەستراوی ئەپەستریتە ژوریکی سەربەخۆ وە، هەتا ٢ - ٣ رۆژ لی ی ناپرسریتەوە، پاشان ئەبریت بۆ لیپرسینەوە، لیرە شیواز ئەگۆریت، لە پیش دا بە خۆشی و دلنەوایی و ریز لی گرتن، پاشان بە ئەشکەنجە و ئازاردان و ئیهانە کردن، لە بەر روشنایی ئەو فایلەی بوی ئامادە کراوە پرسیاری لی ئەکریت، ئەگەر شایەت یان جاسوس دەس بکەون ئەوا ئەوانیش ئامادە ئەکرین.

لیدان و ئازاری نەفسی و تۆقاندن، بەشیکە لە ژیانی ئەم دەزگایە. لیدان بە سوندە و دار و کیبل، ئینجا هەلواسین بە پانکەدا و لیدان بە دار، لە کاتی لیدان دا پەل ئەبەستریت و پەروی سەرچاو لا ئەبریت، هەندی جار هەردو پەل لە پشتەوە ئەبەستری و هەل ئەواسری بە شیشیکی ئاسن دا کە ئامادە کراوە بۆ ئەم مەبەستە.

ئەمانە هەموی بە کار دیت لە کاتی لیپرسینەوەدا، ئەگەر ئەمانەش دەمی بەندەکەیان هەل ئەهینایەوە ئەوا جیهازیک بە کار ئەهینریت کە هیزی ئەلەکتریکی تی دایە بریتیە لە وایەریک کە ئەبەستریت بە سەرەوە، جیهازەکە لە لایەن دەستی ئەچی، کارەبا لە سەری بەندەکە ئەدات. بە پێ ی خوراگرتنی بەندەکە، جۆری ئازاردان ئەگۆریت.. زۆر جار لە رۆژیک دا ٤ - ٥ جار ئەبری بۆ ژوری ئازاردان. لە کاتی پشودان دا عەریفیک یان سەربازیک ئەنیردریت بۆ لای بەندەکە بۆ تۆقاندن و ترساندن و وەرەروخاندن، بەوەی کە باسی چەندین بەندی پیشوی بۆ ئەکات کە چۆن لە ژیر ئازار و ئەشکەنجەدا مردون، چۆن

ئەو جێگایە نهێنییە و کەس نازانی کوێ یە و هەرچی بگاتە ئەوێ ئیتر ژیانی تەواو ئەبێ ئەگەر دان بە تاوانەکانی دا نەنێ..

ماوەی لێپرسینەوە لە هەفتەیەکەوە هەتا مانگێک ئەخایەنێت، هەموو جۆرە پەیوەندییەک لە گەڵ دەرەوە، بینینی کەسوکار قەدەغەیە، لێرە تینویەتی یش وەکو چەکێکی تر بە کار ئەهێنرێ بۆ رووخاندن، چونکە جاری وا هەیە بە درێژایی یەک رۆژ ئاو نادرێ بە بەندەکە. ئەوەی بێتە «منظومە» ئەگەر تاوانباریش نەبێ بە زۆر تاوانبار ئەکرێ، ئیتر سا یان بە ئازاردان و ترساندن، یان بە بەکارهێنانی لەرینەوەی کارەبایی، یان بە هەڵبەستنی بوختان و درۆ.

لە کاتی لێپرسینەوەدا لە «منظومە» ٣ کەس بەشداری لێکۆڵینەوەکە ئەبن بە جلی مەدەنییەوە، بەڵام هەرسێکیان عەسکەرن، هەر خۆیشیان لە لێدان و ئازاردان دا بەشدار ئەبن، ئەم سێیانە یەکێکیان بە رووتبەی نەقیب و دوانەکەی تر بە رووتبەی مولازمن.

لە «منظومە» ش فایلێکی تر بۆ بەندەکە ئامادە ئەکرێ و، ئینجا ئەبرێ بۆ «هیئە» کە ئەویش لە هەمان سەربازگەدایە.

لە «هیئە» هەر بە گەیشتنی بەندەکان و کردنەوەی دەرگای بەندیخانە، لە حەوشەکەدا چێنێکی باش لە بەندەکان ئەدرێ بە سوندە و زللە و شەق و بۆکس.

«هیئە» بریتییە لە ٣ خانوی پێکەوە نوساو، خانوی یەکەم جێگای لێپرسینەوەیە، خانوی دوهەم هی بەندە تازەکانە کە هێشتا لە ژێر لێپرسینەوەدان، خانوی سێیەمیش جێگەی ئازاردان و، ئەو بەندانەیە کە چاوەڕێ ی «محکمە خاصە» ئەکەن.

خانوی یەکەم بریتییە لە ٢ ژوور، ژووری لێپرسینەوە و، ژووری پاساوڵ.

خانوی دوەم بریتییە لە ٣ ژوور بۆ بەندەکان و، ١ ژوور بۆ پاساوڵ. ژوورەکانی پچکۆلە و پیس و پۆخڵن. بەندەکان ئەخرێنە ئەم ژوورانەوە، هەر ژوورەی ٤٠ تا ٥٠ بەندی تێ ئەئاخنرێ، بە جۆرێک کە شوێنی دانیشتنیشی تێ دا نابێتەوە. رۆژی تەنیا ١ سەتڵ ئاو بۆ بەندەکان تەرخان ئەکرێ ژمارەیان هەرچەنێک بێت.

ژیانی رۆژانەی ئەم بەندیخانەیە بەیانیان سەعات ٥ دەس پێ ئەکات کە دەرگای ژوورەکان ئەکرێتەوە و بەندەکان هەموو لە حەوشەکەدا ریز ئەکرێن، ئینجا ٢ سەرباز بە سوندە تێ یان ئەکەون لە بەر ئەوەی گوایە نازانن بەریز راوەستن! ئەوەی لە حەوشەکەدا زیاتر سەرنج رائەکێشێ، ئەو هەموو پێڵاو و جل و جامانە و پشتێنەیە کە لە لایەکی حەوشەکەدا وەکو خەرمان هەڵ دراوەتەوە.

رەفتاری سەربازەکان لە گەڵ بەندەکان دا یەکجار درندانەیە، بە رادەیەک کە فەرمان

ئەدەن هەمو سەریان شور بکەن و سەیری ئەم لا و ئەو لای خویان نەکەن، ئەمە سەرەرای تف و شەق و زللە و هەزار جنێوی سوک وقسەی ناشیرین.

چونە سەر ئاودەست، دیسانەوە، وەکو چەکیکی تر، بو ئازاردان بە کار ئەهێنری، چونکە مولەتی دانیشتن نابی لە دەقیقەیەک تێ پەر بکات، کە زوریەی بەندەکان فریای هیچ ناکەون، هەر ئەمەشە ئەبێتە هوی ئەوەی هەمو روژ چەندین بەند لە ژورەکان دا تەنگەتاو بێن و بە ناچاری لە ژورەوە برێن.

هەر روژەی ٥ تا ٦ کەس بانگ ئەکرێن بو لیپرسینەوە، سەرلەنوی لە سەرەتاوە دەس ئەکریتەوە بە پرسیار، گوایە ئەوانەی پیشو، کە لە شارەکان و کە لە «منظومە» کراوە بایەخی پی نادری! سەرلەنوی فایلیکی تازەی لیکولینەوە ئەکریتەوە.

«هینە» یەکیکە لە نهێنیترین شوینەکانی لیکولینەوەو ئازاردان بو «ناوچەی ژورو» ، لە هەمو لایەکی کوردستانەوە روژی چەندین کەس راپیچ ئەکری بو ئیرە، هەموشی لە چەند شتیک دا یەک ئەگریتەوە: ریکخستن، پیشمەرگایەتی، هاوکاری پیشمەرگە. کە یەکی بانگ ئەکری بو لیپرسینەوە، دو سەرباز بانگی ئەکەن، چاو و دەستی ئەبەستنەوە، بە لیدان هەتا ژوری لیپرسینەوە ئەیبەن، لەوی پرسیاری لی ئەکری و داوای لی ئەکری هەرچی ئەزانی راست و رەوان بیلی. پاش ٣ - ٤ پرسیاری هەرەمەکی ئەبری بو خانوی سێیەم بو ئازاردان. لەوی، لە حەوشەکەدا پالی ئەخەن، هەردو قاچی بە شیشیکەوە ئەبەستنەوە. شەش سەرباز دو دو ئەکەونە لیدانی بنی پی ی بە سوندە تا هیلاکی ئەبن تا بەندەکە لە هوش خوی ئەچی، ئینجا سەتلیک ئاو ئەکەن بە سەر و پویلاکیا، کە هوشی پیا هاتەوە ئەکەونەوە لیدانی. بەم شیوەیە ٤ تا ٥ جار ئەیبەستنەوە و ئەیکەنەوە، لە پاش دا بو ماوەی چارەکە سەعاتی بە حەوشەکەدا راوی ئەنین.

زوریەی بەندەکان زمانی عەرەبی نازانن، بو ئەم مەبەستەش چلکاوخوریکی خویان بە ناوی تەرجومانەوە ئەهینن، ئەویش بە ئارەزوی خوی قسەی بەندەکان ئالوگور ئەکا.

ئازاردان و لیپرسینەوە لە حەفتەیەکەوە تا چەند مانگیک ئەخایەنی بە پی ی خوراگرتنی بەندەکە هەتا لە پاشان فایلیکی بو ئامادە ئەکری و پەنجەموری پی ئەکەن.

لە گەل ئەو هەمو ئازار و ئەشکەنجەیە دا، سەدان رولەی ئەبەزی میللەتەکەمان، چەندین لاپەرەی شانازی و دلیریان ئەخشاندوە بە هیمەت و خوراگرتنیان سەری یاساول و لیپرساوە فاشیستەکانیان شور کرد و، ئیسپاتیان کرد کە رولە تیکوشەرەکانی میللەتەکەمان، ئازار و ترساندن و، هیلانە نهێنیەکانی رەگەزپەرستەکانی عیراق هەستی بەرەنگاری و خەباتیان خاپور ناکات.

پاش لێدانێکی زۆر بەندەکە ئەبەنەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، هەر خێرا لەوێ هاوڵەکانی دەوری ئەدەن و، ئاوی ئەدەنێ و، دەس ئەکەن بە شێلانی قاچی. پاش تەواو بونی لێپرسینەوە بەندەکە ئەبەن بۆ خانوی سێیەم. ئەویش بریتیە لە ۳ ژور، جگە لە ژوری پاسەوان. ئەوانەی ئەگەنە خانوی سێیەم بە رەسمی ئازاردانیان ئامێنێ و، چاوەڕێ ی «المحکمە العسکریە الخاصە» ئەکەن. مانەوەی بەندەکە لە خانوی سێیەم لە ۳ تا ٦ مانگ ئەخایەنێ. مەبەست لە مانەوەشیان تەنیا زۆر بونی ژمارەیانە، کە وەک مێگەل بە رەوە بیانبەن بۆ «دادگا».

«مەحکەمەی عەسکری خاص» بریتیە لە دەزگایەکی کاریکاتوری، تەنیا بۆ بڕیاردانی خنکاندن و حوکمدانی تێکۆشەران و بێتاوانانی گەلی کورد، دامەزراوە. هیچ سیفەتێکی قانونی و شەرعی و ڕاستی تێ دا بەدی ناکرێ. ئەو بڕیارانەی ئەیشدرێن پێشەکی ئامادە کراوە ، ڕۆژی «مەحکەمە» تەنیا ئەخوێنرێتەوە. بەندەکان بە هیچ جۆری مافی دیفاع کردنیان نیە، خۆ ئەگەر یەکێک بڵێ: ئەو ئیفادانە هی ئەو نیە و بە زۆر لە ژێر ئەشکەنجەدا پێ یان مۆر کردوە، ئەوا ئەینێرنەوە بۆ «هێنە» و ئیتر جارێکی تر چاوی بە مەحکەمەش ناکەوێتەوە.

کاتێک ڕۆژی بەستنی «دادگا» دیاری ئەکرێ، ئەو بەیانییە هەمو بەندەکان ریز ئەکەن و، عەریفێک بە مقەستێکەوە دەست ئەکا بە سەر و ڕیش و سمێل هەڵپاچینیان بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین، کە مەبەست تەنها ئیهانە و ناشیرین کردنی سەر و سیمایانە لای «حاکمەکانا».

کاتی سەر و ڕیش و سمێلی بەندەکان هەڵ ئەپاچن ئینجا بە لوری ئەیانبەن بۆ «دادگا»، لەوێ هەمویان ریز ئەکەن، بە جۆرێک کە ڕویان لە دیوارەکە بێت، ئینجا بە سوندە و شەق و زللە تێ یان ئەکەون تا هیلاک ئەبن.

«دادگا» خۆی بریتیە لە شانۆیەکی گریاناوی ئەم خەلکە سەر و ڕیش هاتوە، بە پێ ی پەتی وەک مێگەل ریزیان ئەکەن، حاکمەکانیش بە گاڵتە پێ کردنەوە ئەڕواننە سەر و پرتەلاکیان و بە جوملە حوکم ئەخوێنێتەوە کە لە پێش دا ئامادە کراوە.

لە هەر جارێک دا، دەستەیەک لە خەباتکەرانی میللەتەکەمان، ڕەوانەی زۆری ئیعدام ئەکرێ. ئەوانەی کە ئەمری ئیعدامیان دەرئەچێ، دوای تەواو بونی «شانۆی دادگا» دەستیان کەلەپچە ئەکرێ و لەوانی تر جیا ئەکرێنەوە.

ئەوانەی بە گرتنی چەند ساڵە حوکم ئەدرێن، پاش چەند ڕۆژێک ئەنێردرێن بۆ بەغداد بۆ «سجنی ئەبو غریب» و، ئەوانیش کە حوکم ئەدرێن بە ئیعدام ڕەوانەی موسل

ئەكرین.

کاتیک بەندەکان ئەهێنرێنەوە بو «هێنە» حوکمدراو و ئیعدامەکان یەکتر ماچ ئەکەن و، دەست ئەکەن بە گورانی و وتنی سرودی نیشتمانی، دەنگی دلیریان دلی داگیرکەری فاشیست ئەخاتە لەرزە و، بو جاری هەزارەمین، بو رەگەزپەرستەکانی ئیسپات ئەکەنەوە کە پەتی خنکاندن و دەزگای لە ناوبردن دلی رولە دلیرەکانی گەلی کورد سارد ناکەنەوە لە خەبات و تیکوشان و خوبەخت کردن، بەلکو بە پیچەوانەوە تەبەزی و هیمەتیان ئەخاتە دلەوە و، زیاتر هەستی بەرەنگاری و خەباتیان تیا زیاد ئەکات. هەلویستی هەمو ئەو رولانەی، دلیرانە چونەتە بەر پەتی ئیعدام، ئەوەی بە داگیرکەران سەلماندەوە.

*

دانانی بنکە

ئەوسا لە بەر پەلاماری کتوپری هالیکوپتەر هیچ هیز و مەفرەزەیەک نە ئەبو وە نەی ئەتوانی بە روژ لە ناو ئاوایی دا بمینیتەوە. ناوچەکە ژمارەیەکی کەم گوندی تی دا بو. گوندەکانیش پچوک بون. باری ژیانیشیان ئەوەندە باش نەبو هەمو روژ و هەمو ژەم لە مالەکانی ئەوان نان بخوین. ئیمەش بە تەما بوین ئەو ناوچەیە بکەین بە پردی پیوەندی لە گەل سوریا بو هاتوچو و، هینانی چەک. ماوەیەک بە گوندەکانی دەریاسور، گەرەپیچ، چەمەلو، هەدن، ئاری، بەرمیزە...دا سورایەنەوە. چوینە ناو رەشمالی رەوەندەکانی «هەرکی» لە دەشتی بەرازگر. ئاگاداری کاک خالیدمان کرد بو بگەریتەوە ئەوی. چاوەریی ئەومان ئەکرد. ئەمان ویست کات بە سەر بەرین.

شارەزا ئەمینەکانی ناوچەکەم لە گەل خوم ئەبرد بو ئەوەی شوینە نادیار و عاسیبەکانم پیشان بدەن بنکەیەکی نهینی خواردن و حەسانەوەی تی دا دابمەزرینم. چەند شوینیکمان نوری. شارەزایەکی خەلکی «هەدن» لە ناو لیرەواریکی چردا شوینیکی گولجاوی لە باری بو دوزینەوە. کانی خوش و سیبەری خەستی هەبو. پەنایەکی نادیار و شوینیکی عاسی بو. چەند سەعاتی لە کانی رەش دور بو.

لە بن داربەروە پیرەکان دا جیگەمان بو دانیشتن و نوستن لە سەر ئەرزە رەقەکە خوش کرد. یەکی لە پیشمەرگەکان بە ناوی ئەحمەد گەلالی شارەزای دروست کردنی تەنور بو. بو ئەوەش پیویستی بە بەرد و هەندی کەرەستەی تر بو وەکو دار و تەختە و تەنەکە... لە کاتی کوکردنەوەی بەردا ئەوەی سەرنجی هەموانی راکیشا ئەوە بو لە بن هەر بەردیک دا چەند دوپشکیکی تی دا بو. ئەمە هەندی ترسی لا دروست کردین. خەریک بو پەشیمان ببنەوە لەو شوینە. یەکی لە پیشمەرگەکان بە گالتەوە وتی: «عەسکەر

بانکوژی باشتره له دوپشکدا». که گەڕاینەوە بو ناو دی بو ئامادەکردنی پیویستییەکان، کابرای شارەزا ترسەکەی رەواندینەوە. وتی ولاتی ئیمە مەشهورە بە پایتەختی دوپشک و پیشکە. بەلام نە دوپشکەکەی کەس ئەکوژی و نە پیشکەکەشی مەلاریا بلاو ئەکاتەوە.

دوای ئاشبەتال کە حکومەت گەیشت بوە هەدن مەخفەریکی گەورەی لی دروست کرد بو. زستانەکەی لە بەر توندیی سەرما و زوریی بەفر بە هالیکوپتەر زەلامەکانیان گویزا بوەوە. مەخفەرەکەیان وەکو خوی بە جی هیشت بو. موختاری هەدنیان ئاگادار کرد بو ئاگای لە شتەکان بی کەس نەی بات و دەسکاری نەکا. دەرگا و پەنجەرە و کورسی و میزەکانی هەمو ساخ بون. هەروەها چەندین تەنەکەی نەوتی پر و بەتال لەوی بو، ئەویش کەس دەستی تیوە نە دا بو. تەنانەت هەندی وینەی احمد حسن البکر و صدام حسین و هەندی شیعاری بەعسیش هەل واسرا بو، هیچ دەسکارییەک نەکرا بون. پیشمەرگەکان بو پیویستییەکانی تەنورەکە دەرگایەکیان دەرهینا گونکی لەسەر بەرن و هەندی تەنەکەی بەتالیان بو ناو تی کردن برد بو بنکە. بو روژی دوایی پیویستیان بە هەندی شتی تر بو چون لە مەخفەرەکە بیبەن هیچی تی دا نەمابو. خەلکی ئاوایییەکە دەرگا و پەنجەرەکانیان دەرهینا بو، هەروەها هەمو تەنەکە پر و خالییەکانیان برد بو . تا ئەوکاتە لە ترسی سزادانی بەعس نەیان ویرا بو دەستی لی بدەن، بەلام دوای ئەوەی پیشمەرگە دەستکاریان کرد ، ئەوانیش بیانویان دەس کەوت بو ئەوەی لە پاشەروژدا ئەگەر هیزی حکومەت گەرایەوە، ئوبالەکەی بخەنە ملی پیشمەرگە.

ئەو سەردەمە، پیشمەرگە ئەبو کولەپشت و زەمزەمی و یەکی کوپیکی چاخواردنەوە و قاپیکی چیشت و کەوچکیک لە گەل خویان هەل بگریت. پیشتر هەمو وتار و کتیبەکانی «ئارنیستو چی گیفارا» م دەربارەی «جەنگی پارتیزانی» و «یادداشتەکانی بولیفیا» م خویند بوەوە، هەندی بابەتیشم لی تەرجومە کرد بو. راستییەکەی، هەرچەند لە خوم و هاوریکانم ورد ئەبومەوە، ئەو مەرجانەی گیفارا بو پیشمەرگەی دانا بو، بە تایبەتی لە روی توانای لەش و کول هەلگرتن و ریگا رویشتنەوە، لە ئیمەدا نەبو.

ئازوقە و مەنجەل و هەندی ئاسنجاو پەیدا کرا بو بنکەکە، بەلام پیخەف نەبو ئەبو لە سەر ئەرز بنون. چراش دائەنەگیرسینرا.

*

قم ریکەوتنە مەیدانییەکەی سوریا بە نەبو دائەنی

هەر لەم ماوەیەدا نامەیەکم پی گەیشت بە ئیمزای «سەرپەست» یەکی لە بەرپرسەکانی قم داوای کرد بو: لە بەر ئەوەی هەندی روداوی تازە هاتوتە پیشەوە بە پەلە

یەکتر ببینین. سەرەیست ناوی تەبینی ئەورەحمان بیداوی بو. د. خالید هیشتا ئەهات بوەوە. تەنیا بەرپرسی لەوی بو فەرماندەی کەرتی بو، ناوی رەحمان بیشەیی بو. ٤ - ٥ پیشمەرگەمان لە گەڵ خومان برد و، پیکەوە چوین بو دیتنیان. شەو گەیشتینە دەریا سور. ئەورەحمان بیداوی و فاضیل جەلال و عەبدوللا صالح و هەندیکی تر لە کادر و بەرپرسەکانی قم لەوی بون. قەرە باخییەکی چەکداریان لە خویان کو کرد بوەوە. لە سەر ریگاکە چەندین کەمین و پاسەوانیان دانا بو.

شەو لە گەڵ فاضیل و چەند کەسیکی کەیان پیکەوە لە مالیک دا ماینەوە. پیش نوستن ویستمان بچین بو سەر ئاو. کوریکی خاوەن مالەکە دومان کەوت بو لیمان نەئەبودوە. فاضل ئەیویست کورەکە گوی ی لە قسەکانمان نەبی. چەند جاری داوای لی کرد بگەریتەوە مالی خویان چاوەریمان بکا. کورەکە وتی: «ئەترسم بزر بین». فاضل لە وەلامی دا وتی: «بگەریرەوە مالی خوتان، بە سەر دە دەولەت دا بە قاچاخ هاتوین بو ئیرە بزر نەبوین، ئیستا لە بەینی مالی ئیوە و چەمەکەدا بزر ئەبین؟»

کوبونەوەی بەیانی لە گورەپانی گوندەکەدا بە بەرچاوی کادرو پیشمەرگەکانیانەوە بو ئەوە بو تەبلیغمان بکەن لەبەر ئەوەی ینک زوری خروقات کردوە: بی ئاگاداری قم چەکی هیناوەتە کوردستان، هەندی ئەندامی ئەوانی بە توهمەی جاسوسی کوشتوە... ئیتر ئەوان التزام بە ریکەوتنەکەوە ناکەن و بە ئەبوی دائەنین و ئەگەر ینک چەک بهینی ئەوان ئەی گرن. من ئەوسا ئەمئەزانی ق م بوچی لەو ریککەوتنە پەشیمان بوتەوە. چەند سالی دوای ئەوە بیستمان: مەسعود هەوال و ناوەروکی ریککەوتنەکەی بە تەلەفون دابو بە موحسین دزەیی لە واشینتون، تا ئەویش بە مەلا مستەفای بلی. موحسین ئەم هەوالە بە خوشییەوە بو بارزانی باس ئەکا. کورەکەیان د. نەجمەدین کەریم و، د. شەفیق قەزازیشی لی ئەبی. بارزانی لە باتی ئەوەی رەزامەندی دەربری جنێویکی ناشیرین بە مەسعود ئەدا لە سەر ئەوەی لە گەڵ مامجەلال ریککەوتنی ئیمزا کردوە.

مەلا مستەفا تەمەنی لە حەفتا تی پەری بو. بە هوی نەخوشیی «شیرپەنجەی سی» یەوە لە سەر مردن بو. ئەبو دەرسی حیکمەت و گیانی لیبوردن و بە تەنگەوە هاتنی قازانجی کوردی بە کور و شاگردەکانی دابدایە. بەم هەلویستەی دوای مردنی خوی دوژمنایەتییەکی خویناوی بە میرات بو کورەکانی و نەوەکانی و، عەشیرەتەکەی و حیزبەکەی بە جی هیشت، سەدان کوردی بیتاوانی تی دا کوژرا.

*

گفتوگوی تورک و د خالد

شیخ کوکس یەکی لە نەوەکانی شیخ عوبەیدوللا لە عیراقەوە هەلات بو بو تورکیا. لە شەمزینان دانیشت بو. وەلامی نارد بو کە نوینەرانی حکومەتی تورکی ئەیانەوی هەندی لە بەرپرسەکانی جولانەوەکە ببینن. کات و شوینی یەکتر بینین دانرا. نوینەری تورک لە کاتی دیاری کراوا هاتە گوندی روباروک لە بەری تورکی روباری سەرکەم. د خالد چو بو دیتنی. کابرا لەم دیتنەدا گوت بوی: لە ئەنقەرەوە هاتوە. ئەیەوی بزانی سەرکردەکانی ئەم جولانەوە تازەیە کین. ئامانجەکانیان چیە. هەلویستیان بەرامبەر حکومەتی تورک چونە. پیوەندییان لە گەل حیزب و ریکخراوە کوردییەکانی تورکیا چیە. پیویستییەکانیان چیە و داواکانیان لە حکومەتی تورک چیە؟

کاک خالید وەلامی پرسیارەکانی دا بوەوە. پیویستییەکانی جولانەوەکەی، لە سنوری مەعقول و تیگەیشتنی تورکدا، پی وت بو. کابرا گوت بوی کە ئەو دەسەلاتی بریاردانی نیە بەلام قسەکان ئەگەیەنیتە دەسەلاتدارانی سەرو، لە حەفتەکانی داهاتودا خوی یا یەکیکی تر وەلامەکانی ئەهینیتەوە.

بینینی تورک لە چەند سەرەوە بو ئیمە پیویست بو:

پیشمەرگەی کورد و جەندرمەی تورک بو بون بە هاوسنور. هەمو روژی لە سەر سنور ئەمان لەمبەر و ئەوان لەوبەر یەکتریان ئەدی.

جولانەوەکە ئەگەر بوی بکرایە لە دوژمنایەتی دەولەتانی دراوسیی کەم بکردایەتەوە، بە تایبەتی هی تورک و، بیلایەنی بکردایە تا رادەیەکی زور بە هیزی ئەکرد

تورک لەو کاتەدا لە گەل عیراق لە سەر مەسەلەی نەوت ناکوک بو. تورک قەرزاری عیراق بو. عیراق بو ئەوەی تورک ناچار بکا قەرزەکانی بداتەوە، ئەی ویست رویشتنی نەوت بە لولەی ستراتیجی میناء جیهان دا رابگری. ئەوەش زەرەریکی ئابوری گەورەی لە تورک ئەدا.

ینک و دەدەقادە دو هاوپەیمانی یەکتری بون. هەوالی ئەم دیتنەیان بو باس کرا. دەدەقادە زور بە توندی دژی راوەستا و پروپاگاندەیەکی فراوانی دەست پی کردو، هەرەشەی لە ینک کرد کە ئەگەر پیوەندی لە گەل تورک دوبارە بکەنەوە، ئەوان پیوەندی خویان لە گەل ینک «قوت ئەکەن» واتە ئەبرن. گازاندەیان لەم کارە گەیاندە لای مام جەلال. سەرکردایەتی ینک بو خاتری پاریزگاری پیوەندی خوی لە گەل دەدەقادە بریاری دا پیوەندی لە گەل تورک ببری. کاتی کابرای نوینەری تورک هاتەوە ناوچەکە بو هینانی وەلامی دانیشتنی یەکەم، بە زمانیکی شیرین «جەواب» درا.

*

پنکەکمان تا ئەحات قەرەبالغ ئەبو.

کاک خالید گەرایەوە لامان. شوینەکەی بە دل بو. ئەویش لەوی مایەوە.

هیزیکی دولی بالەییان، قادر خەبات فەرماندەیان بو، گەیشتن. گورجوگول و چالاک و ئازا و گویرایەل بون.

هەندی لە کادرە سورانییەکانی یەکیتی کە لە سوریاوە بە ناو تورکیادا گەرا بونەوە، بە دو تاقم گەیشتنە لامان. لەوانە: حەسەن خوشناو، سەید کەریم، د. خدر مەعصوم، سامان گەرمیانی، عادل شوکر، داود محەممەد عەلی، عەبدوللا خوشناو... لە گەل خویان دو کادری «الجیش الشعبی لتحریر العراق» یان هینا بو. تاقمی لەم کادرانە بی چەک هات بونەوە. لە کاتی پەرینەوەدا لە روباری سەرکەم لە ئاستی گوندی دەریا سور چەکدارەکانی ق م بوسەیەکیان بو نابونەوە گرت بویانن. برد بویانن بو لای فەرماندەکەیان. گفتوگو و مشتومر لە نیوان ئەوان و کابرای ق م دا روی دا بو. کابرای ق م وت بوی: «بوچی ئیوە دوای جەلال کەوتون، جەلال جاشە!». ئەوانیش وت بویان: «مامجەلال جاش نیە. سەرکردایەتی بارزانی ئاشبەتالی کرد. بوچی واز لە کورد ناهینن؟». کابرای ق م وت بوی: «بە کویرایی جەلال و ئیوە هەتا مەلا مستەفا مابی سەروکمانە. دوای ئەو ئیدریس، دوای ئەو مەسعود، دوای ئەو نیهاد... ئەگەر هیچ کەسی لە مالی مەلا مستەفا نەما کەریک لە مالی بارزانی ئەهینین، جامانەیەکی سوری لە سەر ئەکەین و ئەیکەین بە سەروکی خومان»

هەر لەو ماوەیەدا زیروی عەبدوللا ریوی لە ناوچەی سلیمانیەوە گەیشت. لە «پردی ناوەندە» کەوت بونە کەمینەوە. تیکوشەری بە تەمەن «حەمەسید باتاسی» و ٣ پیشمەرگە کوژرا بون. ماموستا ئیبراهیم ئەحمەد شیعریکی بو دانابو، لە دیریکی دا بە «ئاشقەروتەکەی خاکی کوردستان» ناوی برد بو. دوا بە دوای ئەویش چەند کادریکی تری کومەلە گەیشتن لەوانە: ئەبو شەهاب، دلیری سەید مەجید.

هەمو بەیانییەک شەوەکی کاک خالید هەمو هیزەکەی لە خەو هەلئەستان و هەندی قسەی سیاسی بو ئەکردن. زور جار دوپشک بە پیشمەرگەکانیەوە ئەدا بەلام مەترسییان نەبو.

لەم ماوەیەدا عیراق سەرژمیری گشتی کرد. لە گەل سەرژمیرەکەدا بە هالیکوپتەر لە زوری گوندەکان دائەبەزین. لە روژی سەرژمیردا چەند هالیکوپتەری هاتنە ئاسمانی ناوچەکە. چەند شوینیکیان ئاگر باران کرد و ئاگریان بەردایە پوش و پاوانی ناوچەکە و لە هەندی شوین دابەزین. هەرچەندە پیشمەرگەکان دامەزرا بون و چاویان لە نیشتنەوە و

دابەزین و سواربونەوە و فرینی سەرباز و هالیکوپتەرەکان بو تەماشەکردن تەقەیان لی بکەن. چونکە ئەوان پیشمەرگە و شوینی بنکەکانیان نەبینی. تەقەی کویرانەیان ئەکرد. کاک خالید بە چاکی زانی هەمو بارەگاکان بگویزرینەوە سەر روباری سەرکەم لە دول و شیوەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دا جیگیر بن. چەند فرنیکی نان برژاندمان دروست کرد.

شیخ حسەینی بەزیدی زوری پیشمەرگە بادینیەکانی کو کرد بوەوە بەرەو کوردستان هینا بونی. لە ناوچەی گویی لە نیوان ئولودەرە - زاخو دا ق م بە پیچەوانەی پەیمان و بەلینەکانی مەسعودەوە کەوتنە راونانیان. ئەیانویست بیانگرن و چەکیان بکەن. خویان گەیاند بوە جیگایەکی قایم بە ناوی «کەلی مەمی». ق م گەماروبان دا بون. لە سوریاوە بە هوی «لیژنەی هاوکاری»وە هەولی دەربازکردنیان دابو. کەلکی نەبو. نامەی بو ئیمە نارد تەگبیریک لە حالیان بکەین. من و حسەن چوینە تورکیا و بە نهینی خومان گەیاندە ناوچەکە. تراکتورمان بو پەیدا کردن. شەولەناو بە تراکتور هەمومان گویزانەوە بو ناوچەی شەمزینان. حسەن پیشیان کەوت گەیاندنیە بنکەکانی خومان. پیشمەرگەکان ماوەیەکی دریژ بو بە ئاسودەیی نەنوست بون و نانیان نەخوارد بو، بە تەواوی حسانەوە.

*

لیرەوە پیوەندی لە گەل بنکەی سوریا بە هوی «پ د ک ت»وە و بە هوی صەلاحەوە دامەزرینرا. نامە و دەنگوباسی کوردستانی عیراق بە ریکوپیکی ئەنیردرا. ریگەی هاتوچو کردن و، ریگەی هینانی چەک دوزرابەوە. لە هەمان کات دا پیوەندی دوستانە لە گەل زور لە دانیشتوانی گوندەکانی ماسیرو، گارە، گلیشم، سونە، دیرکی، مەلاویا، شەپەتا، زەرن، ریبونس، نەهری...لە دیوی تورکیا دروست کرا. ئەوانە بو کرینی ئازوقە و، هەندی جار بو حەواندنەوەی پیشمەرگە و، بو هاتوچو کردن یارمەتی کادر و پیشمەرگەکانی بنک یان ئەدا. چەند کەسی لە خەلکی ئەم ناوچانە زوریان خزمەت کردین و، زورمان پیوە ماندو بون لەوانە: محەمەد عارەب و، حاجی مەجید، لە ماسیرو. عەولا خان و، نوری خان، لە زەرن. صادق، لە شەپەتان. جەمال لە سونی، خورشید لە گەلیشم و، هەندیکیان لە سەر ئیمە لە لایەن ق م و حکومەتی تورکەوە توشی گرتن و تەنگ پی هەلچنین بون.

نەهری شوینیکی زور خوش بو. چەند مالیکی کەمی لی بو. کەلاوەی کوشک و سەرای شیخ عوبەیدوللای شەمزینی سەرکردەی راپەرینی ١٨٨٠ هەروەها گورستانی باووباپیرانی شیخ هیشتا ما بو. چەند جاری بە نەهری دا تی پەریم. جاریکیان لە ئارامگای سەید طەهای باوکی شیخ عوبەیدوللادا «عەریزە» یەکمان دوزییەوە کابرایەک لە

ریگای شیخەوە دابوی بە «خوا» لی ی ئەپاڕایەوە چاوەکانی کز بون چاکیان بکاتەوە.

*

هاتنی چەند نەمسایەک

دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عیراق هیچ جورە هەواڵ، دەنگوباس یا لیدوانیکی لە سەر جولانەوەکە بلاو نەئەکردەوە. ئەبویست بە بیدەنگیی بیخنکینی. وەکو عەرەب پی ی ئەلین: «تعتیم اعلامی» لە سەر بو. ڕوژنامەوانی بیگانەش نەئەگەیشتنە لامان. جولانەوەکەش ئەوەندە ڕونەقی پەیدا نەکرد بو ڕوژنامەوان خوی بو بکوتی. بەلام هاوینی ۷۷ دوجار بیگانە لە تورکیاوە گەیشتنە بنکەکانی ئیمە. جاری یەکەم دو خویندکاری گەنجی نەمسایی بون، هەردوکیان لە شەمزینانەوە من لە گەل خوم هینامن بو بنکەکانی برادوست، جاریکی تریش نەمسایەکی تر. ئەمانە کەسیان ڕوژنامەوانی پیشەیی نەبون. هەمویان «هاوی» بون. بەلام هەردوجار دو وتاری وینەداریان لە گوڤارەکانی ڤییەننادا بلاو کردەوە.

هەرچەند هەلم بو بڕەخسایە نامەیەکم بو د. کەمال فوئاد، یان بو عومەر شیخموس ئەنوسی و، ئەمدا بە کەسیکی ئەمین لە ناو یەکی لە شارەکانی تورکیاوە بیخاتە پوستەوە، هەواڵ و دەنگوباسەکان و، بیروڕای خومم بو ئەنوسین.

*

هینانی وەجبەی یەکەمی چەک

کاتی خوی ئومیدیکی گەورەمان بە سەرانی «پ د ک ت» بو کە یارمەتیمان بدەن بو گویزانەوەی چەک بە ناو تورکیادا. دوایی بومان دەرکەوت کە هەم توانایان لەو بوارەدا کەمە و، هەم ناپانەوی خویان توشی «تەهلوکە» بکەن. د. کەمال خوشناو و عومەرمستەفا لە قامیشلی بنکەیەکیان دانا بو بە زوری بو گویزانەوەی چەک بو. بەلام زوری چەکەکان کە ئەگەیشتە تورکیا ئەکەوتنە دەستی نائەمین و ئەفەوتان.

«پ د ک ت» بە پچڕپچڕی وەجبەیەک چەک کە پیک هات بو لە ٦٠ کلاشینکوف گەیاند بویانە گوندی «بەردەرەش» لە نیوان وان - گەوەردا. ئامادە نەبون لەوە زیاتر نزیکی بخەنەوە. مانگی تەموز ئاگاداریان کردین کە بیگویزینەوە. ناچار خومان کەوتینە هەولی هینانی. ٦ ئیستری باشمان کری. ٦ کەسم لە پیشمەرگە بادینیەکانی شارەزای بار و ولاخ بون هەلبژارد. حەسەن خوشناو و من خومان ئامادە کرد بو هینانی. لە پیشمەرگەی سورانی تەنها «عەلی ئاغای ماونان» مان لە گەل خومان برد. وامان بە چاک زانی بە ژمارە کەم بین بو ئەوەی بە ئاسانی تیپەڕین و بگەڕیینەوە.

چیای بەرزی «زیرینجو» مان بری بەرەو نەهری و بیسەلاتە و بی شەمسی و باوی... دوو رۆژ زیاترمان پی چو تا گەیشتینە بەردەرەش. بارەکانمان بار کرد و بە هەمان ریگادا گەراینەوە. هەولمان ئەدا کەس نەمان بینی و، لە گوندەکان لامان نەئەدا. لە نەهریەوە کە ئەچوی بو «ریبونس» ئەبو لە پردیکی دیرینەی بەردین بپەرینەوە ئینجا بە چیای «زیرینجو» دا هەلگەریین. بە ۸ سەعات ئینجا گەیشتینە سەر لوتکەی شاخەکەو دوای پشودانیکی کورت شور بوینەوە بو دولی گوستە. دابەزینیشی بە ئەندازەی سەرکەوتنی ناخوش بو. یەکی لە پیشمەرگە بادینیەکان ناوی «یوسفی گەوهەر» بو. ریچەلەکی ئەرمەنی بو. لە قەتلوعامی ئەرمەنیەکان دا باووباپیریان موسولمان بوبون. کابرایەکی چوارشانە و بەهیز بو. زور شارەزای بار بو. قەپاسەی یەکی لە ئیسترەکان بن کلکی بری بو. خوینی لی ئەهات. ئیسترەکە هەلی ئەتیزان و بە تولەرییەکی شاخی هەزار بە هەزاری زیرینجودا شور ئەبوینەوە. مام یوسف ویستی قەپاسەکەی چاک بکا ئیسترەکە لەقەیەکی لی دا. مام یوسف سست بو. کەوتەوە ری قسەی نەکرد. تومەز لەقەکە بەر گونی کەوت بو. کە گەراینەوە شوینەکەی خومان چو بو بو لای د. خدر مەعصوم. گونی ئاوسا بو. ئەبویست ئیزنی بدەین بو چارەسەرکردن بگەریتەوە بو سوریا. بە گالتەوە پیم وت: «مام یوسف زور لە میژە ژنت هیناوە و خوا لیت نەسینی چوار کورت هەیە، خویشت گەورە بوی، تازە گونت بوچیە؟» زور تورە بو ئەیوت: «چون نامەوی ئەگەر گونم نەمینی بمرم باشترە!»

بە سەلامەتی گەیشتینەوە بنکەکانی خومان. هەمومان هەستمان بە شانازی و خوشی ئەکرد. پیشمەرگەکان کە کلاشینکوفە تازەکانیان ئەدی لە ناو کیسەدا وایان ئەزانی یەکی لە مەرجە گرنگەکانی سەرکەوتن تەئمین بوە. ئەوە یەکەمین وەجبەی کلاشینکوفی یەکلاق بو بگاتە کوردستانی عیراق بە هەموی ۶۰ دانە بو.

*

گەرانەوەی مامجەلال

چەند حەفتەیەک چاوەروانی مامجەلال بوین بگەریتەوە کوردستان. من هیزیکم لە گەل خوم برد بو لە نزیک سەرچاوەکانی سەرکەم لە بن دالاتپەردا لە سەر چەمەکە لە شوینیک دا بە ناوی «چەمکەبی» دامەزرا بوین. پیخەف و راخەر و چادرمان نەبو. شەو لە ناو سەرما خومان لی نەئەکەوت تا بەیانی بە دیار ئاگرەوە دائەنیشتین. کە روژ هەلئەهات خومان ئەدایە بەری و ئینجا ئەنوستین. هەتاو و تیشکدانەوەی بەفری کویستانەکان روخساری هەمومانی رەش داگەراند بو. رومەت و پیستی ملمان بە زوری سوتا بون.

چەمکەبی ژمارەیەکی زور بی کونسالی لی بو. هەندیکیان بنەکانیان زور ئەستور بو. زوریمان هەلکەند و سوتاند. زور روژ بە شاخیکی سەخت دا نزیکەی سەعات و نیوی سەرئەکەوتین بو ئەوەی بچینە گوندی ماسیرو و، هەمان روژ ئەگەراینەوە بو چەمکەبی، گەرانەوەشمان ئەوەندەی پی ئەچو.

مامجەلال گەیشتە روما بو ئەوەی لەویوە بیتە ئەستەمول و بەرەو کوردستان بگەریتەوە، بەلام عەبدولئیلاە النصراوی ریبەری ئەوسای «الحركه العربيه الاشتراكيه» و، عومەر مستەفا لە شامەوە تەلەفونیان بو کرد بو. پییان وت بو: «لەبەر ئەوەی کاریکی گرنگ و پەلە هاتوتە پیشەوە پیویستە بگەریتەوە شام». مامجەلال گەرا بوەوە شام. من زورم پیناخوش بو. دەرکەوت کار هەر نەبوە. گوایە عەبدولئیلاە ویست بوی مامجەلال لە گەرانەوە ژیوان بکاتەوە، بە بیانوی ئەوەی هەلومەرجی کوردستان خراپە و نابی جاری مامجەلال موجازەفە بکا.

من نامەیەکم بو مامجەلال نوسی. بارودوخی کوردستانم بو رون کرد بوەوە. باسی دوزینەوەی ریگای هاتوچو و، پەیوەستی گەرانەوەی ئەو و، خراپی زیانی ئەو هەمزەشم بو نوسی بو، کە چاوەروانی ئەو بون. ئاگادارم کرد کە ئەگەر بەو نزیکانە نەگەریتەوە، وا ئیتر ئیمە ناتوانین لەوە زیاتر چاوەری بکەین. کاتی نامەکەی منی پی گەیشت بو، مامجەلال لە گەل هیرو خانی هاوسەری لە بیروت ئەبی، هیروخان چەند روژیکی کەمی مابو منالی ببی. من ئاگاداری ئەمە نەبوم. بەلام مامجەلال دەسبەجی هاوسەرەکەی بە جی هیشت بو گەرابوەوە دیمەشق و لەویوە چوە بوە ئەوروپا و ئاگاداری کردین لە کات و شوینی گەیشتنی. ئیمەش نەجو و حەسەن خوشناومان نارد بو ئەستەمول بو پیشوازی. مامجەلال بە پاسپورتی خوالیخوشبو فاضیل تالەبانی لە تەموزی ۹۷۷ دا گەرابوەوە بو کوردستان. پاسپورتەکەی فاضیل ئیرانی بو، خوی لە لەندەن لە نەخوشخانە کەوت بو لە سەر مردن بو، پاسپورتەکەی خوی دا بو بە مامجەلال بو ئەوەی لە تورکیا بە کاری بهینی. ئەو زەمانە پاسپورتی ئیرانی لە تورکیا بەریزەوە رەفتاری لە گەل ئەکرا.

من هەر لە چەمکەبی بوم. نامەی حەسەنم پی گەیشت لە دیاریەکرەوە ئاگاداری کردم لە کاتی گەیشتنیان. لە هەمان کات دا خەلکی گوندی ماسیروش ئاگاداریان کردم کە چەند کەسیک لە بەرپرسەکانی یەکیتی گەیشتونەتە لای ئەوان داوایان لی ئەکەن بیانئەبەن بو سوریا. من ئەم هەوالەم بە لاوە زور سەیر بو. تاقمی بەرپرسی یەکیتی بە بی ئاگاداری ئیمە، بە سەر ئیمەدا باز بدەن و، بیانەوی بچن بو سوریا. بو ساغ کردنەوەی ئەم هەوالە من خوم چوم بو ماسیرو. سەید کەریم و سامان گەرمیانی چەند کەسیکی کەم لە گەل خوم

برد.

له گوندەکە هەوالی میوانەکانم پرسی. منیشیان برد بو لای ئەوان. جگە لە فاضیل جەلال «عادل» ی قیادە موقەتە، من کەسیانم نەناسی. بە خیرهاتنم کردن و لیم پرسین: «ئیوە کین؟» زوریان پی ناخوش بو، بە تورەییەوە ئەوانیش لە منیان پرسی: «تو کی ی؟». وتم: «من فلانم بەلام ئیوە کین و بوچی هاتونەتە ئیرە بە بی ئاگاداری ئیمە؟». مەلا بەختیار عەلی دایە وتی: «من مەلا بەختیارم نوینەری کومەلەم، ئەوە کاک رەسول مامەندە نوینەری بزوتنەوەیە، ئەوە کاک عەلی کویە سەربەخویە، ئەوەش فاضیل جەلالە نوینەری ق م». وتم: «بوچی ئەچن بو سوریا و چ کاریکتان لەوی هەیە». وتیان: «ئەچین بو سوریا مامجەلال ئەبینین و، کیشەی ئیوە و قیادە موقەتە چارەسەر ئەکەین». منیش پیم وتن: «ئەگەر ئەتانەوی کیشەی ئیمە و ق م چارەسەر بکەن پیویستە لیرەوە دەس پی بکەن. هەر دولای کیشەکە لەم ناوەداین. ئەگەر ئەشتانەوی مامجەلال ببینن. ئەوە پیویست ناکا بچن بو سوریا چونکە ئەمرو ئەگاتە ئیرە.

ئەم برادەرانە لە قەندیلەوە بە نهینی چوبون بو شنو، لەویشەوە هینا بویانن بو ئیرە. هەمویان پانتولیان لە پی دا بو. لە وەلامەکانی من و جوری رەفتارم دلگیر بون و، باوەریشیان بە قسەکانم نەبو. بە هەر حال رازیم کردن و لە گەل خوم هەمویانم برد بو گارە. لە بن سیبەری چەند داریکی گەورەدا جیگامان راخست. لەو نزیکانە قەرەقولیکی تورک لە سەر جادەکە بو. ئەترساین مامجەلال لە هاتنی دا توشی کیشە بی لە گەلیان. پیشمەرگەکانم لە ناوچەکەدا دامەزران. خوم و، صدیقی کریخا طەهای کانی کوردە «حەمەسور» و خەیری خودێدەی بەزیدیم برد و نزیکتر کەوتینەوە لە شوینی گەیشتنی مامجەلال. زوری پی نەچو مامجەلال گەیشت و هەمو سەرکردەکانی «پ د ک ت» بو ریز لی نانی لە گەلی هات بون. هەروەها ٣ کادری «سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودەی ئیران لە دەرەوە» بو هاودەردی و هاودەنگی لە گەلی هات بون. ماوەیەکی دریژ مانەوە و، ق م یەکیکیان: بەشیری خوسرەوی، دوای بە دیل گیرانی لە کارەساتی هەکاری دا کوشت. حاجی فارسی موختاری گوند بەو بونەیەوە مەریکی بو سەربرین. بە خیرایی نانمان خوارد و بەرەو بنکەکانی خومان کەوتینە ری. رەسول و مەلا بەختیار و عەلی کو و فاضیلیش لە گەل ئیمە گەرانەوە.

من ئەو چەند روژە چەند جاری بە شاخەکەدا ئەمدیو و ئەودیوم کرد بو. بە چیای «وەنەیب» دا سەرئەکەوتین. هەورازیکی رک و دوورودریژ بو. مامجەلال سواری ولاخ بو، من پیادە بوم، لی ی پرسیم: «وەزعی ولات چونە؟». وتم: «ئیستا ماندوم لەم هەورازەدا

ناتوانم زور قسه بکەم، بەلام هەر ئەوەندەت پێ ئەڵێم، ئیمه: ئەوانەی دەرەوە، لە گەڵ ئەم برادەرانەی ئێرە، هەر ناوەکەمان یەکە، ئەگینا لە هەمو شتێک دا جیاوازین. وەزعی شۆرشەکە بە هۆی هێرشی جەیش و تەسلیم بونەوەی زۆری پێشمەرگە خراپە، ئەبی خەریکی هەلسانەوەی بین، بە جی هیشتنیان لەم کاتەدا عەیبە ئەگینا هەر لێرەدا پێشنیارم بو ئەکردی بە کام ڕێگادا هاتوی بە هەمان ڕێگادا بگەرێینەوە بو دەرەوە».

مامجەلال قسەکانی پێ ناخوش بو، بە تایبەتی هەموی چەند سەعاتێ بو گەیشت بوەوە کوردستان، چاوەروانی هەوالی خوشتری ئەکرد. بەلام زور زو تێگەیشت لەم قسانەدا من ناهەق نەبوم.

ئەندامانی سەرکردایەتی و، کادرەکان و، فەرماندەکانی پێشمەرگە بە دوای یەک دا ئەگەیشتنە برادوست، بە تایبەتی دوای ئەوەی زانییان مامجەلال گەیشتوتەوە کوردستان و، ناوچەکەش تا رادەیەکی زور لە چاو سەرانسەری کوردستان دا ئەمینتره و، دورتره لە هێرشەکانی جەیشەوە. کاک خالید و شیخ حسین و من هەر لەوی بوین. عەلی عەسکەری، تاهیری عەلی والی، سەعدی گچکە، سەید کاکە، سالار، عومەری حاجی عەبدوللا، ئازاد هەورامی گەیشتن. هەروەها کادر و فەرماندەی کەرتەکانی پێشمەرگەش ئەهاتن. حاجی شیخەی بنزیری، کویخاکانی مەنگور، ئەحمەدی نەقی رەش، حاجی حاجی برایم و، زور کەسی تر هاتن.

*

گیروگرفتی سیاسی

پیکهینانی یەکیتی لە شیوەی نیمچە بەرەدا کە ریکخراوی جیاواز و بەرووای جیاوازی تی دا کو ببیتەوە تەجروبەیەکی تازە بو لە کوردستان دا، ئەو بیروبوچونانەش کە بە ئاشکرا بلاوی ئەکردەوە ئەویش شتیکی تازە بو. ئەم ریکخراوە تازەیە گیروگرفتی سیاسی سەخت و دژواری هەبو:

- لە ئاستی کوردستان دا

یەکیتی لە ناوخوی دا بالەکانی ناتەبا بون و، لە هەندی بیروبوچونی بنەرەتی دا یەکیان نەئەگرتەوە: هەلویست لە چینە کومەلایەتییەکان، لە روخاندنی رژیمی عیراق، لە جوری کوکردنەوە و ریکخستنی پیشمەرگە... ناکوکی لە ناودا دروست ئەکردن.

یەکیتی چەندی هەولی دا لە گەڵ ق م تەبایی دروست بکا سەرکەوتو نەبو. دوژمنایەتی لە گەڵ ق م تا ئەهات قولتر ئەبو.

- لە ئاستی عیراق دا

حشع هاوبەشی حکومەت و وەزارەت و جەبهە بو لە گەڵ حیزبی بەعس. ئەگەرچی درا بە دوای ئاشبەتاڵ حشع هەولی دا ئەو بوشاییە سیاسی و ریکخراوەییە پر بکاتەوە کە هەرەسی پارتی و شورشەکە دروستیان کرد بو، بەلام نەک هەر هیچی پی نەکرا بەلکو بەعسیشی وا لی کرد بیانخاتە ژیر گوشارەوە. حشع بو ئەوەی لە وەزارەت و جەبهەدا بمینیتەوە سەری بو گوشاری بەعسی دانەواند، لە بەیانیکی کومیتەی ناوەندی دا ئیشارەتی بو دەس پی کردنەوەی خەباتی سیاسی و چەکداری یەکیتی کرد بو بە وەی کە دیسان لە سەرەوی ئیشتمانەکەیان دا پەنجەی ئیستیعمار کەوتوتەوە هاندانی گومانلیکراوەکان بو ئەوەی ئاژاوە و پشیوی دروست بکەن.

- لە ئاستی ناوچەیی دا

یەکیتی ئالاهەلگری پشتیوانی بو لە کوردایەتی لە سەرانسەری کوردستان دا.

ئیران بە گویرەی ریککەوتنی جەزائیر هاوکاری لە گەڵ عیراق ئەکرد. بە توندی دوژمنایەتی یەکیتی ئەکرد. دیموکرات حیزبیکی لاواز بو، سەرکردە و کادرەکانی لە دەرەوەی ئیران بون، تەجروبەیەکی تالیان لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی هەبو، لە گەڵ حکومەتی بەعس پەیوەندی دوستانەیان دامەزراند بو، لە بەر ئەوە هاوکاری یەکیتی یان نەئەکرد.

تورکیا لە سەرەتاوە دژی جولانەوەی نەتەوەیی کورد وەستا بو. بە توندی دوژمنایەتی یەکیتی ئەکرد. لە ناو حیزب و ریکخراوەکانی کوردستانی تورکیادا تەنیا پ د ک ت هاوکاری یەکیتی ئەکرد. ئەویش تازە خوی ریک خست بوەوە، لە ناوچە سنورییەکان دا لاواز بو، سەرکردایەتییەکەیشی نەیان ئەویست بە هوی کوردستانی عیراقەوە توشی تەملوکە بێن.

- لە ئاستی جیهانیی دا

یەکیتی دوژمنایەتی خوی لە گەڵ ئیمپریالیزمی جیهانیی بە تایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمەریکی نەئەشاردەوە. هیچ دوستیکیشی لە ناو ولاتانی بلوکی روژهەلات دا پەیدا نەکرد بو. یەکیتی لە دنیادا هیچ دەولەتیکی دوستی نەبو.

بەمجورە یەکیتی لە هەمو لایەکەوە بە دوژمن گەمارو درا بو. تەنیا هیزی کە ئەبو پشتی پی ببەستی، هیزی کومەلاتی خەلک بو، کە لە راستی دا هیزیکی گەورە و بەخشندە و لە بن نەهاتو بو.

*

گیروگرفتی لوجستیکی

ئەو چەند مانگەی لە دولی گوستە بوین لە کەناری روبارەکەدا جیگامان لە بن دار و لە ناو کونەبەردا بو خومان چاک کرد بو. وەکو ئەلین: ئەرزمان رائەخست و ئاسمانمان ئەدا بە خومان دا. حەسەن خوشناو، د. خدر و، من پیکەوە دەلاقەیەکی ئاودرمان چاک کرد بو لە نزیک مامجەلال لەوی ئەنوستین. ئاگردانیکیشمان تی دا دروست کرد بو، جاروبار چامان لە سەر لی ئەنا، یا پەتاتەمان لە ناو ژیلەمۆکەی دا ئەپەشان. کانیەکی سازگاری لە لاوە بو. چەند سورەچناریکی پیر و گەورە، بەلام کلوز سیبەریکی خەستی کەریان لە سەر کرد بوین. لە سەروی ئیمەشەوە سالار و عومەر و، هەندیکی تریش لە پیشمەرگەکان بە چوار دەوری سەرچاوەی کانیەکەدا جیگایان چاک کرد بو. تا حاجی شیخەی بنزیری گەیشت ئیمە ئیشکمان لە مامجەلال ئەگرت.

لەو ماوەیەدا گیروگرفتی لوجستیکی گەورەمان هەبو.

- هیچ خانو و نوایەکمان نەبو تی یا بحەوینەوە. چادرمان نەبو. ژمارەیەکی زور کەم رایەخ و پیخەف مان هەبو. من لە پیش دا لە سەر لم و دوایی‌تر لە سەر جلە ئیستریک ئەنوستم. هەر حەیوانیکمان سەربریایە پیستەکەیمان بو نوستن بە کار ئەهینا.

- خواردنمان زور خراپ بو. زوری ژەمەکان نان و چا بو. زور بە زەحمەت و زور بە گران ئازوقەمان پی ئەگەیشت. ق م دیوی عیراقی لی بەست بوین هەر ئازوقەیەک بو ئیمە بهاتایە دەستیان بە سەردا ئەگرت و، ئەوەی کەلوپەل و خواردنی بو ئیمە بکریایە ئەیانگرت و، سزای قورسیان ئەدا. چەند کەسیکیان لە روبار هەلکیشا بو لە سەر ئەوەی ئاردیان بو ئیمە کری بو.

ئازوقەیان لە تورکیا بو ئەکرین، گران ئەکەوت لە سەرمان.

- چەکمان کەم بو. بەعس چەکی چنی بوەوە. بە دەگمەن چەک بە کرین پەیدا ئەبو. هیشتا نەگەیشتبوینە ئەو رادەیەی بە شەر بیگرین. ق م ریگەی سوریا - تورکیایان لی گرت بوین.

چەکەکانمان سوک بو، بە زوری کلاشینکوف و برنەو بو، ژمارەیەکی کەم ئاریبیجی و رشاشی سوک. چەکی قورس و ناوەنجی مان نەبو. چەکی دژی ئاسمانیمان نەبو. ١٠ دوشکامان هینا بوە ناو تورکیا دوای لیدانی کاروانەکەی حەسەن خوشناو دەس ق م کەوت. لە ناو ئەوانەش دا کە لە بنکەکانی برادوست بون پیشمەرگەی بی چەکمان زور بو. بە هیوای گەیشتنی چەک بون.

- هیچ هویەکی پەیوەندی مان نەبو. دەزگای بیتەلمان نەبو. عومەر شیخموس چەند «ووکی توکی» یەکی بو نارد بوین لە بەر بی کەلکی کەس بەکاری نەئەهینا. تەنیا

هوی پەیوەندیمان نامەنوسین بو.

– هیچ هویەکی راگەیاندنمان نەبو. چاپخانەمان نەبو روژنامە و بلاوکراوەی پی چاپ بکەین. تەنانەت تایپرایتەر و رونیومان نەبو. بلاوکراوەکانی دەرەوەش: «الشرارە» و «ریبازی نوی» بە ریکوپیکی نەدەگەیشتن. دوای گەرانەوەی مامجەلال لە دەرچون وەستان. ژمارە کونەکانیش بە زەحمەت ئەگەیشتن.

«دەزگایەکی رادیو» مان پی گەیشت بو. سەید مورسەل زور بە وریایی هینایەوە بو کوردستان. بەلام بە هوی نەبونی پیویستییەکانی نەمانئەتوانی بیخەینە کار.

– لە مانەش هەموی خراپتر پارەمان نەبو بو دابینکردنی موچە و ئازوقە و پیویستییەکانی پیشمەرگە، وەکو جلوبەرگ، پیلاو، خەرجیی گیرفان. زوری پیشمەرگەکان کەسوکاریان پارمەتییان ئەدان.

*

لە ئەفسانەی کونی کوردی دا ئەیان گیرایەوە: قارەمانی سەرگروشتە بو ئەوەی بە «مورادی دل» بگا ئەبو «حەوت کەو بیری و، حەوت جوت پیلاو بدری و، سەری حەوت دیو بیری». پیشمەرگایەتی لەم سەردەمەدا زەحمەتتر بو لە سەفەری ئەم کابرایە، سەرباری ئەوەش ئەمان کەسوکاریان ئەکەوتنە بەر دەستدریژیی درندانەی داوودەزگاکانی بەعس. لە گەل هەمو ئەوانەش دا، بە دەگمەن هەبو، لەم ژیانە پەشیمانی و لە دوژمن ترس دەربیری. هەبونی «موتیڤ» یکی راستەقینە و رەوا مروڤی ئاسایی ئەکا بە مروڤیکی نائاسایی خاوەن باوەریکی پتەو و، وورەیەکی بەرز و، ئازایەتیەکی شیتانەی وەها، کە دەس لە هەمو خوشییەکی ژیان هەلبگری و، بەرگەی هەمو ناخوشییەک بگری. هەر ئەم «موتیڤ» ە پیروزە بو: «باوەر بە رەوایی مەسەلەی کورد»، وای لە پیشمەرگەکانی شاخ و، تیکوشەرانی شار و، گیراوەکانی زیندان ئەکرد لە مردن نەترسن و گوی نەدەنە ژیان، وەکو جەواهیری وتویەتی: «یهب الحیاة کأنه لایفهم».

*

یەکەمین کوبونەوەی

کومیتەی سەرکردایەتی یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان

بە گەیشتنی مامجەلال ریوشوینی یەکەمین کوبونەوەی سەرکردایەتی یەنک لە سەر ئەرزی کوردستانی عیراق دانرا. ئەم کوبونەوەیە گرنگییەکی تایبەتی هەبو. چونکە تا ئەو کاتە یەنک سەروک یا سکرتیر و مەکتەبی سیاسی و کومیتەیەکی سەرکردایەتی دیاری کراوی نەبو.

«دەستەی دامەزرێنەر» لە دەرەوەی ولات بو، سەرانی کومەلە و بزوتنەوە نەیان توانی بو لە سەر دیاریکردنی ئەندامەکانی «سەرکردایەتی ولات» و ژمارە و دابەشکردنی ئەرک و فرمانەکانیان ریک بکەون. بو ئەوەی ناکوکییەکە زل نەبی، وەکو چارەسەریکی کاتیی و مامناوەنجی تا گەرانەوەی مامجەلال، لە سەر ئەوە پیک هات بون: «سەرکردایەتی دوانە» بو ناوچەکان دروست بکەن. لە هەر ناوچەیەک دا دو کەس: یەکیک لە کومەلە و یەکیک لە بزوتنەوە دابنرین، دەسەلاتی هەردوکیان وەکو یەک بی و، پیکەوە کاروباری پیشمەرگەیی و سیاسی و ریکخراوەیی ناوچەکە سەرکردایەتی بکەن. بەم پی یە: ئارام - رەسول مامەند بو کاروباری سیاسی، سالار - عەلی عەسکەری، تالیب روستەم - خالید سەعید، عومەر عەبدوللا - تاهیر عەلی والی بو کاروباری پیشمەرگایەتی ناوچەکان دانرا بون. «سەرکردایەتی دوانە» لە کاری سیاسی و پیشمەرگەیی دا، پیچەوانەی «یەکیتی ویست و بریاردان» و «یەکیتی کار و جیبەجی کردن» بو، ناکوکی و رقەبەری دروست ئەکرد و، کارەکانی دوا ئەخست و، لە گەل بەریوەبردنی باشی کاروباری شورش دا نەئەگونجا .

هەر ۳ ریکخستن وا ریک کەوتن مامجەلال براگەورەی هەموان و، سکرتیری گشتی یەنک بی و، هەر ۳ لا بە قەدەر یەک نوینەریان لە سەرکردایەتی یەنک دا هەبی.

ناکوکی قول و زور لە نیوان سەرانی کومەلە و بزوتنەوەدا هەبو.

سەرانی کومەلە گەنجی خوینگەرم و توندرەو بون، خویان بە نوینەری بیری پرولیتاریا و بزوتنەوەیان بە نوینەری بیری بورجوازی ئەزانی. لە کتیبە مارکسییەکان دا خویند بویانەوە، کە شورش بە سەرکردایەتی بورجوازی سەر ناکەوی لە بەر ئەوە ئەبی پرولیتاریا سەرکردایەتی بکا. نەیان ئەشاردەوە کە ئەبی سەرکردایەتی شورشەکە بە دەس ئەوانەوە بی.

کومەلە، وەکو ریکخراویکی سیاسی هیشتا لە ناو خەلک دا خوی ئاشکرا نەکرد بو. بەشیکی سەرکردەکانی لە زیندان دا بون. ئەوانەش کە کومیتەی هەریمەکانیان دروست کرد بو لە ژیانی سیاسی دا کەم تەجروبە و لە ژیانی پیشمەرگایەتی دا بی تەجروبە بون. گەنجی نەناسراو بون و هەمویان ناوی خویانیان گوری بو. هەر یەکەیان مەفرەزەیەکی کەمی لە گەل بو زوریان بی چەک بون.

بزوتنەوە، تازە دامەزرا بو، بەلام سەرکردەکانی هەمو کەسایەتی ناسراو بون. هەر یەکەیان رابردویەکی دریژی لە کاری سیاسی و لە ژیانی پیشمەرگایەتی دا هەبو. خەلکی زوریان لە شار و لادی ئەناسی. سەرانی ئیلەکان و کویخای گوندەکان ریزیان لی ئەگرتن و

به قسەیان ئەکردن.

پێش ئەوەی نوێنەرەکانی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا دیاری بکرێن. سەرانی کۆمەڵە، ئەوانەی لە برادۆست بون: سالار، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، عومەری حاجی عەبدوڵلا کۆبونەوەیەکیان کرد. ئارام نەهات بۆ کۆبونەوەکان. منیشیان بانگ کرد بۆ کۆبونەوەکە. هەمویان داوایان لی کردم منیش یەکی بم لە نوێنەرەکانی کۆمەڵە. من خۆم پێم خۆش نەبو. زۆریش بەهانەم هێنایەوە بۆ ئەوەی واز لە من بهێنن و، بە راشکاوی وتم:

«ئەو چەند ساڵە من دور بوم لە کاری کۆمەڵە. ئێوە ماندو بون و فیداکاریتان کردوە. نامەوێ من بیمە سەر حازری. چی بە من بکرێ بۆ پشتیوانیتان دریغی ناکەم، بەلام ئەمەوێ لە دەرەوەی کۆمەڵە بم. من ئەندامی «دەستەی دامەزرێنەر» م، خۆم بە روتینی ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیم وەکو هەڤاڵەکانی تر. چاکتر وایە ئەو جێگایەی بۆ منی تەرخان ئەکەن بیدەن بە برادەرێکی تر. سەرباری ئەمانەش لێتان ناشارمەوە: من باوەڕم بە کۆمونیزم نیە».

راستییەکەشی ئەوە بو: تۆشی «خیبە امل» بو بوم لێ یان. ئەمویست بی ئەوەی دڵیان بشکێنم، تێکەڵاوی کاری ناو کۆمەڵە نەبم، جگە لەوەش کەسانی وەکو کاک خالید و عەلی عەسکەری رەئیان وابو بە هەمومان رێکخستنێکی تازە بە گوێرەی پێویستییەکانی شۆرشەکە دابمەزرێنین، جێگەی بزوتنەوە و کۆمەڵە و خەتی گشتی بگرێتەوە.

قسەکانی من هیچ سودێکی نەبو. سور بون لە سەر ئەوەی بۆ راستکردنەوەی نابەرامبەری لە گەڵ بزوتنەوە من یەکی بم لە نوێنەرەکانی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا. مامجەلالیش هەمان رەئی هەبو. لای وابو کە پێویستە من لە ناو کۆمەڵەدا بمێنمەوە، بۆ ئەوەی بە باری باشەدا کاریان تێ بکەم. زۆر بە نابەدڵی وتم: باشە.

نوێنەرەکانی کۆمەڵە بەمجۆرە دانران: شاسوار جەلال «ئارام»، نەجمەدین عەزیز «سالار»، حیکمەت محەممەد کەریم «مەلا بەختیار»، ئازاد هەورامی «عادل»، عومەری حاجی عەبدوڵلا «رەنجدەر» و، من.

نوێنەرەکانی بزوتنەوە: عەلی عەسکەری، رەسول مامەند، خالید سەعید، تاهیری عەلی والی، سەعدی عەزیز. کاک عومەر مستەفا لە دەرەوەی کوردستان بو، بەلام ئەویش لە رێزی نوێنەرەکانی بزوتنەوەدا دانرا.

نوێنەرەکانی خەتی گشتی: شێخ حسێن یەزیدی و، هەمو ئەندامانی «دەستەی دامەزرێنەر» کە لە دەرەوە بون.

کاک ئارام نەهات بۆ برادۆست و بەشداری کۆبونەوەکانیش نەبو. چەند کەسێ،

یەکی لەوانە کادریکی کومەلە دوایی دەرکەوت سەر بە ریژیم بو، بە نامە و بە قسە لە کاک ئارامیان گەیاند بو؛ کەوا مامجەلال ریزی ئەندامەکانی کومەلە ناگری و، ئەگەر ئەویش بچی ریزی ئەویش ناگری.

مەکتەبی سیاسی پیک هینرا لە سکرتیری گشتی و ٤ ئەندام. دوان لە ئەندامەکانی: عەلی عەسکەری و رەسول مامەند نوینەری بزوتنەوە بون و، دوانەکەی تریش: ئارام و سالار نوینەری کومەلە بون. نوینەری خەتی گشتی یا دەستەی دامەزرینەری تی دا نەبو چونکە، جگە لە شیخ حسین و من، کەسیان هیشتا نەگەرابونەوە بو ولات.

لەم کوبونەوەیەدا بە وردی هەلومەرجی کوردستان و عیراق و، ریوشوینەکانی پەرەپیدانی خەباتی سیاسی، چەکدار، ریکخراوەیی و راگەیاندن، باس کرا.

*

ریکخستنەوەی پیشمەرگە

کوردستان دابەش کرا بە ٨ هەریمی پیشمەرگایەتی و فەرماندەی هەریمەکان و جیگرەکانیان دیاری کران بەمجورە:

حسین بابەشیخ، فەرماندەی هەریمی بادینان

تایەری عەلی والی (ب)، فەرماندەی هەریمی پینجوین و هەورامان

سەید کاکە (ب)، فەرماندەی هەریمی دەشتی هەولیر

سەعدی عەزیز (ب)، فەرماندەی هەریمی خوشناوەتی

ئەنوەری مەجید سولتان (ک)، فەرماندەی هەریمی دەشتی کەرکوک

عومەری حاجی عەبدوللا (ک)، فەرماندەی هەریمی قەرەداغ

تالیب روستەم (ک)، فەرماندەی هەریمی پشدەر

من (ک)، فەرماندەی هەریمی شارباژیر.

کاک تایەر لە کوبونەوەکەدا وتی: «هیچ کاریکتان بو کاک خالید دیاری نەکرد».
کاک خالید خوی هەلی دایە وتی: «ئیوە لە ناو خوتان دا شەر مەکەن من هیچ مەسئولیەتیکم ناوی. گەروک ئەبم». لەمەش مەبەستی سەعدی گچکە و سەیدکاکە بو لە سەر هەولیر ناکوک بون.

تەجرەبەی یەک سالی رابردوی نابەرامبەریی هیزەکانی هەردولا و شەر و پیکادانەکانی سەرانسەری کوردستان هەندی دەرس و پەندی دابو بە پیشمەرگە. لە هەندی ناوچە پیشمەرگە بارەگای گەورە و ئاشکرایان دانا بو. لە بەرامبەر هیرشەکانی جەیش دا نەیان توانی بو بیپاریزن. شەری روبەرو توشی زیانی ئەکردن. ئەبو نەهیلن دوژمن زەمان

و زەمینی تێکهەڵچوونەکانیان بە سەرا بسەپێنێ، چونکە لە هەر جێیەکدا دوژمن گات و شوێنی شەڕی بە سەر پێشمەرگەدا ئەسەپاند، هەمیشە ئەوان سەرنەکەوتن و، ئەمان تووشی کشانەوە یا شکان ئەبوون.

پچووکترین یەکەی ڕێکخراوی پێشمەرگە مەفرەزە بوو. مەفرەزە ئەبوو پێک بێ لە ٥ تا ١٠ پێشمەرگە. هەر ٣ تا ٥ مەفرەزە ئەبوو یەک کەرت پێک بهێنن و، هەر چەند کەرتێکیش هەرێمیان پێک ئەهێنا. لە هەرجێیەک فەرماندەی هەرێم ئەندامی بزووتنەوە بوایە ئەبوو یاریدەدەرەکەی ئەندامی کۆمەڵە بێ، هەروەها بە پێچەوانەوە.

مەفرەزە ئەبوو فەرمان لە کەرت و کەرت لە هەرێم و هەرێم لە مع و فەرماندەی گشتییەوە وەربگرێ. بە هۆی نەبوونی دەزگای بێتەل و دژواریی هاتوچوی تەتەرەوە، هەرێمەکان، بگرە مەفرەزەکانیش جۆری لە سەربەخۆیی پێشمەرگەیی و سیاسی و ڕێکخراوەیی و دارایی و ئازادی تەواوی کار کردنیان هەبوو.

ئەبوو پێشمەرگە گەڕۆک بێ. بە ڕۆژ خۆی دەرنەخات و لە شاخ خۆی حەشار بدات، بە شەو بچێتە ناو ئاوایی و پێویستییەکانی ڕۆژی دابین بکات و، لە پێش ڕووناک بوونەوەی دنیادا ئاوایی بە جێ بهێڵێ و ڕوو لە شوێنێکی نهێنی بکات. ئەبوو لە هیچ جێگایەک بۆ ماوەی درێژ نەمێنێتەوە. ئەبوو پێشمەرگە لەو گەنجانەی تەندروست و ئاسراو و بە وورە بوون هەڵ بژێردرێن. باشتر وابوو سەڵت بن. لە بەر ئەوەی بنکەیان نەبوو بۆی بچن، ئەبوو پێویستییەکانیان بە کۆڵی خۆیانەوە بێ. جگە لە تفەنگەکەی، ئەبوو چەندی بتوانی مەخزەن و فیشەک و نارنجۆک و، هەندی جار دووربین و نیزە و دەمانچە و کتێبیشی هەڵ ئەگرت. سەرەڕای ئەمانە بە زۆری کوڵە پشت و کوپ و کەوچک و مەتارە و تاقمی تەراشی خۆیان پێ بوو. خواردنەوەی مەشروبات بە توندی قەدەغە بوو. ئەبوو خاوەنی خووڕەوشتی بەرز و لە گەڵ خەڵک ڕووخۆش و زمان شیرین بێ.

*

ڕێکخستنەوەی کاروباری ڕێکخراوەیی

بنک ڕێکخستنێکی فراوان و یەکگرتوی نەبوو. پێک هات بوو لە چەند ڕێکخستن و خەتی جیاواز. هەم بزووتنەوە و هەم کۆمەڵە ئایدیۆلۆجی تایبەتی، سەرکردایەتی جیاواز و ڕێکخستنی سەربەخۆی خۆیان هەبوو.

کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٧٠ەوە دامەزرا بوو بە نهێنی ڕێکخستنی دروست کرد بوو. بەلام گیرانی شەهاب و هاوڕێکانی و چەندین کەس لە ئەندامەکانی کۆمەڵە و خۆشاردنەوەی بەشێکی تریان تەگەرەی لە پەرەسەندنی دا بوو. کۆمیتەی هەرێمەکان کە دوای ڕێکخستنی

کومەڵە لە شەهید ئارام، سالار، مەلا بەختیار و، شەهید ئازاد پێک هات بو، جگە لەوەی هەمویان لە داوودەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم ڕاکردو بون، هەموشیان گەنجی کەم تەجروبە و نەناسراو بون. کە خەباتی چەکداریش دەستی پێ کرد بوە وە هەمویان بە دوی یەکتری دا هات بونە ڕیزی پێشمەرگایەتییەوە. لە ناو شارەکان دا ژمارەیەکی کەم کەسانی شارەزای وەکو جەمال طاهیر، ئازاد صائیب، حەمە چاوشین مابون بو کاری ژێرزەمینی.

بزوتنەوە ڕێکخراوێکی تازە دامەزراو بو لەو کادرانەی پ د ک کە لە تێهرانەوە گەرا بونەوە. لە بەر ئەوەی زوریان دور خرا بونەوە بو خواروی عێراق و، لە ژێر چاودێری دەزگا ئەمنییەکان دا بون، نەیان توانی بو ڕێکخستنی فراوان دروست بکەن. عەلی عەسکەری و، عومەر مستەفا، ڕەسول مامەند، طاهیر عەلی والی هات بونە ڕیزی پێشمەرگایەتییەوە و، چەند کەسێکی وەکو صالح یوسفی، عەلی هەژار، کاردو گەلالی لە ناو شارەکان دا بو خەباتی ژێرزەمینی لە بەغدا بون.

خەتی گشتی لە ناو وڵات دا هێشتا ڕێکخستنی نەبو. بزوتنەوە و کومەڵە هەریەکەیان بو خوی خەڵکی ڕێکخست بو. د. خالیدیش کە سەرەتا سەر بە هیچ لایەکیان نەبو، سەرکردەکانی بزوتنەوە وەکو مەرجی پێشەکی داوایان لێ کرد بو کە ئەویش ببێتە ئەندامی سەرکردایەتی ئەوان، بو ئەوەی لە گەڵی بچنە شاخ و بەشداریی بکەن لە هەڵگیرساندنەوەی شورش دا.

دەستەی دامەزرێنەر پەیڕەوێکی ناوخوی بو ینک نوسی بو. هەمان پەیڕەو کرایە پەیڕەوی کارکردنی ڕێکخراوەیی هەمو ینک. لیژنەی لقەکان و ناوچەکان ئەبو لە ۳ ئەندام پێک بێ: ۱ ئەندامی کومەڵە، ۱ ئەندامی بزوتنەوە و ، ۱ ئەندامی خەتی گشتی. ئەمانە خەڵکیان لە پێش دا بو ینک ڕائەکێشا و پاش ئاشنایەتی ئینجا بو یەکێ لەو ۳ ڕێکخراوە. سەرکردایەتی بزوتنەوە سور بو لە سەر ئەوەی کە ڕێکخستنی شارەکانیش تێکەڵاو بکرێن و، کومیتەی هاوبەشیان لێ پێک بهێنرێ. کومەڵە بەمە ڕازی نەبو.

ناوی بەرپرسی لقەکانی سلێمانی، هەلێر، کەرکوک، بادینان و ئەندامەکانی دیاری کران. بو پڕکردنەوەی شوێنە بوشەکان زور جار خەڵکی وا ئەهێنرانە پێشەوە شایستەی ئەو شوێنە نەبون. ڕەخنە و گازاندەی لە ناو ئەندامەکانی ینک دا ئەخولقاند.

کوبونەوەکان کە لە ۸/۳۱ دا دەستی پێ کرد بو لە ۱۹۷۷/۹/۱۲ دا کوتایی هات.

مامجەلال «بلاغی ختامی» کوبونەکانی بە عەرەبی نوسی. لە برادوست هیچ هویەکی چاپکردنمان لە لا نەبو، لە بەر ئەوە ناردمان بو سوریا. لەوێ چاپیان کرد و لە

«الشراره» ش دا بلاویان کردەوە. بەلام ئەندامەکانی دەستەی دامەزرێنەر کە لە سوریا بون، هەندێ لەناوەکانی کە لە مسوودەی بەلاغەکەدا نوسرا بو، لەوانە ناوی ئەندامی مەکتەبی سیاسییان، کوژاند بوەوە.

*

ئەوانەی لە نزیک مامجەلال بوین بە تایبەتی ئەوانەی لە سوریاوە هات بوینەوە لە گەل بەرپرس و پێشمەرگەکانی کومەلە ئاسایشی مامجەلال و بارەگەکەمان گرت بوە ئەستو. لە سەر پێشنیاری من، کورێکمان کرد بە لێپرسراوی بارەگەکەمان، بو دابەشکردنی ئەرکەکانی روژ و شەوی خەفارەت و حەراسەت و هەندێ جار کەمین، ناوی عەبدوللا بو.

عەبدوللا ئەبوت من مولازمی قوات خاصەم و هاورێکانی ئەبنکاریان ئەکرد کە ئەسلەن مولازم بو بێ. تورە و کەم چێکەلانە بو. لە یەک سەعات دا چەند جاری تورە ئەبو خاو ئەبوەوە پێ ئەکەنی لە پر ناوچەوانی ئەدا بە یەکاو تورە ئەبوەوە. روژێکیان لە ناو خومان دا وتمان: بو حالەتی نەفسی روژانەی عەبدوللا نەخەینە بەر لێکولینەوەی زانستی؟ لە سەر کاغەزێک جەدولی خەتی بەیانی مان دروست کرد.

- لایەکیان ٢٤ سەعاتەکەی روژمان سەعات بە سەعات نوسی بو،

- لاکەی تری حالەتی نەفسی عەبدوللامان تێ دا رون کرد بوەوە. لە ناوەراستی خەتەکەدا ئاسایی و، بەرەوژوری زور خوشحال، خوشحال، کەم خوشحال و، بەرەو خواری زور تورە و، تورە، کەم تورە... لە ناو هەمو ئەو خانانەدا وردە حالەتی وەکو: پێکەنین، زەردەخەنە... مان دیاری کرد بو. چەند روژی د. خدر، حەسەن خوشناو، سەید کەریم و، من دەقیقە بە دەقیقە چاودێریمان ئەکرد و، لە سەر جەدوەلەکە تومارمان ئەکرد. کێرفەکان بەرزبونەوە و دابەزینێکی سەیریان تێ دا بو. بە گوێرەی خواروخێچی کێرفەکان ناچار ئەبوین روژانە بە جوری دابەشکردنی موفرەداتی جەدوەلەکەدا بچینەوە.

ئەو چەند روژەی ئەم لێکولینەوەیەمان ئەکرد لای کەس باسمان نەئەکرد لە بەر ئەوە بە سەلامەتی تەواو ئەبو. حەسەن خوشناو قسەی لە لا رانەئەوەستا. روژێکیان کاک عەلی بە میوانیمان هات بو. حەسەن سەرگروشتەکەی بو گێرابوەوە. کاک عەلیش حەزی بە سوعبەت و گالتەو فشقیات ئەکرد. عەبدوللای بانگ کرد و، پێ ی وت: «ئەوانەی کومەلە پێت راتەبوێرن و بو گالتە تویان کردوە بە لێپرسراوی خویان». عەبدوللا جنێوێکی سەرەوانەی هەمو ئەوانەی پێ ی رائەبوێرن و کەوتە «تحدی» کەس ناتوانێ بەو رابوێرێ. کاک عەلی جەدولەکانی پیشان دا. عەبدوللا لە پێستی خوی دەرچو. هەرچی بە دەمی دا هات وتی. ئێمە وەکو رێک کەوت بوین لە ناو خومان دا کەسمان گوێمان نەدایە قسەکانی

و توره نەبوین. لە گوێ پێ نەدانەکەی ئیمە زیاتر توره بو. کاک عەلی ئەمەی بو خوشکردنی بەزمەکە کرد بەلام بە پیچەوانە شکایەوە، عەبدوللا وازی هینا و، ئیمەش کارەکەمان لی تیکچو. پاش چەند حەفتەیەک عەبدوللا بە یەکجاری بیزار بو لە پیشمەرگایەتی. گەرایەوە سوریا و لە وێوە چو بۆ ئەوروپا.

*

قم لە ناو تورکیا لە چەندین شوین بنکەی دانا بو. چەکدارەکانی بە دریژایی ناوچەکانی سنور هاتوچویان ئەکرد. ئیلە کوردەکان، بە تایبەتی زوری هوزەکانی ئیلی گەورەی ئەرتوشی و، گویی هاوکاریان ئەکردن. پ د ک (تورکیە کوردستان دیموکرات پارتیسی) کە نیمچە نهینی بو وە لە ناو پیاوە دەسرویشتوەکانی کوردستانی تورکیادا نفوزی هەبو زور بە توندی دوژمنایەتی ینک ی ئەکرد. بە تورکی لە سەریان ئەنوسی و بلاویان ئەکردەوە. لە نوسینەکانیان دا بە ینک یان ئەگوت: «چاشی ٧٦». لە هەمان کات دا حیزبیکی سیاسی ئاشکرای ماوی کە روژنامەی «تایدنلک»ی دەر ئەکرد دوستەکانی ینک و، شیوەی هاتوچو و، ریگەکانی لە روژنامەکەی دا ئاشکرا ئەکرد. هەوالەکانی بە ناراستەوخو ئەگەیاندەوە دەزگا جاسوسیەکانی تورکیا بە بیانوی ئەوەی ینک «ئاژانی سوڤیتە».

چەکدارەکانی قم لە ناو گوندەکانی تورکیا و لە یادینان لە هەرجییەک سوسەی دوستیکی ینکیان بکردایە ئازاریان ئەدا و زەرەریان لی ئەدا بو ئەوەی لە ینک ی دور بخەنەوە. گەماروی بنکەکانی ینکی دا بو. نەی ئەهیشت خەلکی ناوچەکە هاتوچویان بکەن. هەرکەسی کرین و فروشتنی لە گەل بکردنایە، بە تایبەتی ئەگەر ئارد و ئازوقەی بو بکرینایە، جگە لەوەی کەلوپەلەکانیان لی ئەسەند سزاو ئازاری خویشیان ئەدا و، چەند جار ئەوانەیان لە ئاو هەل کیشا.

کادر و پیشمەرگەکانیان لە هەمو جی لە ناو گوندەکانی عیراق و تورکیا دژی ینک و مامجەلال ئەدوان و، تاوانی ناراست و قسەی نارەوایان بە پال ئەدان. لە دەرەوەش لە سوریا و، ئەوروپاو، ئەمریکا دریغییان نەئەکرد.

دوژمنایەتی قم لە گەل ینک گەیشتە رادەیەک، لە هەر جییەک بیان توانیایە بوسەیان بو دائەنان، چەکیان ئەکردن و، ئەیان گرتن و سوکایەتییان پی ئەکردن. سەرەنجام گەیشتە ئەوەی سەرلەنوی دەستیان خستەوە خوینی پیشمەرگەکانی ینک.

لە چەند شوینیکی تر کە چاری هیزەکانی یەکیتییان پی نەئەکرا دەستیان لە گەل هیزەکانی جەیش تیکەلاو ئەکرد و بە هاوکاری ئەوان دەستیان لە پیشمەرگەکانی ینک

ئەوەشاند.

*

داهێنانی نەریتی جاش - پێشمەرگە

لە چەند جێگا بەرپرسەکانی ق م خۆیان تەسلیمی حکومەت ئەکردەوە و، مەفرەزەی تایبەتییان دروست ئەکرد بۆ راوی پێشمەرگەکانی یەکێتی.

تەحسین شاوەیس، قادر فەرەج... بە فیل محەممەد غەفور ئاغجەلەرییان، بە ناوی هاوکارییەوە، بانگ کرد بۆ لای خۆیان، بۆ ئەوەی پێکەوە کاری هاوبەش بکەن. حەمە غەفور فەرماندەی دەستە چەکدارەکانی کەرکوک بو. شەوی ۹۷۷/۷/۲۳ هەمو پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی یەکێتی یان لە گوندی «کانی بی» کوشت و، رۆژی دوایی هالیکوپتەریان بۆ هات، بۆ گوێزانەوەی خۆیان و لاشەی کوژراوەکان. لە گەڵ حەمە غەفور ئەم پێشمەرگانە کوژران: ئەنوەر کەریم، ئەحمەد محەممەد، عەبدوللا توفیق، حەمید عەزیز، رەمەضان سەعید، رەضا عومەر.

هەر لەو دەوروبەرەدا خلەی رەشە بەحری، صابیری ئەحمەی مینە رەندان، حەمەخانی حاجی دارا، مەفرەزەی جاشیان دروست کرد بۆ شەری پێشمەرگەی یەکێتی.

ئەم نەریتە دۆزەوە: «نەریتی جاش - پێشمەرگە»، واتە لە پێشمەرگایەتییەوە بێن بە جاشی حکومەتی عیراق و، بە ئاشکرا شەری پێشمەرگەی یەکێتی و، بە نهێنی کار بۆ پارتی بکەن، کە ق م دای هێنا زۆر لە بەها پیرۆزەکانی کوردایەتی و شۆرشگێریتی و پێشمەرگایەتی هەڵتەکاند.

*

کوشتنی حەسەن خۆشناو

دوای ئەمە ق م کەوتە هەوڵێکی زۆر بۆ هاندانی کوردەکانی تورکیا بە تایبەتی ئەو ناوچانەی رێگای کاروانی یەکێتی پی دا ئەرۆیشت، بۆ گرتنی رێگاکە. بە دانیشتوانی ئەو ناوچانەیان وت بۆ تفەنگەکانیان و شتەکانیان بۆ خۆتان و سەریان بۆ ئێمە.

حەسەن خۆشناو جارێکی تر چو بۆ هەمان شوێن بۆ گوێزانەوەی وەجبەیەکی تر. بە سەرکەوتویی گەرایەوە.

. ۱ دوشکاو وەجبەیەکی تر کلاشینکوف و داوودەرمانیان لە هەمان بەردەرمش دانا بو. چەند کەسێکیش لە سوریاوە گەیشت بون بون بێن بە پێشمەرگە لەوانە چەند کوردێکی سوریاشیان تی دا بو. ئەمجارەش حەسەنیان راسپارد بچی بیهێنی. مەفرەزەیەکی تێکەڵاویشیان بۆ دروستکرد لە پێشمەرگەی هەرێمە جیاوازەکان. ئەمجارەیان ق م بە

هاوکاری دانیشتوانی ناوچەی راشیدان، بە تایبەتی خەلکی گوندی باویان، لە بەیانی ۱۳/ . ۱/ ۹۷۷ دا بوسەیەکی گەورەیان بو دانان.

حسەن و ئەم پیشمەرگانەی لە گەلی بون کوژران: باهیر ئەحمەد (میهرەدی)، کەمال محەممەد حسین (ماوەت)، نەجات نوردین (کەرکوک)، عەلی کویخا هومەر (باوزی)، خدر ئەحمەد (قەلادزی)، عەبدولمەلیک بەرزنجی «سەرهەنگ» (توزخورماتو)، لە کوردەکانی سوریاش عەزیز چەرکەس و خالید و حسەن. چەند پیشمەرگەیەکیش بریندار بون. ئەوانی تریان هەمو گرت و بە دیلی برد بویانن بو گوندی شەتونسی تورکی لە سەر سنوری عیراق. کاروانەکەیان روت کردەوە. بریندارەکانیان ئیزن دابو بو ئەوەی چاوی یەکیتی پی بترسینن. ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو لە یەکیتی یان دا. سەرلەنوی ئاگری شەری ناوخوی هەلگیرسانەوە.

حسەن خەلکی گوندی زیارەتی خوشناوەتی بو. ئەفسەری یەک ئەستیرە بو لە جەیشی عیراق دا. لە ریزی شورشی ئەیلول دا، لە هیزی کاوە، فەرماندەی بەتالیون بو. کوریکی قسەخوش، نوکتەباز، ئازا، سادە و راستگو بو. من بە کوشتنی حسەن زور نارەحەت بوم. لە هەمویان زیاتر هاوری ی من بو. ماوەیەکی دریژ حسەن و سەید کەریم و من لە شام پیکەوە لە فلاتیک دا بوین. برایەتیمان زور بە هیز بوبو. حسەن بو من پشتیوانیکی جیگەی باوەر بو.

دوبارە بونەوەی ئەم رووداوە خویناویانە، دوای رووداوی کوشتنی ئیبراهیم عەزو و هەفرەزەکانی بادینان و چاوپوشینی یەکیتی لە خوینی ئەوانە و، دوای ئیمزا کردنی ریکەوتنی «هاوکاری مەیدانی» شام، کاریکی زور خراپی کردە سەر ورەی پیشمەرگەکانی ینک و، سەر دەرونی بەرپرسەکانی. قم بریاری دا بو ینک نەهیلی بو ئەو مەبەستەش پەنای ئەبردە بەر هەمو ریگایەکی ناجوامیرانە. ینک کە بروای بە فرە - پارتی و ململانیی ئایدیولوجی و سیاسی هەبو، ئەیویست نەریتیکی تازەی ژیانی دیموکراتی و بوبوونی پارتایەتی دابهینی، لە بەردەمی تاقی کردنەوەیەکی دژواردا بو. مەیدان چول بکا بو قم و ئاشبەتالی لی بکا، یان رابوەستی و بەربەرچی قم بداتەوە؟ ئەم مەسەلەیە ئەوەندە کوبونەوەی لە سەر کراو، بریاری تی دا درا و هەل وەشینرایەوە، ئەو دولەی لی ی بوین ناوی گوستە بو، لە ئەنجامی ئەو هەمو کوبونەوە بی ئەنجامەدا ناوی «دولە گوستە» یان کرد بە «دولە فشە».

ینک لە لایەکەوە قورسایی رویەرو بونەوەی گوشاری جوربەجوری بەعسی لە سەر بو لە لایەکی ترەوە قورسایی دوژمنایەتی قم.

هەولەکانی یەنک بو پیکهوەژیان بە ئاشتی لە گەڵ قەم سەری نەگرت. یەنک بریاری دەسکردنەوە و تەمی کـردنی قەم ی دا. قەم لە سنوری تورکـیـا تەمی نەنەکـران. لەوی قولاییەکی ستراتیجییان هەبو. ئیلە کوردەکانی ئەوی پشتیوانیی و، کاربەدەستانی تورک چاوپوشییان لی ئەکردن. بەلام لە مەلبەندی سوران لاواز بون ئەکرا لەوی سزا بدرین.

رەسول مامەند بو گەشتی سیاسی چو بو سوریا و هەندی لە ولاتانی ئەوروپا. د. خالیدیش چو بو سەردانی خیزانەکەی لە شام. چەندین پیشمەرگەی بریندارێش بو چارسەر چون بو سوریا. ئەمانە هەموی بە ناو تورکیادا ئەرویشتن.

*

گفتوگو لە گەڵ بەعس

هەر لەم ماوەیەدا عیراق بە هوی شیخ محەمەدی لولانەوە وەلامی بو سەرکردایەتی یەنک نارد بو گفتوگو. سەرکردایەتی بزوتنەوە هەر لە سەرەتاوە کە هات بونە شاخ، بە هیوا بون ئەوە ببیتە گوشاری بو سەر بەعس و ناچار بی بو گفتوگو و ریک کەوتن. ئەمەیان لە بەیانیکی دریژا بە عـەرەبی لە لوبنان و دەرەوەی ولات راگـەیاند بو. بەرپرسـەکـانی تری بزوتنەوە لە کوبونەوەکانی ک س ـ یەنک دا بیروبوچونی خویان دەربارەی گفتوگو لە گەڵ سەرکردایەتی عیراقی نەئەشاردەوە. راستیەکەی سەرکردایەتی یەکیتی بەش نەی ئەتوانی بە ئاسانی داوایەکی عیراقی بو دەسپیکردنی گفتوگو بو چارسەرکردنی بە ئاشتی گیروگرفتی کـورد لە عـیـراق دا رەت بکاتەوە. رەتکردنـەوەی باسـیـکی لەو بابەتە بیـانوی ئەدا بە کەسانیکی تر، سەرکـردایەتی یەنک تاوانبار بکەن بەوەی کە شەر بو سوریا ئەکەن نەک بو کورد، ئەگینا ئەگەر عـیـراق ئامادە بی بە ئاشـتی بیتـە پیشـەوە ئەبی سەرکـردایەتی یەنک بوچی رەتی بکاتەوە؟

سـەرکردایەتی عیراقی لە کاغەزیکی سپی بی سەرناو و بی ئیمزا بە مەرەکەبیکی سەوز بە خەتی صدام حسین ئەم چەند نوقطەیەی نارد بو:

وان الخط العام الذی تتبعه الثورة فی معالجة المسألة الكردية وبناء مؤسسات الحكم الذاتی خط صحیح ولا تراجع عنه، والثوره متوجه بشكل مهذنی وجدی فی تطویر مؤسسات الحكم الذاتی وممارساتها. ومن الامور الطبیعیه ان ترافق الاعمـال الكبیره والمعقده كالحكم الذاتی ومعالجه القضیه الكردیه بعض الاخطاء، غیر ان القسم الاكبر من هذه الاخطاء سببه ... ومنها انتم.

نعلن استعدادنا للعفو عنكم و عن من هم بمعیتكم و تاریخ التعامل یوكد التزامنا بوعدنا و ابتعادنا عن اسالیب الغدر

ان الاطلاع على وجهه نظركم فى المسائل السياسيه ودرجه تفاعلنا معها ترتبط بتغيير موقفكم وموقعكم المضاد من السلطه

ان الفرص المتاحه لكم فى المساهمه فى البناء والتفاعل مع الثوره وموقفنا نحن من التفاعل لا يمكن تصورها الا عندما تكونوا مواطنين صالحين تعبرون وتثبتون بجديه عن رغبتكم فى العمل من اجل البناء المشترك بناء العراق الواحد الاشتراكى القوى

ان ماضى العلاقه مع جلال وماضى على العسكرى يتيحان فرصا جديه لبناء علاقات من شأنها خدمه شعبنا العراقى بعربه و اكراده

نؤكد ان الفرص المتاحه لكم الان قد لا تتوفر فى المستقبل وعلينا ان نتعظ بالماضى القريب»

له پاش زنجیرەیەک کۆبونەوە، کە نەک هەر ئەندامەکانی سەرکردایەتی، بەلکو هەمو ئەو کادر و فەرماندەی کەرت و مەفرەزانەی لە پرادوست بون بەشدار بون، بریار درا گفتوگۆ لە گەڵ عیراق بکری. بۆ ئەو مەبەستەش مامجەلال، علی عسکەری و عومەر عەبدوللا چون بۆ لولان. وا بریار بو ئەگەر پێویستی کرد بۆ چون بۆ بەغدا بۆ دیتنی سەرکومار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر - مامجەلال و، بۆ دیتنی جێگری سەرکومار صەددام حسین - علی عسکەری و، بۆ دیتنی خوار ئەوان - عومەر عەبدوللا بچی. بۆ ئەوەی بیانوی گلدرانەوەش نەبی لە یەکی زیاتر نەچی. لە لایەن ک س - ینک بە هەمان شیوەی حکومەت خوی کاغەزیکی بی سەرناو و بی ئیمزا نوسرا کە بدری بە کاربەدستان:

« اولا - ان العراق يستطيع القيام بدوره فى حركه الامه العربيه المجيده فى نضالها ضد الامبرياليه والصهيونيه والرجعيه فى تحرير فلسطين وصيانه الخليج العربى. ولكى يستطيع العراق اداء دوره القومى يجب عليه:

١. تعزيز وحده الشعب العراقى الوطنيه التى تشكل الاخوه العربيه الكردية حجر الزاويه فيها.

٢. وحده القوى التقدميه العراقيه واتحاد تياراتها الاساسيه (الحقيقيه و الفاعله) فى نضالها الموحد.

٣. اطلاق الحريات الديمقراطيه بما فيها حريه العمل السياسى للاتحاد الوطنى الكردستانى.

٤. اخذ العراق بمبادره عربيه جديده فى الدعوه الى جبهه عربيه تضم العراق، سوريه، منظمه التحرير الفلسطينيه، اليمن الديمقراطيه، ليبيا، الجزائر لتصدى المؤامره الاستعماريه الصهيونيه.

٥. تعبئه العراق الماديه والعسكريه لزجها في معركه الامه العربيه ضد العدوان لصهيوني الاستعماری

٦. التنسيق مع القوى والدول العربيه دفاعا عن الخليج العربي.

٧. دعم الثوره الفلسطينيه بجميع فصائلها حتى تحقق التحرير التام الكامل للتراب الفلسطيني.

ثانيا - المعالجه الاتيه للمشكله الكرديه:

١. انهاء سياسه التهجير وتغيير المعالم القوميه واعاده جميع المهجرين الى اماكنهم.

٢. تنفيذ جميع بنود اذار وتطبيق قانون الحكم الذاتي على ايدي ممثلي الشعب الكردي وتطويره.

٣. اطلاق سراح جميع المحكومين والموقوفين.

٤. تخويل القوى التقدمية الكردية مهمة الدفاع عن الحدود العراقيه في المنطقة الكردية.»

عەلی عەسکەری لە تشرینی دوەمی ٧٧ دا لە لولانەوە بە هالیکوپتەر برایە «نادی عەسکەری کەرکوک» و، لەویشەوە راستەوخو بو بەغداد. لە بەغداد سەعدون شاکیر سەروکی جیهازی مخابرات و، عەدنان خەیروللا وەزیری دیفاع و چەند کەسیکی تری لە کاربەدەستانی بەعس دی بو. لە دوای هەموویان سەددام حسین، کە زور بە راشکاوی وت بوی، دوایین بریار لە دەس خویایەتی. جولانەوەی کورد لەو کاتەدا لاواز بو. لە ناوەوە هەرەسی هینا بو. سەرباری ئەوەش توشی ناکوکی دوژمنانەی ناوخوی بو بو. لە دەرەوەش دوستیکی ئەوتوی نەبو لە سەری هەڵ بداتی و پشتیوانی بکات. لە بەر ئەوە ئەبو «بەقەد بەرەی خوی پی رابکیشی». خواستەکانی کورد کەم و سادە و رەوا بون. زمانی نوسین و دەربرینەکانیشی، لە مەسەلەی عەرەبی و فەلەستینی دا، لە هی بەعسیەکان دور نەبو، بگرە لە وانیشی تی پەراند بو. هەندی لەوەش بو راکیشانی فەلەستینیەکان بو کە ئەوانیش زور بو بەعس بهینن؛ کیشەی کورد چارەسەر بکات.

سەددام خواستە گرنگ و سەرەکییەکانی رەت کرد بوەوە. وت بوی راگویزانی دیهاتەکانی سنور پیوەندی بە ئاسایشی عیراق و پاشەروژییەوە هەیە، لە بەر ئەوە ئەگەر هەمو جەیشی عیراقی ئیبادەش بی هەر جی بەجیی ئەکەین.

گفتوگو سەری نەگرت. عەلی عەسکەری گەرایەوە برادوست. هەمو سەفەرەکە ٣ روژی خایاند.

لایەنەکانی «التجمع الوطني العراقي» و، کاربەدەستانی سوری و لیبی لەم

گفتوگۆیە دلگران بون. بە توندی هێرشیان کردە سەر یەنک. تاوانباریان کرد بە پەیمانشکێنی. چونکە ئەو یەنک دریژە بە خەبات بدا و هەرگیز گفتوگو نەکا تا رژێمی دیکتاتوری عیراق ئەروخێنی. قم یش کەرسەیەکی باشی دەست کەوت بو دوبارەکردنەوەی پەلامارەکانی بو سەر یەنک.

یەنک ئەندام بو لە «التجمع الوطني العراقي»دا. لە کاتێکا یەنک بریاری دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکداری دا، وا بریار بو ئەوانیش هەم لە کوردستان بەشداری بکەن؛ سەفەرەزەی چەکدار بنێرن، هەم لە ناوەراست و خواروی عیراق دا ئەوانیش خەباتی چەکداردەس پی بکەن. وا بریار بو بەشێکی پێویستیەکانی پێشمەرگەی کوردستان ئەوان دابین بکەن. تجمع لە سوریا و لیبیا و لە ناو کورە عەرەبی و جیهانیەکان دا خوی بە چالاکیەکانی یەنک دوە هەڵ ئەکیشا، بەلام هیچکام لە بەلێن و گفت و ئیلتیزاماتی خوی بە جی نە هێنا بو. پێویستە بە جیبەجێنانی ئیلتیزامات لە هەردو لاوە بی، نەک لایەک هیچ ئیلتیزامیکی خوی بە جی نەهێنی کەچی داوا لە لاکەی تر بکا هەمو ئیلتیزاماتی خوی جی بە جی بکات.

سوریەکان کە ئەوەندە دژی گفتوگوی یەنک ـ بەعس بون بو چارەسەرکردنی کیشەی کورد، زوری نەخایان خویان کەوتنە گفتوگوی دو قولی لەگەڵ سەرکردایەتی عیراق بو یەکخستنی هەردو حیزب و هەردو جەیش و هەردو دەولەت.

سەرکردەکانی ئەو لایەنە فەلەستینیانەش کە دژی ئەم کارەیان نوسی بو، زوری پی نەچو خویان لە بەغدا بون بە لایەنی گفتوگو لە گەڵ بەعس.

بە واتایەکی تر بو خویان هەمو شت ئەشی، بەلام بو کورد ناشی!

ئاسایی کردنەوەی پیوەندیەکان ماوەیەکی خایان.

فەریق روکن اسماعیل تایە النعیمی، قائیدی ئەسای فەیلەقی یەکی جەیشی عیراق لە کتیبەکەی دا: «تجربتي في القيادة، الجزء الاول، دائرة التدريب، مديرية التطوير القتالي، تشرين اول ١٩٨٥» لە ژیر سەرناوی «علي العسكري يسلم ويواجه المسؤلين» نوسویتی:

«٣٩٨. كان علي العسكري من قادة العصاة وهو ينتمي الى جماعة الطلباني الذين يعادون زمرة الملا مصطفى البرزاني، لقد اشتغل هذا الرجل بامرتي عندما كان جلال الطلباني يعمل الى جانب الحكومة عام ١٩٦٩ عندما كنت قائدا للفرقة الثانية وكنت اعرفه جيدا فهو مقاتل شجاع وشريف لذا فقد وجهت جهود استخبارات الفيلق من اجل اعادة علي العسكري الى الصف الوطني لقد بذل العميد الركن محمد زهاد ضابط استخبارات الفيلق جهدا في ذلك

وكانت هنالك اتصالات مع علي العسكري بواسطة محمد رشيد لولان وفي احد الايام زارني محمد رشيد لولان في كركوك واخبرني ان علي العسكري سوف يسلم الى السلطة الوطنية بعد اعطاءه كلام من قبلي وفعلا تم اتخاذ الموافقات من المراجع العسكرية والسياسية حول هذه الخطوة وارسلت له رسالة وبعد فترة عاد علي العسكري واستصحبته الى بغداد حيث واجه السيد وزير الدفاع الفريق الاول الركن عدنان خيرالله والفريق الاول الركن عبدالجبار خليل شنشل رئيس اركان الجيش ثم بعد ذلك زار المسوولين في القيادة السياسية وقد علمت انه قدم طلبات الى القيادة السياسية والتي يمكن اعتبارها شروط ولذلك عاد ثانية الى المنطقة الشمالية وقد اخبرني بعد ذلك انه سيعود ثانية ولكن يظهر انه لم يستطع اقناع جماعة الطلباني بالعودة الى جانب السلطة وانهاء العصيان مع العلم ان اتفاق الجزائر قد اثبت عمالة العصيان في شمال الوطن الى الاستعمار والصهيونية.....»

ئەم گێڕانەوەیەی ئەلنعیمی فری بەسەر ڕاستییەوە نیە. هەرچی لەوی دا نوسیویەتی دەربارەی عەلی عەسکەری دروی هەلبەستراوی خویەتی. ئەمەی لیرەدا نوسراوەتەوە هەردو «ورقە عمل» ی بەعسی و کوردی بو، کە پنچینەی سەفەرەکەی عەلی عەسکەری و گفتوگوکانی بو لە گەل کاربەدەستانی ئەوسای عیراق لەوانە: صەددام حسین. ئەم بەلگەنامانە کاتی خوی لە سوریا و لوبنان و هەندی شوینی تردا بلاو کراونەتەوە.

ئەلنعیمی ئەو درویانەی بو زلکردنی خوی و سوک کردنی کاک عەلی نوسیوە. یەکی لە ئوسلوبە نزمەکانی سەرکردەکانی جەیشی عیراق و دەزگای «ئیستیخباراتی عەسکەری» بو زراندنی ناوی کەلەپیاوەکانی میژوی کورد و شیواندنی ناوبانگیان هەلبەستنی قسەی ناراست و دروی بی بناغەیە. بیگومان روژی لە روژان ئارشیفی نهینی عیراقیش بو پشکنین و لیکولینەوەی زانستی ئەکریتەوە.

ئەلنعیمی پیاویکی دروزنی بی بەلینە. هەر ئەم بو دەستی کاک عەلی و هاوریکانی بری، کە ئەوسا لە ئیران بون و، دوایی بزوتنەوەیان پیک هینا. بەلینی پی دان کە ئەگەر بگەرینەوە عیراق، بەعس ماوەیان ئەدا سەر لە نوی پارتی دیموکراتی کوردستان ریک بخەنەوە و، بەشدار ئەکرین لە داوودەزگاکانی حکومەت و حوکمی زاتی دا. کە گەرانەوە چالاکیی سیاسییان لی قەدەغە کردن و، وەکو ئاردی ناو درک هەر یەکەیان بە لایەک دا بلاو کردەوە. کاک عەلی یان کرد بە سەروکی شارەوانی «رەففاعی» لە خواروی عیراق.

ئەلنعیمی بو پاراستنی پلەوپایەکانی خوی زوری چاپلوسی درو بو صەددام ئەکرد و، لە جەنگی ئیران دا کوریکی کوژرا، لە بەر ئەوە ناوی لە خوی نا بو «ئەبولشەهید».

بەلام ئەمـانە هیـچی دادیان نەدا، صـەددام بو ئەوەی سوکی بکا، کرد بوی بە سـەرکـردەی فەیلەقی پیر و پەککەوتەکان. خویشی زوری پی خوش بو.
کـە عـەلی عـەسکەری لە بەغـدا گـەرایەوە و، گـفـتـوگـوکـە بە ئەنجـامـیکی باش نەگـەیشت، حکومـەت هەرەشـەیان لە شیخ محـەمـەد کرد بو کە ئەگەر هیزەکـانی یەکیـتی ناوچەکـەی ئەوان بە جی نەهیلی وەکـو شیخ مـحـەمـەد نوسی بوی: هیـزەکـانی حکومـەتی عـیراق «ئیـغـارەیەکی بە شـیـددەت» ئەکـاتە سـەر گوندەکـانی ئەوان. بو ئەوەی گوندەکـانی برادوست توشی زەرەر و زیان نەبن هەمـومـان چوینە گـوندەکـانی گـارە، گـەلیـشم، مەلاویان... لە بەری تورکیا، چونکە چاوەروانی گەیشتنی وەجبەیەک چەک و گەرانەوەی هەندی لە هەڤالانی دەرەوە بوین.

*

خەوی گران

تەنیـا پزیشک لە ناو هیزەکـەمان دا د. خدر مـەعـصـوم بو. لە بەر ئەوە نرخـیکی زوری هەبو بو ئیـمـە. شـەرکـەر بە ئاسـانی پەیدا ئەکـرا، بەلام پزیشک بە ئاسـانی دەس نەئەکەوت.

چارێکیـان هەمـو روژەکـەی بە شـاخیکەوە بوین روژمـان بـە سـەر ئەبرد تا ببی بە ئیـوارەو دابەزینە ناو ئاوایی. برسیـتی تینی بو هینام. پرسیم کی شتیکی پی یە بدا تی بیخوم. کاک عـەلی وتی هەندی «مـعلبـات» مـان پی یە. یەکیـکیـان «باپراخی قوتو» ی دسکردی تورکیا بو. لە شـوینیکی وەها و کـاتیکی وەهادا ئەمـە یەکی لە خواردنە نایابە خوشەکان بو. دەستم کرد بە خواردنی. ئیواره چوینە ناو گوند. دوای شیو و قسە کردن جی راخـرا بو نوستن. جگە لە ئیـشـکگرەکـان ئەوانی تر هەمـو نوستن. مـامجـەلال و کـاک عەلیش لە هەمان ژوردا بون.

لە پر پیـستی سـەرم، پیستی ورگ و بن باخەل و هەمـو شـوینە ناسکەکانی لەشم، کەوتە خورویەکی بی ئەندازە. هەموی بوبو بە لیر. ئارامم لە بەر برا بو. سکم پیچی زور بە ئازاری پی دا ئەهات. کـەوتمە رشـانەوە و رەوانی. چەند جـاری د. خـدرم خـەبەر کـردەوە، ئەمـوت: «هەسـتـە نەخـوشم چاریکم بکە!». بەتانیـەکـەی ئەدایەوە بە سـەر خـوی دا. ئەیوت: «بنو تا بەیانی چاک ئەبی». تومەز د. خـدر شـەکـەت و خەوگـران بو. بی ئەوەی ئاگـای لە خـوی بی وەلام ئەداتەوە. وازم لـەو هیناو تەسلیـمی چارەنوس بوم. شـەویکی سەختی پر ئازارم بە سەر برد. بەلام ئیتر بەرەو چاکبونەوە ئەچوم. بەیانی د. خدر بینیمی بە گلەییەوە وتی: «بوچی منت هەلنەستان؟». باسەکـەم بو گیرایەوە بە شەرمەوە گوی ی

لی راگرت.

دوای ئەوەش چەند جارێکی تر کە خواردنی ناو قوتوم ئەخوارد تووشی هەمان دەرد واتە: «تسـمم» ئەبوم. لەو ساوە ئیتر لە ناخۆشترین هەلومەرجی ژیان دا نان و ئاوم ئەخوارد و دەمم لە خواردنی قوتو نەئەدا.

*

جورجان یا دورجان خۆیان بە گوندیان دائەنا بەلام لە راستی دا بە گوند دانانرێ. دو یا سێ ماڵ بو. خدری مەلا عەزیز و براکەی لەوێ ئەژیان. لە چاو زۆریی ئێمە و کەمی ئەوان و، توانای داراییان دا هەتا پلی ی میوانپەروەر و نانبدە بون.

چەند رۆژێ ئێمە: د. خدر مەعصوم، شەوکەتی حاجی موشیر، قادر جەباری، من... لە ژورێکی ماڵەکەی ئەودا بوین. شەوێکی پایز کردی بە رەهێڵەی بارانی سەر بە کلاو. ژورەکەمان کەوتە دڵۆپە. کەس نەیئەتوانی بنوێ. لە هەمو لایەکەوە دڵۆپە ئەهاتە خوارێ. ناچار هەمومان دەرپەرین بانەکە بگیرین و درزەکانی بشێلین. د. خدر، ئەگەرچی لە چەند لاوە دڵۆپە لێ ی ئەدا، لە ناو جێگاکەی ئەبزوت و ئەهاتە دەرێ. بیرم نەماوە شەوکەت بو یا یەکێکی تر تیوەی ژەنی وتی: «هەستە لە کوردەواری ئەڵێن ئەوەی دڵۆپە قبوڵ بکا گەوواداییش قبوڵ ئەکا». د. خدر لە جێگاکەی نەهاتە دەرێ. بە دەم خەوەوە وتی: «هەڵناستم و من هەردوکی قبوڵ ئەکەم». ئەو شەوەم بیر هاتەوە، کە خەریک بو بە تسمم ئەمردم و چی لە گەڵ خەریک بوین لە خەو هەڵنەستا. ئینجا تێ گەیشتم لە لای هەندێ کەس خەو چەند خۆشە و، بە راستی زانیم کە هەڵنەستانەکەی «لاشعوری» بوە نەک «متعمد».

د. خدر لە زانستگای «عین شمس» ی «قاهیرە» پزیشکیی خوێند بو. ماوەیەک لە پێش ئاشبەتاڵ دا لە میرگەسور پزیشکی کرد بو. وازی لە هەمو خۆشییەکی قاهیرە و عیراق هێنا بو. کابرایەکی بە وره بو بە هەمانەیەکی پڕ لە کەرەستەی پزیشکییەوە بەو گیانە گاڵتەجارییەوە بەرەنگاری هەمو ناخۆشیەکان ئەبوەوە.

*

چەک و گەڕانەوەی هەندێ لە کادرەکان

ئەو چەند رۆژەی مانگی تشرینی دوەم کە لە گارە و گەڵیشم چاوەڕێ بوین دو کاری خۆش بە دوی یەک دا هاتن:

یەکەمیان، کاک خالید، رەسوڵ، لە گەڵ ئەوانیش د. کەمال خۆشناو، د. مەحمود، شەمسەدین موفتی، قادر جەباری، مستەفا چاورەش گەڕانەوە کوردستان. سالار بو گشتی

سیاسی چو بۆ ئەورووپا، ئارامیش، تا شەهید کرا، لە قەرەداخ نەجوولا. مەکتەبی سیاسی نوێنەری کۆمەڵەی تێ دا نەبوو. ئازاد هەورامی مابۆوە لە گەڵ مام جەلال بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی کۆمەڵە بکا.

دوەمیان، چوارتەن و نیو چەک و تەقەمەنی مان پێ گەیشت. وایان ڕێک خست بوو بە لۆری هەتا نزیک خۆمان بیهێنن. قورسایی چەک و تەقەمەنییەکە چوار تەن و نیو بوو. خستبوویانە ژێر چەند تەنێک ئارد و مەعکەرۆنییەوە. ئەم لۆرییە بەهزادی لە گەڵ هات بوو. بەهزاد نامەیەکی نارد نووسی بووی کە لۆرییەکەیان لە هەورازەکەی نێوان گەوەر - شەمزینان گیری خواردوە، ئەگەر پێی ڕا نەگەین شۆفێرەکە کەلوپەلەکە فڕێ ئەدا و ئەگەڕێتەوە. چەند وەخت بوو ئیمە چاوەڕوانی ئەم بارە بووین. گرنگییەکی ژیانیی هەبوو هەم بۆ چەکدارکردنی هەرێمەکان و، هەم بۆ بەرزکردنەوەی وورەی پێشمەرگە.

لە چاو برادەرەکانی تردا من لە هەمویان باشتر شارەزای ناوچەکە و ڕێگاوبانەکانی بووم. کاک خالیدیش لە هەموومان زیاتر پەرۆشی هێنانی چەکەکانی بوو. پێشتر چەند وەجبەیەک چەکمان هێنا بوو، هەندێکی من خۆم هێنا بووم، بەڵام هیچی بەر من نەکەوت بوو. کاک خالید لە منی پرسی چۆن تەگبیری هێنانی بکەین. منیش وتم: «من چەکم ناوێ، کێ بە تەمای چەکە با ئەو بچێ بیهێنێ». هەندێ لە بەرپرسەکان خۆیان لە قەرەی هیچ کارێ نەئەدا ماندوبوون یا مەترسی تێ دا بوایە. کاک خالید زۆر بە سەرم دا هات کە نابێ من قسەی وا بکەم و، لە گەڵم خەریک بوو تا قانیعی کردم بچین چەکەکان بگوێزینەوە. من پێشنیارم کرد کە هەمو هێزەکەمان بکەین بە دوو بەشەوە. بەشێکی کەمی لە گەڵ ئەو و من بە تراکتۆر بچین بۆ لای لۆرییەکە. بۆ ئەوەی ئەگەر لۆرییەکە پەکی کەوت بوو لە پەنایەک دا چەکەکان دابگرین و پارێزگاری بکەین. بەشەکەی تری بە پێ بێن و، هەر کەسە چەکێ یا زیاتر بە کۆڵ هەڵبگرێ تا ئەیگەیێنێتە شوێنێکی ئەمین.

کاک خالید و من نزیکەی ٤٠ کەسمان لە پێشمەرگە وریاکان هەڵبژارد. بە تراکتۆر ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای لۆرییەکە. زۆر لە شۆفێرەکە پاراینەوە هەوڵ بدا لۆرییەکە لێ بخوڕێ، گوێ ی لێ نەگرتین، وتی سەر ناکەوێ و، من لۆرییەکەم بایی ئەوەندە ملیۆن بانقەنۆتە ئەگەر ڕۆژ بێتەوە خۆم و لۆرییەکەم ئەگیرێین و ماڵمان وێران ئەبێ، لە بەر ئەوە شتەکانی خۆتان داگرن و من ئەگەڕێمەوە. قسەکانی ڕاست بوون. زۆری لە گەڵ خەریک بووین وتمان: «چارەنوسی کوردستانی عیراق بەمەوە بەستراوە ئەگەر نەگاتە دەست پێشمەرگە لەوانەیە جوڵانەوەکەمان بشکێ...» لەم بابەتە زۆرمان بۆ وت، بەڵام ئەو هیچی نەبیست. سەیرمان کرد ئەگەر وا بڕوا ڕۆژمان لێ ئەبێتەوە. ناچار کلیلی

لوریەکـەمـان لی سـەند و بە پیشـمـەرگـەیەکی شـارەزامـان وت هەولی لیـخـورینی بدا. پیشـمـەرگەکە لوریەکەی خستـەوە گەر بەلام چی هەولی دا سەرنەکەوت. وتی: «بارەکەی گرانە بویە سەر ناکەوی، ئەگەر بارەکەی سوک بکەن ئەروا». چەند کەسیکمان سەر خست زوری فـەردە ئارد و مـەعکەرونیـەکـەیان فـری دا و، لوری سـەرکـەوت. شـوفـیرەکـە لە تاو لوریەکەی هاواری ئەکرد و رازی بو خوی بومان لی بخوری. منیش لە تەنیشتیەو سوار بوم و ۳۰ کـەسـیک سـواری لوریەکـە بون. ترسـمـان هـەبو توشی چـەندرمـەی تورک بین. لوری بەری کەوت بەرەو گەلیشم. بە سەلامەتی گەیشت. کابرای شوفیر هەندی جنیوی دا بە خوی و، بەوەی ئارد بوی. سویندی خوارد: هەتا ماوە «کوردینی» نەکا. جوابمان بو ئەو هیزە نارد کە بە پی بەری کەوت بون بگەرینەوە. ئەگەرچی هەمویان شەکەت بوبون و، بەو سەرمایە چونکە دوسی جار لە روباریکی ساردیان دابو، گرد بوبون، بەلام کە چەکەکانیان بینی لە بن دیواریکا هەلپـەسـیردرا بون، هەمـو بوژانەوە. ئیـتـر هەر یەکـە شـتـیکی لی هەلگرت بو ئەوەی بە تەواوی لە مەترسی تورک دوری بخەینەوە.

داپەشکردنی چەک هەمیـشـە بوتە هوی دروسـتکردنی کـیشـە. لە بەر ئەوەی بەشی پیویستیەکانی هەموانی نەئەکرد و، هەرکەسەش ناوچەکەی خوی و، پیشمەرگەکانی خوی بە پیـویـسـتـتر یا شـایانتر ئەزانی لە هی ئەوانی تر، زور جـار لە باتی ئەوەی ببی بە هوی سوپاس و پیزانین و خوشی بهینی، توڕەبون و توران و، گلەیی و گازاندەی ئەخولقاند.

چەکـەکـان بریتی بون لـە: کـلاشـینکوف، ئاربـیجی ۷، دیـکتـاریوف، هاوەنی ٦۰ ملیم، مینی دژی تانک، فیشەک، نارنجوک، دوربین... بە سەر بەرپرس و هەریمـەکان دا دابەش کـرا. ۲۰ کلاشـینکوف و ٥ ئاربیجی ۷ بەر هەریـمـەکـەی من کـەوت. ئیـتـر خـوم ئامادە کرد بەرەو ناوچەی کاری خوم بگەریمەوە.

*

ئیـسـمـاعیل نعیـمی ۱ سال و ۲ مـانگ سـەرکردەی فـەیلەقی یەک بو. ستراتیجی تازەی دانا و، هیـزی ۱۰ فـیـرقـەی عـسـکەر خـرا بوە بەردەس. ژمـارەی پیـشـمـەرگـە لەو سـەردەمـەدا هیچ کـاتی لە ۱٥۰۰ کـەس تی نەئەپەری، کەچی بەو هەمو توانایەوە کـە خرا بوە بەردەسـتی و، بەو هەمو دەسـەلاتەوە کە درا بویە و، بەو هەمو پشـتـیـوانیـیەوە کـە لە لایەن سـەرکردایەتی بەعـسەوە لی ی ئەکرا، نەک هەر نەیتوانی جولانەوەکە بکوژینیتـەوە، بەلکو جولانەوەکـە - سەرەرای هەمـو گیـروگرفتـەکانی ناوخوی - تا ئەهات زیاتر پەرەی ئەسەند و، تەشەنەی ئەکرد و، پشتیوانی لە ناو خەلک دا زورتر ئەبو.

نعیـمی یش، بو پاساوداني سـەرنەکەوتنی خوی، وەکـو هەمـو سـەرکردەکـانی تری

بەعس و جەیش، هوی مانی جولانەوەکە ئەباتەوە بو بیگانە، لەم روەوە نوسیویتی: « ٤٠٠ ...والسوال الذی یطرح نفسه هل نستطیع القضاء علی العصیان لو استمرینا بتطبیق الستراتیجیة التی وضعناها لو استمریت فی قیادة الفیلق لسنین اخری؟

فاقول ان العصیان اصبح دولیا ومرتبط بالدول الطامعة فی الوطن العربی واخضاعه لسیاسة مناطق النفوذ وبما ان العراق بقیادة حزب البعث العربی الاشتراکی ینتهج سیاسة مستقلة ویهدف الی توحید الوطن العربی وتخلیصه من مناطق النفوذ الاجنبیة فان العصیان الذی تحرکه الایادی الاجنبیة وبعض الدول المجاورة الطامعة فی العراق سیستمر..».

لە چەند جیگایەکی تردا کە باسی سەرنەکەوتنی خوی ئەکا هویەکەی ئەباتەوە بو بیگانە: ئیران و، ئەلی بنکەکانیان لە ئیرانە و لە ئیرانەوە یارمەتییان بو دی. ئەم قسەیەی نەعیمی راست نیە و، خویشی ئەزانی درویە. لەو کاتەدا سوریا و لیبیا پشتیوانییان لە یەکیتی و، ئیران پشتیوانی لە عیراق ئەکرد. سوریا و لیبیا لە لایەک و، ئیران لە لایەکی ترەوە دوژمنی یەکتری بون. ئیران ماوەی بە یەکیتی نەئەدا هیچ بنکەیەک لە ئیران دا دابمەزرینی و، هیچ یارمەتییەکی نەئەدا. ئیران دوژمنایەتی یەکیتی و جولانەوەکەی ئەکرد و، بە گویرەی ریککەوتنی جەزائیر هاوکاری لە گەل عیراق ئەکرد. جەنەرال ئەزهاری، سەروکی ستادی ئەرتەشی ئیران، لە ١٩٧٨ دا سەردانی عیراقی کرد و، لە گەل سەرکردەکانی جەیش کوبوەوە، بە تایبەتی سەردانی فەیلەقی ١ ی کرد و، لە گەل نەعیمی دانیشت. هەر بو ئەم مەبەستە:

١. لە هەمو شارە سنورییەکان، لە شنو وە تا قەسری شیرین و، لە خانەقینەوە تا سیدەکان «لجان التنسیق العسکری» بو هاوکاری سپایی ئیران و عیراق دروست کرا بو.

٢. زانیاری و ئاگادارییان لە سەر جولانەوەکە ئەدا بە یەکتری.

٣. ئیران هەر تیکوشەر و پیشمەرگەیەکی یەکیتی ئەگرت تەسلیمی عیراقی ئەکردەوە.

٤. ئیران چاوپوشی لە هیزەکانی عیراق ئەکرد تاسمان و ئەرزی ئیران بە کار بهینن بو پشت گرتن لە پیشمەرگە و پەلاماردانی لە ناکاو، هەروەها بو راگویزانی گوندەکانی سنور.

ساواک و، حکومەتی ئیران، چاوپوشییان لە بنەمالەی بارزانی کرد کە: ق م دابمەزرینیتەوە، هەندی لە کادرەکانی لە ئیرانەوە بنیری بو عیراق و تورکیا و ئەوروپا و ئەمەریکا، هیزەکانی بە ناو خاکی ئیران دا بروا و، بنکە لە نوکان (لای سەردەشت) و، دزلی (لای مەریوان) دابمەزرینن. بەلام ئەمە بو یارمەتیدانی کورد نەبو بەلکو بو ئەوە بو

ملوزمەیکی کوردی بو یەکیتی دروست بکەن، ناکوکی و ناتەبایی و شەر بخاتە ناو ریزەکانی جولانەوەی کوردەوە.

*

چولکردنی برادوست

سال بەرەو زستان ئەچو. هەوا سارد ئەبو. وەرزی باران و بەفر نزیک ئەبوەوە. هیزەکانی یەنک خانو و پیخەف و رایەخ و خەوەتیان نەبو. ئازوقە زور بە زەحمەت و بە گران دەست ئەکەوت. زستانان ریگاوبانەکان ئەبەستران ئەبو لە پایزەوە زەخیرەی خواردن و سوتەمەنی بخری. هاتوچو کردن زور کەم ئەبوەوە. توانای دارایی یەنک کز بو. نەی ئەتوانی پیویستیەکانی چەند مانگیکی هەمو هیزەکە دابین بکا.

مانەوەی بە کومەلی هەمو هیزەکە لە برادوست کاریکی راست نەبو، هەروەها چول کردنیشی شتیکی راست نەبو. ناوچەکە گرنگییەکی ستراتیجی هەبو. چول کردنی ئەبو بە هوی دابرانی یەنک و جولانەوەکەی لە دنیای دەرەوە. لە بەر ئەوە بریار درا بەشیکی هیزەکە لەوی بمینیتەوە و، ئەوی تری هەر بەشەی بچیتە شوینی کارکردنی خوی. ئەبو کاک خالید و شیخ حسین و پیشمەرگە بادینیەکان لەوی بمیننەوە بو دریژە پیدانی پیکەوە بەستنی ناوەوە و دەرەوە، ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی و کومیتەی سەرکردایەتی و فەرماندەی هەریمەکان بە کوردستان دا بلاو ببنەوە. هەر کەس و هیزە رو بکاتە ئەو شوینەی بوی دیاری کراوە.

*

# له نزیک سلیمانی: گەرانی بەردەوام

*

من کاروباری پێشمەرگەکانی هەرێمی سلێمانی یا وردتر شارباژێڕیان پێ سپارد بوم. بەرپرسی پێشمەرگەکانی ناوچەکانی دوکان ـ چوارتا بوم. لە ئاوی زێی بچوکەوە بو سنوری پێنجوێن سنوری کار کردنی من بو. ک س حاجی حاجی برایمیان بە جێگری فەرماندەی هەرێمەکەی من و لە هەمان کات دا بەرابەری سیاسی دانا بو. هەردولا: بەرپرسەکانی کومەلە و بەرپرسەکانی بزوتنەوە، ناوچەی شارباژێڕیان بە لاوە گرنگ بو، بە دەروازەی سلێمانییان دائەنا، بویە لە کوبونەوەکانی ک س و لە کاتی دابەش کردنی هەرێمەکانی پێشمەرگایەتی دا هەردولایان پێ یان لە سەر ئەوە دائەگرت: شارباژێڕ بو ئەویان بێت. وەکو چارەیەکی ناوڤجی هەردولایان بە منیان سپارد.

لە گوندێکی شەمزینانەوە، گەلێشم، کەوتینە خو سازدان بو گەڕانەوە بو سلێمانی. من خوم هێشتا مەفرەزەم بو خوم پێک نەهێنا بو. هیچ پێشمەرگەیەکم لە گەڵ نەبو. ئەو کادر و پێشمەرگانەی لە برادوست بون و سەر بە هەرێمەکەی من بون و ئەوانەی بە هەمان ری دا ئەرویشتن ئەبو کو ببنەوە بو ئەوەی پێکەوە بە ری بکەوین. هێزەکە تێکەلاو بو لە کەس و تاقمی جیاوازی پێکەوە نەگونجاو:

– عومەری حاجی عەبدوللا، کە دانرا بو بە فەرماندەی هەرێمی قەرەداخ، خوی و مەفرەزەکەی.

– عەزیز مەحمود، کە دانرا بو بە لێپرسراوی لقی کەرکوکی یەکێتی.

– حەمەی حاجی مەحمود، کە فەرماندەی کەرت بو لە هەرێمەکەی کاک تایەر و، دکتور رەزا (حەمە سەعید خورمالی)، ئەویش کرا بو بە لێپرسراوی ناوچەی هەلەبجەی یەکێتی.

– مستەفا چاورەش، کە تازە لە هولەنداوە هات بومەوە.

– عەبدولقادری هەلەدنی، حاجی مەحمودی گەورەدی، محەیدینی چوخماخی، شێخ صدیقی چوخماخی، عەلی حیکمەت (علی ئامەخان)، عوسمانی قادر مەنوەر، دکتور چالاک (کەریمی دادەمەنە)، هاوری جەبار (جەباری حاجی عەبدوللا)، هەژار (فوئاد یاسین)، سەلامی مەلا عەبدوللا... کە سەر بە هەرێمەکەی من بون.

بە هەمومان ٣٥ کەس بوین، بو شارەزایی ریگاوبانیش قادر خەیات و خدری

کامەلای بالەییمان لە گەڵ خومان برد. ١٠ ئیسترمان کری بو. بارمان لی نا بو. زوری بارەکان چەک بو.

یەکی لە گەورەترین گیروگرفتەکانی ریگە دریژەکەمان ئەوە بو؛ زوری پیشمەرگەکانمان شاری بون، نەیان ئەزانی چون رەفتار لە گەڵ ولاخ بکەن و چون بار بکەن. من لە تەجروبەی پیشومەوە هەستم بەم کیشەیە ئەکرد، پیشنیارم کرد ١٠ کەس لە پیشمەرگە بادینییەکان، کە خوم باشم ئەناسین هەلبیژیرم و، لە گەڵ خومان بیانهەین لە ریگا بو بار کردن و، بەریوەبردنی ولاخەکان یارمەتی مان بدەن. عومەر تورە بو. وتی: «تو باوەرت بە هاوریبانی کومەلە نیە و ئەتەوی بیانشکینیی، ئەگینا ئەمان چییان لەوان کەمترە». منیش وتم: «باشە ئەیبینین».

روژی ٧٧/١١/٣٠ چوم بو خواحافیزی لە مامجەلال و مەکتەبی سیاسی. سالار خوی ئامادە کرد بو بچی بو سوریا و، لەویوە بو گەشتی سیاسی بو ئەوروپا. مامجەلال ئەیویست هەردولا رازی بکا: لە بزوتنەوە رەسول مامەندی نارد بو، ئەبو لە کومەلەش یەکی بنیری. بریاری دا بو سالار بنیری. سالار لە گەڵ مامجەلال هەندی ناخوشییان بوبو. من خواحافیزیم لی کردن و، گەرامەوە لای هیزەکەی خومان.

روژی ١ی ١٢ی ١٩٧٧ لە کویردەیی «جوورجان» وە لە برادوست بەرەو شارباژیر لە سلیمانی بەری کەوتین. لە بەر هیزەکانی قم و هیزەکانی حکومەت نەمانئەتوانی بە ناو خاکی کوردستانی عیراق دا بە دەشتی بەرازگردا بەرەو هەلگورد و چومان بروین. بە تایبەتی نیمە بارمان پی بو. لەبەر ئەوە ملی ریگای کیلەشین مان گرت.

چیاکە بەفر گرتبوی هەتا چاو بری ئەکرد سپی ئەچوەوە. هەمو روژەکە بە ریگاوە بوین نەگەیشتینە نوا یا رەشاییەک پشوی تی دا بدەین، یا ستاری تیا بگرین. قادر خەبات و خدری کامەلا هەردوکیان کوری قەندیل بون. مەترسی بەفر و ونبونی ناو بەفریان ئەزانی. کە چوینە دیوی ئیران بو ئەوەی لە ناو بەفرەکەدا بزر نەبین چوینە سەر سەرچاوەکانی چەمی «گادەر» بە کەناری چەمەکەدا بردیانین. خومان و ولاخەکان زیاتر لە ٦٠ کەرەت لە چەمەکە ئەمبەر و ئەوبەرمان کرد. لە کەناری چەمەکەدا بوین بارانیکی بەهیزیش دای کرد. بە تاریکی شەو گەیشتینە جیگایەک هەندی چلوچیو و چیلکەی لی بو. ٢٠ سەعات زیاتر بو بە ریگاوە بوین. هەمومان شەکەت بوبوین. لە ژیر رەهیلەی باران دا خومان دا بە ئەرزدا و هەندی ئاگرمان کردەوە.

بو بەیانییەکەی خومان گەیاندە کویرە دی یەک ناوی «رەشان» بو. چەند مالیکی

کەم بو. کەوت بوە ڕوژهەلاتی «شنو». لە شوێنێکی تەختایی دا بو. نەمانئەتوانی لی ی بمێنینەوە چونکە لە شنو وە نزیک بو. خاوەن مالەکان کەسانی باش و کوردپەروەر بون. عوسمانی قالە مندومر لەوە لێمان جیا بوەوە وتی من بە پی بر ناکەم. چوە شنو بو ئەوەی بە ئوتومومبیل پیمان بگاتەوە. لەوێوە بەرەو کەوتین بو «زیوکە».

زیوکەش بەفر گرت بوی و بەفری لی ئەباری. بو ئیمە هەلێکی زیرین بو ماوەیەک بی ترس بمێنینەوە تا ماندویەتی مان دەرئەچی. لە ناو گوندەکەدا جاسوسی ساواکی تی دا بو. هەولمان دا تا گوندەکە بە جی ئەهێلین کەس لە دی دەرنەچی. مستەفا چاورەش تازە لە ئەوروپاوە هات بوەوە. چەند دانەیەک ڕوژنامەی «کوردستان» ی حیزبی دیموکراتی لە گەل خوی هێنا بو. بی ئاگاداری من هەندێکی لە زیوکە بلاو کرد بوەوە و، باسی حیزبی دیموکراتی بو کرد بون. کە بویان باس کردم پیم سەیر بو. وتم: «ڕێوی خوی نەئەچو بە کونەوە، هەژگێکیشی ئەبەست بە کونەوە». ئاگادارمان کرد شتی وا دوبارە نەکاتەوە. شەوێک لەوی ماینەوە بوژاینەوە. لەوێوە بە بناری شاخ دا بە ڕی کەوتین بەرەو «قەمتەران» و «قزقاپان».

ئیوارەیەکی درەنگ بو، دنیا تاریکی کرد بو، گەیشتینە قزقاپان لە نزیک «خانە». پاسگایەکی لی نزیک بو. چەند کەسی لە خەلکی دی چو بون لە لای فەرماندەی پاسگاکە خەبەریان لی دابوین. هێشتا لە نانخواردن نەبوبوینەوە گەیشتنە سەرمان. کابرا داوای لی کردین دەسبەجی ناوچەکە بە جی بهێلین. زوری لە گەل خەریک بوم چەند سەعاتی مولەتمان بدا تا ولاخەکانمان ئەحەسێنەوە، قەبولی نەکرد. هەڕەشەی لی کردین ئەگەر نەروین ئاگاداری خانە ئەکا هێز بهێننە سەرمان. پاسگاکان خویان ئەوەندەیان هێز تی دا نەبو چاری هێزێکی ئەوەندەی ئیمەی پی بکری. جنێوێکی بە خەلکی ئاواییەکەش دا وتی: «ئەگەر ئەوان بەم تاریکایی و سەرمایە گوزارشیان بو من نەهێنایە من لە کوی ئەمزانی و، ئەگەر منیش بە دەنگ گوزارشەکەیانەوە نەیەم، دوایی توش ئەیەم». کابرای فەرماندەی پاسگا کە عەجەم بو، لە ئاغای دی یەکە کە کورد بو، شەریفتر بو. خومان کو کردەوە ملی ڕێگامان گرت.

دەمەوبەیان گەیشتینە «زیوەی کونە لاجان». گوندێکی گەورە بو، ئەمیش پاسگایەکی تی دا بو. کەوت بوە لای سەروی ئاوایی. دی کە بە تەواوی کشومات بو هیچ دەنگێکی تی دا نەئەبیسترا جگە لە وەڕینی سەگ. هیچ کەس بە دەرەوە نەبو. لە دەرگای چەند مالێکمان دا لی یان نەکردینەوە. لە ناو خومان دا وامان تەگبیر کرد بو ڕوژەکە لە ناو دی دا بمێنینەوە و، هیچ کەسێکمان لە مالەکان دەرنەچن. ئاگاداری خاوەن مالەکانیش

بکەین کە ئەگەر خەبەرمان لی بدەن و، هیزی ئیرانیمان بهیننە سەر لە ناو دی یەکیان دا ئەیکەین بە شەر. زۆرمان لە دەرگای مالیک دا. کوریک پرسی ئیوە کین و چیتان ئەوی. هەرچونی بو دەرگاکەمان پی کردەوە و، چوینە ژورەوە وتمان: «ئیمە پیشمەرگەی کوردستانی عیراقین، لیرەوە رائەبورین، تازە خەریکە روژ ئەبیتەوە ناتوانین بە ئاشکرا تیپەرین، لەم دی یەدا ئەمینینەوە تا ئیواری. ئیواری ئەروین. ئەگەر خەبەریشمان لی بدەن لە دی کەتان دا ئەیکەین بە شەر».

ئەم کورە پیاوی چاک و تیگەیشتو بو. وتی: «باشە بمیننەوە، بەلام چەند مالی لە دی کەمان دا هەیە گومانم لەوان هەیە خەبەرتان لی بدەن، بو هەر مالیکیان چەند کەسیک بنیرن و، بە روژ لە مال دەرمەچن، هەمان هەرەشەی لەمنی ئەکەن، لەوانیشی بکەن. بزانین خوا چی ئەکا». بە قسەمان کرد لەو مالانە دابەش بوین کە ئەو بوی دیاری کردین. نانی چەژن مان لە گەل ئەوان خوارد و، هەمو روژەکە بە سەلامەتی لە ناو مالەکان دا ماینەوە. کەس پی ی نەزانین. راستییەکەی خەلکی دی یەکە کوردپەروەر و دلسوز بون. هەندیکیان بون بە دوستمان و تا چەند سالی هاتوچویان ئەکردین.

هەر لەوی لوریەکیان بو پەیدا کردین، ولاخەکانمان بو بگەیەنیتە گوندی «کونە مشکە» ی لای سەردەشت و، یەکی لە خاوەن مالەکانیش تراکتورەکەی خوی بو ئامادە کردین، بە شەو خومان و بارەکان، بو ئەوەی توشی گیچەلی ژاندارمەری نەبین، بە لاری دا بگوێزیتەوە بو هەمان کونەمشکەی ئەبو ولاخەکانی بگاتی.

ئیوارە بە دەشتی لاجان دا بە تراکتور کەوتینە ری. حاجی قادری کویی لە سەردەمی فەقی یەتی دا بەم شوینەدا رابوردوە و، ئافرەتیکی قەشەنگی دەوارنشینی لی دیوە. دوای گەرانەوەی یەکی لە شیعرە غەرامییە هەرە جوانەکانی بەم بونەیەوە داناوە و، بە «بادی سەبا» دا بوی ناردوە. لە بەیتیکی دا ئەلی:

هەر لیرە هەتا دەشتی بەهەشت یەعنی: «لاجان»

ئاهیستە برۆ، نەک وەکو دیوانەیی هەرزە

لە بەر تاریکیی و، لە ترسی ریگا نیمە نە ئەو «دەشتی بەهەشت» ەمان بینی و، نە هیچ کچیکی جوانی لە بابەتی ئەوەی حاجی شەیدای بو بو، بەلکو لە کوتایی ریگاکەمان دا توشی جیبیکی عەسکەری بوین، داوای لی کردین رابوەستین. ئیمە سەری تراکتورەکەمان داپوشی بو، نە پیشمەرگەکان و نە بارەکان دیار نەبون. سەربازیک دابەزی دەستی کرد بە ژیر پەردەی عەرەبانەکەدا دەستی بەر چەک و پیشمەرگەکان کەوت. بە فارسی هاواری کرد: «ئاغای سەروان پرێتی لە چەکدارا». کابرای سەروان دابەزی. من لە

تەنیشت شوفێرەکەوە دانیشت بوم. پرسی: «ئێوە چین؟». وتم: «پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین. ڕێگامان لی تێکچوە. ئەگەڕێینەوە بۆ کوردستانی عێراق». وتی: «ئەم تراکتۆرەتان لە کوێ هێناوە؟». وتم: «بە زۆر هێناومانە». وتی: «زۆرجار پێشمەرگەی کوردستانی عێراق دێنە ئەم دێو، هەمو جار ئێمە دەعوەتیان ئەکەین بۆ پادگان. پاش حەسانەوە بە ڕێ یان ئەکەینەوە بۆ وڵاتی خۆیان. ئێوەش وەرن دوای من بکەون تا ئەوێ». سەروان دو کەسی لە گەڵ بو. نەیئەتوانی بە زۆر بمانبا ئەیویست بە قسەی لوس تەفرەمان بدا. منیش وتم: «فەرمو پێشمان کەوە ئێمەش بە دواتا دێین». ئەوان بە ڕێ کەوتن بەرەو ئالوەتان. ئێمەش ڕێگەکەمان گۆری بەرەو جێگایەک ناوی «گوێزێلە» بو.

بارەکانمان لە نزیک گوێزێلە داگرت و، کەوتینە ناو ماڵەکان هەرچی ولاخێکی لی بو لە ئێستر و گوێدرێژ بە پەلە هەمویمان هێنا و بارمان کرد و، بە خێرایی کەوتینە ڕێ بەرەو شوێنی ئامادە بونی ولاخەکانی خۆمان. بۆ خۆشبەختی ولاخەکان لە پێش خۆمان دا گەیشت بون.

لە کونەمشک پشومان دا و، دیسان ولاخەکانمان بار کرد و بەرەو «شێنێ» بەری کەوتین.

*

تەقوتوق لە گەڵ قم

کاروانەکە لە گوندی «داوداوا» وە بە ڕێکاوە بو بەرەو «گۆزرشێر» بو ئەوەی لەوێوە بچێتە شێنێ. لە لیرەوارەکەی پشتی «نزکان» دا توشی تاقمی چەکدار بون بەرەو ئێران ئەرۆیشتن، پاش هەندی لە یەک خورین پیکا هەلپژان. لە ماوەیەکی کورتا یەکێکیان بە کوژراوی و یەکێکیان بە بریناری بە جی هێشت و ئەوانی تر هەڵاتن. دەرکەوت ئەمانە چەند کەسی لە کادر وپێشمەرگەکانی قم بون لەوانە: جەوهەر ئاغای ئیندزی، عەلی کوردە و، مەلا شێخ محەمەد... قم بارەگای سەرکردایەتی هەرێمی سلیمانی و کەرکوکی لە نوکان بو. پێش گەیشتنی کاروانەکەی ئێمە بە چەند ڕۆژێکی کەم فاضیل جەلال (عادل) ئەندامی قم و لیپرسراوی سلیمانی و کەرکوک تەسلیمی ڕژێم بو بوەوە. لە بەرپرسەکانی بنک پش پایز ئاغای هەباس ئاغای ئاکو لە گەڵ چەندین فەرماندەی کەرت و مەفرەزەی ئاکو و بالەیی تەسلیم بو بونەوە.

هەرچەندە دەرکردنی هێزەکانی قم لە ناوچەکانی سلیمانی لە بەرنامەی کاری ئێمەدا بو. بەڵام لەو سەفەرەدا ئێمە بە تەمای پەلامار دانی قم نەبوین. هێزەکەشمان بو ئەوە کۆ نەکرا بوەوە. بەڵکو مەبەستی سەرەکیمان ئەوە بو چەکەکان بە سەلامەتی بگەیەنینەوە

هەریمەکانی سلیمانی. تازە توشی شەر بوبوین. بو حەسانەوەی شەو لامان دایە بارەگاکانی کویخاکانی مەنگور لە دولیکی نزیک گورشیر. کویخاکانی مەنگور: کویخا عەلی قەلاوی، کویخا قادری زودی، کویخا محەممەدی مەلا شەریف، کویخا محەممەدی سیوەیس هەروەها چەند کەسیکی تر لەوانە کویخا بایزی مامەش، بەکر پیروت لە هەمان دۆڵ دا بنکەیان دانا بو. ئەمانە هەمو پیشمەرگەی یەکیتی بون.

کویخاکانی مەنگور نەیان ئەویست پشیوی بکەویتە ناوچەکەوە. ویستیان ببن بە ناوبژیکەر لە بەینی ئیمەو چەکدارەکانی قم دا. ئیمە قەبولمان نەکرد. پیمان وتن نابی ئەوان لە یادینان پیشمەرگەکانی ئیمە بکوژن و ئیمەش لیرە لە پال خومان دا بیان حەوینینەوە. ئاگاداری ئەوانی قم مان کرد: ئەبی واز لە قم بهینن و بینە ریزی یەکیتیەوە، یان ئەبی ناوچەی سوران بە جی بهیلن. ئەگەر هیچیان ناکەن، وا با خویان بو شەر ئامادە بکەن. هەمو چەکدارەکانی قم هەر ئەو شەوە کەلوپەلی خویان پیچا بوەوە بارەگاکانی خویان لە «نزکان» جی هیشت بو چو بونە «کانی زەرد». ئیمەش بو پشودان و چاودیری چەکدارەکانی قم چوینە شینی.

چەکدارەکانی قم هەندیکیان تسلیمی رژیم بونەوە و، هەندیکیان چونە ناو دیهاتەکانی ئیرانەوە و، هەندیکیشیان هاتنە ناو یەکیتییەوە. خانوەکانیان پاش چەند روژی کرا بە بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکیتی. مامجەلال و عەلی عەسکەری و رەسول مامەند و ئازاد هەورامی و د. مەحمود عوسمان و شەمسەدین موفتی چونە ناوی.

*

شینی گوندیکی گەورە بو. بەرەوژوری ۳۰۰ مال بو. مزگەوتیکی گەورەشیان هەبو. گوندیکی خوش بو. لەو کاتەدا بەفر سپی کرد بو. دو کویخایان هەبو: کویخا خدر و، کویخا عەبدوللا. هەر یەکەیان سەرپەرشتی چەند بەرەبابیکی ئەکرد. کویخا خدر لە کونەوە لە گەڵ دەزگاکانی حکومەت تیکەلاو بو. ماوەیەک ئەم پوستەی قەلادزەی بە سەردەشت گەیاند بو. کویخا عەبدوللا تیکەلاوی لە گەڵ داوودەزگاکانی حکومەت نەبو.

هەندی لە شینی ییەکان لە گەڵ ق م رویشت بون. نامەمان بو نوسین بگەرینەوە. بە کومەڵ هاتنەوە. ئیمەش وەکو بەلینمان پی دا بون ریزمان لی گرتن.

کویخاکانی مەنگور لایان وابو ناوچەکەمان لی شیواندون. لە بەر ئەوە حەزیان ئەکرد زو ناوچەکە بە جی بهیلین. خەلکی شینی یش هەروەها. سەرەرای ئەوەش مانەوەی ئیمە لە ناوچەکەدا لەوانە بو ببی بە هوی هیرشی جەیش. هەمویان ئەیانویست پالمان پیوە بنین. ئیمەش خومان ئەمانویست بە زوترین کات بروین. نیوەرویەک لە «شینی» وە بەرەو

«بیدەلان» بەری کەوتبین بە نیازی ئەوەی بە دەشتی قەلادزەدا بچین بۆ «ئاسۆس». خەلیل جەلال و یەکێ پێشمەرگەی تر، بۆ چاوساغی و شارەزایی، لە گەڵمان هات بوون. سەعات ٩ ی ئێوارە رابوورد بو ٩ سەعات زیاتر بو بە رێگاوە بووین، هێشتا ماوەیەکی کورتمان بری بو. لە دەشتی قەلادزێ بووین. روناکی و ئاگر و تەقەوتوقی رەبیئەکانی دەوروپشتمان قەوارەی هێزەکانی دوژمن و جۆری دابەشبونیانی لە ناوچەکەدا دەردەخست.

*

هەر ٣ کەس ١ ولاخمان پێ سپارد بو. ئەبو ئاگایان لێ ی بی بو خزمەتکردن و بارکردن و پاراستنی. شارییەکان هێشتا پێ یان تەگبیر نەدەکرا. زورجار بارەکانیان ئەکەوت. و گوریس و قەپاسە بنکلک و ورگ و پشتی ولاخەکانی برینداز ئەکرد. کەچی لادییەکان ١ کەسیان بو بەرێوەبردنی ٣ ولاخ دائەنا، بێ گیروگرفت و کیشە، کارەکەی ئەنجام ئەدا.

کە بە دەشتی قەلادزەدا ئەرویشتین. ئەبو پێ هەلگرین بو ئەوەی پیش ئەوەی روژمان لێ ببێتەوە بگەینە سەر زێ بو پەرینەوە. کاروانەکە زو زو رائەوەستا و دوا ئەکەوت. منیش گەرامەوە دواوە بو ئەوەی بزانم هوی ئەم دواکەوتنە چیە. سەیرم کرد هاوری جەبار و ولاخەکەی ئەو هوی دواکەوتن و تیکدانی ریزی کاروانەکەن. منیش بە توڕەییەوە پیم وت: «مەردوت مری ئەوە چیتە؟ بوچی لە ناو ئەم کاروانە درێژەدا هەر ولاخەکەی تۆ ئەکەوێ؟». یەکسەر وتی: «چوزانم، قابیلە من پاشقولی لێ بگرم. خوی ئەکەوێ!»

*

هەرچەند بیرم لێ ئەکردەوە بەو جورە رویشتنە و، بەو ماندویەتیە هەرچونی بروین ناگەینە مەنزلیکی ئەمین و سەلامەت. بە روژ ئەبو لە دەشتی قەلادزەدا بمینینەوە. دەشتی قەلادزەش سەربازگەیەکی گەورە بو. خەلیل و دەلیلەکانی ترم بانگ کرد. قوناغی داهاتوی مانەوەی روژ و، رادەی سەلامەتی شوینەکەم لە گەڵ باس کردن. دوژمن بە ئاسانی ئەگەیشتە سەرمان و ئەیکردین بە «پوزری خوراو». لە بەر ئەوە بریارم دا بگەرێینەوە بو دواوە رێگایەکی سەلامەت بدوزینەوە. هەندێ لە پێشمەرگەکان نەشارەزا بون، یان نەزان بون، رادەی مەترسیی ناوچەکە و، خەتەری تیکەوتنی نابەرامبەریان نەئەزانی، کەوتنە پرتەوبولە. من گویم نەدانێ گەراینەوە دواوە بو بیدەلان و شینێ.

بەفر چیاکانی گرت بو. چیاکان لوس بوبون. بەردەوام بەفر ئەباری. لە شینێ پرسیمان بە هەندێ لە شارەزاکانیان کرد. هەندێ رێگەوشوینیان بو داناین کە بچینە سەرچاوەی «هەلشو»، ئینجا بو «نورەدین» و لەوێ لە زێ بپەرینەوە بو بەری ئاسوس.

ئەبو بە پشتی «توژەڵە» دا تی بپەرین ئەویش کویستانیکی سەخت بو. بو شارەزایی و، شکاندنی ریگا و، ئاسانکردنی باری ولاخەکان، لە گەڵ خومان ۱۰ کاروانچی مان لە گەڵ ولاخەکانیان بە کری گرت و، زیاتر لە ۱۰ کەسی خەڵکی شینی مان بە خاکەنازەوە لە گەڵ خومان برد.

*

لە شینی کە خەریکی بارکردنی ولاخەکان بون، ماموستا عەزیز، پیاویک بو بە خو وە بو، دەنگی گەورە و سمیلی زل، پوزەوانەی لی هەڵکیشا بو، خەریکی بارکردنی ولاخەکەی خویان بو. نەیزانی بو چونی بار بکا. لە کاتی توندکردنی گوریسەکەدا پی ی لە ورگی ئیسترەکە گیر کرد بو، ئیسترەکە هەڵی تیزان بو. کابرایەکی شینیی کە ئەم دیمەنە ئەبینی، لە ماموستا عەزیز نزیک ئەکەویتەوە و ئەڵی: «ئەری کابرا عەیب ناکەی بەم سەر و قەڵافەتەوە نازانی بار بارکەی؟»

ماموستا عەزیزیش ئەڵی: «ئەی توش عەیب ناکەی بەو سەر و قەڵافەتەوە نازانی ئوتومبیل لی بخوری و، سوئالی ریاضیات حەل بکەی؟ ئەگەر بزانیایە توشی ئەمە ئەبم هەر لە منالییەوە ئەچومە خانەکەی گەرەکی خومان ئەبوم بە قەتارچی!»

ماموستا عەزیز نمونەیەک بو لەو پیشمەرگە شاریپانەی بە تەواوی بیگانە بون بە ژیانی لادی و بە ژیانی پیشمەرگایەتی. جاریکیا لە کوبونەوەیەک دا لە بەری قەرەداخ، بە ئامادە بونی کاک ئارام، پیشنیاری کرد بو لە باتی ئەوەی بە شەو «حەراسەت» دابنین و، پیشمەرگە بە هوی سەرماوە نەخوش بکەوی، هەر مەفرەزەیەک بو حەراسەتی شەوانە «قاز» یک رابگری. هەر لەم بابەتە برادەریکی تری شاری ئەیوت: من شتی ئەنوسم لە سەر «مضار الحراسه الليليه على صحه المقاتل الثوري».

*

بە لای توژەڵەدا هەڵگەراین. دنیا سپی ئەچوەوە. ماوەیەکی باش مان بری بو. زریان دەستی پی کرد. بەفریکی رەقی ورد، لە زیخ ئەچو، بە باوە لە دەموچاوی ئەداین. لە هیچ لایەکەوە رشایی مان لی دیار نەبو. دەست و پی مان تەزی بو. ولاخەکان ئەگلان زور بە زەحمەت راست ئەکسرانەوە. لە ترسی تەزین و رەق بون لە هیچ جیگایەک نەمانئەتوانی بو پشودان رابوەستین. ئەوجارە هەستم بە ترس و سامی بەفر کرد بو. زوری کاروانەکەمان، بە تایبەتی شینی بیەکان، لایان وابو هەمومان رەق ئەبینەوە، چەند کەسیکیان ئەگریان و لە بەر خویانەوە جنیویان ئەدا. خەریک بو شەومان بە سەردا ئەهات. من وام بیر لی کرد بوەوە کە ئەگەر تا شەو نەگەیشتینە رشایی. نایلونی زور و بەتانی

زورمان پی بو. له سەر بەفرەکە نایلون رابخەین و، بەتانی لەسەر نایلونەکە رابخەین و، هەمومان کو ببینەوە و، پشت بنیین بە پشتی یەکتریەوە و، لە شێوەی چادردا بەتانی تر بدەین بە سەر خومان دا و، بەتانییەکانی سەریشمان بە نایلون داپوشین.

هەرچونی بو گەیشتینە بەرزایی شاخەکە. وامان بە چاک زانی بارەکان دابگرین و لەوی بە نایلون دایان بپوشین و، بە جییان بهێلین. خومان بە نشیوەکەدا شور ببینەوە بو خواری. شەو لە دولەکەدا بە سەر بەرین و روژی دوایی ببینەوە بو بارەکان. بارەکانمان بە جی هیشت. شور بوینەوە بەروخوار. رەشایی مان لی دەرکەوت، ئیتر شینی بیەکان و کاروانچییەکان ناوچەکەیان ناسیبەوە و ریگایان دەرئەکرد.

شوینەکە «دولی ئاوسپی» بو. ئاشیکی ئاو و، مالی ئاشەوانەکەی لی بو، نزیک بو لە گوندی «بیگەلاس» و «مەسکریکی» گەورەی جەیش، ناوچەکە بە رەبیە تەنرا بو. کە سەرت هەلئەبری لە هەمو شوینە بەرزەکان نیشانەی دزیوی دوژمنی داگیرکەرت بە دی ئەکرد. هاوریکانمان چونە مالی ئاشەوانەکە. من لە گەل کاروانچییەکان و، شینیی یەکان چومە ئاشەکە. کەس مان لی نەئەناسین و بە ناپەدلی راپیچمان کرد بون بو ئەم بیگارە پر مەترسییە. نەمئەویرا بە جی یان بهیلم، ئەوان شارەزا وریا و گورجوگول بون، ئەترسام یەکیکیان خوی بدزیتەوە، بچی لە رەبیەیەک خەبەرمان لی بدا، یان بگەریتەوە باری چەک بیا و بروا. کاک عومەر و چەند پیشمەرگەیەکیش لە بەر من مانەوە. ئاگرمان کردەوە و چامان دەم کرد. گەرمان بومەوە و حەسایەوە. لە گەل شینی بیەکان و کاروانچییەکان کەوتینە قسەی خوش و گالتە و باسی جوراوجور. بوین بە ئاشنا و دوست. تا بەیانی بەمجورە ماینەوە.

*

ماموستا عەزیز و مولازم عومەر لە منالییەوە هاوری ی نزیکی یەکتری بون. لە پیشمەرگایەتی دا هاورییەتییەکەیان پتەوتر بو بو. بەیانییەکەی کە ئەبو کوببینەوە بو داگرتنی بارەکان لە سەر شاخ. ماموستا عەزیز خوی دواخست. عومەر کردی بە گلەیی و بولە و قسە. عەزیز جوابی دایەوە. عەزیز بو بەهانەیەک ئەگەرا خوی لە سەرکەوتنی شاخەکە لا بدا.

عومەر وتی: «تو بویە وا ئەکەیت بو ئەوەی خوت بدزیتەوە».

عەزیز وتی: «بەلی وایە. من سەرناکەوم. چی ئەکەی بیکە».

عومەر وتی: «مامجەلال باشتان ئەناسی، مێم لامیەکەی تو: مارکسیەتی لینینی نیە، مریشک لیدانە».

خەریک بو زیاتر دەمیان لە یەک گیر بێ و قسەکانیان لەوە تێ پەڕێ. ناچار بوم خۆمم تێ هەڵقورتان و قسەکەم پێ بڕینەوە.

بەیانی هەمومان کۆ بوینەوە: پێشمەرگە، کاروانچی، شینی بیەکان. بەو ڕیگایەدا کە ئێواری ی پێشو شکاند بومان، جارێکی تر بە شاخەکەدا هەڵگەڕاین بۆ لای بارەکان. بارەکانمان بە کۆڵ هێنایە خوارێ. ئیتر پێویستی مان بە کاروانچی و شینی بیەکان نەما بو. خۆمان لێرە بە دواوە شارەزای ڕیگا و ناوچەکان بوین. کری ی خوێانمان دانێ و ئێزنمان دان.

لە ناو «غەل» یک دا لە سەر بەفرەکە مولازم عومەر چوارمشقی دانیشت بو شتێ ئەنوسی. بە لامەوە سەیر بو، وامزانی نامە ئەنوسی بیدا بە کاروانچییەکان بوی بەن بو شینی یان جیگایەکی تر. لیم پرسی: «ئەوە چی ئەکەی؟»

وتی: «نامە ئەنوسم»

وتم: «بو کێ؟»

وتی: «بو تو!»

وتم: «من ئەوە خۆم لە بەردەمتا راوەستاوم چ پێویست ئەکا نامەم بو بنوسی؟»

وتی: «ئیستیقالە ئەنوسم لە پێشمەرگایەتی!»

ئەو سەردەمە سەرچاوەی هەڵشو بوبو بە ناوەندێکی گرنگی ئاڵوگۆڕی قاچاغی کەلوپەلی ئێرانی و عیراقی. هەندێ لە ولاخەکانی خۆمان وەستا بون، ناچار بوین هەندێ ولاخی تر لە خەڵکی سەرچاوەی هەڵشو بە کری بگرین. چەند «یەرمغە» یەکی خێرامان بە کری گرت بو. هێشتا نەکەوت بوینە ڕێ لە یەکێ لە ولاخدارەکانم پرسی: «مەخفەرەکەی هەڵشو چەندە لە ریگاکەمانەوە دورە؟». وتی: «ساچمەزەنهاوێژێ». یەکەم جار بو ئەم وشەیە بیبیستم. بە لامەوە خوش و رەسەن بو. دیارە مەبەستی لەم وشەیە «المدی المؤثر» ی تفەنگی ساچمەزن بو، کە لە هەمو تفەنگەکانی تری وەکو برنەو و، کلاشینکوف، کەمتر بر ئەکا. ئەم وشەیە چەند زاراوێکی تری بیر خستمەوە کە زمانی نەزانینی «مەتر» و «مەترموکەعەب» و «کیلو» کورد بو پێوانەی دوراییی و بو کێشانی قورسایی و نیشاندانی قەوارە، بە کاری هێناوە. وەکو ئەڵێ: خۆر یەک «رم» لە کەل بەرز بوتەوە. ریگاکە «روژە رێ یەک» دورە. جوگاکە دو «ئاشگێر» ئاوی لە بەر ئەروا. فلان بە قەد «گاجوتێ» بەهێزە...

دولی هەڵشو یەکێکە لە شوێنە هەرە خوشەکانی کوردستان. دیمەنی جوانە. ئاووهەوای خوشە. کانی و ئاوی زورە. چیاکانی جوان و، لێرەوارەکانی چر و سەوزن.

هەلشو خوی گوندیکی گەورە و قەرەبالغ بو. چەند «مەرچە» یەکیشی هەبو.

لە ناوچە سنورییەکانی پشدەر، ئالان، سیوەیل، شلیر ئەم جورە دابەش بونە بەرچاو ئەکەوت. ئاواییەکی گەورە چەند ئاواییەکی پچوکی لی کەوت بوەوە، ئاواییە پچوکەکە خوی بە سەربەخو دانەئەنا، بەلکو خوی بە بەشی لە ئاواییە گەورەکە ئەزانی، وەکو دایک و بەچکە. بە ئاواییە پچوکەکانیسان ئەوت: «قـزخ» و، بە ئەرزەکانیان ئەوت: «مـەرچە». خیزانیک یان چەند خیزانیک، هەمویان برا یا خزمی نزیک بون، پیکەوە لەو مەرچەیەدا کشتوکال و ئاژەلدارییان ئەکرد و، چەند خانویەکیان دروست ئەکرد، ئەرزەکان هی خویان بو، «قزخ» یکیان لە سەر ئاوەدان کرد بوەوە.

«قزخ» بو خو حەشاردانی پیشمەرگە جیگایەکی نمونەیی بو. دانیشتوانی قزخەکە داخراو و هەمو خزمی یەکتری بون، زور کەم هاتوچوی ئاواییەکانی تریان ئەکرد، لەبەرئەوە هەوال و دەنگوباسیان لی دەرنەئەچو. قزخەکانیش بە زوری لە شوینی شاخاوی عاسی دا ئاوا کرابونەوە.

بارەکانمان بار کرد و بەری کەوتین، بە ناو هەلشودا بە خیرایی تیپەرین بەرەو سالکی. «سالکی» و «نورستە» دو قوخی هەلشو و، لە دولەکەدا ئەمبەر و ئەوبەر بون.

*

دەمەو ئیوارە بە ناو نورستەدا هەلکشاین و، بە لای «دارەشمانە» دا بەرەو «نورەدین» رویشتین. دارشمانە «مەعسکر» یکی گەورەی لی بو. لە نورەدین گیر نەبوین، چەند یەلمەوانیکمان پەیدا کرد لە ئاستی «هەلاویژە» وە ئیمە و بارەکان و ولاخەکانیان پەراندەوە بو گوندی «بینخری» لە بەری ئاسوس.

ریگایەکی دور و ناخوشمان بری بو بەلام هیشتا نەگەیشتبوینە شوینیکی ئەمین، ئەبو چەند سەعاتیکی تر بە ئاسوس دا هەلگەریین تا بگەینە «سەرتەنگ». هەندی لە پیشمەرگەکان پی یان داگرت لە «بینخری» بمینینەوە تا بەیانی. ئەویش بو مانەوە دەستی نەئەدا. بەیانییان کریکاری ریگاوبان ئەهاتن لەوبەر ئاوەکە جادەیان چاک ئەکرد، هەمو روژی بو پاراستنی مەکینەکان سەرباز و زریپوشیان لە گەل ئەهات. ئەترساین بە روژ توشی شەر ببین لە گەلیان. ئیمە دریژەمان دا بە رویشتن، بەلام هەمو شارییەکان «مان» یان لی گرتین و، لە گەلمان نەهاتن. ئەوانەی لە گەل ئیمە هاتن: عەبدولقادری هەلەدنی و پیشمەرگەکانی و، حاجی مەحمودی گەورەدی و، حەمەی حاجی مەحمود و، دو پیشمەرگەی لای ملازم عومەر بون.

*

سەرتەنگ گوندێک بو بە ئاسوسەوە. کانی و ئاویان نەبو. هەندی بیریان هەبو بارانی زستان پری ئەکرد و، ئاوەکەی تی دا ئەمایەوە، زستان و بەهار ئاویان لی هەڵ ئەهینجا بو خواردنەوە. ئاوەکەیان پاک نەبو. پر بو لە سەرمێکوتە و جروجانەوەر. لە بەر ئەوە پێش خواردنەوەی ئەیان پالاوت. هاوینان چۆلیان ئەکرد ئەچون بو هەواری کوێستان. کشتوکالیان نەبو. ئاژەڵداری بەرهەمی سەرەکییان بو. خانوەکانیان تاریک و تەنگ و ناخوش بو.

ئیمە کە گەیشتینە سەرتەنگ بە دەگمەن پیاوی تی دا ما بو. ژنەکان کاروباری ناومال و ئەرکی ئاژەڵدارییان بە جی ئەهینا. لە مانگی نیسانی ئەمسال دا (١٩٧٧) جەیش هێرشێکی بو ناوچەکە کرد بو لە شوێنێکی نزیک سەرتەنگ بە ناوی «کانی شیلان» شەرێک لە نیوان جەیش و پێشمەرگەدا بوبو، چەند سەربازی کوژرا بون. لە تولەی ئەمەدا سەرکردەکانی جەیش هەرچی پیاوێکیان لەم دی بە بەر دەس کەوت بو دەردەسیان کرد بو. زیاتر لە ۲۰ کەسیان لی حوکم دا بون بە ٥ تا ۲۰ سال. لە گەڵ ئەوەش دا خەڵکی دی روخوش و میواندوست بون. پێشمەرگەیان خوش ئەویست و بە خوشیەوە پێشوازییان لی ئەکردن.

سەرتەنگ شوێنێکی نمونەیی بو بو حەسانەوەی پێشمەرگە. ئیمە لە مزگەوتەکەی لامان دا. یارەکانمان لەوی خست. مزگەوتەکە بریتی بو لە ژورێکی تەنگ و تاریک و دوکەڵاویی پر کوڵەکە. چاوەروانی گەیشتنی هاورێکانمان کرد.

*

لە سەرتەنگەوە چوین بو «بیترخێ». ئەمیش ئاوی کەم و کشتوکالی نەبو. ئاژەڵدارییان ئەکرد. هەندی لە کەسوکاری «صالحی دەرویش قادر» لیرە بون. یەکی لە کچەکانی هەوالی باوکی لی پرسین. باوکی تەندروست بو، بەلام مەکتەبی سیاسی لە لای خویان بە گیراوی گلیان دابوەوە.

صالح خوی و فەقی قادری کوری پێشمەرگە بون. قادر کادری بزوتنەوە بو لە ناوچەی قەلادزە. بە قیل دو کادری دیموکراتی گرت بو و، تەسلیمی ساواکی کرد بون. خویشی چو بو بو ئیران دانیشت بو. حیزبی دیموکرات لە سەر ئەمە بەهانەکیان دژی یەکیتی دەرکرد. قم و ناحەزەکانی یەکیتی ئەمەیان بە هەڵ زانی بو زراندنی ناوبانگی یەکیتی. بو ئەوەی روداوی لەو بابەتە دوبارە نەبیتەوە یەکیتی صالحی بو لیکولینەوە گرت بو.

بیترخێ گوندێکی پچوک بو. بەلام لە شوێنێکی عاسی دا بو. شەوێکمان لی بە

سەر پرد و بەیانییەکەی بەرەو «زەروون» بە ری کەوتین.

*

زەروون یەکی بو لە ئاواییەکانی شینکایەتی. «شینکی» تیرەیەکی پچوک بو لە چەند گوندیک دا دانیشتبون: گەلالە، سەفرە، زەروون، بەرگورد، قامیش، دری.. .ناوچەکەش بە ناوی تیرەکەیانە وە پی ی ئەلین: «شینکایەتی». ناوچەی شینکایەتی هەموی شاخ و داخە. ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە لە گەڵ ئەرز و ئاوی ناوچەکە نەئەگونجا. دانیشتوانی زور و ئەرزی تەخت و زەوی کشتوکالیان زور کەم بو. بەلام دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە هونەری چاککردنی ئەرزی لیژی قەدپالی شاخەکان و، پەروەردە کردنی رەزی دیمی تری و، ترش و، چوالە دا شارەزاییەکی زوریان هەبو. زوری قەدپالی شاخەکانیان چاک کرد بو، بەردیان لی بژارد بو، ریکیان خست بو و، سنوری رەزەکانیان لە یەکتری جیا کرد بوەوە و، لە بنی شاخەکەوە تا نزیک لوتکەکەیان کرد بو بە رەز. لە بەر لیژی و سەختی ولاخ نەیئەتوانی جوتی تی دا بکا، رەزەوانەکان ئەبوایە خویان بە پاچ بیکیلن.

تری، دژشار، میوژ، باسوق و سنجوق.. لە بەرهەمە سەرەکییەکانیان بو. هەندیکیان بو خواردنی خویان و، ئەوی تریان بو فروشتن ئامادە ئەکرد. هەروەها ولاخدارییشیان ئەکرد، بو گویزانەوەی بار.

چاککردنی ئەرزی شاخاوی و رەزەوانی، بەو شیوەیەی لە شینکایەتی دا کرا بو، نمونەیەکی چاک بو بو ئەوەی دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان بو گەشەپیدانی ناوچەکانیان چاویان لی بکەن.

*

روژی ٢٥ ی کانونی یەکەمی ٧٧ گەیشتینە «گەورەدێ».

روژی ٢٥ ی مانگ لای خەلکی گەورەدێ و دانیشتوانی ناوچەکە و، لای پیشمەرگەکانیش، وەکو روژەکانی تر وابو.

روژی ٢٥ ی مانگ لە دنیای مەسیحی دا پیروزییەکی تایبەتی هەیە. لەم روژەدا لە مال دەرناچن، بە دیار «داری کریسمس» ەوە دائەنیشن و، خوشترین خواردن دروست ئەکەن، چونکە لایان وایە مەسیح لەم روژەدا لە دایک بوە.

روژی پیشتر لە زەروون بوین. سەربازگەیەکی گەورەی جەیش لە گەلالەی شینکایەتی بو، بەفریکی ئەستور شاخی «گزجار» ی گرت بو. بارەکان لیرە داگیران و چەکەکان تا کاتی دابەش کردن هەڵ گیران. ئەرکیکی قورسمان لە کول بوەوە و،

ئازادییەکی زۆرتری بزوتنمان بە دەس هێنا.

«گەلاڵە» و «گۆجار» و «زێوە» وەکو ناو لە چەند جێگای کوردستان دوبارە بونەتەوە.

- شاری «گەلالە» لە بالەکایەتی و، گوندی «گەلالە» لە شێنکایەتی و، چەمی «گەلاڵ» لە بەرزنجە و چیای «گەلاڵ» لە مەنگورایەتی...

- گوندی «گۆجار» لە بناری چیای «مامەروت» ی بالەکایەتی و، هەواری «گوجار» لە بناری چیای «کاروخ» و، گوندی «گوجار» لە پشدەر و، چیای «گوجار» لە جافەتی.

- گوندەکانی «زێوە» و «زێوکە» ی شنو، «زێوەی کونە لاجان» ی پیراشەهر، «زێوە» ی سەردەشت کە بە سێوە لاسورە بە ناوبانگە، «زێوە» و «بەرزێوە» بالەکایەتی، «زێوە» و «دەرە زێوە» ی خوشناوەتی، «زێوی» ی پیرەمەگرون، «زێوەمەر» ی قەرەداغ، گەرەکی «زێوی» ی کەرکوک...

*

یەکی لەو مەسەلانەی لە مێژ بو سەرنجی راکێشا بوم جیاوازیی و سەیریی ناوی شوێن: شاخ، گرد، گوند، شار، کانی، جوگا، روباری... کوردستان بو. کە چومە جەزیرە و ناوی گوند و شوێنەکانی ئەویم بیست و، دوایێتر کە چومە شەمزینان و برادوست و، ئینجا پشدەر و دولی جافەتی و شارباژێر و شلێر، ئەم مەسەلەیە زورتر سەرنجی راکێشام.

لە کوردستان هەمو شوێنێک ناوێکی ناوچەیی هەیە، دانیشتوانی ناوچەکە بەو ناوەوە ئەیناسن. حکومەتەکانی تورکیا و سوریا ناوە ناوچەییەکانی هەمو شار و گوندە کوردنشینەکانی تورکیا و سوریایان گوریوە، لە سەر زمانی دانیشتوانی ناوچەکە ناوێکی هەیە و، لە نوسینی رەسمیی حکومەتی دا ناوێکی تر. بەلام دانیشتوانی ناوچەکە هەر بە ناوە کونەکەی ناوی ئەبەن. ئەوەی سەرنج راکێشی ئەوەیە، لە پاڵ ناوی کوردی کون و تازەدا بە هەزاران ناوی یونانی، سریانی، ئەرمەنی، ئیرانی، عەرەبی، مەغولی، تورکی... هەیە.

کوردستان کەوتوتە ناوجەرگەی روژهەلاتی ناوەراستەوە. ناوچەکە ٣ ئاررەی گرنگی دنیا: ئاسیا، ئەوروپا، ئەفەریقا بە یەکەوە ئەبەستی. رێگای ئاوریشم و، رێگای لەشکرکێشیی هێزە گەورەکانی یونان و رومان و ئیسلام و مەغول بە ناو کوردستان دا رویشتوە. چەند سەدە لە ژێر دەسەلاتی ئیرانی و یونانی و عەرەب و مەغولی و تورک دا بوە. لە سەردەمی جیا جیا دا دینی جیاجیای وەکو زەردەشتی، جو، دیانی تیا بلاو

بوتەوە تا سەرەنجام ئیسلام زاڵ بوە. دراوسی ی فارس و ئەرمەن و تورک و عەرەب بوە. ئەم روداوانە هەمو تەئسیریان لە زمانی کوردی و، ناونانی شوێنەکانی کوردستان کردوە.
ئەمی ناوی

– چیاکانی: جودی، هەرەکوڵ، شەکیب، نەقیب، قەندیل، سیلم، شەگەور، ماکوک، هەندرین، کاروخ، ناسوس، مالیموس..

– گوندەکانی: موزەلان، پلیسبیە، بیملاتە، بیشەمسی، سونی، دیرکی، شاورتە، گەلیشم، گارە، هەدن، بیتوش، بیموش، بیتوات، سفرە، زەرون، هەلەدن، مالومە، چوخماخ، گاپیلون، ولاغلو..

– شارەکانی: سلوپی، وان، گەوەر، سەقز، دوکان..

– روبارەکانی: دیجلە، خابور، فیشخابور، هیزل، سەرکەم، زی، گادەر، گوگسور، سیروان..

ئەمی ئەم ناوانە لە چی وەرگیراون و، سەر بە چ زەمان و زمانێک بن و، چون کەوتونەتە سەر زمان؟

دانیشتوانی ناوچەکان خۆیان بو زور لەم وشانە مەعنا ئەدوزنەوە و، لیکی ئەدەنەوە، بەلام زوری تیکەلاوە بە ئەفسانە و سەرگوشتەی ناراست، پشت ئەستور نیە بە هیچ بەلگەیەکی زانستی. ناوی شوین لە زمانی کوردی دا ئەهینی لیکولینەوەی زمانەوانی قولی لە چەند لایەنەوە لە سەر بکری، وەکو:

١. تەئسیری زمانی هیزە داگیرکەرەکان و، گەلانی خاوەن فەرهەنگی بەرز، لە سەپاندنی وشەکانی زمانی خویان دا بە سەر ناوی شوینەکانی کوردستان دا.

٢. ساغکردنەوەی بنجی وشەکان و، گوڕان و گەشەکردنیان، لە باری مەعنا و فونەتیکەوە، لە کونەوە تا ئیستا.

*

لە گەورەدی بارەکانمان خست و، ئەوی زیاد بو شاردمانەوە. ئەرکیکی قورسمان لە کوڵ بوەوە و، هەناسەیەکی ئاسودەییمان هەلژی. گەورەدی یەکی لە گوندەکانی ناوچەی جافەتی بو. ژیانی دانیشتوانی لە سەر چوالە بادام و، ئاژەلداری بو. کانی و ئاوی خوشیی هەبو، بەلام زەویوزاری کشتوکالی کەم بو.

ناوچەی جافەتی پیک هاتوە لە ژمارەیەکی زور گوند و ئاوایی گەورە و ئاوەدان. سەریکی کاریزە، کونەماسی، گاپیلون، گەڕەدی، گەورەدی و سەرەکەی تری دولمازەلە، قەلەم پاشا، سابورا، توپزاوا و دوکانە. بالغ، چوخماخ، مالومە، هەلەدن، باخسەمەر،

چالاوا، سەرگەلو، سێکانیان، سیدەر، شارستێن، باخێیان، خورخورە، سەرمورد، قەمچوغە، سورداش، هومەرقەوم و تەلان لە گوندە گەورەکانی و، قومرغان، مەولان، گوێزیلە لە ئاوابیە پچوکەکانی بو. ماوەیەکی زور «سورداش» ناوەندی بەریوەبەرایەتی ناوچەکە بوە، تا گزمی دوکان دروست کرا و، لە سەرەتای شستەکانەوە دوکان لە گوندیکی پچوکەوە بو بە شاریکی گەورە و، ناوەندی بەریوەبەرایەتی ناوچەکە.

بویە پی ی ئەلین: «ناوچەی جافەتی» چونکە دانیشتوانی ناوچەکە خویان بە تیرەیەکی جاف دائەنین، بەلام لە ناو جاف دا بەمانەی تیرە ئەلین: «جافە رەشکە». جگە لە جاف، لە هەندی لە گوندەکانی ناوچەکەدا بنەمالەی شیخانی لی یە وەکو: کاریزە، بەردەشین، سەرگەلو، چوخماخ.

ناوچەکە شاخاوی و بەردەلانە و «ئاوی سەرزەوی» کەمە. چینەکانی ئەرزەکەی وا دروست بوە بە ئاسانی ناگاتە ئاو و، «ئاوی ژیرزەوی» ی زور لە قولایی دایە. چەندین چەم و روباری گەورە لە نزیکی هەیە و، «گزمی دوکان» یش کەوتوتە لای روژئاوای. بە هوی بەرزی ئاستی ئەرزی ناوچەکە لە چاو ئاستی ئاوی روبارەکان و گزمی دوکان دا، ئاوی ناگاتی. ئاوی هەندی لە گوندەکان بە تەنیا بەشی خواردنەوەی خویان و ئاژەلەکانیان ئەکا.

ئاو و ئەرزی بەراوی بو کشتوکال کەمە. بو رەزی تری و چوالەی دیم و، سماق و، هەندی میوەی وەکو قەیسی و هەنجیر و، بە خیوکردنی ئاژەل لە بارە. لە شاخەکان لەوەرگای باشی لی یە. چەندین شیو و دولی تی دایە ئەکری ئاوی باران و بەفراوی تی دا کو بکریتەوە. خورخورە و باخییان بە پەنیری باش و بە تام بە ناوبانگن، لە بەهاران دا «پەنیری سەلک» و لە پایزان دا «پەنیری پیستە» دروست ئەکەن.

ناوچەی جافەتی ناوچەیەکی سەخت و عاسیبە کەوتوتە ناو زنجیرە چیاکانی چەرماوەند، گوجار، ژیلوان، ئاسنگەران، سارا و قەرە سردەوە.

*

بەنداوی دوکان یەکیکە لە پروژە گرنگ و ستراتیجیەکانی عیراق. ئەگەر کەلکی بو عیراق هەبوبی ئەوا زیانی لە کورد داوە.

گزماوی دوکان ۷۰ هەزاردونم زەوی بە پیتی کشتوکالی ۷۳ گوندی دەشتی بیتوینی داپوشیوە، لە ئەنجامی ئەمەش دا ۱۲۳۷ خیزان بو شوینانی تر گویزراونەتەوە. جگە لەوەی چەندین جی ی پر شوینەواری کونی کردوە بە ژیرەوە.

جوتیارانی کوردستان، تەنانەت جوتیارانی دەوروبەری گوماوی دوکانیش، بویان نیە بو ئاودیریی کەلک لە ئاوی ئەستیلی دوکان وەربگرن. یەکەمیان لە بەر ئەوەی

حکومەتی عیراق ریگایان نادا، دوەمیان چونکە ئاستی ئاوەکە لە ئاستی ئەرزەکانی ناوچەکە نزمترە.

لیرەدا بە کورتی هەندی زانیاری پیویستی لە سەر ئەنوسم کە لە پاسیک دەرم هیناوە شورش حاجی، کاتی خوی لە سەر داوای من، لە سەر ئاوەکانی کوردستان ئامادەی کرد بو.

- یەکەمین لیکولینەوە لە سەر پروژەی دوکان لە سالی ۱۹۳۸ دا لە لایەن «دامەزراوی ویلسون» ی بەریتانییەوە کراوە. راپورتەکەی ئەمان لە سالی ۱۹٤٦ دا درا بە دەستەیەک شارەزای تر، ئەوانیش دکتور ستانسفیلد هیگن یان راسپارد لی ی بکولیتەوە.

هیگن لە ناو چوار شوین دا تەنگی دوکانی هەلبژارد، چونکە چینە بەردەکانی قایم و باش و، تەنگەکەش قول بو، لە «وەرزی کەمئاوی» دا پانایییەکەی ٤٠ م و، لە «وەرزی زورئاوی» دا ۱۰۰ م ئەبی و، لاشانەکانی شاخەکە ستونیین. ئەمانە هوی لە بارن بو دروستکردنی بەنداو لەم ناوچەیەدا.

- بەنداوی دوکان لە تەنگی دوکان دا لە سەر زی ی پچوک دروست کراوە. ٦٠ کم لە خواروی روژئاوای شاری سلیمانی و، ٨٠ کم لە سەروی روژهەلاتی شاری پردی دایە. ١٨٠ کم لە دواوانی زیی بچوک و دیجلە و، ١٠٠ کم لە کەرکوک و ٣٠٠ کم لە بەغداد، دورە.

- لە ١٩٥٤/٢/٣ جیبەجی کردنی پروژەکە درا بە کومپانیای «دی میز» ی فەرەنساوی بە تیچونی ٨،٨١٧،٤٦٠ دینار. ئەوایە لە ٤٠ مانگ دا واتە لە حوزەیرانی ١٩٥٧ تەواو ببی، بەلام بە هوی لافاوە چاوەروان نەکراوەکانی سالانی ٩٥٤ و ٩٥٧ تەواو بونی پروژەکە دواکەوت بو حوزەیرانی ١٩٥٩.

لە شوباتی ١٩٥٩ەوە ئاوەکەیان گرتەوە. بەلام لە ئەیلولی ١٩٦٠ دا دەرکەوت بن دیواری بەنداوەکە ئاو ئەدزی. کومپانیای دوکراکو بو چارە کردنی، بەربەستیکی پرکردنەوەی بە دریژی ٣٤٠ م دروست کرد. بە تەنیشتەکانیەوە گەیشتە ٢٤٥٠ م.

- لاشەی بەنداوەکە پیکهاتوە لە دیواریکی گەورەی خەرسانە، لە سەر شیوەی کەوانە. دریژاییەکەی ٣٦٠ م و، بەرزاییەکەی لە بناغەوە ١١٦،٥ م و ئەستوری بناغەکەی ٥٤ م لە ژیرەوە «واتە لە بن زی یەکە» ٣٢،٥ م و لە سەرەوە ٦،٢ م .

بەرزی ئاوەکە لە بەردەم سەدەکە ١٠٠ م و لە ئاستی دەریاوە ٥١١ م ، بەرزی لوتکەی سەدەکە لە ئاستی دەریاوە ٥١٦ م . دریژی نیوەتیرەی کەوانەکە لە روی پیشەوەی ١٢٠ م.

- کوی گشتی تیچوی هەمو سەدەکە و پاشکوکانی و کارە تەواوکەرەکانی گەیشتوتە ۲۳ ملیون دینار.
- عیراق لە بنیاتنانی بەنداوی دوکان چەند مەبەستیکی هەبو:
۱. کوکردنەوەی ئاوی بارانی وەرزی زستان و بەفراوی بەهارو، بە کارهینانەوەی لە وەرزی هاوین و پایزو کاتی وشکی دا.
۲. نەهیشتنی مەترسی لافاوی بەهارانی زی ی بچوک.
۳. بەرهەمهینانی وزەی کارەبا.
٤. پەروەردە کردنی ماسی و مەلی ئاوی.
٥. کشتوکوزار.
- دریژایی ئستیلی ئاوی دوکان ٤٠ کم و پانایییەکەی ٢٠ کم ە.
ئەو کاتەی بەرزیی ئاوەکە لە ئاستی دەریاوە ئەگاتە ٥١١ م، ئستیلەکە ٦,٨ ملیار م٣ ئاوی تی دا کو ئەبیتەوە و رویەرەکەی ئەبی بە ٢٧٠ کم ٢.
بەشیکی ئاوەکە پیی ئەوتری «ئاوی مردو» چونکە بو «ترسبات» بە کاردی و ئەکەویتە ژیر ئاستی ٤٦٩ م و ئەگاتە ٧,٠ ملیار م٣. بەشەکەی تری کە لە نیوان ٤٦٩-٥١١ م دایە و ٦,١ ملیار م ٣ ئەبی پیی ئەوتری «ئاوی زیندو» چونکە سودی لی وەرئەگیری.
بەشی لە ئاوی ئستیلەکە ئەبی بە هەلم و بەشیکی تری بە ناخی ئەرزدا ئەچیتە خواری، بەلام ئەمە لە چاو زوریی ئاوی گومەکەدا شتیکی کەمە.
ئەم ژمارانە بە پی ی سال و زور و کەمیی ئاوەکە ئەگورین.
- لە دامینی سەدەکەدا ٥ گونجی ئاسنین بو بەرهەمهینانی وزەی کارەبا دانراوە. تیرەی هەر گونجیکیان ٣,٦٥ مەترە، ١٢٠ م٣ /س ئاوی پیا ئەروا و، توربایینیک و جەنەرەیتەریکی تی دا دانراوە، بە هەر پینجیان توانای بەرهەمهینانی ٥ X ٨٠ = ٤٠٠ میگاوات کارەبایان هەیە.

*

ئەگەر روژی لە روژان کورد دەسەلاتی هەبو قازانجی لەوەدایە: ئستیلەکەی دوکان لە ئاو خالی بکات و، ئەو ئەرزانەی ژیرئاو کەوتون بو کشتوکال بە کار بهینی و، هەمو داوودەزگاکانی بەنداوەکە بکاتە پروژەی توریستی. بە دریژایی زی چەندین جیگای تر هەیە بو کشتوکال کەمتر بەکار ئەهینرین، بەلام ئەتوانری بو کوکردنەوەی ئاو سودیان لی وەربگیری.

لە سەردەمی شیخ مەحمودا دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەشداری شورشەکانی کورد بون. شیخ مەحمود، دوای ئەوەی سلیمانی بە جی هیشتوە، ماوەیەک لە ئەشکەوتی «جاسەنە» بوە و، بارەگای سەرکردایەتی ئوردوی کوردستان و، چاپخانەکەی سلیمانی بو ئەوی گواستوتەوە. ٣ ژمارەکەی «بانگی هەق» لە ئەشکەوتی جاسەنە چاپ کراوە. ئەمەش یەکەمین چاپخانە و روژنامەی ئەشکەوت بوە لە میژوی کوردا. دوای ئەوەی ئینگلیز جاسەنەی بوردومان کرد و ئەشکەوتەکەی گرت، شیخ مەحمود کشایەوە دولی جافەتی. فروکەی ئینگلیز چەند جاری بوردومانی ناوچەکەی کردوە و، زەرەری گیانی و مالی لی داون. هەر لەم ناوچەیەدا بوە وەفدیکی شیخ مەحمود و وەفدیکی حکومەتی عیراق، بو گفتوگو یەکتری ئەبینن. یەکی لە ئەندامانی وەفدی حکومەت لە ئەندامانی وەفدی کورد ئەپرسی: «ئیوە دەریاتان نیە. چوار دەورتان بە دوژمن گیراوە. ئەگەر بون بە حکومەت بە کوی دا هاتوچو ئەکەن». یەکی لە ئەندامانی وەفدەکەی شیخ مەحمود ئەلی: «لە حکومەتی ئیسویچەرە (سویسرا) ئەپرسین بە کوی دا هاتوچو بکەین»

لە دەسپیکردنی شورشی ئەیلول دا ئەم ناوچەیە بو بە یەکی لە بنکە سەرەکییەکانی تا لەت بونی پارتی، بارەگای مەکتەبی سیاسی و، لقی سلیمانی لە ئەشکەوتەکەی «مالومە» بو، تا ئاشبەتالیش بارەگای هیزی رزگاری لە «سەرگەلو» بو. بەو هویەوە ناوچەکە زورجار بوردومان کراوە. هوشی کوردایەتی لە ناو دانیشتوانی ناوچەکەدا بە هیز بو.

کاتی خوی کاکەحەمەی تەلان سەروکی جافەکانی ئەم ناوچەیە بوە و، دوای ئەوەی لە سەرەتای شورشی ئەیلول دا لە دەربەندی بازیان ئەو کوژراوە، کویخا سمایلی برای جیگای گرت بوەوە. کویخا سمایل لە شورشی ئەیلول دا پیشمەرگە بو، دوای ئاشبەتال دور خرا بوەوە بو «روطبە» لە خواروی عیراق. پیوەندی خیلەکیی هیشتا لە ناویان دا ماوە.

سەرەتای شورشی ئەیلول هەندی لە خەلکی دولی جافەتی پیشمەرگە ئەبن و، ئەوانیش لە سەنگەرگرتنی ناوچەکانی کانی سارد و ریگای دوکان و دەربەندی بازیان دا بەشدار ئەبن. کە فروکەی عیراقی دیتە سەریان و بوردومانیان ئەکا، پلاوەی لی ئەکەن. ناحەزەکانیان بو گالتە پی کردن، بالورەیەکیان بو هەلبەست بون، ئەیان وت:

یا شیخ سمایلی عەودالانێ
لاقم درێژکەی بو غاردانێ
زو بگەمەوە یاخییانێ
شەرم پێ ناکرێ لە گەڵ ئاسمانێ

بۆ یەکەمین جار، لە تەمموزی ١٩٦٣ دا من ئەم ناوچەیەم دی بوو. بەعس لەو کاتەدا بەو پەڕی دڕندایەتییەوە خەریکی هێرش بوو بۆ سەر کوردستان. ئەو کاتە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی و بارەگای لقی سلێمانی لە ئەشکەوتەکەی مالومە بوو. ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی و، عەلی حەمدی لێپرسراوی لقی سلێمانی بوو. ئەو زەمانە من خوێندکار بووم لە زانستگای بەغداد، لە سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووم، دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە بەغداوە هەڵات بووم بۆ هەولێر و، بە دەشتی هەولێر و کۆیەدا گەڕابوومەوە ئەم ناوچەیە.

بۆ دووەمین جار، لە شوباتی ١٩٦٤ دا سەردانی ئەم ناوچەیەم کرد بوو. لەو ساڵەدا کۆنگرەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان مان لە مزگەوتەکەی چوخماخ دا بەست. لە سەرانسەری عیراقەوە نوێنەری قوتابیانی کورد بەشدار بوون، تەنانەت لە شارەکانی خوارووی عیراقەوە وەکو نوعمانیە، قەڵەمصالح و عەمارە نوێنەری ڕێکخستنەکانی یەکێتیی قوتابیان هات بوون. عەلی حەمدی و مەحمودی حاجی توفیق لە کردنەوەی کۆنگرەکە دا بەشدار بوون. ئێمە لە کۆنگرە بووین، کە ڕاگرتنی شەڕ لە نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی عیراق دا ڕاگەیەنرا و، گفتوگۆی بارزانی - عارف دەستی پێ کرد. ئەوەش سەرەتای لەت بوونی پارتی و، هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ بوو.

لەوساوە تا ئێستا ناوچەکە هەندێ ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات بوو. بە تایبەتی ئەوسا ناوچەکە دارودەوەنی زۆر زیاتر بوو. دوڵەکە داری زۆرتری تیا بوو، ئێستا ڕووت بوو بوو. بەروبومی ئابووری ناوچەکە کەم و، ئاستی گوزەرانی دانیشتوانی نزم بوو. «خەڵوز کردن» لە کۆنەوە یەکێ لە پیشە پڕ دەرامەتەکانی خەڵکی ناوچەکە بوە. خەڵوزەکانیان لە بازارەکانی سلێمانی و کەرکوک دا ساخ کردوتەوە. خەڵوز داری ناوچەکەی کەم کرد بووەوە.

*

سەرەتای شۆڕشی حوزەیران ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە بوبون بە پێشمەرگە. کوێخا عەبدوڵلای چوخماخ، عەبدولقادری هەڵەدنی، سەلیمی قەڵەم پاشا، فەقێ سمایلی یاخیان، حاجی عەزیزی قامیش، حاجی سەلیمی قامیش... ئەمانە زۆریان لە سەر داوای عەلی عەسکەری چەکیان هەڵ گرت بوو، بەڵام کەمال کەرکوکی و شێرکۆی شێخ عەلی سەرگەڵو کە ئەندامی ق م بوون، لە ئێرانەوە دێنەوە و، چوبونە بن کلیشەیانەوە هەندێکیان، بە نامەی ئیدریس و، بە پارە و، بە پلەی سیاسی و پێشمەرگایەتی بەرز، تەفرە دابوون کرد بویانن بە قم لەوانە: فەقێ سمایلی یاخیان و سەلیمی قەڵەم پاشا.

جەیشی عیراق چەند لەشکرکێشییەکی بۆ سەر ناوچەکە کرد بوو. هێرشەکانی

جەیش یەک لە دوای یەک بەردەوام بو. جەیش لە هەرجی یەک نشکا، یا هیچی دەس نەکەوت، تولەی لە خەلک ئەکردەوە. لەم هیرشانەدا چەندین هاوولاتی لە گوندەکانی: شارستین، باخیبان، سیدەر، هەنجیرە، سیکانیان، دولەبی، خورخورە، قامیش، سەرگەلو، سەرتەنگ... کوشت بو، لەوانە: مەلای گوندی شارستین: حاجی مەلا رەسول مستەفا و، مەلای گوندی خورخورە: مەلا مەحمود ئیسماعیل. لە شارستین ٦ کەیبانو و چەند پیاویکی کوشت بو. لەم هیرشانەدا بە زوری هالیکوپتەریان بە کار ئەهینا. گوشاریکی زوریان خست بوە سەر دانیشتوانی ناوچەکە و، پیشمەرگەکانیان بە تەواوی سەغلەت کرد بو. سەختی ناوچەکە لە بەردەمی جموجولی هالیکوپتەردا کەلکیکی ئەوتوی نەمابو. «لاقی دریژ بو غاردان بەرەو باخیبان» و ناوچە سەختەکان لە بەرامبەر تاکتیکی تازە داهینراوی سورانەوە و هیرش و نیشتنەوەی ئاسانی هالیکوپتەردا کەلکی نەما بو.

لە ئەنجامی ئەم لەشکرکیشیانەدا زوری ئەوانەی سەر بە قم بون بە سەرکردایەتی فەقی سمایلی باخیبان بە کومەل تەسلیم بە رژیم بونەوە. شیرکوی شیخ عەلی بش تەسلیم بوەوە و کەمال کەرکوکی بش گەرا بوەوە ئیران. بە دوای ئەوانیش دا کویخا عەبدوللا و حاجی سەلیم و حاجی عەزیز تەسلیم بونەوە. لە راستی دا ئەمان پیر و بە ساڵا چو بون، فیری ئەم جورە پیشمەرگایەتیە نەبوبون و، بەرگەی ئەو زەحمەتی و شاخەو شاخەیان نەئەگرت، دوای تەسلیم بونەوەشیان بە دلسوزیی مانەوە، گەنجەکانیان هان ئەدا بچن بە پیشمەرگە و، خزم و عەشیرەتەکانی خویان هان ئەدا هاوکاری لە گەل پیشمەرگە بکەن.

*

من کە گەیشتمە ناوچەکە هەمو فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکان و، کادرەکانی هەریمەکەم بانگ کرد.

هەندی لە فەرماندەکانی هەریمەکە لە گەل خوم گەرا بونەوە، لەوانە: عەبدولقادر هەلەدنی، حاجی مەحمودی گەورەدیی، عەلی ئامەخان، عوسمانی قالە منەوەر، کەریمی دادە مەنە... ئەوانی تریشم بانگ کرد. وردە وردە هەمویان پەیدا بون: سەلاح سەعید «چاوشین»، جەمالی عەلی باپیر، مەحمود «نەبەز»، غەفور سەعید «دەرسیم»، حەمەی مامە سەلام، جەلالی کویخا عەبدوللا، ئیسماعیل گەورەدیی، عەلی مام ئەحمەد و، مام ئەحمەدی حاجی محەمەدی قەرەتەپە.

هەریمەکەم گیروگرفت و کیشەی قولی تی دا بو.

– ئەو ماوەیەی هەمو بەرپرسەکان لە پرادوست بون. ئەمان بە ئارەزوی خویان کاریان کرد بو. کەسیان کاغەزی ئەوی تریانی نەخویند بوەوە. بەرەللایی و پاشاگەردانی

بلاو بوبوەوە. بە زور و بە بیانوی پوچ پارەیان لە خەلک سەند بو. لە هەندی جیگا بە بی سوچ و تاوان لە خەلکیان دا بو. هەندیکیان سەرسەریتییان کرد بو و، بە ئاشکرا عارەقیان خوارد بوەوە. ئەمەش بو ناوبانگی پیشمەرگە و یەکیتی خراپ بون.

- یەکەی پیشمەرگایەتی لە یەک نەئەچو، بە گویرەی هەر فەرماندەیەک جیاواز بو، هەندیکیان زور و هەندیکیان کەم بو. لە سەر پلە و پایە ملمەلانی یان ئەکرد و، زوریان ئەیانویست بە فەرماندەی کەرت ناو ببرین و، کەمیان هەبو ئامادە بی ناوی فەرماندەی مەفرەزە بی. هەر یەکەیان ئەیویست خوی بە تەنیا بسوریتەوە و، چاوی لیپرسینەوەی کەسیکی لە خوی سەروتری لی دیار نەبی. ناوچەکە پر بوبو لە مەسئول.

- پیشمەرگەکان و فەرماندەکانیان تیکەلاو بون لە خەلکی سلیمانی و، خەلکی ناوچەکە. شارییەکان و لادییەکان ئاکوک بون و، ئامادە نەبون سەر بو یەکتری داینەویان. گالتەیان بە یەکتری ئەکرد و، کارەکانی یەکتریان تیک ئەدا. هەردوکیشیان بو جولانەوەکە پیویست بون. بی پیشمەرگەی خوجیی کارکردن لە ناوچەکەدا دژوار بو.

- هەندی لە فەرماندە و کادرەکان ئەندامی کومەلە و هەندیکی تریان ئەندامی بزوتنەوە بون. هەریەکەیان هەولی ئەدا پیشمەرگە و ئەندام و لایەنگر بو ریکخراوەکەی خوی زیاد بکا. بو ئەمەش زور جار لە ناو خەلک دا دژی یەکتری ئەدوان و، ریگای ناراستیان ئەگرت بو بەهیزکردنی خویان و لاوازکردنی لایەنەکەی تر.

- قم لەم ناوچەیەدا کز بوبو، بەلام هیزیکیان لە شارباژیر و هیزیکیان لە سورین مابو. جاروبار بو راوورووت ئەپەرینەوە بو ئەم ناوچەیەش.

حاجی حاجی ئیبراهیم دانرا بو بە جیگری من و، رابەری سیاسی هەریم. ئەویش کارەکەی خوی بە دل نەبو. نەهاتە هەریمەکە و، لە ناوچەی نوکان مایەوە. زوری کارەکان کەوت بوە سەر شانی خوم.

هەولیکی زورم دا ئەم گیروگرفتانە چارسەر بکەم. تەبایی لە نیوان کومەلە و بزوتنەوەدا دروست بکەم. چەند جاری کوبونەوەم بە فەرماندەکان کرد و، چەند جاریکیش کوبونەوەی گشتیم بە زوری پیشمەرگەکان کرد. ئەو کاتە، بو خوپاراستن لە هیرشی کتوپری هیزەکانی جەیش، ئەبو شەوەکی لە دی دەر بچین و، بچینە شوینیکی نهینی قایم تا ئیوارە خومان حەشار بدەین. لەم ماوەیەدا بە کوبونەوە و قسە و باسی سیاسی گشتیەوە خەریکم ئەکردن. زور جاریش هەوری تیرە و تاریک و لیزمەی باران و کریوەی بەفر، هەلی بو ئەرەخسانین، بە ئاسودەیی و ئازادی بە روژ، لە ناو ئاواییەکان دا بمینینەوە.

سالی ۱۹۷۷ مان بە ری کرد. شەوی سەری سال لە مزگەوتەکەی چوخماخ بوین.

بو ئیمه ئەمشەویش وەکو شەوەکانی تر بو. «کریسمس» و «سەری ساڵ» لای خەڵکی چوخماخ و، لای زوری پیشمەرگەکان هیچی نەئەگەیاند.

ئەوەندەی فریا کەوتم گوندەکانی چوخماخ، مالومە، هەلەدن، چالاوا، گویزیلە، یاخسەمەر، قزلەر، قەیوان، خەمزە.. گەراین. لە گەڵ ریش سپی و پیاوماقولی ناوچەکە دانیشتم. دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی باش بون، بە روی خوشەوە پیشوازییان لی ئەکردین و، لە هەمو رویەکەوە هاوکارییان ئەکردین. بە دلسوزییەکی قوڵ و پەروشیکی بی ئەندازەوە پشتیوانییان لە جولانەوەکە ئەکرد. هەر کاریکی سەخت و خەتەرم پی ئەسپاردن، بە تایبەتی هاتوچوی سلیمانی، بی دودلی و سلەمینەوە بویان ئەنجام ئەدام.

حاجی قادری مالومە، یەکی لە کەسایەتیە ناسراوەکانی ناوچەکە بو. پیاویکی کوردپەروەر و، دلپاک و قسە خوش بو. بە ناوبردنی وشەی «دیگەڵ» تورە ئەبو. هەر کس بیوتایە: «دیگەڵ» جنیویکی بە دایکی ئەدا، ئەو کەسە هەر کەسیک بوایە و لە هەر پلە و پایەیەک دا بوایە. زورجار سەریان ئەکردە سەری تورەیان ئەکرد و، ئەیان وروژاند. هەندی جار دوای جنیودان پەشیمان ئەبوەوە و، لە داخانا ئەگریا. بە گەرانەوەی ئیمە و، گەیشتنی چەکی نوی و، ریکخستنەوەی هیزەکان زور خوشحال بو. لە ماڵەکەی خوی میوانداریی کردین و، بو روژی دوایی چو بو سلیمانی بو ئەوەی ئەو هەواڵە خوشانەیان پی بگەیەنی. لە سلیمانی، بە تایبەتی لە ناو بازار دا، ناسیاوی زوری هەبو.

حامید حەمە ئەمین، گەنجیکی یاخسەمەری، کادری ریکخستن بو لە ناوچەکەدا، ئەندامی کومەڵە بو. خوی بە تەنیا ئەگەرا و، تیکەڵاوی مەفرەزەکان نەئەبو. بو خوپاراستن پشتی بە خوشاردنەوە ئەبەست. چەند کادریکی لەم بابەتەمان هەبو. ئەمەش کاریکی راست نەبو. ئاموژگاریمان کرد بو خوی بە تەنیا نەبی و، بو سەلامەتی خوی هەمیشە لە گەڵ یەکی لە مەفرەزەکان بی، ئاموژگارییەکەی لە گوی نەگرت بو. لە هیرشیکی جەیش دا بو سەر ناوچەکە گیرا. حوکمی ئیعدام درا و، لە موسڵ ئیعدام کرا. لە «زیندانی موسڵ»ەوە چەند نامەیەکی نوسی بو، نمونەی ئازایەتی بو.

ماموستا عەزیز مەحمود، دانرا بو بە لیپرسراوی لقی کەرکوکی یەکیتی، ئەبو بچیتە بەری قەرەداغ لەویوە کارەکانی ئەنجام بدا. ئەیویست لە پیش دا بچیتەوە بو سلیمانی پشو بدا و هاوریکانی ببینی و، لەویوە بچیتە ناوچەی قەرەداغ. ئەمەم بە هەل زانی نامەم بو هەندی لە هاوری کونەکانم، لەوانە شازاد و، جەمال تاهیر نوسی. هەندی «مارک» ی ئەلمانیم لە مامجەلال وەرگرت بو بو خەرجی هەریم دام بە عەزیز بیدا بە شازاد بومان بگوریتەوە.

*

زمرده و دەرزی

ئەبو هەمو پێشمەرگەکان پێش ئەوەی دنیا روناک ببێتەوە لە خەو هەستن، نانی ٣ ژەم لە گەڵ خۆیان هەڵبگرن و، لە ئاوایی دەربچن و، بچن بۆ شوێنێکی قایمی چۆلی نەزانراو، لەویش بە درێژایی رۆژەکە لە حاڵەتی ئامادەیی دا بن بۆ روبەروبونەوەی هەمو روداوێکی کتوپڕ تا ئێواری.

خۆئامادەکردنی ئێواران بۆ چونەوە ناو دێ، ئینجا بڵاو بونەوە و دامەزران بۆ نان خواردن و، کۆبونەوە بۆ دانانی حەراسەت و کەمینی دەوری دێ و، نوستنی پڕ ترس و لەرز و، دیسانەوە کۆبونەوەی شەوەکی بۆ بە جێ هێشتنی ئاوایی بەرەو شوێنێکی چۆلی نەزانراو... دوبارەبونەوەی رۆژانەی هەمان ژیان هەستێکی ناخۆشی لای هەموان دروست ئەکرد. بۆ ئەوەی توشی بێزاری نەبن و لە ژیانی پێشمەرگایەتی وەرز نەبن ئەبو رابەری سیاسی یا کادری ناوچەکە باسێکی سیاسیان بۆ بکا، یا شتێ لە ئەدەبیاتی بەکێتییان بۆ بخوێنێتەوە. سەرەرای ئەوەش، هەندێ کەس پاش ماوەیەک لەم جۆرە ژیانە ماندو ئەبو، ئەگەیشتە بێهودەیی ئەمجۆرە خەباتە. وازی لە پێشمەرگایەتی ئەهێنا.

لە یەکێ لەو هێرشانەدا کە جەیش و جاش بەردەوام بۆ ناوچەی قەرەداغیان ئەکرد، دو پێشمەرگە: یەکێکیان لادێی و نەخوێندەوار و، ئەوی تریان شاری و خوێندەوار، بۆ ئەوەی خۆیان لە هێرشەکە بشارنەوە، پێکەوە بە «شاخی زمردە» دا هەڵئەگەڕێن. پێشمەرگە لادێییەکە ناوی : شاهۆ (حەمەی تەلە) بو، خەڵکی گوندی «دەرەدزێن» بو لە تونی باپای لای دەربەندیخان. هەمو ژیانی خۆی لە شاخ بە سەر برد بو. لە ئاشبەتالەکەش دا نە چو بۆ بۆ شار. خوێندەوارەکە، خەڵکی سلێمانی و دەرچوی کوللیەی ئاداب و، لە رێکخستنی کۆمەڵە بوبو، لە کتێبە سورەکەی «ماوتسیتونگ» دا، چیرۆکی پیاوە پیرەکەی خوێند بوەوە کە چون کێوێکی لە بن هێنا بو. لە گەڵ ئەوەش دا لە شاهۆی پرسی بو: «زمردە بە دەرزی کون ئەکری؟»

شاهۆش وەڵامی دابوەوە: «زمردە چون بە دەرزی کون ئەکری؟»

خوێندەوارە شارییەکە وت بوی: «ئیشەکەی ئێمە وەکو ئەوە وایە زمردە بە دەرزی کون بکەین!»

هەندێکی تر قسەی لەم بابەتەی بۆ شاهۆ کرد بو تا روخاند بوی و، بە یەکەوە چوبون بۆ دەربەندیخان تەسلیم بونەوە. شاهۆ پاش چەند رۆژێ پەشیمان بوبوەوە و گەڕابوەوە شاخ، سەرلەنوێ بوبوە بە پێشمەرگە.

له گهڵ ههمو ئهو ناخوشیبیهدا، ههمیشه ئهوانهی ئههاتن بو پیشمهرگایهتی زورتر بون لهوانهی وازیان له پیشمهرگایهتی ئههینا. هیزهکه تا ئههات زیادی ئهکرد و گهوره تر ئهبو. مهفرهزهکان ئهبوژانهوه و قهرهبالغ ئهبون و، بهری ئهکران بو سنوری چالاکی خویان.

*

دوژمن هیزیکی درندهی مهشق دادراوی گهورهی ههبو. بهلام ئیمه فیرگهیهکمان نهبو پیشمهرگهی نوی مهشقی تی دا بکا. زور لهوانهی ئههاتن بو پیشمهرگایهتی به کار هینانی تفهنگ و ئهرکهکانی پیشمهرگایهتیبان نهئهزانی، چ جای شهر و، هیرش و، خوپاراستن و کشانهوه.

ههمو فهرماندهی مهفرهزهیهک ئهبو وهکو ماموستا پیشمهرگه تازهکان فیری کردنهوه و بهستنهوهی تفهنگ و، پاککردنهوه و، بهکارهینانی بکا. ههروهها فیری ئیشک گرتن و، ریگاروپشتنی شهوانه و روژانه و، دهرچون و وریایی و چاو ههلفستنی بهیانیبان بکا... زور شتی تریش ئهبو خوی له ژیانی روژانه و له تیکهوتن و دهرباز بون و بوسهدا فیر بێ.

*

له کوبونهوهی کومیتهی سهرکردایهتی دا، عومهری حاجی عهبدوللا به فهرماندهی ههریمی قهرهداغ و، ئهنوهری مهجید سولتان به فهرماندهی ههریمی دهشتی کهرکوک دانرا بون.

بهلام ئهنوهر ئهو بهرزکردنهوهیهی به دورخستنهوه دائهنا له ناوچهکه. وهکو خوی ئهیوت: حهزی ئهکرد به پیشمهرگایهتی له شارباژیر بمینیتهوه، نهک بهرزترین پلهی پیشمهرگایهتی له ناوچهیهکی تر بدریتی. له سهر داوای کومهله بو بو به پیشمهرگه و، له سهر پیشنیاری سهرانی کومهلهش، دوای مشتومریکی زور له گهڵ سهرانی بزوتنهوه، دانرا بو به فهرماندهی ههریمی کهرکوک، بهلام ئهنوهر خوی پهروشی هیچ «ئیلتزامیکی» حیزبی نهبو. ههر له شارباژیر مایهوه.

ئهنوهر له جهیشی عیراق دا ئهفسهر بو بو، له شورشی ئهیلول دا بو بو به پیشمهرگه. کوریکی ئازا و دهسپاک و دلسوز بو. بهلام کابرایهکی ساویلکه و کهللهرهق بو. ئهوانهی له گهلی بون به ئاسانی کاریان تی ئهکرد. زوری حهز له ئازارداني خهلک ئهکرد. ئهچو بو ههر دی یهک چهند کهسیکی فهلاقه ئهکرد و ئهشکاند. لای وابو مهسئول بهوجوره ههیبهت پهیدا ئهکا. ههولیکی زورم له گهڵ دا واز لهم خوه خرابه بهینی.

به دریژایی ریگا له گهڵ عومهر پیکهوه بوین، هیچ ئارهزویهکی ئهبو بچی بو

قەرەداخ و کاروباری هەرێمی قەرەداخ وەربگری، تاقەتی لە پێشمەرگایەتی چو بو ئەیویست ڕێگە بدری بچی بو دەرەوە. حەزی ئەکرد جاری هەر لە گەڵ من بمێنێتەوە. ئەوی ڕاستی بێ بو من پارمەتیدەرێکی باش بو. لەو ڕووەوە نامەمان بو کاک ئارام نوسی و، من بیروراکانی خومم دەربارەی هەلومەرجی کوردستان و جولانەوەکە بو ڕون کرد بوەوە و، هەولم دابو زور لەو قسە ناراستانەی پی یان گەیاند بو، ڕاست بکەمەوە. وەلامی نامەکانی بو نوسینەوە و، مەفرەزەیەکی نارد بو بەشی هەرێمەکەیان لەو چەکانەی هێنا بومان بویان بنێرین. مەفرەزەکە بریتی بو لە شەماڵ (شێخ محەممەدی شێخ مەحمودی باخ)، ڕوستەم (حەسەن حەمید) و ئازد محەممەد غەریب و، چەند پێشمەرگەیەکی تر. بەشەکەی خویان وەرگرت و گەڕانەوە. لە گەڵ کاک ئارام وا ڕێک کەوت بوین، دوای ڕێکخستنەوەی کاروباری هەرێمی قەرەداخ بیەرێتەوە بو لای ئێمە و ماوەیەک بە یەکەوە بین.

*

سەرەرای تەروتوشی هەوا، ناوبەناو هێزەکانی جەیش هێرشیان ئەهێنایە سەر گوندەکان و بو دوزینەوەمان بە هالیکوپتەر دائەبەزین. ئێمە هەولێکی زورمان ئەدا توشی شەر و پێکادان نەبین. بو ئەو مەبەستە حسابی سنوری جولانی لیواکانی ناوچەکەمان کرد بو. لە سنوری هەر لیوایەک دا چەند روژێکی کەم زیاتر نەئەمایەنەوە. هەر کە ئەمان زانی زانیاری تەواو گەیشتوتە ئیستیخباراتی لیوا و کاتی پەلاماردانمان هاتوە، ئەمان گویزایەوە بو سنوری لیوایەکی تر. بەمجورە خومان لە ڕوبەروبونەوە ئەپاراست. لە گەڵ ئەوەش دا لە هەندی شوین هەندی هێزی پچوکمان تی ئەکەوتن و توشی شەر ئەبون.

*

کاروباری هەرێمەکەم تا ئەندازەیەک ڕێکخستەوە. فەرماندەی کەرتەکان و مەفرەزەکانیان و، سنوری کارکردن و، دەسەلاتەکانیانمان دیاری کرد. خومان ئامادە کرد بەرەو شارباژێر بچین.

جادەی سلێمانی - چوارتا ناوچەی جافەتی لە ناوچەی شارباژێر جیا ئەکردەوە. شارباژێر خوی ناوەکەی سەیرە: «شار» و «باژێر» هەردوکیان یەک مەعنایان هەیە. پی ئەچی کاتی خوی بازاری کرین و فروشتن لەم ناوچەیەدا بوبی، بە تایبەتی چونکە سەردەمێکی درێژ بنکەی ئەمارەتی بابان لە قەلاچوالان بوە.

ئێوارەیەکی درەنگ چوینە «سەرەمەرگ» و، شەو بە ناو «تەگەران» دا لە جادەکە پەرینەوە بو ناوچەی شارباژێر. ڕوناکی چراکانی شاری چوارتا، ناوەندی قەزای شارباژێرمان، لی دیار بو. لە سەردەمی ئەمارەتی بابان دا «قەلاچولان» و، لە سەردەمی تورک دا

«سیتەک» ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی شارباژێڕ بوو. دوای تیشکانی شۆڕشی شێخ مەحمود، ئینگلیز ناوەندی قەزاکەی گواستوتەوە بۆ «چوارتا».

پێوەندی کۆمەڵایەتی لە شارباژێڕ پێشکەوتوتر بو لە چاو ناوچەکانی تردا. تیرە یا هۆزێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو لە ناوچەکەدا زاڵ نەبو. بەڵام ژمارەیەکی زۆر بنەماڵەی شێخ لە هەندی لە دێهاتەکانی دا هەبون. زۆری جوتیارەکان خاوەنی زەوی و رەز و باخی خۆیان بون و، میوە بەرهەمێکی سەرەکییان بو.

شاباژێڕ نزیک بو لە سلێمانییەوە. هاتوچوی خەڵکی ناوچەکە لە گەڵ شاری سلێمانی دا لە کۆنەوە بەهێز بو، هەندی لە گوندەکانیشیان لە چاو گوندەکانی هەندی ناوچەی تردا پێشکەوتوتر و خۆشتر بو، خوێندەواریشیان زۆرتر بو. لە هەندێکیان دا قوتابخانە، تیمارخانە، حەمام، دوکان و چاپخانەی تی دا بو.

لە شارباژێڕ بە پێچەوانەی ناوچەی جافەتییەوە پێشمەرگەی خۆجێی مان کەم بو. زۆری فەرماندە و کادرەکانی خەڵکی سلێمانی خۆیان بۆ ئەم ناوچەیە ئەکوتا و، لەم ناوە کۆ بوبونەوە. دەستیان وەرئەدایە کاروباری یەکتریەوە. بۆ ئەوەی خۆیان جێگەیان پێ لێژ نەبێ، حەزیان نەئەکرد خەڵکی ناوچەکە بێن بە پێشمەرگە و، لە پلەی پێشمەرگایەتی دا سەر بکەون. چنگنیان، بزەینان، عازەبان، گورگەدەر، ویلەدەر و، بناویلە... لەو گوندانە بون کە بە زۆری پێشمەرگەکانی سلێمانی لی کۆ ئەبونەوە. شایییەکەی «بناویلە» مەسەلێکی مەشهورە. پیرەمێرد لە «گاڵتە و گەپ» دا بە درێژی باسی کردوە.

ناوچەکە چەند شاخێکی گەورەی لی یە.

گوندەکانی چنگنیان، نودێ، باراو، حاجی مامەند، پارمزان، دولپەمو، هەرمێلە و هەولۆ لە دەوری شاخێکی بەرزدا دروست کرا بون، ناوەراستەکەی گەڵی بو. «گەڵی» دێ یەکی چەند ماڵی بو بە هۆی هەرەسی بەفرەوە ویران بوبو. شاخەکە دارو دەوەنی چڕ و پڕی لی ما بو. دانیشتوانی هەندی لەم گوندانە هەموی شێخ بون. زانای بە ناوبانگ: «شێخ مارف» لە گوندی نودی لە دایک بوە.

شاخێکی تریان «کەتو» ە. کەتو شاخێکی دابڕاوە لە شاخەکانی تر، بەڵام سەخت و پڕ لە دارە. لە پەنجاکان دا مەکۆگای خولە پیزە و چەتەکانی بوە.

شاخێکی گەورەی تر «کوڕەکاژاو» ە. وشەی «کوڕ» لە ناوی چەند جێگای تریش دا بەر گوی ئەکەوی، وەکو : کوڕە کاژاو، کوڕە داوی، کوڕ کوڕ، کوڕپەس، کوڕی گەپلە، کوڕەک...

*

قم له ناوچەی سلیمانی

هیزەکانی قم کشابونەوە بو سیوەیل. خویان لە گوندەکانی شاخی سورکیو قایم کرد بو. لە مەلبەندەکانی سوران دا لە چەند جیگایەکی کەم مابون یەکیکیان ئەم ناوچەیە بو. عەبدولمەلیک عەلی عوسمان و ستاری سەعید خەلەف لە بەرپرسە ناسراوەکانیان بون. ستار لە سەر داوای کومەلە و عەبدولمەلیک لە سەر داوای بزوتنەوە هات بونە شاخ و بو بون بە پیشمەرگە. لە سەر ئەوەی پلەی بەرزی لیپرسراوەتییان نەدرا بویە؛ وازیان لە یەکیتی هینا بو، بوبون بە قم.

ئەم تاقمە جگە لەوەی لە روی سیاسییەوە لە گەل ئیمە ناکوک بون، وەکو باندیکی ناسیاسی جەردە رەفتاریان لە گەل خەلک ئەکرد. خەریک بون تابروی شورش و پیشمەرگایەتییان ئەبرد. پارەی زوریان لە خەلک ئەسەند. ریگایان بە کاروانی قاچاغچی ئەگرت. لە خەلکیان ئەدا. خەلکیان ئەکوشت. لەوەش خراپتر دەستدریژییان ئەکردە سەر ناموسی خەلک و، لە مالی هەندی لە پیاوماقول و ریشسپییەکانی ناوچەکەدا بە تونڕی بەزمی خواردنەوە و رابواردنیان ساز ئەکرد.

ئیتر کاتی ئەوە هات بو چارسەر بکرین.

چەند نامەیەکمان بو نوسین کە: یان بگەرینەوە ریزی یەکیتی، یان ناوچەکە بە جی بهیلن برون بو بادینان، یاخود خویان بو شەر ئامادە بکەن. بە دریژی باسی رەفتاری قم مان بەرامبەر پیشمەرگەکانی یەکیتی و، کوشتنی ئیبراهیم عەزۆ و، هاوریکانی و حەسەن خوشناو و هاوریکانی مان بو نوسی بون. هیزەکانیشمان کو کردەوە و سازمان دان بو پەلاماردان و راونانیان. کەریمی دادە مەنە دوستی ستار بو نامەکانی برد و هەندی راسپاردەشی پی بو پیبیان بلی. ستار و هیزەکەیان کوبونەوەی ناوخویان کرد بو بریاریان دا بو تەسلیم ببنەوە.

کەریم وەلامی نامەکانی هینایەوە. ستار نامەی بو چەند کەسی نوسی بو لەوانە: مامجەلال، عەلی عەسکەری، طاهیری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا و، من و چەند ناسیاویکی پیشمەرگەی. لە نامەکانی دا زور بە کورتی و دوستانە نوسی بوی: باوەری بە قم نیە تا لە سەر ئەوان شەر لە گەل یەکیتی بکات، بە جوانیشی نازانی بیتە ناو یەکیتییەوە، لە بەر ئەوە مەیدان بو پیشمەرگەکانی یەکیتی چول ئەکات، خوی و هەمو ئەوانەی بە قسەی ئەکەن تەسلیم ئەبیتەوە. پەیوەندییان لە گەل حکومەت کرد. چەند هالیکوپتەریکیان بو ناردن بو ... لەوی خوی و عەبدولمەلیک و هەمو پیشمەرگەکانی لەگەلیان بون بە کومەل سواری هالیکوپتەر بون رویشتنەوە.

ئەم خەمەمان بە بێ ماندو بون لە کوڵ بوەوە.

عەلی چوارتایی زۆر خۆی لێ دزی بونەوە و نامەی بۆ ئیمە نوسی بو کە: ئەو نایەوێ تەسلیم بە ڕژێم ببێتەوە و، ئەیەوێ بێتە ناو ڕیزی پێشمەرگەکانی یەکێتیەوە خزمەتی گەلەکەی بکا. جەمالی عەلی باپیرمان نارد بۆ پێشوازی و بەخێر هێنانی. عەلی چوارتایی هاتە ناو پێشمەرگەکانی یەکێتیەوە. پێشمەرگەیەکی لێوەشاوە و وریا بو. شارەزایی زۆری لە هەڵگرتنەوە و دانانی مین دا هەبو. کرایە فەرماندەی کەرت و دوایتر بە فەرماندەی تیپ. بە دڵسۆزی و ئازایەتی ئەرکی قورسی پێشمەرگایەتی بە جێ هێنا تا شەهید بو.

جگە لەم تاقمەی تەسلیم بونەوە کە نەتوانرا بە هێزی سەرەکی قەم بژمێردرێن، دو تاقمی تریان مابون: تاقمێکیان پاشماوەی ئەوانەی نۆکان بون لە دەوروبەری سەردەشت خۆیان پەنا دابو. ئەوی تریان بە سەرکردایەتی نادر هەورامی بنکەیان لە شاخی سورێن بو، کە تەنگاویش ئەبون ئەچونە دزلی و مەریوان لە ئێران.

هێزەکانی هەرێمی پشدەر چونە سەر ئەوانەی ناوچەی سەردەشت. پاش کەمی تەقوتوق هەندێکیان گرتن و هەندێکیان چون بۆ قوڵایی ئێران و، ئەوانی تریان هاتنە ناو ڕیزی یەکێتیەوە. هەڵوەشاندنی هێزەکەی نادر هەورامیش بە هەرێمەکەی کاک طاهیر سپێردرا بو. بەڵام کاک تاهیر هێشتا لە لای م س بو نەگەرا بوەوە هەرێمەکەی خۆی.

*

فوفوی ئەدەبی کوردی

هەندی کەسم ڕاسپارد بو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی و عەرەبیەکانمان بو بنێرن. هەمو ڕۆژ چەند جاری ئوتومبیل لە سلێمانیەوە ئەهات بو گوندەکانی شارباژێر، بە تایبەتی بو چنگنیان. ئەمە لە لایەکەوە قازانجی هەبو، ئاگاداری هەواڵەکانی سلێمانی ئەبوین و، پێویستیەکانیان بو ئەهێناین. لە لایەکی ترەوە زیانی هەبو چونکە هەواڵەکانی ئیمەش بە ئاسانی و خێرایی ئەگەیشتەوە حکومەت.

ڕۆژێکیان توپەڵی گۆڤار و ڕۆژنامەم بو هات بو. یەکێکیان گۆڤاری کوردی «بەیان» ی بەغدایی بو. لە لاپەڕەی دوایەرگی گۆڤارەکەدا نوسینێکی کورتی تی دا بڵاو کرا بوەوە بە بونەی کوچی دوایی کابرایەکەوە، وەکو نوسەرێکی گەورە و ڕۆژنامەوانێکی زل و ئەدیبێکی مەزنی... کورد زوریان هەڵ دا بو. من ئەو ناوەم هەرگیز نە بیست بو. لە دڵی خوما وتم: ڕەنگە ئەو ماوەیەی من لە کوردستان دور بوم، ئەم و چەند کەسی کە هەڵکەوت بن و، من نەیان ناسم. کوڕەکەمان هەمویان خوێندەوار بون، لێم پرسین: ئەم

نوسەرە گەورەیە کی یە مردوە؟ کەسیان نەیان ئەناسی و نەیان بیست بو. یەکیکی قسە خوش لە کورەکەدا بو، سەیری وینەکەی کابرای کرد و، نوسینەکەی خویندەوە، وتی: «ئەزانی ئەمە لە چی ئەچی؟». وتم: «لە چی؟» وتی: «لە سەر دەرگای هەندی «مەلها» نوسراوە: «الفنانه العالمیه المشهوره والراقصه الساحره المعروفه... فوفو. بەلام فوفو کی یە؟ خاوەنی مەلهاکە هەر خوی ئەیناسی. ئەمیش لەو بابەتەیە!»

*

پولیس و پیشمەرگە

شەویکیان لە حاجی مامەند بوین. یەکی بو لە ساردترین شەوەکانی ئەوسالە. ۲۰۰ کەس زیاتر بوین. لە مزگەوتەکەدا نوست بوین. لە ٤ لاوە حەرەسمان دانا بو. منیش هەر لەوی نوست بوم. درەنگانی لە کاتی گورینی ئیشکگرەکان دا لە مشتومری هەندی پیشمەرگە خەبەرم بوەوە. پرسیم: «چیە؟». یەکیکیان وتی: «یەکی لە حەرەسەکانمان دیار نیە!». هەستام کەوتە پرسین و گەران. چەند مەفرەزەیەکم بە ریگاکان دا نارد دوای حەرەسی هەلاتو بکەون. فریای نەکەوتن. یەکی لە باشترین تفەنگەکانیشی لە گەل خوی برد بو. دوای لیکولینەوە دەرکەوت ئەمە پولیس بوە چەند روژی لەوەو پیش هات بو بو پیشمەرگایەتی.

زور گەنج ئەهاتن بو پیشمەرگایەتی لەوانە هەندیکیان منال و هەندیکیان پولیس بون. لەو کاتەدا گەنجی عیراقی کە تەمەنی ئەگەیشتە ۱۸ سالی لە باتی بەجیهینانی خزمەتی عەسکەری ئەیتوانی ببی بە پولیس. ماوەی ٤ سال بە پولیسی ئەمایەوە. معاشیکی باشتری وەر ئەگرت و حسانەوە و پشودانیشی زورتر بو. کارەکەشی بە خزمەتی عەسکەری بو حساب ئەکرا. هەر پولیسیک ئەبو بە پیشمەرگە و تسلیم ئەبوەوە دەسبەجی «تسریح» یان ئەکرد. هەندی پولیس ئەم دەرفەتەی بە هەل ئەزانی ئەهات ماوەیەکی کورت پیشمەرگایەتی ئەکرد و لە پر بە دزییەوە تسلیم ئەبوەوە بو ئەوەی تسریحی بکەن. هاتوچوی ئەم پولیس ـ پیشمەرگانە کاریکی خراپی لە وورەی پیشمەرگەکانی تر و لە ریکخستنی پیشمەرگەیی مەفرەزەکانیان ئەکرد. ناچار بوین چەند مەرجیکی قورس بو وەرگرتنیان دابنیین.

هاتنی خالید سەعید و شیخ حسین

لە گوندی حاجی مامەند بوین لە نزیک بەرزنجە نامەیەکی د خالیدمان پی گەیشت. د خالید و حسین بابەشیخ و پیشمەرگە بادینییەکان گەیشت بونە شوینیکی نزیک ئیمە. پیشمەرگەکان دانیان بە خویانا نەگرت بو لە برادوست بیننەوە. پییان وابو

زستان له هەمو هێزەکانی ینک داتەبرێن لە ژێر گوشاری سروشت و تم دا پەرێشان ئەبن. بریاریان دا بو بو بەسەر بردنی زستان بینە ناوچەکانی هەولێر.

چولکردنی برادوست هەڵەیەکی کوشندە بو. یەکیەتی لە بەهاردا نرخەکەی دا و، توشی کارەساتی هەکاری بو.

لە ناوچەی خوشناوەتی هێزێکی زوری جەیشیان لە سەر کو بوبوەوە. کشابونەوە کوسرەت لەویوە بریاریان دابو لە گومی دوکان بپەرنەوە بو ناوچەی سلیمانی و، بە تایبەتی بو سنوری هەرێمەکەی من. نەیوانی من لە گەڵ هەردوکیان زور خوش بو، هەردوکیان بە دوستایەتی من خوشحال بون. لە دەرەوەی گوندی حاجی مامەند پێشوازیەکی گەرمیان لی کردن. بە تایبەتی چونکە شێخ حسین و پێشمەرگە بادینیەکان بو یەکەم جار بو بینە ناوچەی سلیمانی. سەرلەنوی لە گەڵ د. خالید و شێخ حسین یەکمان گرتەوە.

*

پاسوک

لە گەڵ جەلالی حاجی حسین ناسیاویمان ئەگەرایەوە بو سەرەتای شەستەکان. ئەو کاتە هەردوکمان هەرزەکار بوین. تازە شورشی ئەیلول دەستی پی کرد بو. لە خەباتی ژێرزەمینیی سەردەمی «زەعیم صدیق» دا یەکتریمان ناسی. ئەگەرچی دوایتر جیاوازیی هەڵویستی سیاسی بو بە هوی ئەوەی هەر یەکەمان ریبازێکی جیا لەوی تر بگری، بەلام برایەتیەکەمان هەر مابو. تەنانەت لە روداوەکانی ٦٤ دا من کە ناچار بوم خوم بشارمەوە، ماوەیەک لە مالی ئەوان بوم. جەلال بە بیروباوەر نەتەوەیی بو چو بوە ریزی «کاژیک» وە، بەلام بە دلسوزی خزمەتی شورش و بارزانی ئەکرد. «کاژیک» جاران خوی ئاشکرا و، ئەندامەکانی بە ئاشکرا کاریان نەئەکرد، ئەندامەکانی فیری «خوحەشاردان» و «دزە» کرد بو لە ناو داوودەزگاکانی پارتی و بارەگای بارزانی دا. هەولیان ئەدا «شەقاوە» و «پیاوکوژ» لە خویان کو بکەنەوە. لە روداوەکانی ١٩٦٤ - ١٩٦٥ دا دەورێکی خراپیان گیرا و، لە پەنای پارتی و بە ناوی پارتیەوە لە سلیمانی تاوانی گەورەیان دژی هەندی لە شیوعیەکان و، پارتیەکان و، کەسانی نیشتمانپەروەر کرد. لە بەر ئەوە ناوبانگی سیاسی و کومەلایەتی کاژیک باش نەبو.

دوای ئاشبەتال هەندی لە تیکوشەرانی کاژیک بریاریان دابو خویان ریک بخەنەوە. ویست بویان کەلک لە هەڵەکانی رابردویان وەربگرن و، لە سەر بنچینەیەکی نوی و، بە ناو و بیر و ئوسلوبێکی تازەوە بینە مەیدانەوە. «پاسوک: پارتی سوسیالیستی کورد» یان دامەزراند. جەلال یەکی بو لەوانە و، لە گەڵ کومەلە کەوت بونە گفتوگو بو بەشداری لە

شورشەکە دا.

کە شورش دەستی پی کردەوە دوای ماوەیەک جەلال بە ناوی پاسوکەوە هات بوە شاخ و، مەفرەزەیەکی ریکخست بو، لە شارباژیر و شلیر کەوت بوە چالاکی. توانای پاسوک کەم بو. کەم کەس بە دەنگ بیروباوەرەکانیانەوە ئەچو. لە بەر ئەوە هەر بە پچوکی مابوەوە.

دوای چەند سال لە «پارەزان» لە گەل جەلال یەکتریمان بینیەوە. گفتوگوی پەیوەستمان کرد. من پیم خوش بو ئەمجارە پاسوک بە ئاشکرا و بە ناوی خویەوە هاتوتە مەیدانی خەباتەوە، نەک وەکو کاژیکی جاران لە ناو حیزبەکانی ترا دزە بکەن و، لە ریگەی «ئینتەریزم» ەوە کە جوریکە لە «پیلانگیران» مەبەستەکانی خویان جیبەجی بکەن. جەلال تەئکیدی کرد: کە ئەوان سەربەخون. گریدراوی پارتی نین. ناکوکیی یەکیتی و ئیم یان پی ناخوشە و، لەو ناکوکییەدا ئەوان لایەن نین. وتی: جگە لەو مەفرەزەیەکیشیان لە شلیر هەیە، بەختیاری مەجیدخان مەسئولیانە.

منیش بەلینی ریزلینان و هاوکاری و یارمەتی خوی و پیشمەرگەکانیان و حیزبەکەیانم پی دا.

*

شیخان

یەکی لە ناحیەکانی شاباژیر بەرزنجەیە. زوری سادات و شیخانی کوردستانی عیراق و، هەندیکی کوردستانی ئیران، لە خیزانیکی ئەم دی یە کەوتونەتەوە و، بلاو بونەتەوە.

لە سەرانسەری کوردستانی عیراق دا ژمارەیەکی زور شیخ هەیە. شیخەکان بە گشتی ئەکرین بە دو بەشەوە:

- هەندیکیان خویان بە نەوەی پیغەمبەر، لە بەر ئەوە خویان بە «سەید» دائەنین و شەجەرەیان هەیە ئەیانباتەوە سەر یەکی لە ئیمامەکان.

- هەندیکی تریان لە ریگای خوا پەرستییەوە، بە تایبەتی لە ریگەی «ئیرشادی تەریقەت» ی قادری یا نەقشبەندییەوە بون بە شیخ. ئەمانە بە ریچەلەک ناچنەوە سەر پیغەمبەر، بە مانە ئەلین: «شیخی بەرمال».

شیخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی «خانەقا» و، شیخەکانی قادری «تەکیە» یان هەیە. هەردوکیان مورید و مەنسوب و خەلیفەیان راکیشاوە و، سوفی و دەرویش یان راگرتوە. هەم دەولەت و هەم موسولمانانی خیرومەند، گوند و زەویوزار و باخ و ئاش و دوکان و بازاریان کردوتە وەقفی خانەقا و تەکیەی شیخەکان. شیخەکان و نەوەکانیان بە

مروری زەمان دەستیان بە سەردا گرتوە و کردویانە بە مولکی خویان. شیخایەتی یەکیک بوە لە ریگەکانی دروست بونی «دەرەبەگایەتی زەوی» لە کوردستان دا.

لە ناوچەی سلیمانی دا دو بنەمالەی گەورەی شیخان ئیدیعای سیادەت ئەکەن:

- ساداتی بەرزنجە، وا ئیدیعا ئەکەن ئەچنەوە سەر شیخ عیسای نوربەخش، کوری باباعەلی هەمەدانی، نەوەی ئیمامی هەشتەمی شیعەکان: ئیمام موسای کاظم.

- شیخانی تەکیەی قەرەداغ وا ئیدیعا ئەکەن ئەچنەوە سەر ئیمام حەمزە.

لە سەردەمی عەبباسیەکان دا کە نەوەکانی ئیمامی عەلی کەوتونەتە بەر شالاوی قر کردن، گوایە ئەمان لە ناو چەوسانەوە و، لە ترسی کوشتن، هەلاتون بو چیاکانی کوردستان و لیرە جیگیر بون و، ئەم نەوانەیان لی کەوتوتەوە.

ئەم دو بنەمالەیە چەندین «بحر الانساب» و «شەجەرە» یان نوسیوە و، کاربەدەستانی سەردەم موری راست بونیان پی دا ناوە، بەلام ئەم «بەحر» و «شەجەرانە»:

١. هەمویان لەم دوسی چەرخەی دوایی دا لە بەر یەکتری نوسراون، هیچ بەلگەیەکی کون بە دەستەوە نیە پشتیوانییان لی بکا.

٢. تا ئیستا هیچ لیکولینەوەیەکی زانستی بو ساغ کردنەوەی رادەی راستی و دروستییان نەکراوە و، کەسیش نەیویراوە خوی لە قەرەی باسیکی وەها بدا، بە تایبەتی شیخەکان هەمیشە لە لایەکەوە پشت ئەستور بون بە کاربەدەستانی سەردەم و، لە لایەکی ترەوە خویشیان لە ناوچەکەدا دەسەلاتدار و دەسرویشتو بون.

ئەدموندز بەشیکی کتیبەکەی: «کورد و تورک و عەرەب» بو لیکولینەوەی ریچەلەکی شیخان و سادات تەرخان کردوە. بە پی ی توژینەوەی ئەدمونز لە «شەجەرە» ی ساداتی بەرزنجە دا، لە نیوان شیخ عیسای دامەزرینەری ئەم بنەمالەیە و ئیمام موسای کاظم دا بوشاییەکی زەمانی هەیە، بە حەوت پشت ئینجا پر ئەبیتەوە.

صەفەویەکان، لە پیش دا شیخەکانی تەریقەتیان و، دوایی‌تر شاهەکانیان، وایان ئیدیعا ئەکرد، سەیدن و ئەچنەوە سەر ئیمام جەعفەری صادق. میژونوسی ناوداری ئیرانی «احمد کسروی» نوسەری میژوی «مشروطە» و «ئازەربایجان»، دوای لیکولینەوەیەکی ورد کتیبیکی نوسی لە ژیر ناوی: «شیخ صفی و تبارش»، واتە شیخ صەفی و بنەچەبناوانی. لەم کتیبەدا سەلماند بوی باپیرە گەورەی صەفەویەکان لە چیای شەنگاری کوردستانی عیراقەوە چوتە ئازەربایجان، نە سەیدە و نە تورک بەلکو کوردیکی سوننی بوە. هەندی لیکولینەوەی تری لەم بابەتەی نوسی. لە سەر ئەوە کوشتیان.

باسەکە وەکو بابەتیکی پیروزی دینیی ئەوەندە ناسک بوە کەس زاتی نەکردوە لی

ی بدوی. له بەر ئەم هویانە ئیدیعای شیخەکان سەری گرتوە و، لە لایەن خەلکەوە بی مشتومر قبول کراوە.

شیخانی تەکیە تیکەلاوی ژیانی سیاسی نەبون، لە ریگەی مەلایەتییەوە نفوزیکی کەمیان هەبوە. بەلام ساداتی بەرزنجە لە ماوەی قەرن و نیوی رابردودا سەرەرای دەسەلاتی دینیی، نفوزی سیاسی، کومەلایەتی و ئابوریشیان هەبوە.

ساداتی بەرزنجە لە سەردەمی شیخ مارفی نودی(؟ - ١٨٣٨) وە ناوبانگی دینیی و زانستییان بلاو بوتەوە، دوای ئەویش کاک ئەحمەدی کوری و، شیخ سەعیدی نەوەی کاک ئەحمەد، سەرەرای دەسەلاتی دینیی، دەسەلاتی دنیاییشیان پەیدا کرد. لەوەش دا چەند هویەک یارمەتی داون:

١. دروستبونی بوشایی دەسەلات و، بوشایی رابەری لە ناوچەی سلیمانی دا لە ئەنجامی روخانی ئەمارەتی بابان دا.

٢. هاوکاری ئەمان لە گەل دەسەلاتدارانی عوسمانی و، پشتیوانی دەسەلاتدارانی عوسمانی لە مان.

٣. هەبونی گوند و زەویوزاری فراوانی وەقف لە سەرانسەری ناوچەی سلیمانی دا.

بیگومان ئەم بوچونە بو تانە دان نیە لەم بنەمالە بەریزە. لە ناو ساداتی بەرزنجەدا، پیاوی زور گەورەیان لە بواری جیا جیادا تیا هەلکەوتوە، لە میژوی سیاسی، ئەدەبی، روشنبیریی کوردا پایەی بەرزیان هەیە. شیخ مەحمود لە سالاتی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە تا سەرەتای سییەکان پیشەوای جولانەوەی کورد بو لە کوردستانی جنوبی دا.

لە ناوچەی شارباژیر و دولی جافەتی دا سەدان بنەمالەی شیخی تیایە بە تایبەتی لە گوندەکانی: بەرزنجە، کاژاو، نودی، باراو، حاجی مامەند، پارەزان، دولپەمو، قولەگیسکان، بەردەزەرد، سویرەلە، سەرگەلو، شەدەلە... زوری ئەمانە جوتیاری هەژار و مامناوجین، زور کەمیان تیا بو دەولەمەن و دارایی.

شیخەکان، بە تایبەتی ئەوانەی سەیدن، دەولەمەن بن یا هەژار، باقی خەلک بە «ئومی» و، لە خویان بە نزمتر دائەنین، ژنیان لی ئەهینن، بەلام بە دەگمەن روی داوە ژنیان دابی بە ئومی.

لە ناو گەلانی موسولمانی ناعەرەب دا، گیرانەوەی ریچەلەکی بنەمالەیەک یان تیرەیەک بو سەر پیغەمبەر یان یەکی لە خەلیفەکان، یان سەحابەکان زور جار روی داوە. زوریشی بو مەبەستی سیاسی یا دینیی یا کومەلایەتی هەلبەستراو و دروستکراون. رەنگە هوی ئەمەش بگەریتەوە بو روداوەکانی سەردەمی ئەمەوی.

بەر لە ئیسلام سەرزەمینی کورد لە ژێر دەسەڵاتی دو ئیمپراتوریەتی گەورەی ئەو زەمانەدا بون: ڕوژهەڵات و لای ژێروی لە ژێر دەسەڵاتی ساسانی و، لای ڕوژئاوای و بەشی ژوروی لە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتییەکان دا بو. ساسانییەکان فارس بون یا کورد؟ خوی باسێکە ئەهێنی زوری لە سەر بکولرێتەوە.

هەردو کومەڵی ساسانی و بیزەنتی لە سەر بنچینەی چینایەتی دامەزرا بون. چینەکانی سەرەوە حوکمی وڵاتیان ئەکرد و، سەرکردایەتی لەشکر و لەشکرکێشییەکان، چینەکانی خوارەوەش کار و پیشە و هەندێ جار سەربازی شەرکەر بون. ئیسلام وەکو دینێکی تازە کە هات سنوری چینەکانی لە ناو ئەم کومەڵانەدا تێک دا و، بانگی دو جورە یەکسانی بە گوێ ی مروڤایەتی دا دا: یەکسانی لە نێوان عەرەب و هەمو نەتەوەکانی تردا و، یەکسانی هەموان لە ناو کومەڵی ئیسلام دا. تەنیا شت کە ئەبو بە هوی جیاوازی لە نێوان نەتەوەیەک و نەتەوەیەک و، مروڤێک و مروڤێک دا خواپەرستی «تەقوا» بو.

ئیسلام ئەگەرچی یەکسانی لەو بوارانەدا هێنا، بەلام ئەمیش مروڤایەتی لە سەر بنچینەی دین کرد بە ۳ پولەوە: ئەوانەی باوەریان بە ئیسلام هێنا بو: «الامە الاسلامیە». ئەوانەی باوەریان بە ئیسلام نەهێنا بو بەلام «ئەهلی کیتاب» بون وەکو جو، مەسیحی، سوبی، زەردەشتی و، لە «دار الاسلام» دا ئەژیان: «اهل الذمە». ئەوانەی باوەریان بە ئیسلام نەهێنا بو و «ئەهلی کیتاب» یش نەبون: «الکفار والمشرکین».

ئەم دابەشکردنە سنوری ئەرک و فەرمانەکانی هاوولاتی جیا ئەکردەوە:

- ئیسلام لە باج ئەبەخشرا.

- «ئەهلی کیتاب» کە لە سەر دینەکەی خویان ما بون، بەلام لە ژێر سایەی ئیسلام دا ئەژیان، پێ یان ئەوترا «اهل الذمە». بەرامبەر پاراستنی سەر و سامانیان ئەبو سەرانە «جزیە» بدەن.

- ئەوانەی ئەهلی کیتاب نەبون و، ئیسلامیش نەبون، بە «کافر» دائەنران، سەر و مالیان بو موسوڵمانان حەڵاڵ بو.

ئەمەوییەکان داوودەزگای حکومەتیی گەورەیان دامەزراند، بو دابینکردنی خەرجی داوودەزگاکانی حکومەتەکەیان و، کوشک و سەراکانیان پێویستیان بە سەرچاوەی تازەی دەرامەت بو. یەکێ لە سەرەتا گرنگەکانی ئیسلام: «یەکسانی موسوڵمانی عەرەب و موسوڵمانی ناعەرەب» یان، هەڵوەشاندەوە. بەو گەلانەیان ئەوت «موالی» کە موسوڵمان بون بەلام عەرەب نەبون. وەکو جاران موسوڵمانی عەرەب لە باج بەخشرا بو، بەلام باج خرایە سەر «مەوالی » یش، وەکو «جزیە» لە سەر «ئەهلی ذیممە» بو.

کــاروباری دەولـەت و دەســەلاتداری لە دەس عــەرەب دا کــو کــرا بووەوە. لە نـاو عـەرەبیش دا «قورەیش» لە پیش بون. سەردەمیک «بەنی ئومەییە» و سـەردەمیـک «بەنی عـەباس». شیعـەش بە نهینی لە چالاکییـەکی بی پسانەوەدا بو بو پروپاگاندەی دینیی - سیاسی بو «ئالی عـلی» کـە نەوەی مـحـەممەد بون لە ریگای فـاطیـمـەی کـچـیـەوە. هەمـو مـوسـولمانیک لە نـویژ و دوعـادا ئەبو «صـەلات و سـەلام» بو «مـحـەممەد و ئالی مـحـەممەد» بنیری.

ئەمەویەکان گیانی خویەزلزانینیان لە ناو عەرەب دا بلاو ئەکردەوە، بە چاوی سوک سەیری گـەلانی ناعـەرەبیان ئـەکرد موسولمان بونایە یا ناموسـولمان. بو روبەروبونەوەی ئەم «خـویەزلزانینەی عـەرەب» بزوتنەوەی «شـعـوبی» پەیدا بو. لە ناو شـعـوبیـەکـان دا زانا و نوسـەری گـەورە هەبو. زوریان بە عـەرەبی ئەیان نوسی. ئەمـانیش لە نوسـینـەکـانیـان دا لە پایەی عەرەبیان ئەهینایە خواری.

«عـەرەب بون»، لە ناو عـەرەبیش دا «قورەیشی بون» پلەی مـروڤی بەرز ئەکردەوە و، ئیمتیازی سیاسی و کومەلایەتی و دارایی پی ئەبەخشی. فەقیهەکانی ئیسلام بە دەیان باس و لیکولینەوەیان لە سـەر مـەرجـەکـانی حـاکـم نوسـیـوە، زوریان پی یان لە سـەر ئەوە داگرتوە ئەبی بە ریچـەلەک قورەیشی بی و هەندیکیان وتویانە ئەبی هاشمی بی و، کەمیان وتویانە مـەرج نیـە لەوان بی، بەلام ئەبی عادل و بە تەقوا و سالح بی. فـەقیـهـەکانی شیعـە «ئیمامەتی» یان بە تەنیا بە هەقی عەلی و نەوەکانی عەلی ئەزانی.

ئیلە موسولمانەکانی ناعەرەب بو خوپاراستن خویان خستوتە پەنای یەکی لە قـەبیلە ناودارەکانی عـەرەب بەرامبەر پیشـکەش کردنی هەندی خزمەت. زور کـەس و زور تیرە لە سـەرانسـەری ولاتانی ئیسـلامی دا بو ئەوەی کـەلک لە ئیـمـتـیـازەکـانی عـەرەب وەر بگرن ریچـەلەکی خویان بردوتـەوە سـەر یەکی لە نـەوەکانی عـەلی، یان یەکی لە خـەلیـفـەکـان، یا سەحابەکانی پیغەمبەر.

جورجی زەیدان، لە یەکی لە کتیبەکانی دا چیروکیکی لەم بابەتە لە سەر سولتان سـەلاحـەدینی ئەیوبی ئەگیـریتـەوە. کـە صـەلاحـەدین جیگیـر ئەبی هەندی لە دەسـوپیـوەندە نزیک و شـارەزاکـانی ئامـوژگـاری ئەکـەن، بو ئەوەی بنچـینەکـانی حـوکـمی ئەم و دوای ئەم نەوەکـانی بـە تەواوی بچـەسـپـی، «شـەجـەرە» یەکی بو دروست بکـەن بیبـەنەوە بو سـەر پیـغـەمبەر. صـەلاحـەدین پرس بە باوکی ئەکـا. باوکی رازی نابی و پی ی ئەلی: «تو کـە ئیستا خوا بەم پایە بەرزەی گەیاندوی چ پیویستیەکت بە شتیکی دروستکراوی وەها هەیە. هەمـان تاقـمی ئیـسـتـا شـەجەرەکەت بو ریک ئەخەن، لە پاشەروژدا، کە لە گـەلت تیکچون،

تانەی لی ئەدەن».

شەرەفخان لە میژووەکەی دا: «شەرەفنامە» کە باسی ریچەلەکی بنەمالە دەسەلاتدارەکانی کوردستان ئەکا، هی زوریان ئەباتەوە بو سەر کسایەتیەکی عەرەب، بو نمونە: میرەکانی هەکاری و ئامیدی و چەمشکەزەک ریچەلەکی خویان بردوتەوە بو سەر خەلیفەکانی عەباسی و، میرەکانی مەرداسی و کلیس بو سەر عەبباسی مامی پیغەمەر و، میرەکانی سلیمانی بو سەر مەروان ئەلحیماری خەلیفەی ئەمەوی و، میرەکانی جزیرە بو سەر خالیدی کوری وەلید و، میرەکانی سوران بو سەر عەرەبیکی بەغدادی و، میرەکانی زەرقی و دونبولی بو سەر عەرەبیکی شامی.

بیگومان شەرەفخان ئەمانەی لە خویەوە دروست نەکردوە، بەلکو لە زمانی خویانی بیستوە و لە بەلگەکانی ئەو زەمانەی وەرگرتوە. بنەمالەی میرانی جزیرە و بوتان ریچەلەکی خویان بردوتەوە سەر خالیدی کوری وەلید، کەچی وا باوە خالید کە مردوە وەجاخی کویر بوە. جەلادەت بەدرخان رونکردنەوەیەکی لە سەر ئەمە نوسیوە و، بە هەلبەستراوی داناوە.

ریچەلەکی «عەرەبیی» زور لەم بنەمالانە ئەبی لەم چوارچیوەیەدا لیک بدریتەوە.

*

شلیر

شلیر گولیکی کویستانیی جوانە بەهاران ئەگشیتەوە. بە ناوی ئەم گولە جوانەوە زور کچ ناو نراون. هەروەها ناوە بو ناوچەیەکی خوش لە پینجوین. لە پیش پینجوین دا «قزلجە» ناوەندی بەریوەبەرایەتی ناوچەکە بوە. ناوی قزلجە وەکو ناوچەیەکی سنوریی لە ریککەوتننامەی زەهاو دا هاتوە.

ناوچەی شلیر لە نەخشەی عیراق دا وەکو زمان چوتە ناو ئیرانەوە. شلیر کەوتوتە نیوان شاخەکانی «لەری» و «تاریدەر» و، بە دریژایی دولەکە گوندەکانی میشیاو، شایەن، باریکەدەر، لارەدەر، هاربر، شیرزاد، وینە، داروخان.. دروست کرا بون. یەکی بو لە شوینە نمونەییەکانی خوحەشاردان و حەوانەوەی پیشمەرگە. خانوەکانی ئەمانیش وەکو گوندەکانی تری کوردستان تەنگ و تاریک و دوکەلاوی بو.

شلیر ناوچەیەکی دلگیر و، ئاووهەوای خوش و دیمەنەکانی جوان و، کانی و ئاوی زوری هەبو. لیرەواری چری ما بو. رەز و باخی زور کەم بو. کاتی خوی ئاغاکان ریگای جوتیارەکانیان نەداوە باخ بکەن چونکە دەسکەوتی ئابوری کەم بوە. لە باتی ئەوە توتن و مەرمزە و گەنم و سپیداریان پی چاندون. جوتیارەکان هەژار بون و، روتاندنەوەیان پیوە دیار بو.

دانیشتوانی شلیر سەر بە خیلیکی دیاریکراو نەبون و، پیوەندی خیلەکیان لاواز بو. زەمانیک حەمە رەشید خان دەسەلاتداری بە هیزی ناوچەکە بوە و، بو گرتنی بانە و، بو بەشداری لە جمهوریەتی مەهابادا خەلکی ئیرەشی لە گەل خوی بردوە.

*

قم لە ئیرانەوە چەند کەسیکی نارد بوەوە لە ناوچەکەدا کاربکەن، وەکو: خەلەی رەشە بەحری، شەریفە کەچەل، صابیری مینە رەندان. ئەمانە هەمویان پاش ماوەیەک تەسلیم بوبونەوە و، مەفرەزەی جاشی ئیستیخباراتیان دروست کرد بو. تەنیا هیزی قم ئەوە بو لە گەل نادر هەورامی لە سورین بون. بەلام یەکیتی چەندین مەفرەزە و فەرماندە و کادری لە ناوچەکەدا هەبو.

هیزەکەمان بە ئاواییەکانی شلیر دا دابەش بون.

کوبونەوەی هیزەکە لە شلیر بو چەند مەبەستی بو: یەکەمیان، پشو پی دان و ریکخستنەوەی. دوەمیان، دانانی ریوشوینی هەلکەندنی قم لە سورین و هەلوەشاندنی هیزەکەیان.

لەو ماوەیەدا کاک تایەریش بە ناو ئیران دا بە نهینی لە نوکانەوە گەیشتەوە هەریمەکەی خوی. لە گەل خوی نامەی مامجەلال و مەکتەبی سیاسی بو ئیمەش هینا بو. مامجەلال داوای کرد بو بەر لە نەوروز بگەینە شینی بو کوبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی.

*

کوژرانی کاک ئارام

ئیوارەیەکیان لە گوندی «چاژ» بوین ئاگاداریان کردم کە یەکی لە سلیمانیەوە نامەیەکی بە پەلەی بو هیناوم. نامەکەیان بو هینام. نامەکە لە «کومیتەی هەلمەت» ەوە بو. ئەوسا کومیتەی هەلمەت ناوی ریکخستنی سەرەکی کومەلە بو لە ناو شارەکانی کوردستانی عیراق دا.

لە نامەکەدا بویان نوسی بوم کە روژی ۷۸/۱/۳۱ مەفرەزەیەکی جاش بە ریکەوت چونەتە گوندی تەنگیسەر لە قەرەداغ. کاک ئارام خوی لەو گوندەدا شارد بوەوە. کە جاشەکان ئەبینی تفەنگەکەی ئەکاتە شانی و ئەیەوی بە خیرایی لە ئاوایی دەرچی. جاشەکان بەدی ئەکەن و تەقەی لی ئەکەن. کاک ئارام ئەپیکری و هەر لەوی دا گیانی دەرئەچی. جاشەکان ئەچنە سەری گیرفانی ئەپشکنن «هەویە» یەکی پی ئەبی بە ناوی «انور» ەوە. جاشەکان نای ناسن و لاشەکەی بە جی ئەهیلن. بەلام «هەویە» کەی ئەبەن و،

ئەدەن بە دائیرەی «ئەمن» لە سلێمانی. «ئەمن» یش نەیزانی بو ئەو «ئانور» ناوە کاک ئارامە. رووداوەکە یەک رۆژ بو قەوما بو.

کومیتەی هەلەت بە داخ و پەژارەیەکی بێ ئەندازەوە ئەو هەواڵەیان بو من نوسی بو. هەروەها باسی دەوری کاک ئارامیان کرد بو لە سەرپەرشتی و ئامۆژگاری ڕێکخستنی نهێنی شارەکان دا. شەهید بونی کاک ئارام جگە لەوەی خەمێکی گەورەی بە هاوڕێکانی ئەدا، بوشاییەکی گەورەی لە ژیانی ڕێکخراوەیی دا دروست ئەکرد.

کومیتەی هەلەت داوایان لێ کرد بوم لێرە بەدواوە لە باتی کاک ئارام من پیوەندییان لە گەڵ ببەستم. سەرپەرشتی کار و چالاکییەکانیان بکەم. کاک ئارام دوستێکی نزیک و خوشەویستی من بو. لە بیروباوەڕدا لە یەکەوە نزیک بوین. لە دامەزراندنی کومەڵەدا لە گروپەکەی ئیمە بو. دوای پانزەی ئازاری ۷۰ لە بەغدا زور جار، من و ئەو و حیلمی عەلی شەریف، یەکترمان ئەبینی و، من هانم دا ڕێگەی ڕۆژنامەوانی بگری. پێش ئەوەی سەفەری ئێمەننا بکەم لە گەڵ کاک ئارام پێکەوە چوین بو چومان بو خواحافیزی لە مامۆستا ئیبراهیم و کاک عەلی و کاک عومەر.

شەهید بونی ناوەختی کاک ئارام بو هەموومان جێگەی داخ بو. چاوەڕوانی گەیشتنی بوین. بە نامە وا ڕێ کەوت بوین کاروباری پێشمەرگەکانی قەرەداخ و کاروباری ڕێکخستن تەواو بکاو لەو ماوەیەدا بگاتە لای ئیمەو پێکەوە بە کومەڵ بەرەو پشدەر بچین بو بەشداری لە کوبونەوەکانی سەرکردایەتی دا.

وەڵامی نامەکەی کومیتەی هەلەتم نوسیبەوە. بەڵێنم دانی بو هاوکاری و یارمەتی هەرچی بە من بکری دریغی نەکەم. مسودەی بەیانێکیشم بە ناوی کومەڵەوە بەو بونەیەوە نوسی و، بوم ناردن کە ئەگەر پەسند بێ چاپی بکەن و بڵاوی بکەنەوە. نامەیەکی پەلەم بو مامجەلال و مەکتەبی سیاسی نوسی، کە ئەوانیش بەیانێکی لە سەر دەربکەن. هەروەها هەمو ئەو کادرانەی کومەڵە کە لەو نزیکانە بون بانگم کردن بو کو بونەوە. هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاندن. پێم وتن پێویستە خویان بو کوبونەوەی فراوانی کادرەکان ئامادە بکەن بو ئەوەی کاروباری ڕێکخراوەیی کومەڵە بە جورێکی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی نوی سەر لە نوی ڕێک بخەینەوە.

*

خێش!

ماوەیەک بو نەخوش کەوت بوم. کە هەناسەم ئەدا، بە تایبەتی کە ئەکوکیم یا ئەپژمیم، ئازارێک لە ژێر پەراسوەکانی لای چەپی سنگم دا، بروسکەی ئەدا و، ئەیگەیاندمە

شەرای مەرگ. زورم لە خوم ئەکرد و خومم راتەکیشا. بە دەم گەران و سورانی بەردەوامەوە چوینە گوندی باریکەدەر، یان وەکو خویان ئەیانوت: بالیکەدەر. ژمارەمان زور بو. خالید سەعید و شیخ حسین و بەکری حاجی سەفەر... پیکەوە بوین. کابرایەک پرچی بەردا بوەوە هات بە پیرمانەوە. من چومە مزگەوتەکە لە پەنای زوپاکەدا راکشام. پیشمەرگەکانی لای خومم ئیزن دا بو نان خواردن برون بو ناو دی. هەمو هیزەکەی دامەزراند.

کابرای دەرویش هاتە مزگەوت منی دی راکشاوم. وتی: «هەستە بتبەم لە مالیک داتبمەزرینم».

وتم: «دەرویش گیان من برسیم نیە و ناساغم حەز ئەکەم لیرە بو خوم ئیسراحەت بکەم».

وتی: «نابی! هەرچی بیتە ئەم ئاوایەی ئیمە ئەبی ئەکسان بکا. ئەتبەم بو مالیک هەم نان بخو هەم ئیسراحەت بکە!»

زوری لە گەل خەریک بوم. کولی نەدا و وازی لی نەهینام. ناچار لە گەلی رویشتم. بە هەورازیک دا سەری خستم بو دوایین خانو. هەناسەم لی برا بو. لە تاو ئازاری سنگم خەریک بو بکەوم. بەدەس ئیشارەتی بو کردم وتی: «بچورە ئەو مالە لەوی نان بخو و هەر لەویش ئیسراحەت بکە». منیش سوپاسم کرد. ئەو رویشت و منیش چوم بو مالەکە. سەیرم کرد نزیکەی ۲۰ پیشمەرگە لە بادینییەکان لەو مالەدا دانیشتون. یەکسەر گەرامەوە دواوە. چومەوە بو مزگەوت. مزگەوتەکە ژوریکی روناک و پاک و گەرم و خوش بو. خوم لی دا بە ئەرزا.

جاریکی تر دەرویش پەیدا بو. کە منی لەوی بینیەوە تورە بو.

وتی: «ئەی ئیستا من توم نەبرد دامەزراندی، بو هاتیتەوە؟»

وتم: «دەرویش مالەکە خەلکی تری زور لی بو. بە جوانم نەزانی منیش ببم بە سەربار»

وتی: «دەی قەیناکا هەستە بتبەم بو مالیکی تر».

سوپاسم کرد وتم: «حەز ئەکەم لیرە بم».

پی ی لی کردمە کەوش کە هەر ئەبی هەستم. وتم: «دەرویش ئەزانی ئازار و نەخوشیی چیە؟».

وتی: «بەلی منیش خوم ناساغم».

وتم: «کەواتە وازم لی بینە. تاقەتم نیە و نان ناخوم».

وتی: «تا ئیستا چەند جار پیشمەرگە هاتونەتە ئیرە، هەمو جار من دامەزراندون

تا ئیستە هیچ کەسیکیان گلەیی نەکردوە، ئەمە چیتە تو ئەلی ی لرزەنگەری خوتت داوە بە ئەرزەکەدا خیشت کردوە!»

ئەوە یەکەم جار بو وشەی «خیش» بیستم. وای ئەزانی من دلگیر بوم بویە نان ناخوم. ئیتر گەیشتە تینم خومم پی رانەگیرا. راست بومەوە بە تورەییەوە قسەیەکم پی وت و، وتم: «ئەگەر ئەروی هەلئەستم لە لیتەی بەر مزگەوتەکەت هەلئەکیشم».

دەرویش بیست بوی پیش من پیشمەرگە خەلکی تریان لە ناو هەلکیشاوە، لە ترسی هەرەشەکەی من، لی ی دا رویشت. پاش توزیکی تر هاتەوە. لە پیشەوە منی ئەناسی بو، وای زانی بو پیشمەرگەیەکم وەکو پیشمەرگەکانی تر، ئەمجارە زانی بوی من کیم و چیم. دیسان بەروکی گرتەوە. داوای لی بوردنی لی ئەکردم کە ئەیناسیبوم و، زوری لی ئەکردم لە گەلی بروم میوانی مالی ئەوان بم. لە راستی دا لەو کاتەدا خوشترین خواردنی دنیا لە لای من یەک تاو پشودانی بی دەنگ و سەنگ و ئارامگرتنی بی قسەی ئەئەهینا. بەلام دەرویش لەمە تی ئەئەگەیشت. مەعنای «خیش» م لی پرسی. بوی رون کردمەوە. لەمەوە ئیتر وشەی «خیش» لە ناو پیشمەرگەدا بلاو بوەوە.

*

بەختیاری مەجیدخان

لە نیوانی چەمەک و سیپیار دا بوین، توشی چەند کەسیکی بی چەکە بوین. ئەوانە پیشمەرگەی مەفرەزەیەک بون شەوی رابردو لە مزگەوتیکا، لە گەل مەفرەزەکەی بەختیار پیکەوە واجباتی شەوانەیان دانا بو. مەفرەزەکەی بەختیار لە وەختی نوستن دا هەمویان چەک کرد بون. ئەم کارە ناڕەزاییەکی قولی لە ناو هەمو هیزەکەدا وروژان. ئەمەش بە سوکایەتییەکی گەورە دائەنرا بو یەکیتی.

هیزەکەمان بەرەوژوری . . ٥ کەس ئەبو. زوری بەرپرسەکانی ناوچەی سلیمانی یەکیتی لە گەل بون. هەمو هیزەکە کرا بە ٣ ریز بو کیومالی ناوچەی شلیر بە دوی بەختیار و مەفرەزەکەی دا. بەختیار لە گوندی وینە بو. چواردەوری دی گیرا و هەلیان کوتایە ناو دی. بەختیار و مەفرەزەکەی پییان زانی. شاوری کوبونەوەیان لی دا. بە راکردن لە ناو دی دەرچون. بە بەردەمی عومەری کویخا قادری ئاوەکەلە و تاقمەکەی دا تی پەری بون، دەنگیان لە گەل نەکرد بون.

بەختیار و پیشمەرگەکانی هەر هەمان شەو تەسلیم بونەوە. حکومەت بردنی بو کەرکوک و پاش چەند روژی بە چەکداری هینانیەوە بو پینجوین. مەفرەزەیەکی یەکیتی چو بون بو کاریکی پیشمەرگانە لە ناو پینجوین دا. هەندیک لە پیشمەرگەکانی ئەم

مــەفــرەزەیە لە وانە بون بەختـــیـــار چەکی کـــرد بون. ئەو هەلەیان بە دەرفـــەت زانی بو کەمینیکیان بو بەختیـار دانا بو. روژی ۷۸/۲/۱۲ کوشتیـان. مەفرەزەکە ئەو کارەیان سەربەخو، بی پرسی هیچکام لە بەرپرسەکانی یەکیتی، کرد بو.

مردنی بە ختیار بەو شیوەیە مـخابن بو. بەختـیـار کـوری مـەجیـد خان و نەوەی حـەمـەرەشـیـد خان بو. حـەمـەرەشـیـد خان یەکی بو لە ٤ جەنەرالەکـەی کـوماری مـەهاباد. مەجید خانیش یەکی بو لە فەرماندەکانی هیزی دیموکراتی بانە. لە سەر کوردایەتی توشی دەربەدەری و ناخوشییەکی زور بو بون. لە سەرەتای شورشی ئەیلول دا حەمەرەشید خان و کورەکانی و خزمەکانی هاوکارییان لە گەل بەرپرسەکانی شورش کرد بو بو ئازاد کردنی پینجوین. بە دریژی سالانی شورش دلسوزی کورد بون. لە دوای ئاشبەتال رویان لە ئیران کرد بو. لە گـەل دەس پی کـردنەوەی شـورشی حوزەیران دا بەختـیـاریش لە ئیـرانەوە هات بوەوە لە ناوچەی شلیری پینجوین بو بو بە پیشمەرگە.

*

چەککردنی عومەری ئاوەکەلە

ئەنوەری مەجید سولتان و، کەریمی دادەمەنە کابرایەکی فەراشی قوتابخانەی یەکی لە گـوندەکـانی ئەو نـاوەیان گرت بو. نامـەیەکی لە «مـودیری ئەمن» ی سلیـمـانیـیـەوە بو عومـەری کویخا قادری ئاوەکەلە هینا بو. نامـەکە وەکو لە وەلامی نامەی عومەردا نوسرابی وا بو. عومەر پیش ئەوەی ببتە شاخ ماموستای سەرەتایی بو.

عومەر فـەرماندەی کەرت بو لە هەریمەکەی من. هەروەها ئەندامی کومەلە بو. بەلام ئەمیش هەندی «موخالەفاتی» هەبو بە تایبەتی پارە سەندن. لە بەر ئەوە سلی لە من ئەکرد و خوی دور رائەگرت. نازانم بوچی ئەنوەر و کەریمیش حەزیان لە چارەی نەبو.

عومەر کوریکی گورجوگول و، شارەزا و وریا بو. تاقمی پیشمەرگەی گورجوگولی لە خوی کو کرد بوەوە. لەو کاتەدا چو بو بو میشیاو. خزمایەتی لە گەل حەمەصدیق خان و سـەرحـەدی خـەلیـفـە یونـس دا هەبو، کـە هەردوکـیـان روغـزایی بون. بریار درا خـوی و پیـشـمـەرگەکـانی چەک بکرین. خویشی بگیری و لیکولینەوەی لە گەل بکری. بو چەک کردن و گـرتنی عـومـەر، د خـالیـد، شیخ حـسـین، عـومـەر عـەبدوللا، ئەنوەری مـەجیـد سولتـان، مستـەفا چاورەش و خوم چوینە میشیـاو. لەو روژانەدا من و مستـەفا هەردوکمان نەخوش بوین. من جگەرم ئازاری ئەدام.

بو ئەوەی حـەمـە صـدیق خـان لیمـان دلگران نەبی، بە چاکـمـان زانی عـومـەر لە مـالەکەی ئەودا چەک نەکەین. عومەرمان بانگ کردە مزگەوتەکەی میشیاو لەوی خوی و

هەمو پێشمەرگەکانی مان چەک کرد. عومەرمان سپارد بە پێشمەرگە بادینییەکان.

عومەر لای کاک خالید و شێخ حسێن پاکانەی کرد بو، هەردوکیانی خست بوە سەر ئەو باوەری غەدری لی کراوە.

هێشتا لێکولینەوەی تەواو نەبو بو، عومەر فرسەتی هێنا و هەلات. لە بەر کەمتەرخەمی پێشمەرگە بادینییەکان هەلات بو، یا خویان بە ئەنقەست چاوپوشییان لی کرد بو، مەعلوم نەبو. عومەر ئەگەر پێشتر بێتاوانیش بوبی، وەکو خوی لە کاتی گیرانی دا ئەیوت، لە دوای راکردنی بە ئاشکرا و بە دلسوزی هاوکاری لە گەل دەزگاکانی «ئەمن» دا ئەکرد و دوایی بو بو بە «موقن» یکی دری ئەمنی سلیمانی.

*

دوای ئەوەی گەیشتمە ناوچەکە و، کەوتمە گەران و خەلک بینین، زور کەس سکالایان لە دەس هەندی لە فەرماندەی مەفرەزە و بەرپرسەکانی ناوچەکە لە لا کردم و شکاتیان لی ئەکردن. چاوەروان بون سزایان بدەم. بەلام من لەو کاتەدا سزادانی ئەوانەم بە چاک نەئەزانی. چونکە هەندیکیان ئەچونە ناو قم و، هەندیکی تریان یاخی ئەبون. زورم ئاموژگاری کردن و هەرەشەی لیپرسینەوە و سزادانی قورسم لی کرد بون.

کە کاک خالیدیش گەیشت بو، هەمان سکالا و شکاتیان لای ئەویش کرد بو. چەند جاری کاک خالید ئەو باسەی لە گەل کردم، کە هەندی لەمانە چەک بکەین و، بگرین، ئەگەر دەستیشیان کردەوە بیانکوژین. من ئەو شێوەیەم بو لیپرسینەوەیان بە راست نەئەزانی. لە گەرانەوەمان دا کاک خالید راپورتیکی سیاسی و پێشمەرگەیی دریژی بو مەکتەبی سیاسی نوسی، گلەیی لە منیش کرد بو، کە نەرم بوم لە سزادانی ئەوانەدا. راستییەکەی من نەرم نەبوم، بەلکو بە شێوەی خوم لیم پرسی بونەوە، هەمو ئیشیکم لە دەرسیم و کەریمی دادەمەنە سەند بوەوە. دەرسیم و کەریم تەسلیمی عیراق بونەوە. ئەوانی تریشمان برد بو بەشداری لە سەفەری پرادۆست دا.

*

کشانەوە لە شلیر

ئیمە خەریکی تەگبیری هێرش بوین بو سەر بنکەکەی قم لە سورین، لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەوالمان بو هات: هێزیکی گەورەی جەیش خوی بو پەلامار دانی هێزەکەی ئیمە ئامادە کردوە. بە پەلە بەرپرسەکانی هێزەکە: تایەری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا، بەکری حاجی صەفەر، ئەنوەری مەجید سولتان، خالید سەعید و شێخ حسێن و، خوم کوبوینەوە بو لیکدانەوەی هەوالەکە و بریاردانی کاری پیویست.

هیزەکە زور بو. وردی بەرز بو. ناوچەکەش بو بەرەنگاری و لیدانی دوژمن لە بار بو. بەلام کیوەکانی شلیر بەفریکی زوریان لی باری بو نەمان ئەتوانی بە شەو لەوی بمینینەوە، بە تایبەتی ئەگەر هیزەکانی حکومەت لە گوندەکان دا بچاناپاتەوە. سەرەرای ئەوەش تەقەمەنی هەر ئەوەمان هەبو کە بە پیشمەرگەکان خویان بو، هیچ تەقەمەنییەکی احتیاط و شاردراوەمان نەبو. لە بەر ئەوە بریاری کشانەوەمان دا. ئیوارەیەکی درەنگ بە تاریکی هەمو هیزەکە بە لای «سەیرانبەن» دا کشایەوە دولیکی نزیک «سپیال». بو روژی دوایی هالیکوپتەر بە ئاسمانی ناوچەکەدا کەوتنە فرین و هیزیکی گەورە بە هەمو گوندەکان دا بلاو بونەوە. ٣ روژ لەو ناوەدا مانەوە. شوینەواری پیشمەرگەیان نەدی. بی ئەوەی توشی شەر بین یا هیچ دەسکەوتیکیان هەبی کشانەوە.

خو لادان لە شەری نابەرامبەر و، خو دزینەوە لەو شەرانەی دوژمن زەمان و زەمینی هەل ئەبژاردن، یەکی بو لە تاکتیکە سەرەکییەکانی کاری پیشمەرگەیی سالانی دەس پی کردنەوە. سەلامەتی ئەمەش لایەکی بو پاراستنی پیشمەرگە بو لە فەوتانی نابەجی و، لایەکی تریشی بو ماندو کردنی بیهودەی دوژمن و سەر لی تیکدانی بو.

ئەو هیزەی هات بون بو سەر ئیمە بو شلیر، ئیمەیان بەر دەس نەکەوت، هەندیکیان پەلاماری سورینیان دا، قم بنکەکانی خوی چول کرد و، چونە ناو ئیرانەوە.

لە دوای کشانەوەی هیزەکەی عیراق و، نەمانی بنکەی قم لە سورین، ئیتر کاتی ئەوە هات بو هیزەکەی ئیمەش بلاوەی لی بکا. هەر تاقمە بچیتەوە سنوری کارکردنی خوی. ئەندامەکانی سەرکردایەتیش نامەی مەکتەبی سیاسییان بو هات بو، ئەبو پیش نەوروز بگەنە پشدەر بو کوبونەوە.

*

سەردانی گوندەکانی جارخ، مکل، چەمەک، سپیار، سورەبان، گولی، میشەرو، شیوەگویزان و سیاگویز... مان کرد. هەندی لە گوندەکانی ناوچەکە بزنی مەرەزیان راگرت بو. لە مالەکانیان دا دەزگای جولایان دانا بو بو دروستکردنی «شال».

سیاگویز ٢٥ . سال ئەبو. کەوت بوە سەر سنوری ئیران. بەیانییەکیان لە دەرگای مزگەوتەکەی هاتەدەرەوە ریزیک تەوالیتی بە چیمەنتو دروست کراو بەرامبەری بو، خوەم پیا کرد. کە هاتمە دەرەوە زور لە پیشمەرگەکان پی ئەکەنین. وتم: «ئەوە بە چی پی ئەکەنن؟» وتیان: «هیچت نەدی؟» وتم: «چی ببینم لە ئاودەستخانە دا!» وتیان: «ئەوە کانی ژنان بو!». لە خانوی هیچ گوندیکی کوردستان دا تەوالیت نەبو. تەوالیتی پیاوان لە مزگەوت و تەوالیتی ژنان لە کانی ژنان بو. دیارە کورد تەوالیتی بە پیویست نەزانیوە.

خنکانی بەختیاری سەعید والی

من و هەندی لە فەرماندە و کادرەکانی هەریمەکە بو هەندی کاری پیویست بەرەو شارباژیر بەری کەوتین. کاک تاهیری عەلی والی و هیزەکەی لە پاش ئیمە ئەوانیش بەری کەوت بون بەرەو پارەزان. لە کاتی پەرینەوەدا لە چەمی گوگسور بەختیاری ئاموزای لە داری پردەکە خزا بو کەوت بوە ناو ئاوەکەوە. چەندی بە دوای دا گەرا بون لاشەکەیان نەدوزی بوەوە. روژی دوایی خەلکی گوندەکانی دەوروبەر بەدریژایی چەم لە ئاوەکەیان نوری بو بی ئەوەی هیچ ئەنجامیکیان هەبی. دوایی چەند مەلەوانیک کە لە دەورووپشتی پردەکە ئەگەران دیبیان لاشەی بەختیار لە بن داری پردەکەدایە. شەروالەکەی لە دارەکە ئالاوە و بە بنی پردەکەیەوە نوساند بو. ئیمەش بو بەشداری لە ناشتنی تەرمی بەختیار و سەرەخوشی لە ئەنوەر و عوسمانی برای و، لە کاک تاهیر و رەوف بەگ و روستەم بەگی ئاموزایان گەراینەوە گوندی قولەگیسکان.

*

تیکەوتن

مولازم عومەر دەمیک بو تاقەتی لە پیشمەرگایەتی چو بو. بە زور خوی راتەکیشا و، لی ی بوبو بە کوردەناموسی. لە زور شتی پچوک دلگیر ئەبو. روژیکیان لە گەل پیشمەرگەیەکی هەلەبجەیی : فەرەج، دەمیان لیک گیرا بو. لە سەر ئەوە تا دەستی گرتبوی تفەنگەکەی فری دا بو بو ناو دولیکی قول و، بە توراوی و بە تەنیایی رویشت بو. لەو کاتەدا لە سەر سنوری ئیران بوین، چو بو بو قوخیکی ئائەمین. وەهاب و شورش و هاوری جەبارم نارد لە گەلی بن تا دلی چاک ئەبیتەوە. هەرچەندە دەری کرد بون، بەلام ئەمان هەر بە دیاریەوە مابونەوە تا بەهانی بەکمان گرتەوە. هەولی زورم لە گەل دا دلی بهینمەوە جیگای خوی، سودی نەبو.

عومەر بەرەو چنگنیان رویشت، ئەیویست بە نهینی بچیتەوە بو سلیمانی و، لەویوە بروا بو بەصرا. گوایە بەلینیان پی دا بو لە بەصراوە بە نهینی بیگەیەننە کویت. خواحافیزیم لە جەماعەت کرد و، بە ناچاری شوینی کەوتم بو چنگنیان. زورمان قسە کرد. مەترسیەکانی چونە شار و گیران و ئابروچونم بو باس کرد. سەرەنجام رازیم کرد کە لە گەلمان بمینیتەوە و، پیکەوە بچینەوە بو لای مەکتەبی سیاسی و لەویوە بچی بو سوریا و، لە سوریاوە بو ئەو شوینەی خوی حەز ئەکا.

روژی یەکەمان لە چنگنیان بەم مشتومرە بە سەر برد. شەوەکەی لەوی ماینەوە و، روژی دوهەم خەریکی کاروباری هەریم بوم. دەرسیم زوری قسە لە سەر بو. بانگم کرد بو

بو لیپرسینەوە. فەرەج هونگەرینەیی، ئەوسا لە ڕیکخستنە نهێنیەکانی کومەلە بو هیشتا نەبو بو بە پیشمەرگە، بەرەو ڕوی بوەوە، مەفرەزەکەیم هەلوەشاند و، چەکە زیادەکانم لی وەرگرتەوە. دەرسیم بو پاساودانی موخالەفەکانی ئەیوت: «من پیشمەرگەی دەستە سەرەتاییەکانم. جەماعەتی کاک ئارام بوم. کاک ئارام نەماوە بویە شەرم پی ئەفروشی».

پاش نیوەروکەی بە کومەل لە ژوری میوانی مالیک دانیشت بوین. خەریکی قسە بوم لە گەل هەندی لە فەرمانەدەکانی پیشمەرگە، فاضیل رەحیم خوی کرد بە ژوردا. هەمویان ئەیانناسی. هەریەکە گالتەیەکی لە گەل کرد. لی یان پرسی: «بوچی هاتوە؟» وتی: «هاتوم بزانم بەختیاری سەعید والی لە کوی نیژراوە، کەسوکاری ئەیانەوی تەرمەکەی ببەنەوە بو سلیمانی»

لە گەل فاضیل کەوتنە فشەقیات. من چومە دەرەوە. ئەویش هات و، هاتە نزیکمەوە. فاضیل لال بو پچر پچر قسەی بو ئەکرا. وتی: «قسەیەکم پی یە، ئەمەوی بە تەنیا پیت بلیم کەس نەزانی!». بو ئەوەی هەستی کەس ڕانەکیشم وتم: «بەلی.. گویم لیتە!» وتی: «با بچینە جیگایەک بوت باس بکەم» وتم: «بەدەم ڕیگاوە قسەکانت بکە. وەها سەلامەتترە»

وتی: «لیم مەپرسە کی ناردومی. ئەم قسانەیان ڕاسپاردوم پیت بلیم: حکومەت هیزی کو کردوتەوە لە سەرتان. لە ئان و دەقیقەدایە هیرشتان بو بکەن. هەرچی زوە لیرە بگویزنەوە! لای برادەران ناوی من مەبە!»

قسەکانی لە شیوەی تەلگراف دا بو بە خیرایی وەرم گرت. لە سەری نەرویشتم. دلنیا بوم دروی نەئەکرد. لە یەکتری جیا بوینەوە. منیش یەکەم جار بو لە ڕیوشوینە سەختەکانی پیشمەرگایەتی، کە بەشیکی خوم دام نا بو، لا بدەم: دو ڕوژ بو بە هەوای خوش سەرخوش بوین لە چنگنیان ما بوینەوە، چنگنانیش لە نزیک سلیمانی بو.

ماوەیەک خومم مەشغول کرد. سەریکی مزگەوتم دا. سەردانی دوکانەکانم کرد. لە گەل هەمو بەرپرسەکانی پیشمەرگە و، زوری پیشمەرگەکان قسەی ئاسایی م کرد و، لیم ئەپرسین چەندن و چەکەکانیان چیە و، لە کەیەوە پیشمەرگەن و، خەلکی کوی یان کام گەرەکی سلیمانین.. ژمارەی هەمومان نەئەگەیشتە ٤٠ کەس. بەشی زوریان مەسئول بون، زور کەم پیشمەرگەیان تی دا بو. گەرامەوە مالەکەی لی ی میوان بوین.

هەمان تاقمی بە جیم هیشت بون، هیشتا لەوی بون و، دریژەیان بە قسەکانیان ئەدا. منیش چومەوە بو ناویان و بەشداری گفتوگوکانیان بوم. پاش نەختی قسەکانم پی برین وتم: «هەوالم بو هاتوە عیراق هیزی کو کردوتەوە لە ئان و دەقیقەدایە پەلامارمان

بدا..».

یەکێکیان لێ پرسیم: «ئێنجا تەلی ی چی بکەین؟».

وتم: «بە رەئی من هەتا قاچمان هێزی تیایە لەم ناوچەیە دور بکەوینەوە، یان بەیانی زو هەستین و لە شاخەکە دابمەزرێین».

مولازم عومەر عەلی دایە وتی: «تو هەمو پیشمەرگەکانت روخاندوە. لە سەر ئیخبارییەی درو، بەم سەرما و بەفرە هەمومانت ئەوەندە بردوە بو شاخ هەمومان رەنگورومان رەش هەلگەراوە. هیچ جارێکیش توشی شەر نەبوین».

وتم: «من قاچم لە قاچی ئێوە درێژترە. لە یەکەم دەسرێژدا ئەکوژرێم لە راکردن دا کەس پێما ناگات. کەیفی خوتانە بریاری مانەوە ئەدەن یا روشتن. بەلام بزانن ئەمجارە هەوالەکە راستە»

بریاریان دا بمێنەوە و، کەمین و حەراسەتی مەزبوت دابنێن. زور لە میژ بو من، نە خومم شت بو ، نە جلەکانم. خاوەنی مالەکە بە زور جلەکان و قەمسەلەکەمی لێ وەرگرتم بوم بشون. جلەکانی لە بەرم دا بو هاوینە بون. قەمسەلەی ترێشم پێ نەبو.

سەعات چواری بەیانی روژی ۲۵ ی شوباتی ۱۹۷۸ بو، ئێمە لە ژوری میوانی خانەخوێکەمان دا نوست بوین، لە دەنگی دەسرێژی خەبەرمان بوەوە. هەمومان هەستاین و خومان کو کردەوە. ئەگەر ئەو دەسرێژە نەبوایە بە خومان نەئەزانی یان لە مالەکەدا ئەگیراین، یان توشی شەرێکی قورس ئەبوین لە ناو چنگنیان دا. مجەوری مزگەوتەکەی چنگنیان لە ئێمە وریاتر بو، بونی هێرشەکەی کرد بو، لە میکروفونی مزگەوتەوە هاواری ئەکرد: «رەحمەتی خوا لەوەی نوێنی لە مزگەوت هەیە، بیباتەوە»

لە مالەکە هاتینە دەر، چوین بو مزگەوت، زوری پیشمەرگەکان کو ببونەوە. عوسمانی قالە مەنوەر و، مستەفا چاورەش و، جەمالی عەلی باپیر و عەلی چوارتایی ئەو کەمینەکانیان دانابی. عوسمان هەندی پیشمەرگەی نارد بو بو قەیماسە. هێشتا نەمانئەزانی دەورمان گیراوە. پێم وتن یەکسەر بەرە و شاخەکەی بەرامبەرمان رابکەن و بەرەو گەلی برون. هەر چواریان وتیان ئێمە ئەچین بو لای کەمینەکانی خومان. من زورم پێ خوش بو.

لە چنگنیان دەرچوین بەرەو شاخەکەی بەرامبەری، بە گوللە دایان گرتینەوە دەیان هەزار فیشەکیان پێوە ناین. بە راکردن خومان گەیاندە بناری شاخەکە. ملازم عومەر لە گەل خوم بو. مستەفا و عوسمان پێش من گەیشت بونە شاخەکە. وتیان رێگاکە گیرا بو نەمان توانی بگەینە کەمینەکە. تومەز کەمینەکەی عوسمان نارد بونی بو قەیماسە،

هەرزەکاری بی تەجروبە بون، لە ناو سەرما لە چاخانەکەدا نوست بون. جاش هەمویانی گرت بو. جەمال و عەلی پیکەوە بون، ئەبو کەمینەکیان لە پشتی چنگنیان هەبی، کەمینەکەیان دانەنا بو، بەر لەوان جاش شوینەکەی گرت بو. کە ئەمان چو بون توشی تەقە بون و گەرا بونەوە.

بە زەحمەتیکی زور دەرباز بوین. بە پیشمەرگەکانم وت چاوەروانی من نەکەن بە خیرایی بە شاخەکەدا هەلگەرین بو سەرەوە و لەوی دابەزرین. من و عوسمان و مستەفا ماینەوە بە شینەیی بە شاخەکەدا هەلگەراین. دنیا روناک بوبوەوە. جاشەکان هات بونە ناو چنگنیانەوە. ئیمەیان ئەدی. بە قەناسە زوریان نیشانە لی گرتینەوە. بەر نەکەوتین. ئیمەش گەیشتینە سەر شاخەکە. شاخەکە بەفر گرت بوی و، بایەکی ساردی هەبو. پاش ماوەیەک شور بوینەوە بو دولەکەی دولەتو و سوپرەلە بەرامبەر شاخی «کەتو». چاومان لی بو لەویش بە هالیکوپتەر هیزیکیان دابەزاند. هالیکوپتەر کەوتە سورانەوە بە ئاسمانی ناوچەکەدا ئیمە شوینەکانمان قایم بو. هەندی تەقەی کوێرانەیان کرد. زیان بە کەس نەگەیشت. تا ئیواری لەوی ماینەوە. لە ئیوارەدا هیزەکانی دوژمن کشانەوە. ئیمەش هەمومان کوبوینەوە. تاقمیکمان کە لەو سەری دی بون، لە ئیمە دابرا بون رویان کرد بوە باراو. ئیمە شەو چوینەوە بو ناو چنگنیان.

لە تەقوتوقی یەکەمجاردا تەنیا پیشمەرگەیەک بەر کەوت ناوی: «ئەبوبەکر عەبدوللا» بو، لە مەفرەزەکەی من بو، مالیان لە گەرەکی خانوە قورەکانی سلیمانی بو. لاشەکەیمان لە بن داریک دا لە گورستانەکەدا بە جی هیشت بو. جاشەکان بویان نەدوزرابوەوە. لاشەی شەهیدەکەمان هەلگرت و چوین بو باراو روژی دوایی لەوی ناشتمان و، نامەیەکم بو کەسوکاری نارد لە روداوەکە ئاگادارم کردن.

دوایی دەرکەوت ئەوی هەوالەکەی بو نارد بوم، فەرهادی مەلا رەزا بو. فەرهاد بو ئیستیخبارات کاری ئەکرد. هەر لەو ماوەیەدا لە شەردا لە گەل پیشمەرگەی یەکیتی لە بەری قەرەداغ کوژرا.

راستییەکەی هوی ئەم «تیکەوتن» ە: کەمتەرخەمی خومان بو.

بە دریژایی ماوەی رابردو من خوم بەیانییان هەلئەستام و، سەرپەرشتی کەمین و حەراسەتی بەیانیانم ئەکرد، ئەو ماوەیە منیش وازم لەمە هینا بو، دوای ئەم تیکەوتنە چومەوە سەر خوەکەی جاران. بەیانییان خوم سەرپەرشتی کەمینەکانی پاریزگاری و چاودیرییم ئەکرد.

*

راوەکەو

چەند ڕۆژێ لە باراو، نودی، هەولو، هەرمەلە ماینەوە ئینجا پەڕینەوە بۆ ناوچەی سیوەیل و ئالان. سەردانی گوندەکانی کوردەداوی و کەنارو و سیرین و باری.. مان کرد. بە درێژایی ئەو ماوەیە عەلی چوارتایی مان لە گەڵ بو. عەلی زور شارەزای ناوچەکە بو.

سیوەیل ناوچەیەکی زور خوش بو. گوندەکانی ئاوەدان و قەرەبالغ بو. رەز و باخەکانیان گەورە و جوان بو. کانی و ئاوی زوریان هەبو. چەمەکانی کەوتوتە قولاییەوە کەلکیان لێ وەر نەئەگرت.

راو، بە تایبەتی هی کەو، لە کونەوە یەکێک بوە لە سەرگەرمییەکانی دانیشتوانی ناوچەکە. شاخەکانی دابەش کراوە بە سەر راوگەی دیاریکراودا. هەر بنەمالەیەک راوگەی تایبەتی خوی هەبو لە کونەوە حەشارگە و سەنگەری تیا دروست کرا بو. هیچ کەس بوی نەبو لە راوگەی خەلکی تردا راو بکا. ئەم وەرزەی سال، لەو ناوچەیەدا، وەرزی راوەکەو بو. شەویکیان لە باری نوست بوین. حەرەسەکان خەبەریان کردینەوە وتیان دەنگە دەنگیکی زور لە پشتی ئاوایبەوە دی. هەموومان هەستاین گویمان هەڵخست، راست بو غەلبەغەلبیکی زور ئەهات. وامان لیک دایەوە کە پیادەی جەیش هیرشی بو کردبین و، بیانەوی پشتی دی مان لی بگرن. چوینە شاخەکە و دامەزراین. کە دنیا روناک بووەوە سەیرمان کرد تاقمیکی زوری خەلکی ناوچەکەن چون بو راوەکەو.

هەر لەم ماوەیەدا جەیش لە سورکیو بە هالیکوپتەر «ئینزال» ی کرد بو، بە دوای نیمەدا گەرا بو، توشی چەند راوکەریک بو بو لە شاخەکەدا لە حەشارگەدا بون، هەموویان گرت بون.

کەو یەکیکە لە مەلە جوانە دەنگخوشەکانی چیاکانی کوردستان. لە بەهاردا هیلانە ئەکات و ١٥ تا ٢٠ هیلکەی تیا ئەکات و لە سەری کر ئەکەوی تا هەلیان ئەهینی. بە بەچکەکانی ئەلین: «بارەکەو».

کەو کە هیشتا بارە نەبگرن و لە پیش دا لە ناو کولەکە و لبادا بە خیوی ئەکەن، کوللە و گەرای میرولەی ئەدەنی. کە گەورە بو لە ناو قەفەزدا رای ئەگرن، ماش و تالیشک و کوللەی ئەدەنی و، رای ئەهینن بو خویندن یان بو یاری شەرەکەو، یان بو راوەکەو.

لە کونەوە راوەکەو یەکیکە لە سەرگەرمی دانیشتوانی چیاکان. زور شیوە و ریگای جوراوریان داهیناوە بو راوکردنی لەوانە:

- کەوبوار

لە بەهاران دا پولە کەو بە کومەڵ لە ناوچە گەرمەکانەوە بەرەو بەرزایی شاخەکان

کوچ ئەکەن. ڕێگاکانیان دیارە. ڕاوکەرەکان لە سەر ڕێگایان دا لە ناو حەشاردا دائەنیشن و، بە کومەڵ ڕاویان ئەکەن.

- ڕەشە ڕاو

لە هەمو وەرزەکانی ساڵ دا ڕاوکەر لە حەشاردا دا ئەنیشی و، کەو بو خوێندن و ڕاکیشانی کەوی تر لە گەڵ خوی ئەبات. هەندی جار دیوجامە هەڵئەواسی و، هەندی جار کەوڵی سەرە ڕێوی ئەکاتە سەری خوی. کەوی لی کو ئەبیتەوە و ئەکەویتە ڕاو کردنیان.

- ڕاوە سەرکانی

لە پایزدا ئاو کەم ئەبیتەوە. لە هەندی جیگا کانی و لە هەندی جیگا تەنیا ماقور ئەمینیتەوە. ڕاوکەر حەشار لە جیگایەک دا دروست ئەکا بە سەر کانییەکەدا بروانی و، چاوەڕوانی هاتنی کەو ئەکا.

- ڕاوە نیرەکەو

لە بەهار دا ماکەو لە سەر هیلکە کڕ ئەکەوی ژمارەی نیرەکەو زور ئەبی. ڕاوکەر ماکەویک لە قەفەزدا ئەبا و لە نزیک حەشارگاکەی خویەوە دای ئەنی. ماکەوەکە ئەخوینی و، نیرەکەوەکان لە ماکەوەکە کو ئەبنەوە. ڕاوکەر ئەکەویتە ڕاویان.

- ڕاوە ماکەو

لە بەهار دا لە کاتی هیلکە کردن دا کە ماکەو و نیرەکەو جوت ئەگرن، ڕاوکەر نیرەکەو ئەبات لە حەشارگا دا دا ذائەنیشی. نیرەکەوەکە ئەقاسپینی. نیرەکەوەکانی ناوچەکە دەنگەکەی بە بیگانە ئەزانن دین بو شەر لە گەڵی، ماکەوەکانیش دین بو جوت گرتن. ڕاوکەر تیبیان ئەکەوی.

- ڕاو بە تەپکە

ڕاوکەر شوینی هاتوچوی کەو ئەزانی. لە سەر ڕیگاکەیان دا چەند چالیک هەڵئەکەنی و، سەری بە تەختە یان بە دار و پوش ئەگری. کەو کە بە سەری دا ڕویشت تی ی ئەکەوی.

- ڕاو بە داو

بە سەدان داو بە سنگ بە ئەرزەکەدا ئەچەقینی و، کەوی دەنگ خوشی بە دیارەوە دائەنی بو ئەوەی کەوی ناوچەکەی لی کو ببیتەوە. خوی لە ناو حەشاردا چاودیری ئەکا. کەوەکان بە توڕەییەوە بە دەوری قەفەزەکەدا ئەسوڕینەوە و قاچیان ئەبی بە داوەکەوە.

ڕاوکەر زور جار شەویش ئەمینیتەوە بو دریژە پی دانی. زورجار ڕاوکەر یەکیکی کە لە گەڵ خوی دا ئەبا یارمەتی بدا بو هەڵگرتنی کەلوپەلی ڕاو وەکو تفەنگ و قەفەز و

خواردن پی ی ئەلین: «مەخورە».

هەرگیز حەزم لە هیچ جورە راوی نەبوە و کەسیشم هان نەداوە راو بکا. زور جار لە گەران و سورانەوەدا بە ناو شاخ و دەشت و دەردا توشی مەل و دەعبای کێوی بوم، نە خوم تەقەم لی کردون و، نە هیشتومە کەس تەقەیان لی بکا. راو بەو جورەی لە کوردستان دا ئەکری ئەبی بە هوی لە ناو چونی یەکجاری دەعبا و مەلی کێوی.

نەریتێکی خراپ لە شورشی ئەیلولەوە داکەوتوە بوە بە باو. هەمو چەک بە دەستی ئەتوانی بە ئارەزوی خوی بی هیچ جورە لیپرسینەوەیەک راو بکا، یان ئەگەر لە ریگاویان دەعبا و مەلی کێوی بینی بو سەلماندنی دەسراستیی خوی تەقەیان لی بکا و، بیانکوژی و، بە جی یان بهیلی. لە ئەنجامی ئەم راوە بی «دیسیپلین» ە دا، زور مەلی کێویی نایاب بە تەواوی لە ناو چون یان خەریکە لە ناو ئەچن، لەوانە: دال.

دال، چەندین ناو و چەندین جوری هەیە: دالاش، لاشەخور، کەرخور، کورتان بە کول، سیسارک، سەرگەر... ئەمانە بە پول ئەگەرین و، لە هەرجییەک کەلاکی توپیو یا مردار هەبی بە بون ئەیدوزنەوە و لی ی کو ئەبنەوە و ئەیخون. دال لەو مەلانەیە کە زور بە کەلکە بو راگرتنی پاک و خاوینی سروشت لە پیسیی کەلاکی بوگەن.

*

چەند روژی لە ناوچەکەدا ماینەوە، بە زوری لە قوخەکان دا کاتمان بە سەر ئەبرد، چاوەروانی گەیشتنی کاک خالید و شیخ حسین و کاک تاهیر بوین، بو ئەوەی هەمومان پیکەوە بەرەو نوکان بە ری بکەوین بو لای مەکتەبی سیاسی. لە شابەدین بوین کە گەیشتن.

بەدەم ریگاوە، لەم ناوچەیەدا دوجار توشی تەقە بوین: جاری یەکەم، کە بە روناکی ریچکەمان بەست بو بە لای زنجیرەیەک رەبیەدا تی پەرین لە نزیک شیوەکەل. دور بە دور دایان گرتینەوە. جاری دوەم، کە لە شابەدینەوە ئەمانویست بچین بو ئاوەزی. ئەمەیان ریکەوت یارمەتی داین ئەگینا زیانی زورمان لی ئەکەوت. کە گەیشتینە سەر شاخ، هەوا خوش و، دیمەنی ناوچەکە زور جوان بو. گیا تازە سەری دەرئەهینا. لە بەر هەتاوەکە، لە خوشی ئەو هەوا خوش و دیمەنە جوانە لە سەر شاخەکە ماینەوە و، دانیشتین. تومەز لەوبەرمانەوە بوسەیەکی بەهیزیان بو داناوین چاوەروانی ئەوە ئەکەن بە نشیوەکەدا شور ببینەوە بەرەو ئاوەزی. نشیوێکی کور و روت و دریژ بو. بەلام ئیمە دواکەوتین. بوسەکە نائومید بو لەوەی ئیمە دابەزین، لەوە زیاتر دانیان بە خویان دا نەگرت لە پر دایانینە بەر دەسریژی گوللە. ئیمە لە سەر ناوەریژی شاخەکە دانیشت بوین. ئەگەرچی زوری گوللەکان

کەوتە ناومان، بەڵام کەس بەرنەکەوت و نەپێکرا. چونکە دیوی ئەدیوی ئاوەڕێژەکە. بۆسەکە نیتر ئاشکرا بو ئیمەش دەستەیەک پیشمەرگەمان نارده سەریان هەڵیان کەندن و راویان نان.

عـەلی چوارتایی چەند جـاری چو بو بو نوکـان، هەر ئەو ریگاکـەی بو دیاری کردین. ئەحمەد فەتحوڵلا لیپرسراوی ناوچەی ماوەتی یەکیتی بو، ئەومان راسپارد تەگبیری پەرینەوەمـان بو بکا. بو پەرینەوە لە چەمی کەلوی، لە لای گرگاشیوە گوریسیـان رایەل ئەکرد، سەریکیـان لە بەری عـیراق و سەرەکەی تریان لە بەری ئیـران ئەبەستەوە. زەلام و باریان پی ئەپەڕانەوە. کـە ئیشـەکـەیان تەواو ئەبو گوریسـەکانیـان ئەپیـچایەوە و ئەیان شاردەوە.

روژیکی خـوش بو. هەوا لە بار بو بو فـرینی هالیکوپتـەر. ٤ گـوریسـیـان بو بەستین. هیزەکـەمـان بەرەوژووری ۲۰۰ کـەس بو. د. خـالیـد و مـەفرەزەکـەی لە پیشـەوە پەرینەوە بو ئەوەی لـە بەرزاییـەکانی بەری ئیران دابەزری بو پاراستنی پەرینەوەی هیزەکە. منیش لەم بەر سەرپەرشتی پەرینەوەی هیـزەکـەم ئەکرد. بو ئەوەی پشیـوی دروست نەبی مەفرەزە بە مەفرەزە بە ریم ئەکردن. بە سەلامەتی هەمومان پەرینەوە.

بو یەکـەم جـار مـحـەمـەدی مـەلا عـەلی بیـژوی م لە سـەر ئەم ئـاوە بینی و نـاسی. راسپاردەی هەندی لە تیکوشەرە کوردەکانی ئیرانی پی بو.

*

زی ی پچوک

لەم سـەفـەرەدا ئـەمـە دوهـەمـین جـار بو لـە ئاوی «زی» بپـەرینەوە. لە مـاوەی سەفەرەکەش دا لە چەندین روبار و چەم و جوگامان دا بو. کوردستان یەکیکە لە مەلبەندە دەولەمـەنـدەکـانی ئاو. وەکـو چون ئەوت بو بە مـایەی بەدبەختی بو کـورد، بیگومـان لە پاشەروژدا ئەم نیعمەتە گەورەیەی کە خوا بە کوردی بەخشیوە، ئەمیش ئەبی بە غەزەبیکی خراپتـر لە غـەزەبی ئەوت. لیـرەدا بە پیـویستی ئەزانم هەندی زانیـاری دەربارەی «زی ی پچوک» بنوسمەوە لە باسیکی کاک شورش حاجی وەرم گرتوە.

زی ی بچوک یەکیکە لە لقە سەرەکی و گەورەکانی روباری دیجلە. لە کوردستانی ئیران هەلئەقولی و، لە ۳۵ کم ی خوارووی شاری شەرگات ئەرژیتە دیجلەوە.

سـەرچاوەکـانی زی ی بچـوک لە ناوچەی لاجـان و، لە نزیک شـاری خـانە «پیرانشـەهر» ی کوردستانی ئیران هەلئەقولین. هەر لە سەرچاوەوە چەندین لق و چومی ئەچیتەوە سەر، هەندیکیان لە چیای قەندیل هەلئەقولین و، بەرەو خوار ئەروا تا ئەگاتە

ڕۆژهەڵاتی شاری «سەردەشت». لەویش چەند لقێکی تری ئەچێتەوە سەر گەورەترینیان چەمی بانەیە کە لە چیاکانی ناوچەی سنە هەڵئەقوڵێ و لە گوندی ماشان تێکەڵ بە زێ ئەبێت. لێرەوە ئیتر زێ ی بچوک تا ماوەی ٢٣ کم ئەبێ بە سنور لە نێوان عێراق و ئێران دا، تا ئەڕژێتە خاکی کوردستانی عێراقەوە.

لە سەرچاوەوە تا ڕۆژهەڵاتی سەردەشت زێ بە ناوچەیەکی نیمچە تەخت و گردۆڵکاوی دا ئەڕوا، لە ناوچەی ئالان بە دۆڵێکی قوڵ و پڕ لە دارستان دا ئەڕوا. ڕۆژئاواکەی بریتییە لە زنجیرەیەک چیا بەرزاییان لە نێوان ..١٨ تا ..٢١ م، لە هەندێ شوێن ئەگاتە ...٣ مەتر. کە زێ ی بچوک دێتە ناو خاکی عێراق بە گوندەکانی گرگاشە، چومە، ناوکورتی، قورنتینە دا تێ ئەپەڕێ. لە نێوان گوندی قورنتینە و بەر گورد «چەمی قەڵاچوالان» ی تێکەڵ ئەبێت. ئینجا بەرەو خوار ئەبێتەوە تا ئەگاتە دەشتی قەڵادزێ و لەوێ پانایییەکەی زیاد ئەکا، لە هەندێ شوێن ئەگاتە نزیکەی ...١ م. لە ١٢ کیلۆمەتری خوارووی شاری قەڵادزێ کۆمەڵە گردێکی گچکە ئەبڕێ. لە وێشەوە بە سندۆڵان و تەنیشت سەنگەسەردا ئەڕوا تا ئەگاتە دەربەند کە شوێنی بڕینی چیای «کێوەرەش» و «ئاسوس» ە.

لە نێوان قەڵادزێ و دەربەند چوار لقی تری تێکەڵ ئەبێتەوە، سەرچاوەکانیان بەفری چیای قەندیلە. بریتین لە چومی ژاراوە، چومی قەڵادزێ، چومی باوزێ، چومی گارفین.

لە دەربەند تێ ئەپەڕێ و شاری ڕانیە بە جێ ئەهێڵێ، دەشتی بیتوێن و میرزا ڕوستەم ئەبڕێ تا ئەگاتە «تەنگی دوکان». لەم تەنگە دا «سەدی دوکان» دروست کراوە. بەرزاییەکەی ٤٥٩ م لە ئاستی دەریاوە. لە نێوان ڕانیە و تەنگی دوکان دا ڕووبارەکانی «قائمقام» و «قەشان» و «هیزوپ» ی تێ ئەڕژێ. لە سەدەکەوە هەردو زنجیرە چیای «کوسرەت» و «هەیبەت سوڵتان» ئەبڕێ و لە دواوان پێچ ئەکاتەوە بەرەو خوارووی ڕۆژئاوا و بە گوندەکانی کلیسە، بوگد، قزلو، مەلا زیاد دا تێ ئەپەڕێ تا ئەگاتە شاری تەق تەق.

لە نێوان سەدەکە و تەق تەق چەندین ووشکە شیو و ڕووباری بچوک و گەورەی تێکەڵ ئەبێ، گرنگەکانیان ئەمانەن: چەمی شیوی قەیسان لە ئاستی گوندی ئەڵیاسە سور، ڕووباری شیوە سوری کانی هەنجیر لە نێوان کانی هەنجیر و گەڵناغاج، شیوە سور لە قەڵاتکەی نێوان گوندی گومەشین و قزلو. ئینجا لە تەقتەقەوە بەرەو ڕۆژئاوا ئەڕوا و لە نێوان گوندی کانی لەلە و نومەر گومبەت ڕووباری کۆیەی تێکەڵ ئەبێت کە لە چیای باواجی هەڵئەقوڵێ. وە لە ئاستی گوندی سارتک بەستی شەرغەی ئەچێتەوە سەر، کە ئەمیش لە چیای باواجیەوە هەڵئەقوڵێ و لە زستان و بەهارا ئاوەکەی زۆرە و لە ئاستی گوندی

«چومەزەردەلە» ڕووباری شاقازی تەچیتەوە سەر. بەرزایی لەم ناوچەیە لە ئاستی دەریاوە ۳۰۰ م ئەبی. ئینجا بەرەو خوار ئەبیتەوە تا ئەگاتە شاری پردی «ئالتون کوپری» کە بەرزاییەکەی ۲۵۵ م.

لە نیوان «کلیسە» و «پردی» دا، هەردوبەری کناری زی بە هوی قور و لیتەی چەند سالەی لافاوەوە زەوی زور بە پیت دروست بوە، پی ی ئەلین: «حاویە» و «ڕەن» بو کشتوکال سودی لی وەرئەگرن.

لە ناو زی دا لە چەند جیگایەک پەلەیەک وشکایی لە شیوەی جەزیرەیەکی پچوک دا دروست بوە پی ی ئەلین: «دوروگە». یەکیکیان کەوتوتە ناو شاری پردی و پی ی ئەلین: «گەرەکی دوروگە».

لە نیوان پردی و شوینی یەکگرتنەوەی لە گەل دیجلە دا زی ی بچوک لە هەمو شوینەکانی تر پانترە. هەر لەم شوینە هەردو زنجیرەی «زورگەزراو» و «قەرەچوغ» ئەبری. لەسەرو ئەوبەری زی لە زورگەزراو مەیدانیکی گەورەی نەوت هەیە، حکومەتی عیراق سەدان بیری تی دا هەلکەندوە و نەوتیان لی دەرئەهینی.

لیژیی زی ی بچوک زور لە لیژیی ئاوی دیجلە زیاترە، بو غونە: لە سنوری عیراق و ئیرانەوە بو تەق تەق ۱:۳۰۰ و لە نیوان تەق تەق و پردی ۱:۱۱۱۱ .

دریژیی زی ی بچوک نزیکەی ٤٠٠ کیلومەترە. ڕوبەری ئاوەریژەکەی ۱۱٦۹۰ کم۲ یە. زورترین ئاو کە بە زی ی بچوک دا هاتبی لە ڕوژی ۵٤/٤/۲۵ بوە گەیشتوتە ۳٦٦۰ م۳/ سانیە. و کەمترینیشی ۲۵م۳/ سانیەیە، معدلەکەی ۲.۳م۳/ سانیەیە.

زی ی بچوک بە گویرەی ئەو شوینانەی پیا ئەروا ناوی ناوچەیی لی نراوە: لە ناوچەی سەردەشت «چەمی کەلوی» و، لە ناوچەی ئالان «چەمی ئالان» و، لای هەرزنە و ئەشکان «چەمی هەرزنە» و، لە ناوچەی قەلادزی «زی ی خاس» و «زی ی سندولان» و، لە ناوچەی کویە و قەلاسیوکە «زی ی دوکان» و «زی ی کویە» و، لە ناوچەی شیخ بزینی و دەشتی هەولیر «زی».

لە کونەوە بە «کەلەک» بە ناو ئاوی زی دا کەلوپەل بە تایبەتی دار و خەلوزیان لە دوکان و تەقتەقەوە بو دویز و پردی گواستوتەوە.

ئاوی زی لە قولایی دایە. زور نزمترە لە ئاستی زەویوزاری تەنیشتی. لە بەر ئەوە جوگای لی هەلنابەستری تا بو کشتوکال یان خواردنەوە بە کار بهینری بەلام گورینی ناوەروکەی لە هەندی شوین دا ئەتوانی ببی بە سەرچاوەیەکی گەورە بو ئاودانی زەوی پان و بەرین بو غونە:

- ئەگەر لە هیزوپەوە بەو گەلی و دەربەندانەی چیای سەفین و باواجی دا ئاوەکەی بەری بو روژئاوای شاری کویە، توپوگرافیای ناوچەکە بارمەتیدەر ئەبی بو ئاودیری هەردو بەری روژهەلات و روژئاوای دەشتی کویە و سالەیی و ملکیە و شیخ بزەینی خوارو.

- ئەگەر لە دامینی سەددی دوکانەوە ئاوەروی زیەکە بە ناوچەی قەشقولی و زنجیرە چیای «بنزمرد» وە ئاوەکە بگوردری بەری بو بەرزاییەکانی بازیان و قەلاسیوکە ئەوا هەمو دەشتەکانی قەلاسیوکە و شوان و هەمەوەند و جەباری زور بە چاکی ئاودیری ئەکا کە روبەریکی زور گەورەیە و تەبیعەتی ئاو و خاکەکەی زور گونجاوە بو هەمو جورە بەرهەمیکی کشتوکالی.

لە سەر ئاوی زی دو بەنداو دروست کراوە یەکیکیان، «بەنداوی دوکان» و، ئەوی تریان «بەنداوی کونەکوتر» ، لە دوبز. بەنداوی کونەکوتر بچوکترە لە هی دوکان بو ئاودانی ناوچەی حەویجەیە.

*

شەوەکەی لە ئاواییەکی بچوکی ئیران ماینەوە و شەوەکی بەری کەوتین بەرەو «کورینار». ئیوارەیەکی درەنگ گەیشتین. هیشتا بلاو نەبوبوینەوە بو نان خواردن، ژاندارمەری گەیشتە سەرمان. کردیان بە قرە و هەرەشە کە دەسبەجی ئەبی لە ناوچەکەی ئەوان دور بکەوینەوە. هەرچی لە گەلیان خەریک بوین نەیان هیشت بو پشودان بمینینەوە. موختاری کورینار خەبەری لی دابوین.

بو نیوەروی روژی دوایی گەیشتینە «بنوخەلف». بە گەرمی پیشوازییان لی کردین و، بو فراوین بە مالەکان دا بلاو بوینەوە. لیرە بیستمان شەریکی قورس لە «دەشتیو» روی داوە. چەندین پیشمەرگە کوژراون و، هەندیکیان گیراون. کاک خالید کەوتە مەرالەوە وتی: «ئەوە مەفرەزەکەی منە توشی شەر بون». هەرچەندە زور ماندو بوین بەلام کاک خالید پەروشی زانینی هەوالی شەرەکە و دەرباز بوەکان بو. بە پەلە کەوتینەوە ری بەرەو «نوکان».

*

## نۆكان: سەرەتای كارەسات

*

نۆكـان كـوێرە دێ بو. لە ئەرزی ئێـران دا بو. چەند مالێکی كـەمی تێ دا بو. دو سێ خانو كە پایزی راﺑوردو قم دروستیان كردبو. ئێمە لە هاتنمان دا پێمان چۆل كرد بون، مەكتەبی سیاسی یەكێتی تێ چو بو. مامجەلال و عەلی عەسكەری و رەسـول مامـەند و ئازاد هەورامی لەو خانوانەدا بون. خـانوی تەنگ و تاریك و پچـوك بون. بە گـەیشـتنی ئێمە زور خوشحال بون. پێشـمەرگەكانمان نارده «شێنێ» و «بێدەلان» و خومـان لە لای ئەوان ماینەوە.

*

شەری دەشتێو

سـەعدی عـەزیز و، سـەید كاكە، ئەوانیش وەكو ئێمە بەرێگاوە بون بەرەو نۆكان بو بەشـداری لە كـوبونەوەی كـومـیـتـەی سـەركردایەتی یەكـیـتی دا، لە گـوندی «دەشـتـێو» لە پشـدەر توشی شـەر بون. لەم شـەرەدا سـەعـدی و ۱۲ پێـشـمـەرگـە كـوژران و، ٤ لە پێشمەرگەكان بە دیل گیران. دوایی ئەوانیشیان ئێعدام كرد. سەید كاكە و جەوهەری برای كاك خالید و زرار وەرتی و چەند پێشـمەرگەیەك لە شەرەكە دەرباز بوبون و گەیشت بونە نۆكان.

مەكتەبی سیاسی بە بونەی شەهید بونی سەعدی عەزیز و هاورێكانییەوە بەیانێكی دەركرد بو.

كـاتی خـوی من هەوالی شـەرەكـەم بەمـجـورە دارشـتـوە و، لـە یەكـەمـین ژمـارەی «هەوالنامە» دا بلاو كراوەتەوە:

٨ ی مـارتی ٧٨ دەمـەوبەیانی لە كـاتێك دا كـە هێـزێكی پ م بە رێگاوە بون بەرەو ناوچەی پشدەر لە گوندی دەشتـێو (قەلادزە) لە سـەر زێ كەوتە بوسـەیەكی گـەورەی دوژمنەوە. شەر لە بەیانییەوە تا ئێوارەی خایاند. بە قەد ژمارەی پێشمەرگەكان هالیكوپتەر بەشدار بو لە شەردا. پێشمەرگەكان بەوپەری قارەمانێتییەوە وەستان و لاپەرەیەكی تریان لە مێژوی شورشەكانی گەلەكەمان دا بە خوێنی خویان نوسی و زیانی گەورەیان لە دوژمن دا:

. ١٦ سەرباز و ئەفسەر زیاتر كوژران

. ٢٥ سەرباز و ئەفسەر زیاتر برینداركران

چەندین هالیکوپتەر پێکرا لەوانە ٣ یان کەوتنە خوارەوە
چەندین ناقیلە و زێلی سوپایی شکێنرا
زیانی ئێمە: ئەندامی سەرکردایەتی ب س ک، ئەندامی ک س - ی ن ک، فەرماندەی هەرێمی دەشتی هەولێر سەعدی عەزیز. ئەندامی پێشکەوتوی کەلک، رابەری سیاسی هەرێمی دەشتی هەولێر فاروق صدیق. پ م فەرخ قادر (هەولێر). پ م فەریق هەمزە (هەولێر). پ م شاهین عیزەدین (هەولێر). پ م طاهیر حەمەد (هەولێر). پ م جەبار ئیسماعیل (هەولێر). پ م عوسمان باوە (هەولێر). پ م عەزیز باپیر (هەولێر). پ م سامی عوبید (هەولێر). پ م صەباح جەمیل (هەولێر). پ م ئەحمەد محەمەد ئەمین (هەولێر). پ م ئەحمەد محەمەد (هەولێر). شەهید بون.

*

هەروەها ئەم پێشمەرگانە بە دیل گیران: جەعفەر ئەسوەد (کۆیە)، حسین عەبدورەحمان (کۆیە)، جەواد کەریم (کۆیە)، کەمال واحید (کۆیە).
رۆژی ٧٨/٦/٢١ لە زیندانی موسل لە سێدارەیان دان.
ئیسماعیل تایە نعیمی، سەرکردەی ئەوسای فەیلەقی یەک، لە (ل ٢٢١ تا ٢٢٥) ی کتێبەکەی دا: «تجربتی فی القیادە» باسی شەڕی دەشتیوی وەکو یەکێ لە شەڕە سەرکەوتوەکانی ئەو سەردەمەی خۆی بە درێژی گێڕاوەتەوە.
ئەوەی لە سەرەوە نوسراوە راستیی روداوەکە بو. بۆ بەراوردی جۆری گێڕانەوەی ئێمە و گێڕانەوەی سەرانی جەیش و، نیشاندانی زلی قەوارەی لەشکرکێشییەکە و هاشوهوشی ناراستی نعیمی، لێرەدا دەقاودەق باسەکەی نعیمی ئەنوسمەوە:
بساط ناجح فی منطقة (قلمتدزة)
٤١٠. فی ربیع عام ١٩٧٨ خطط الفیلق لمعرکة بساط فی منطقة (قلعتدزة) علی ان یکون مرکز البساط قریة (دیشتیوی) وهی قریة تقع علی وادی اخضر قریبة من الزاب الاسفل وجنوب (قلعتدزة) علی أن تشترك فیها قوات من الفرقة الثانیة والفرقة التی فی منطقة (السلیمانیة) وقد حددت الاهداف علی أن یتم مسك المصدات مع الضیاء الاول بالطائرات السمتیة ثم بعد ذلك تبدأ عملیة التمشیط للبحث عن العصاة المحصورین تحت البساط.

وفی ساعة مبکرة تحرکت من (کرکوك) یرافقنی قائد الفرقة فی قاطع (المرصل) العمید الرکن حازم برهاوی وتوجهنا الی (السلیمانیة) حیث استصحبت محافظ السلیمانیة السید ارشد الزیباری ،من السلیمانیة تحرکت الی (دوکان) التی کانت قاعدة انطلاق قطعات

الفرقة فى منطقة السليمانية وعند النزول فى (دوكان) سألنا عن قائد الفرقة فاخبرونا انه يستطلع بطائرة الويت وسألنا ضابط الركن فى المقر الجوال الذى تم تأسيسه فى (دوكان) لقيادة العملية فاخبرنا انهم لم يستطيعوا مسك المصدات حيث اضطرت عناصر من القوة للعودة الى (دوكان) وبعضها نزل فى (قلعتدزة) نظرا لاصابة طائرتهم وقد بلغ عدد الطائرات المصابة ثمانية طائرات ولذلك لم يتم مسك المصدات المطلوبة وفق الخطة. لقد طلبت حضور قائد الفرقة الى (دوكان) ولكنه تأخر وكان الوقت يقارب الساعة ١٠٠٠ فطلبت احضار القوة وهبوطها فى المصدات بنقلها بوجبات بالطائرات المتوفرة وفعلا أمكن إنزال القوة ومسك المصدات ولم تصب اى طائرة بأذى اذ ان الفرقة الثانية نفذت واجباتها بسرعة ومسكت المصدات وهيأت لواء قوات خاصة للقيام بالتمشيط وبعد ان امكن تنفيذ الخطة بحضورنا فى قاطع (دوكان) ولعدم حضور قائد الفرقة غادرت (دوكان) وذهبت الى (قلعتدزة) وشاهدت الطائرات المصابة فظهر ان اكثر الاصابات لاتؤثر على الطيران ولذلك طلبت طيرانها عدا اثنين منها كانت اصابتها تؤثر على الطيران وتحتاج الى تصليحات قد تستغرق يوما كاملا ولذلك امرت بعودة الطائرات والقوة الى (دوكان) لاستخدامها لتعزيز المصدات التى امكن مسكها بدون مقاومة بالقوة المتوفرة فى (دوكان) ولكن التاخير الذى سببه عدم تنفيذ مسك المصدات فى مواعيدها حسب الخطة ساعد على هروب بعض العصاة قبل اكمال الطوق حولهم.

٤٠٢. عند وصولى الى (قلعتدزة) سألت عن قائد الفرقة الثانية وهو العميد الركن لطفى الدباغ حيث تم نقل قائدها السابق اللواء الركن سعدالدين عزيز بعد الانتصارات الباهرة التى حققتها فرقته الى منصب معاون رئيس اركان الجيش للتدريب ونقل بدله العميد الركن لطفى الدباغ وهو ضابط كفؤ حيث عملنا معا معلمين فى كلية الاركان معا وكنت معلم اقدم وهو معلم معى لدورة الاركان (٣١) كما كان آمر فوج مشاة فى (كويسنجق) عندما كنت قائدا للفرقة الثانية سنة ١٩٦٩ وتمكنا من فتح الطريق الى (كويسنجق) (راجع الفصل الثالث). لقد ذهبت الى مقر الفرقة الجوال فى منطقة مشرفة على قرية (دشتيبوى) فوجدت هناك قائد الفرقة وآمر لواء القوات الخاصة العقيد الركن صباح صبرى ولواءه مفتوح للقيام بالهجوم على سلسلة التلول المشرفة على القرية وكان فى قمة هذه السلسلة موقع يبدو انه ملائم لنزول الطائرات السمتية يظهر ان العدو قد شخص هذا المكان ووضع قوة لمسكه كما توزع على السلسلة بعد اكمال الطوق حوله وعدم امكان التملص الا بعض الاعداد التى كان يقودها (سيد كاكه) والتى استطاعت التملص لتأخر مسك المصدات من قبل الفرقة فى قاطع السليمانية. وعند شرح الموقف من قبل قائد الفرقة وآمر اللواء عرفت انهم ينوون مهاجمة السلسلة بلواء القوات الخاصة لمسك قمة السلسلة ثم بعد ذلك الاندفاع الى القرية وتفتيشها.

لقد لاحظت ان هنالك قمة كائنة شمال القرية، يستطيع العدو الانسحاب اليها من القرية فطلبت ارسال قوة بالطائرات السمتية لمسكها والسيطرة على الوديان التى تؤدى الى الشمال والشرق من القرية فتم ذلك بسرعة بينما كان العصاة مشغولين بالقوات الخاصة التى تتقدم باتجاه السلسلة امكن اجراء عملية الانزال بدون مقاومة وبذلك استطعنا ان نطوق القرية بصورة كاملة بحيث لايمكن ان يفلت العصاة من هذا الطوق الا اثناء الليل، ولذلك طلبت السرعة فى حسم المعركة نهارا قبل حلول الظلام وقد تكلمت مع القوات الخاصة قبل حركتهم للهجوم فازداد اندفاعهم كما اننى اعرف آمر لوائهم وهو من الضباط الشجعان المندفعين ولذلك كنت مطمئنا بانهم سيحتلون اهدافهم بسرعة. كما تكلمت مع طيارى السمتيات المقاتلة وطلبت منهم مساندة القوات الخاصة بضرب الحافة القريبة للسلسلة والاستمرار بالاسناد لحين وصول القوات الخاصة على ان يتم التنسيق بين اسناد الطائرات والاسناد المدفعى الذى تم وضع خطته من قبل آمر مدفعية الفرقة بالتعاون مع امر لواء القوات الخاصة. اندفع الفوج الاول بسرعة واستطاع ان يمسك ربيئة قديمة فى بداية السلسلة بعد ان تركها العصاة ولكن القوات الخاصة كعادتهم لم يمسكوا المنطقة بل انحدروا الى السفح الاخر معقبين العصاة وتركوا الربيئة، فقام العصاة بهجوم مقابل استطاعوا على اثره ان يطاردوا السرية التى وصلت الى الربيئة واستشهد امرها و جرح ضابط اخر. ولم تتراجع السرية الى مسافة بعيدة بل بقيت فى طنف لايبعد عن الربيئة اكثر من مائتى متر وامكن تحويل نيران المدفعية والسمتيات على الربيئة التى مسكها العصاة وارسلت سرية جديدة لتعزيز السرية الاولى فاندفعت السريتان لاحتلال الربيئة. وفى الساعة ١٤٣٠ هبطت طائرة سمتية مقاتلة حيث اصيبت بشظية من قذيفة (آر بى جى ٧) وتحتاج الى تصليحات بسيطة ولكن طيارها لم يصب باذى فتحول الطيار الى طائرة اخرى واستأنف المعركة ان هذا الطيار لا اتذكر اسمه ولكننى اكبرت فيه روح التضحية والاندفاع وقد طلبنا تكريمه لشجاعته لقد كنت اراقب المعركة ومعى محافظ السليمانية ارشد الزيبارى وهو ضابط شجاع ومقاتل جرئ والعميد الركن حازم البرهاوى وقائد الفرقة الثانية. هبطت طائرة الويت ونزل منها قائد الفرقة فى منطقة السليمانية وسألته اين كنت كل هذه الفترة الطويلة وقد سألته عن موقف فرقته فقال جيد مع العلم انه لم ينفذ ما مطلوب من الفرقة الا بعد ان وصلنا (دوكان) وطلبنا التنفيذ. وكان القائد فى الاستطلاع وكان الاعتذار لعدم التنفيذ بسبب وجود مقاومة.

٤٠٣. كانت المعركة تسير بشكل جيد والقوات الخاصة تندفع لاعادة احتلال الربيئة التى يمكن اعتبارها مفتاح الموضع. اقترح قائد الفرقة فى قاطع السليمانية ان اسمح له باستخدام سرية مغاوير من فرقته لانزالها فى قمة السلسلة بالطائرات السمتية فقلت له ان

العدو يمسك القمة بقوة وقد ضربوا احدى السمتيات المقاتلة بالقاذفات ولذلك فان الانزال لايمكن تنفيذه مع العلم ان العصاة محصورين ولذا فانهم يدافعون عن رقابهم ولذلك لم اوافق على هذا المقترح كما ان الفرقة الثانية استطاعت ان تحتل الربيئة في بداية السلسلة واندفعت القوات الخاصة على ظهر السلسلة باتجاه القمة كما ان الناحية الادبية لا تجيز تدخل قائد في قاطع قائد اخر الا بعد ان يثبت عجزه وعدم مقدرته على ادارة المعركة في قاطعه ولذلك رفضت هذا المقترح.

لقد كان لهذا الرفض اثره البالغ على قائد الفرقة في قاطع السليمانية حيث ذهب الى المسؤولين ونقل صورة المعركة بشكل مغاير للحقيقة وقد علمت بذلك من السيد ارشد الزيباري محافظ السليمانية عند مواجهته لاحد المسؤولين حيث اخبره بالمعركة التي شاهدها بنفسه لكنه وجد صورة غير حقيقية لدى المسؤول عن المعركة. ان هذا العمل ان دل على شئ فانما يدل على مدى الطموح غير المشروع الذي كان لدى قائد الفرقة في قاطع السليمانية فلا يهمه قلب الحقائق والاضرار بالاخرين من اجل الوصول، ولم نكن نعلم ان وراء هذا الطموح والتكالب على المنصب مخطط تآمري لضرب قيادتنا وحزبنا المقدام حزب البعث العربي الاشتراكي ولكن الله كان بالمرصاد فتم كشف المؤامرة ونال المتآمرين جزائهم.

٤٠٤. لم تمر فترة طويلة على القوات الخاصة التي اندفعت باتجاه القمة وعند اقترابهم منها هرب العصاة منها فلحقت بهم السمتيات المقاتلة وقتلت اعدادا كبيرة منهم ونحن نشاهد هذا المنظر فقال السيد ارشد الزيباري محافظ السليمانية لقد قاتلت العصاة فترة طويلة ولكنني لم اشاهد في حياتي مثل هذا المنظر فالعصاة ينحدرون من القمة باتجاه القرية ويعقبهم رجال القوات الخاصة وكانت مطاردة مشهودة فتم احتلال القرية واسر مايزيد على ٣٥ من العصاة اما الاعداد الاخرى فتم قتلهم وبقيت جثثهم في المنطقة. كان يعوزنا مصوري تلفزيون لتصوير هذه المعركة ولكن لم يكن معتادا تصوير المعارك تلفزيونيا في ذلك الوقت.

لقد كانت معركة (ديشتوي) معركة ناجحة وحاسمة وامكن مسك وقتل كافة العصاة الذين كانوا في المنطقة ولم يستطيع ان يفلت منها سوى (سيد كاكه) مع عدد من حمايته، وقد هرب عندما تاخرت الفرقة في قاطع (السليمانية) من مسك المصدات حسب الخطة...

*

له ناو كومه‌له‌دا گیروگرفتی راسته‌قینه‌مان هه‌بو:

- كومه‌له هه‌ندی له سه‌ركرده‌كانی له زیندان دا بون. له كومیته‌ی هه‌ریمه‌كانیش: ئارام كوژرا بو، سالار له ده‌ره‌وه‌ی ولات بو. ئازاد هه‌ورامی و مه‌لا به‌ختیار له ناو پیشمه‌رگه‌دا بون. سه‌ركردایه‌تی پیشو و، كومیته‌ی هه‌ریمه‌كان له كونفره‌نس یا

کوبونەوەیەکی فراوان دا هەڵ نەبژێردرا بون. هەردوکیان خویان شەرعیەتی تەنزیمیان بە خویان دا بو.

- کومەڵە کومیتەی سەرکردایەتی یان مەکتەبی سیاسی یان ناوەندیکی نەبو سەرپەرشتی هەمو ریکخستن بکا. ئورگان و بڵاوکراوەی نەبو. کاک ئارام یەک هەولی دابو ئورگانی بو کومەڵە دابمەزرینی. یەک ژمارەشی لی دەر کرد بو. ئیتر هیچی بە دوادا نەهات بو.

- کادرەکانی هەمو گەنجی تازە پیگەیشتو بون. سەرمایەی روشنبیری گشتی و مارکسی و، ئەزمونی سیاسی و پیشمەرگەییان کەم بو.

- بە هوی سەختی هەلومەرجی ئەو کاتەوە پیوەندی لە نیوان کادرەکان و ریکخراوەکان و بەرپرسەکان دا کز بو. هەر کەسە و هەر ریکخراوە سەربەخو بە گویرەی «ئیجتیهاد» ی خوی کاری ئەکرد.

- مەلا بەختیار و سالار «طموح» یان لە توانا و لیوەشاوەیی خویان زور زیاتر بو. هەریەکەیان لە لای خویەوە هەولی ئەدا جیگەی ئارام بگریتەوە. مەلا بەختیار بە هەلەداوان چو بو قەرەداغ هەندی لە کادرەکانی کومەڵەی کو کردەوە، وای ئەزانی هەرچی لە قەرەداغ جیگیر بی ئەبی بە سکرتیری کومەڵە. بەر هیرشیکی جەیش کەوتن، ئەمین پولا (ئەمینی حاجی شیخ عەلی) کوژرا و خویان بە فەلاکەت دەرباز بون. سالاریش لە سوریاوە هەندی نامەی «هەلەت پەلەت» ی بو «کومیتەی هەلەت» نوسی بو.

گرنگترین کاری ئەم کوبونەوەیە ئەوە بو:

یەک ناوەندی جیگای باوەر دروست بکا سەرپەرشتی هەمو ریکخستنەکانی کومەڵە و، پیشمەرگە و فەرماندەکانی بکا. یەکیتی بیر و هەڵویست و کاریان تی دا دروست بکا.

*

بو ئەم کوبونەوەیە هەمو ئەندامەکانی کومەڵە کە لە ریزی پیشمەرگەدا بون، وەکو کادری ریکخستن، رابەری سیاسی، فەرماندەی مەفرەزە و کەرت بانگ کرا بون. داوام لە ریکخراوە نهینییەکانیش کرد بو راپورتی دریژ بنوسن. خوم کومەڵی پرسیارم بو نوسی بون وەلامی بدەنەوە.

زوری ئەوانەی داوام کرد بون بین بو کوبونەوە هات بون، تەنیا ئەوانە نەهات بون کە ئاگادار نەکرا بون، یان نەیان توانی بو شوینەکانی خویان بە جی بهیلن. ریکخستنی شارەکان، بە تایبەتی کومیتەی هەلەت، راپورتی تیرو تەسەلیان نوسی بو. بو من ئەمە تاقیکردنەوەیەکی گەورە بو، باوەری ئەم هاوری یانە نەدورینم و، جیگەی باوەری ئەوان بم.

کوبونەوەکانم لە سەرەتاوە کرد بە «سیمینار» بۆ: «لیکولینەوەی هەلومەرجی ناوخویی، ناوچەیی، جیهانیی» و «چونیەتی گەشە پی دانی سیاسی، ریکخراوەیی، پیشمەرگەیی کومەلە و، بە هیز کردنی یەکیتیی نیشتمانی».

لە سەرەتای دامەزراندنی کومەلەوە ئەمە یەکەمین کوبونەوەی ئەندامەکانی بو. پیشتر بە هوی پیرەوی ریوشوینەکانی کاری ژیرزەمینییەوە نەیتوانی بو کوبونەوەی وەها ریک بخا. خیوەتیکی گەورەمان هەل دا بو، زوری بەشدارانی کوبونەوەکە شەو لەوی ئەمانەوە، ئاسیاوی و برایەتییان بەهیزتر ئەبو، شەویان بە قسەی خوش و «شەرە شیعر» و «شەرە سەرین» تا درەنگ بە سەر ئەبرد. لە میژ بو «سەلتەنەتی» وەهایان بە خویانەوە نەدی بو: شەو بە بی حەراسەت و کەمین و بە بی ترس بنون و، بەیانی بە ئارەزوی خویان هەل بستن!

بەشدارانی کوبونەوەکە بەوپەری ئازادییەوە بیروراکانی خویان دەربارەی هەمو باسەکان دەرئەبری و، هاوبەشییان لە گفتوگوکان دا ئەکرد. مامجەلال چەند «محاضرە»یەکی بو دان و، کاک عەلی و کاک خالید بو بە خەرهاتن سەردانیان کردن.

هەندی بریاری ریکخراوەیی و سیاسی گرنگ درا. لەوانە:

- دروستکردنی ناوەندیک بو کومەلە، کە هەمو ریکخستنەکان و پیشمەرگەکانی کومەلە فەرمان و ئاموژگاری لەو وەربگرن. «ئورگان» و بلاوکراوەی پیویست دەربکا.
- مانەوەی هەمو ئەوانەی ئەندامی سەرکردایەتی بون و، بە هوی خەباتی سیاسییەوە گیرا بون، لە سەرکردایەتی دا.
- دامەزراندنی سەرکردایەتی تایبەی بو ریکخستنی شارەکان.
- بەهیزکردنی تەبایی و دوستایەتی لە گەل بزوتنەوە و، بەهیزکردنی ریزەکانی یەکیتی.

کوبونەوەکان، کە چەند روژیکیان خایاند، بە سەرکەوتویی تەواو بون. ئەوانەی ئەبو لە سەفەری بادینان دا بەشدار بن مانەوە و، ئەوانەی تر گەرانەوە بو ناوچەکانی خویان.

*

کشانەوەی رەسول مامەند لە مەکتەبی سیاسی

لە ناو سەرکردایەتی بزوتنەوەدا کیشەی قول هەبو، ئەم کیشانە کاریان لە چالاکی و کارەکانی یەکیتی بەش کرد بو. هەندی لە سەرکردەکانی بزوتنەوە کە لە شار بون، ئەیانویست بزوتنەوە لە یەکیتی جیا بیتەوە، لە گەل هەندی لە بیروبوچونە بنەرەتییەکانی یەکیتی ئەبون.

دروشـمی سـەرەکی یەکـیـتی: «روخـانـدنی رژێمی فـاشی عـیـراق» بو. ئەوان ئەم دروشمەیان پەسەند نەئەکرد. لایان وابو، جیبەجی کردنی ئەم دروشمە لە توانای کورد بە دەرە، بەلکو هەندیکیـان لایان وابو حـیـزبی بەعس هاوپەیمـانی سـتـراتیـجـیی کـوردە و، جولانەوەی کورد ئەبی دەس لەو دروشـمـە هەلبگری و، لە ریگای گـفـتـوگو لە گـەل بەعس هەولی چاککردنی داوودەزگـای ئوتونومی بدات. لە گـەل دەس پی کـردنەوەی خـەباتی چەکداردا بەیانیکیان بە عەرەبی لە لوبنان و ئەوروپا بەم مەعنایە بلاو کردەوە. وەکو ئەیان وت: صەلاح بەدرەدین، کەدوستی بەعسی عیراق بو، بوی بلاو کرد بونەوە.

لە ناکـوکی نیـوان قم و یەکـیـتی دا پی یان وابو ئەمـە زیندوکـردنەوەی ناکـوکی مەلایی و جەلالییە، ئەوان پیویستە نەبن بە بەشی لەم ناکوکییە، بەلکو پیویستە «خەتی سیهەم» دروست بکەن.

لە کاروبارەکانی ناو یەکیتی دا مامجەلالیان تاوانبار ئەکرد بە «تاکرەوی» و، بە داشکاندن بە لای کومەلەدا.

لە ناو سەرکردەکانی بزوتنەوەدا لە شاخ رەسول مامەند کەوت بوە ژیر تەئسیری ئەم بیر و رایانەوە و، دیفاعی لی ئەکرد. هەندی لە بیر و بوچونەکانیان جوری لە راستییان تی دا بو، بەلام شیـوەی کـار و پروپاگـاندەکـانیـان نادروست و زیانبـەخش بو. رەسـول بە دریژایی زسـتـان کیشـە و گیـروگرفـتی لە گـەل مامجـەلال دروست کرد بو. تەنیایی لە ناو مەکتەبی سیاسی دا نەهیشت بو. زوری کارەکان تەگەرەیان تی کەوت بو.

سـەرکـردایەتی بزوتنەوە خـویان کـوبونەوە. رەسـول لە مـەکـتـەبی سـیـاسی و سەرکردایەتی یەکیتی کشایەوە. لە باتی ئەو تایەریان بو ئەندامەتی مەکتەبی سیاسی و، حاجی حاجی برایم یان بو ئەندامەتی کومیتەی سەرکردایەتی دانا. رەسول «تفرغ» ی کرد بو کاری بزوتنەوە.

*

دەفتەری سەروەری

بە دریژایی سالی ۷۷ بەعس بەوپەری دڕندایەتییەوە تیکوشەرانی گەلەکەمانی لە سیدارە ئەدا. گیراوەکان خویان لیستەکانیان بو ئەناردین و، ریکخستنی شارەکانیش هەوال و دەنگوباسەکانیان ئەنارد. زوری ئەم ئاگاداریانەم لە گەل ئەو ئاگاداریانە، کە خوم لە سەر شەهیدانی پیشـمـەرگە کوم کرد بونەوە، لە یەک دا و، لە نامیلکەیەک دا ئامادەم کرد بە ناوی: «دەفتەری سەروەری» یەوە.

گیـراوەکانی یەکیتی، بە تایبـەتی ئەندامـەکـانی کومەلە، لە زیندان دا نەریتـیکی

ئازایانەیان داهینا: نەریتی «نامە نوسین لە ژوری خنکاندنەوە» کە تا ئەوسا باو نەبو.

ئەفسەرە کوردەکان: محەمەد قودسی، عیزەت عەزیز، خەیروللا عەبدولکەریم و مستەفا خوشناو، پێش هەلواسینیان بە چەند سەعاتی نامەیەکی گرنگیان بو میللەتی کورد نوسیوە. نامەکە وەکو سەروەرییەکی نەتەوەیی زور جار بلاو کراوەتەوە و، بو بە سەرمەشق بو تیکوشەرانی ریگای کوردایەتی.

دوای ئەوان کەسیکی کە نامەی لەو بابەتەی نەنوسی بو، یا ئیمە پیمان نەگەیشت بو. هاوریبانی کومەلە سەردەقیان شکان و، بە نامەی شورشگیرانە لە ژوری ئیعدامەوە، سەرکردەکانیان، هاوریکانیان، خزم و کەسوکاریان هان ئەدا بو دریژەدان بە خەبات تا سەرکەوتن.

زوری ئەو نامانە لە لای من کوبوبونەوە. ریکخراوەکانی کومەلە بویان ئەناردم. نامەکان ئەوەندە بەرز و بە سوز بون، هەستیان ئەبزواند و کاریان لە ناخی دەرون ئەکرد. من هەر کە وەرس ئەبوم، هەندی لەم نامانەم ئەخویندەوە، سەرلەنوی تین و تاوم تی ئەگەرایەوە.

نامەکان هەندیکیان بو مامجەلال و، هەندیکیان بو من و هاوری و دوست و، هەندیکیان بو کەسوکاریان نوسی بو. هەر ئەو زەمانە هەندی بەشم لەم نامانە لە «دەفتەری سەروەری» و «هەوالنامە» و «کومەلە» دا بلاو کردەوە. دوایبیتر هەمویم دا بە دەزگای راگەیاندنی یەکیتی زوریان لە کتیبیک دا بلاو کردەوە لە ژیر ناوی: «چەند نامەیەک لە زیندانی فاشیستەکانەوە». نازانم ئەسلی نامەکانیان چی لی کرد.

لە دەفتەری سەروەری دا، پیشەکییەک و، چەند برگەیەکی هەندی لەو نامانە و، لیستی ناوی هەمو ئەوانەی لە چالاکی پیشمەرگایەتی دا و، لە زیندانەکانی عیراق دا تا ئەو کاتە کوژرا بون، نوسی بو.

پیشەکیی دەفتەرەکەم بەم بەیتەی «مەحوی» دەس پی کرد بو:

بە پیری مەرگەوە فرسەخ بە فرسەخ رویون مەردان

ئەوی پاکی لە مردن بی دیارە پلع و نامەردە!

مەحوی خوی «ئەهلی تەصەوف» بوە. وەکو هەمو صوفیە راستەقینەکان بەو جورە لە مردن و ژیانی روانیوە. هاوریبانی کومەلەش، ئەو زەمانە، صوفی راستەقینە بون: عاشقی نەتەوە و نیشتمانەکەیان بون. «کوردی» لەم بارەیەوە ئەلی:

ئەصلی مەقصەد هەر یەکیکە بو پەرستارانی عشق

یەک سیاقە حەق شوناسی: کەعبە یا بتخانە بی!

تایپیکی «برازەر» و رونیویەکی دەستی مان پەیدا کرد بو، ئەم نامیلکەیە و هەندیکی تر لە بلاوکراوەکانی یەکیتی کە لە دەرەوە دەرچو بون، پی چاپ کرد و، تا ماوەیەکی دریژ ئەم تایپ و رونیویە تەنیا هوی بلاوکردنەوەی بیروباوەر و دەنگوباسەکانی یەکیتی و کومەلە بو.

*

راگویزانی ئاوایییەکانی سنور

بەعس بریاری دابو لە سەرەتای مانگی حوزەیرانەوە دەس بکا بە راگویزانی هەمو ئاوایییەکانی سنور بە قولایی ۲۰ کیلومەتر. یەکی لەو مەسەلانەی لە کوبونەوەکانی کومیتەی سەرکردایەتی دا ئەبو باسی بکری، ئەم مەسەلەیە بو. رەئی هەموان ئەوە بو بەرەنگاری راگویزان بکری و، ریوشوینی سازدانی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور دابنری بو بەرهەلستی هیرشەکانی عیراق و، بەرەنگاریی راگویزان. زوری خەلک ئامادە بون بو بەرەنگاری. بەلام چەکیان نەبو. بو ئەوەی پلانەکە جیبەجی بکری ئەبو چەکیان بو پەیدا بکری. تەنیا سەرچاوەی چەک لەو کاتەدا سوریا بو. ئەبو ریگایەک بو سوریا بکریتەوە. یەکی لە هوکانی سەفەری برادوست، کە بو بە «کارەساتی هەکاری» ئەمە بو.

دەربارەی راگویزان، بو هاندانی خەلک، ئەوسا باسیکم ئامادە کرد بو، لە ژمارەی دوەمی ئابی ۱۹۷۸ ی «هەوالنامە» دا بلاوم کردوتەوە. لیرەدا وەکو خوی ئەینوسمەوە:

*

رەگەزپەرستەکانی عیراق ئاوەدانی و پیشکەوتن دینە کوردستانەوە

- ۱ -

دەولەتە ئیمپریالیستیە گەورەکانی ئەوروپا هەر لە کوتایی قەرنی نوزدەهەم و سەرەتای قەرنی بیستەمەوە مرخیان لە زەویوزارەکانی عوسمانیەکان خوش کرد بو و، کەوت بونە دانانی پلان و نەخشە بو داگیرکردن و دابەشکردنی قەلەمرەوی فراوانی عوسمانیەکان بە سەر خویان دا.

پاش جەنگی جیهانیی یەکەم ئەو دەولەتە ئیمپریالیستیانەی شەرەکەیان بردەوە، بە ئامانجی خویان گەیشتن و، بە پی ی قازانج و دەسکەوتی ستراتیجی، سیاسی، ئابوری - پەترولیی خویان، بی ئەوەی گوی بدەنە ویست و ئارەزوی دانیشتوانی ناوچەکە و، بی ئەوەی گوی بدەنە هیچ ئیعتیباریکی نەتەوەیی، کومەلایەتی، دینیی و جوگرافی.. ناوچەکانی روژهەلاتی ناوەراستیان دابەش کرد و، بەمجورە نیشتمانی عەرەب و نیشتمانی کوردیش لەتوپەت و ولجەر ولجەر کران و، چەندین دەولەتوکەی بی هیز و دەسەلات و گری

دراوی ئیمپریالیزمیان تی دا دروست کرا.

کوردستانیش وەکو نیشتمانی عەرەب لەتوپەت کرا، بەلام ئیمپریالیزم و کونەپەرستانی داگیرکەری کوردستان، هەر بەوە داببین نەبون نەتەوەی کورد پارچە پارچە بکەن، بگرە لە ناو کوردیش دا خیل و هوز و تیرە و بنەمالە و هەندی جار خیزانەکانی ئەو ناوچانەیان بە سەر ئەم دیو و ئەو دیوی سنورەکان دا دابەش کرد.

خیلە کوردەکانی سنورەکان بەم جورە پارچە پارچە بون و کەوتنە دیوە جیا جیاکانەوە هەر پارچەیەکیان کەوتە ناو سنوری سیاسی دەولەتیکەوە، بو وینە:

عیراق - ئیران

زەنگنە، ئەرکەوازی، باجەلان، روژبەیانی، تاوگوزی، جاف، ئیناخی، لەهونی، بارام بەگی، میراودەلی، مەنگور، مامەش، پیران، بلباس، هەرکی، سورچی.

عیراق - تورکیا

هەرکی، سورچی، گەردی، دوسکی، ئەرتوشی، هەویری، سندی، سلوپی.

عیراق - سوریا

میران، موسا رەشی، هەسنی، کچان، هارونی، چیلکان، گاباره (خوارووی شەمگار و سەرووی حسەکە)، شەرقی (دنا، کیکا، ملی).

بەلام هەروەکو لەتوپەت کردنی نیشتمانی عەرەبەکان و دروستکردنی چەندین دەولەتی جیا جیا نەیتوانی یەکیتی عەرەب هەل بوەشینیتەوە، پارچە پارچە کردنی خاکی کوردستان و دابەشکردنی نەتەوەی کوردیش بە سەر چەندین دەولەتی جیا جیادا، کیشانی سنوری سیاسی و هەول و تەقەلای رژیمە کونەپەرستەکان، تەنانەت ئیجرائاتی جەنگی و پولیسی یش نەیتوانیوە یەکیتی نەتەوەی کورد هەلبوەشینی.

یەکیک لەو ریگایانەی زور لە کونەوە داگیرکەرانی کوردستان پەنایان بردوتە بەر بو لە ناو بردنی کورد: راگویزانی هوز و خیل و تیرە کوردەکان و دورخستنەوەیان بوە لە کوردستان.

میژونوسەکان لە سەدەکانی ناوەراستەوە باسی راگویزانی زورەملیٚ ی کوردمان بو ئەگیرنەوە، باسی زولمزوری پاشا و ئەمیر و سولتانە زوردارە خوینمژەکان و هەول و تەقەلاکانیانمان بو ئەگیرنەوە لە سەر بە زور راگویزان و دەربەدەر کردنی کورد لە خاکی کوردستان، باسی بەرگری قارەمانانە و شورشی خویناوی و راپەرینی کوردمان بو ئەگیرنەوە.. تەنانەت قارەمانانی نەمری وەکو سەلاحەدینی ئەیوبی و کەریمخانی زەندیش هەر لە ناو ئەو خیلە بە زور دورخراوە و دەربەدەر کراوانەدا هەلکەوتون.

لەم چەرخەش دا، مێژووی نوێ ی تورکیا نموونەیەکی تری هەوڵی زیرکەوتوانە و ئابرووبەرانەی ڕەگەزپەرستە فاشیستەکانی تورکیامان پیشان ئەدات لە بارەی بە زوور ڕاگوێزانی گەلی کورد لە کوردستان.

بەڵام تاکو ئێستا لەعنەت و نەفرەتی مێژوو بۆ ئەو ئەمیر و سوڵتان و کاربەدەستە خوێنڕێژ و زووردارانە ئەچێت و لە لاپەڕە پڕ شەرمەزارییەکان دا ناویان دێت و گەلی کوردیش سەرەڕای زوور لێ کران و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی، سەرەڕای کوشتن و بڕین، سەرەڕای دەربەدەر کردن و ڕاگوێزان، سەرەڕای پرسی کردن و تالان و دواخستن، سەرەڕای هەوڵ دان بۆ تواندنەوە و تەفروتونا کردن و لە ناو بردنی وەکو یەک نەتەوە، هەروەکو کێوە سەرکەشەکانی کوردستان بە سەربەرزی، بە کوردی ماونەوە.

- ٢ -

ڕەگەزپەرستەکانی عیراق، سەرەڕای هەمو ئەو درۆ و دەلەسانەی لە بارەی چارەسەر کردنی گیروگرفتی نەتەوەیی کورد و دانانی سەرزارەکی بە هەندێ لە مافەکانی کوردا، لاپەڕەیەکی یەکجار ڕەش و فاشیستی و دڕندانەیان هەیە لە ڕەفتاریان دا بەرامبەر گەلی کورد و مێژووی میللەتەکەمان دا، بە بێ گومان کردەوەکانی ئەمانە لە پاڵ کردەوەکانی ڕەگەزپەرستە سپیەکانی ئەفریقا و سەهیونیەکانی فەلەستین دا ئەگیرێتەوە.

ڕەگەزپەرستەکانی عیراق کە ساڵی ١٩٦٣ بۆ یەکەم جار کاروباریان گرتە دەست، دەستیان کرد بە ڕاگوێزانی کورد لە ناوچە نەوتاوییەکان، بە تایبەتی کەرکوک، بە سەدان گوندیان لە دەوروبەری کەرکوک و چەندین گەڕەکیان لە ناو شاری کەرکوک دا لە گەڵ خاک دا یەکسان کرد، جاری دووەمیش ساڵی ١٩٦٨ کە هاتنەوە سەر حوکم هەر زو دەستیان کرد بە دەربەدەر کردنی کوردە فەیلیەکان و ڕاگوێزانی کورد لە خانەقین، شەنگار، کەرکوک، تەلەعفەر، زەممار..و، بەمجۆرە بە سەدان گوندیان چۆڵ کرد و، بە هەزاران خێزانیان لە خاکی باوباپیرانیان دەرکرد.

ئاشبەتاڵەکەی ١٩٧٥ هەلێکی باشی دەس ئەم فاشیستیانە خست بۆ جێبەجێ کردنی بە پەلەی پلانە ڕەگەزپەرستانەکەیان لە مەر گۆڕینی ڕوخساری نەتەوەیی خاکی کوردستان بە دەرکردنی کورد لە ناوچە تێکەڵاوەکانی کوردستان و، بە ڕاگوێزانی دەیان هەزار خێزانی کورد لە ناوچە پەترولی و ستراتیجی و ستراتیجی و سنورییەکانی کوردستان.

بەمجۆرە کەوتنە ڕاگوێزان و دەربەدەر کردنی کورد لە کەرکوک، خانەقین، شەنگار، تەلەعفەر، عەین زالە.. و، هێنانی خێل و هوز و موچەخور و جوتیار و

کریکاری عەرەب بۆ ئەم ناوچانە، هەروەها کەوتنە راگویزانی ناوچە سنوریەکانی کوردستان و، هەمو سنوری سوریا - عیراق و، بەشی هەرە زوری سنوری تورکیا - عیراق و، بەشیکی گەورەی سنوری ئیران - عیراقیان، لە سالانی ۱۹۷۵ تا ۱۹۷۷ دا بە قولایی ۲۰ کم چول کرد و، ئەمسالیش کەوتنە راگویزانی ناوچەکانی میرگەسور، دەشتی بەرازگر، دولی خوا کورک، دولی لولان، سیدەکان، گرتک و روست، پشدەر، مەنگورایەتی.. و، تا ئیستا پلانیان بە دەستەوەیە ئالان، سیوەیل، شلیر، هەورامان.. رابگویزن.

تاکو ئیستا صەددام حسین دو جار بە رەسمیی دانی ناوە بە راگویزانی دانیشتوانی کوردستان دا:

جاری یەکەم، دوای ئاشبەتالەکەی سالی ۱۹۷۵ لە وتاریک دا بە ناوی «سەنگەریک یا دو سەنگەر» وە بلاوی کردوتەوە. لەو وتارەدا باسی پیویستیی چول کردنی ناوچەکانی سنوری کوردستان ئەکا بە قولایی ۱۰ - ۲۰ کم، سەبارەت بە ئەمن و ئاسایشی عیراق، گوایە بۆ ئەوەی «پشتینەی ئەمنی» لە دەوری عیراق دروست بکریت.

جاری دوەم، لەو کونگرەیەدا کە بە بونەی ئاهەنگەکانی تەموزەوە لە ۱۹۷۸/۷/۱۸ دا لە گەل روژنامەنوس و پەیامنیرانی بیگانەدا گرتی. صەددام لەم کونگرەیەدا وتی:

«ففی بعض الاحیان تسمعون حدیثا عن تهجیر الاکراد.. فماهو تهجیر الاکراد فی حقیقته...؟ سوف تشاهدونهم عندما تذهبون الی هناك.. لكن الذی ارید ان اقوله لكم الان، الشریط الحدودی بین العراق وتركیا وبین العراق وایران.. تقرر ان یجری ترحیل القری التی هی عبارة لیست عن قری وانما فی اغلبها من بیوت معزولة عن ای نمط من انماط مستلزمات التقدم والحضارة.. وعن قدرة الدولة فی ایصال ای نمط من انماط الخدمات الاجتماعیة والاقتصادیة لهم. تقرر بالنسبة لكل الذین یسكنون الشریط الحدودی والذی بعمق بین ۱۰ - ۲۰ كم للاراضی الحدودیة الواقعة بین العراق.. یعنی من اراضی العراق المجاورة لتركیا ولایران یرحلون بالعمق فی قری نموذجیة تتوفر فیها كل المستلزمات والخدمات الاساسیة التی تفتقر لها حتی الان قری واسعة فی ضواحی بغداد.. وفی مدن اخری من العراق.. هذا هو معنی الترحیل.. لكن یكتبون ترحیل.. رحلو الاكراد.»

لەم قسانەی صەددام ئەم شتانە تی ئەگەین:

۱. ناوچەکانی سنوری عیراق لە گەل ئیران و تورکیا بە قولایی ۱۰ - ۲۰ کم رائەگویزن.

۲. ئەم جارە هوی راگویزانی نەدایە پال پاراستنی ئەمن و ئاسایش و دروستکردنی

«پشتینەی ئەمنی» لە سەرانسەری سنورەکانی کوردستانی عیراق - ئیران، کوردستانی عیراق - تورکیا، کوردستانی عیراق - سوریا، بەلکو گیرایەوە بۆ دواکەوتن و پیش خستنی کوردستان کە گوایە ئەم ناوچانە خانوی لە یەک داپراو و دور لە یەکی ناوچەیەکی شاخاوی سەختی ئەوتۆ دان، کە دەولەت ناتوانی خزمەتی کومەلایەتی و ئابوری بگەیەنیتی، جا بۆ ئەوەی پیشکەوتن و شارستانیەتیان بگەیەنیتی، دەولەت «گوندی نمونەیی» ان بۆ دروست ئەکات، کە هەمو نیشانەکانی پیشکەوتن و ئاوەدانی.. بە جوریکی ئەوتو تی دایە، کە تەنانەت لە گوندەکانی نزیک بەغدا و شارەکانی تریش دا نین.

٣. صەددام جاری یەکەم کە مەسەلەی راگویزانی کوردی لە «سەنگەریک یا دو سەنگەر» دا لە باری سەرنجی جەنگیی و ستراتیجیەوە لیک ئەدایەوە، ئەمجارە خستویەتیە چوارچیوەیەکی ترەوە کە لە قسەی ئەو ئەوروپاییە داگیرکەرە ئیمپریالیستیانە ئەچی کە کاتی خوی ئاسیا و ئەفەریقا و ئەمەریکای لاتینییان داگیر و تالان کرد بە ناوی ئەوەوە کە گوایە: کابرای سپی پەیامی پیشکەوتن و ئاوەدانی ئەبات بۆ گەلانی دواکەوتوا

رەگەزپەرستەکانی عیراق ناوچەکانی سنور رائەگویزن نەک لە بەر ئەوەی ئەیانەویت کورد پیش بخەن و، کوردستان ئاوەدان بکەنەوە و، شارستانیتی و ژیانی خوش و پیشکەوتوی تی دا ئامادە بکەن، بەلکو ئەیانەویت یەکیتی نەتەوەی کورد تیک بدەن و، کوردی عیراق لە پارچەکانی تری کوردستان دابپرن، چونکە هەمو ئەو هەول و .تەقەلا ئابوری و سیاسی و کومەلایەتی و فەرهەنگی و عەسکەری یانەی کاربەدەستانی عیراق و دەولەتەکانی دراوسی داویانە بو لە یەک پچراندنی کورد، تا ئیستا سەرنەکەوتوە و، بەم شیوەیە ئەیانەویت بوشاییەکی زەمینیی لە بەینی کوردستانی عیراق و پارچەکانی کوردستان لە ئیران و تورکیا و سوریا دروست بکەن و، ئەو بۆشاییەش بە سەربازگە و سەنگەر و قایمکاری جەنگیی پر بکەنەوە کە وەکو شورەیەک وابی لە نیوان کوردی عیراق و کوردی پارچەکانی تری کوردستان دا.

ئەو ناوچانەی راگویزراون لە سنورەکان لە گەڵ ئەو ناوچانەی کە بە دەستەوەیە رابگویزرین بە لایەنی کەمەوە تەقدیر ئەکریت بە ٢٥ هەزار کیلومەتری چوارگوشە، کە دو ئەوەندەی قەلەمرەوی لوبنان زیاترە.

- ٣ -

راگویزانی کورد لە سەرزەمینی باوباپیرانی جگە لەوەی کە سیاسەتیکی رەگەزپەرستانەی دژی مروڤایەتیە، هەنگاویکیشە بو پەرت و بلاوکردنەوە و تواندنەوەی ئەو کوردانەی رائەگویزرین، چونکە ئەم خیزانە کوردانەی دور ئەخرینەوە بی بەش ئەکرین لە

پیشەی هەمیشەیی خۆیان کە ژیانیانی لە سەر بوە: کشتوکاڵ و پەروەردە کردنی ئاژەڵ. ئەمە وایان لی ئەکات کە ئیتر نەتوانن خۆیان بە خێو بکەن و، چاویان لە دەستی کاربەدەستانی بەغدا بیت، بە تایبەتی لە بەر ئەوەی کە لە کار و پیشەکەی پیشویان دور خراونەتەوە بی ئەوەی لە «ئوردوگا زورەملیەکان» یش دا هیچ کار و پیشەیەکی تریان بۆ تەئمین کرابی.

کاربەدەستانی بەغدا پلانیکی رەگەزپەرستانەیان داناوە بۆ ئەوەی ئەمانە بکەنە کریکار لە خوارووی عیراق و، لەم بارەیەوە پیشتر بلاویان کردوتەوە کەوا زیاتر لە ٤٠ هەزار کریکاریان پیویستە بۆ کارگاکانی ناوەراست و خوارووی عیراق. بە پیی لیکدانەوەی رەگەزپەرستەکان ناچاریی خۆ بەخیو کردن و پیویستیی گوزەران، وا لەم خەلکە بی ئیشە راگویزراوەی کە لە زەویەکانی خۆیان هەلکەنراون، ئەکات، کوچ بکەن بەرەو بازاری کار و نان پەیدا کردن، ئەمەش بیگومان زەرەر لە ئابوری عیراق ئەدات، چونکە ئەمانە شارەزاییان لە کاروباری کریکاری دا نیە، بەلام رژیمی فاشیستی عیراق ئەمەی لە لا گرنگ نیە، بەلکو تەنیا مەبەستی تواندنەوەی کوردە لە ناو عەرەبی ناوەراست و خوارووی عیراق دا.

رژیمی بەغدا سەدان ملیون دیناری بودجەی عیراقی سەرف کردوە لە دروستکردنی خانو و بەرەی «ئوردوگا زورەملیەکان» دا و، لە بژاردن و دانی پارەی نەختینەدا بە خیزانە راگویزراوەکان و کاروباری تر، ئەم پارەیە سەرف ئەکری لە ویران کردنی بەشیکی ولات و دەربەدەر کردنی دانیشتوەکانی دا.

راگویزان زەرەریکی گەورەی داوە لە کەرتی کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵ چونکە ئەو ناوچانەی راگویزراون و بە دەستەوەیە رابگویزرین لە ٢٥ تا ٣٠ هەزار کیلومەتری چوارگۆشە ئەگریتەوە کە ئەکاتە سی یەکی سەرزەمینی کوردستان. جا ولات لە بەرهەمی کشتوکاڵ و بەروبومی ئاژەلی ئەم ناوچە گەورەیە بی بەش ئەبیت و، ئەمەش گرانی و ناریکی ئابوری لە ناوچەکانی کوردستان دا دروست ئەکا، جگە لەوەش ئەو خەلکە زورەی ئەچنە نزیک شارەکان ئەبن بەبار بە سەر ئەو ناوچانەوە، نەک ژیانی خۆیان پی مسوگەر ناکری، ژیانی خەلکی شارەکانیش ئەخەنە تەنگوچەلەمەیەکی تەواوەوە.

بە هۆی راگویزانەوە بیکاری زیاتر ئەبی، ئەمەش گیروگرفتی قولتر بۆ ئابوری عیراق بە گشتی و، بۆ ئابوری کوردستان بە تایبەتی، دروست ئەکا.

بە پیچەوانەی ئەو پروپاگاندەیەوە کە رژیمی بەغدا ئەیکات، راگویزان زەرەر لە خزمەتی گشتی (تەندروستی، خویندن..) ئەدات، چونکە هەندی لەو دیهاتانەی ویران

کراون ئەخوشخانە، قوتابخانە و مزگەوتیان تی دا بوە سوتینراون. ئەو ئوردوگایانەیش کە بویان گویزراونەتەوە قوتابخانە و نەخوشخانە و مزگەوت و (داوودەزگای خزمەتی گشتی) یان تی دا ئامادە نەکراوە، ئەمە جگە لەوەی کە کارەباییان تی دا نیە و پروژەی ئاوی خواردنەوەش لەو شوینانەدا ئامادە نەکراوە.

ئەگەرچی ئوردوگا زورەملیەکان ناو نراون گوندی هاوچەرخ و نمونەیی، بەلام لە راستی دا کامپی گرتن (معسکرات الاعتقال) ن، چونکە هیزی سوپای بە دەورەوە دامەزرینراوە و پاسیان ئەکات.

سەرەرای هەمو ئەم لایەنە خراپانە، راگویزان لە روی سیاسیەوە بریتیە لە لادانیکی زیاتر بە لای ئیمپریالیزم و، دەولەتە کونەپەرستەکانی ئیران و تورکیادا، ئەمە زەرەر لە سەربەخویی ولات ئەدا، چونکە ئەو شوینانەی چول ئەکرین یەکجار فراوانن، ماوە ئەبیت دەولەتانی ئیران و تورکیا (تسلل) بکەنە ناوی و، بو مەبەستی خویان بە کاری بهینن. لە راستی دا وازهینانی رژیمی بەغدا لەم ناوچە فراوانەی خاکی ولات خیانەتیکی نیشتمانی و نەتەوەییە، بە نیازی جیبەجی کردنی سیاسەتی زەمینی سوتاو (الارض المحروقە) بو سوتاندنی تەر و وشک لە دیهاتەکان دا، بو لە ناو بردنی مەر و مالات و ئاوەدانی و رەز و باخ و، هەمو سەرمایەیەکی تر گوایە بو ئەوەی تەنگ بە ژیان و گوزەرانی پیشمەرگە هەلبچنیت و لە برسان دا بیکوژیت، کە بیگومان ئەمەش بو رژیمی بەغدا ناچیتە سەر، چونکە میللەت پشتیوانی شورشە و، گەل ژیانی پیشمەرگە تەئمین ئەکات.

ئەم سیاسەتەی رەگەزپەرستەکانی عیراق دژی گەلی کورد و خاکی کوردستان گرتویانە، دژی هەمو ئەو یاسا و پەیمان و ریککەوتنە جیهانی و مروڤایەتیانەیە کە عیراق سەبارەت بە ئەندامەتی لە (کومەلەی نەتەوە یەکگرتوەکان) دا مۆری کردوە.

- ٤ -

رەگەزپەرستەکانی عیراق کە دەست ئەکەن بە راگویزانی ناوچەیەک بەم جورە ئەیانەویت ئاوەدانی و پیشکەوتنی تی دا بلاو بکەنەوە.

- سوپا بە هالیکوپتەر و ئوتومبیل و تانک و زریپوش و پیاوە هیرش دینیتە سەر ناوچەکە و، دەوری ئەو شوینانە ئەگری کە بریاری راگویزانیان دراوە.

- پاش داگیر کردنی ناوچەکە، دانیشتوانی گوندەکە ئەگیرین و بە خویان و هەندیک کەلوپەل و ئاژەل و گاوگوتالەوە راپیچ ئەکرین و ئەیپەستینرینە ناو چەند زیلیکی سوپاییەوە.

- بە زیل ئەگویزرینەوە بو یەکیک لەو ئوردوگا زورەملی یانەی پیشتر ئامادە

کراوە بۆ نیشتەجێ کردنیان.

- لە کاتی گواستنەوەدا هەندێک پیر، ساوا، نەخۆش.. ئەمرن. بۆ نمونە لە کاتی ڕاگوێزانی دانیشتوانی گوندی باوزێ (قەلادزە) بۆ ئۆردوگای توسوران ١١ منال و ژنێک مردن.

- ئەوانەی ڕاتەگوێزرێن زۆر بە زەحمەت هەندێک لە کەلوپەلی پێویستیان بۆ دەرباز ئەکرێت و، ئەوانی تر هەموی بە جێ ئەمێنێت و سوپا ئاگری تێ بەر ئەدات.

- لە ناوچەی ڕاگوێزراوەدا:

خانوبەرە، مزگەوت، قوتابخانە.. بە تەقەمەنی ئەتەقێنرێ و کاول ئەکرێن و ئەسوتێنرێن.

باخ و ڕەز ویران ئەکرێ، ئاگر بەر ئەدرێتە بەرژینەکانی و، تەلانەکانی ئەروخێنرێ و، تیزاب ئەکرێ بە سەر داری بەری دا.

جوگا و بناوان و کانیەکان بە دینەمێت ئەتەپێنرێن و کوێر ئەکرێنەوە.

هەنگەلان ئاگری تێ بەر ئەدرێت و پورە هەنگ ئەتالۆزکێنرێن.

ماوە نادرێت بە جوتیارەکان بەرهەمەکانی ئەو وەرزەیشیان هەلبگرن، بەلکو شێنایی و خەلە و خەرمانیان.. ئەوی فریا بکەون ئەسوتێنرێ و، ئەوی تریان پێ بە جێ ئەهێلرێت.

بە نرخێکی هەرزان ئاژەل و گاگەلەکان لە جوتیارەکان ئەستێنرێ.

- ٥ -

ئەم هەنگاوە ڕەگەزپەرستیەی کاربەدەستانی عیراق دەرهەق بە میللەتی کورد بۆتە هۆی:

١. ڕاگوێزانی دەیان هەزار خێزانی جوتیاری کورد لە سەرزەمینی باووباپیری و پەکخستن و لە کار خستنی هەزاران دەستی کار.

٢. بەرەللا کردنی هەزاران دۆنم زەوی باشی بەراو و دێمی کشتوکال.

٣. وشک بون و لە ناوچونی هەزاران دۆنم ڕەز و باخی میوە و بەرەللا کردنی دەیان هەزار دۆنم لەوەڕگا.

٤. تەفروتونا بون و بە تالان چونی هەزاران میگەلی گەورە و گاگەلی گەورە.

٥. لە ناوچونی دەیان هەزار پورە هەنگ.

٦. ویران بونی سەدان گوندی ئاوەدان و هەزاران خانوبەرە، مزگەوت، قوتابخانە..(تەواو)

دوەمین کۆبونەوەی

کومیتەی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

خولی دوەمی کوبونەوەکانی ک س - ی ن ک چەندین مەسەلەی گرنگی سیاسی، پیشمەرگەیی، ئیعلامی، ریکخراوەیی، دارایی لە بەردەم دا بو کە ئەبو لی یان بدوی و باسیان بکات و بریاریان لە سەر بدات.

کومیتەی سەرکردایەتی پیک هینرایەوە لە:

نوینەرانی بزوتنەوە: عەلی عسکەری، تایەری عەلی والی، خالید سەعید،، سەید کاکە، حاجی حاجی برایم، عومەر مستەفا (لە دەرەوە بو)

نوینەرانی کومەلە: ئازاد هەورامی، مەلا بەختیار، عومەر عەبدوللا، تالیب روستەم، من و، سالار (لە دەرەوە بو).

نوینەرانی خەتی گشتی: شیخ حسین و، دەستەی دامەزرینەر (کە لە دەرەوە بون).

مامجەلال هەلبژیردرایەوە بە سکرتیری گشتی و، مەکتەبی سیاسی لە ۲ نوینەری بزوتنەوە: عەلی عسکەری و تایەری عەلی والی و، ۲ نوینەری کومەلە: سالار و ئازاد، پیک هینرایەوە.

سالار لەو کاتەدا هیشتا لە دەرەوە بو من پیشنیارم کرد لە مەکتەبی سیاسی دابنریتەوە. لە روژانی کوبونەوەکەدا تالیب، بە بیانوی ئەوەی ریزی نەگیراوە و پرسی پی نەکراوە، ئیستیقالەی لە نوینەرایەتی کومەلە و لە کومەلە کرد. لام وایە هوی راستەقینە ئەوە بو نەکرا بو بە ئەندامی سەرکردایەتی کومەلە، چونکە خوی لەوانی تر بە شایستەتر ئەزانی.

سەرلەنوی فەرماندەی هەریم و یاریدەدەرەکانیان و، لیپرسراوی لقەکان، دیاری کران. تالیب روستەم، فەرماندەی هەریمی ٦ ی پشدەر بو، لە هەمان کاردا هیلرایەوە.

پیکهینانی ناوەند و، دەرکردنی ئورگان و، سەرپەرشتی ریکخستنەکانی کومەلە، بەواتایەکی تر زوری کارەکانی کومەلە کەوت بوە ئەستوی من. من ئیتر نەمئەتوانی فەرماندەی هەریم بم، خویشم نەمئەویست بچمە مەکتەبی سیاسییەوە، ئەمویست جی بو هاوریکانی ترم چول بکەم.

*

لە ناو ئەو مەسەلە گرنگانەدا کە باس کران:

یەکیکیان، هەلبژاردنی شوینیک بو بارەگاکانی سەرکردایەتیان تی دا دابنری. ئەوی تریان، مەسەلەی راگویزانی دیهاتەکانی سنور بو.

بارەگای مەکتەبی سیاسی لەو کاتەدا لە «نۆکان» بو، بەلام «نۆکان» نەرزی ئیران بو. کاتی خوی قم ئاوایان کرد بوەوە. مەکتەبی سیاسی بە ناچاری لە بەر سەرمای زستان و لە بەر بی جیگایی چو بوە ناوییەوە. ئیران هەرەشەی کرد بو ئەگەر چولی نەکەن هیز بنیریتە سەریان بە زور دەریان بکا.

راگویزانی ئاوایییەکانی سنور بە مەترسییەکی گەورە بو سەر پاشەروژی گەلی کورد دائەنرا، لە بەر ئەوە بریار درا بە هەمو تواناپەکەوە بەرەنگاری بکری و، دانیشتوانی ناوچەکانی سنور ساز بدرین و، ریک بخرین بو شەری بەرەلستی راگویزان.

*

گرنگی ناوچەی ۳ سنور

ک س - ی ن ک لە کوبونەوەکانی دا، بە گشتی بریاری دا کە بارەگا و بنکەکانی دەزگا سەرکردەییەکانی شورش بهاتەوە شوینەکانی سالی پیشو لە ناوچەی برادوست، کە ئەکەویتە ناوچەی ۳ سنوری عیراق - ئیران - تورکیاوە، لە بەر زور ئیعتیباری نەتەوەیی، سیاسی، جەنگیی، تاکتیکی...

ناوچەی ۳ سنور ئەو کاتە گرنگییەکی گەورە و تایبەتی هەبو لە چاو شوینەکانی تری کوردستانی عیراق دا چونکە:

۳ دەولەتی عیراق، ئیران و تورکیا و، ۳ پارچەی جیاجیای کوردستانی پیکەوە گری ئەدا و ناوچەکانی بادینانی عیراق و سورانی عیراقی بە یەکەوە ئەبەست، هەروەکو توانای هینانی ئازوقە و کەلوپەلی پەیویست لە ۳ دەولەتی جیاوازەوە هەبو، ئابلوقەدانی ئابوری دژوار بو، سەرەرای ئەوەی کە ناوچەکەش شاخاوی و سەخت و عاسیی بو دوژمن نەیئەتوانی لە هەمو لایەکەوە ئابلوقەی سپایی بدات و بە ئاسانی بیگاتی و بویری بچیتە ناویەوە.

جگە لە مانە هەموی، لە بەر ئەوەی کە بەهار و هاوین و پاییزی ۱۹۷۷ بارەگای سەرکردایەتی ی ن ک و هیزیکی گەورەی پیشمەرگە لەوی بوبو، وە زستانەکەی لە بەر نەتوانینی تەئمین کردنی پارەی ئازوقەی هیز و بارەگاکان کشا بونەوە ناوچەکانی هەولیر و سلیمانی، ژمارەیەکی زور لە سەرکردە و کادرە پیشمەرگەیی و سیاسی و پیشمەرگەکانی شارەزاییەکی باشیان لە هەر ۳ دیوی ناوچەکە و ناسیاوی و ئاشنایەتییان لە گەل خەلکی هەر ۳ دیوەکەی سنور هەبو.

*

دانانی پلانی گواستنەوە و ئامانجەکانی

ک س - ی ن ک بە گشتی بریاری دا کە بارەگای سەرکردایەتی بهاتەوە ناوچەی برادوست لە سەر سنور بۆ ئەوەی:

١. بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان لە شوێنێکی ئەمین دا جێگیر ببی و بپەرژێتە سەر جێبەجێ کردنی ئەرک و فرمانەکان.

٢. پێش ١٩٧٨/٦/١، واتە پێش کاتی جێبەجێ کردنی بریاری حکومەتی عێراق لە سەر راگوێزانی دێهاتەکانی سنور، رێگەی پەیوەندی لە گەڵ دنیای دەرەوە و، رێگەی هێنانی تفاقی جەنگی و، یارمەتی و پێویستیەکانی شورش بکاتەوە.

٤. پاککردنەوەی ناوچەکە لە چەکدارەکانی قم ئەگەر بونە رێگری پلانەکانی یەکێتی.

٥. داوای یەک لە سەر یەکی دوستەکانی یەکێتی لە تورکیا بە تایبەتی دە دە قا دە بو نزیک بونەوەی هێزەکانی یەکێتی لە سنورەکانی تورکیا.

*

بو جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجانە ک س - ی ن ک بریاری دا:

١. زانیاری تەواو لە سەر ناوچەکە کو بکاتەوە، بە تایبەتی ئەو ئالوگورانەی بە سەر هێزەکانی دوژمنان دا لە ناوچەکەدا هاتون.

٢. هێزێکی ئەوتو ساز بدات بو ئەوەی بەرەو شوێنی دیاریکراو بە ری بکەوی و بەشی جێبەجێ کردنی پلانەکەی یەکێتی بکات.

٣. شوێنی جێگیر بونی هێزەکەی یەکێتی کە لە دوا قوناغ دا، واتە لە ناوچەی برادوست دا، قایم بکات.

تەرازوی هێزەکانی ناوچەکە

سەرکردایەتی یەکێتی کەوتە کوکردنەوەی زانیاری و دەنگوباسی پێویست لە چەندین سەرچاوەی سەرەکی و لاوەکی جیا جیاوە لەوانە:

١. دە دە کا دا.

٢. ئەوانەی لە لای قم موە رایان ئەکرد و ئەهاتنە ریزی یەکێتیەوە.

٣. ئەو کادر و دوستانەی یەکێتی لە ناوچەکانی قم دا هەبون.

٤. ئەو پێشمەرگانەی یەکێتی کە لە لای قم گیرا بون.

ئەو زانیاریانەی لەم سەرچاوانەوە هاتن لە سەر هێزە چەکدارەکانی قم: ژمارەیان، جوری چەکەکانیان، لێپرسراوەکانیان، بارەگاکانیان، ورەی جەنگاوەرانەیان، توانا و ئیمکانیاتی سیاسیان، پشتیوانییان لە ناو عەشیرەتەکانی سەر سنور دا.. لە یەک دران،

هەروەها ئەو زانیارییانەی لە سەر هێزەکانی عێراق و ئێران و تورکیا کۆکرابونەوە هەڵسەنگێندران، ئەنجامەکانی بەم چەشنە بو:

- هێزە چەکدارەکانی حکومەتی عیراق:

سەربازگە و نوقتە و رەبیەکانی جەیش، لە ناوچەکانی چومان، برادوست، میرگەسور، گورێنێکی ئەوتویان بە سەردا نەهات بو و، هەر لە شوێنەکانی سالی پێشو بون.

- هێزە چەکدارەکانی حکومەتی تورک:

قەرەقولەکانی سەر سنور، دائیمی و موەقەتەکان، لە ناوچەکانی گەوەر، شەمزینان، چەلی، ئەوانەی زستانە لە شوێنەکانی خویان بون و ئەوانەی هاوینە هێشتا نەهات بونەوە.

- هێزە چەکدارەکانی حکومەتی ئێران:

پاسگا و پایەگا و پادگانەکان، لە ناوچەکانی سەردەشت، خانە، شنو، لە شوێنەکانی خویان دا بون و، ئالوگورێکی گرنگیان بە سەردا نەهات بو.

- هێزە چەکدارەکانی قم:

بارەگاکانیان: گوستە، چەمەتو، هەرکی، شەتونس، بێلاو.

لێپرسراوەکانیان: سامی سنجاری، ئەورەحمان بێداوی، ئازاد مەحمود خەفاف، وریا رشوف سەعاتچی، ئازاد بەرواری، غازی زیباری، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق، کەمال کەرکوکی، ملازم سەردار ئەبوبەکر، ملازم عومەر عوسمان، عەریف یاسین، مستەفا نێرویی، نیهاد، یونس روژبەیانی، حەمید حسێن، عەبدوللا سالح، هاشم رەمەزان، مەلا ئەمین بەرزانی.

ژمارەی هێزی ئەسلیان: ۲۵۰ - ۳۰۰ چەکدار.

هێزە چەکدارەکانی قم لە چەندین بارەگا و بنکەی دور و لە یەک دابراو دا لە هێلێکی درێژی سنوری تورکیا - عیراق دا پەرت و بلاو بون، هیچ بارەگایەکیان لە ۳۰ - ۵۰ کەس زورتری تی دا نەبو.

هێزە چەکدارەکانی قم لە روی چونایەتی سیاسی و سوپاییەوە پێکەوە نەگونجاو و ناریکوپێک بون، هەندێکیان خوێندەواری شاری بون لە ئەورووپاوە گەرابونەوە، وەکو: سامی، ئازاد خەفاف، وریا.. و، هەندێکیان پیاوی بنەماڵەی بارزانی بون و، لە ئێرانەوە نێردرابونەوە، وەکو: عەریف یاسین، حەمید ئەفەندی، یونس.. و، هەندێکیان خەڵکی دێهاتەکانی سنور و، هەندێکی تریان خەڵکی ناو تورکیا بون.

دە دە کا دە وای ئیدیعا ئەکرد کە قم لە ناو چەند سەروک عەشیرەتێکی

کونەپەرست دا لە چەلی و ئولودەرە نفوز و دەسەلاتی هەیە و، دە دە کیا دە خوی لە ناو هوز و خیلەکانی شەمزینان و سەرانسەری هەکاری دا نفوز و دەسەلاتی هەیە و، لە کاتی گەیشتنی هیزی پیشمەرگەی یەکیتی دا ئەوان هاوکاری سیاسی و جەنگیی یەکیتی ئەکەن.

*

دارشتنی پلانی دوایی و دیاری کردنی هیزەکان

لە ئەنجامی بەراورد و تاووتوی کردنی ئەو زانیارییانەدا ک س - ی ن ک بریاری دا هیزیکی تیکەلاوی چەکدار و بی چەک لە پیشمەرگەی زوربەی هەریمەکانی کوردستانی عیراق ساز بدا و بە ری ی بکات:

۱. بەشیکی هیزەکە بو پاراستنی بنکەکانی مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری لە برادوست بمیننەوە.

۲. بەشیکی تری دوای پر چەک کردنی بە چەکی زیادەوە بگەرینەوە ناوچەکانی خویان.

۳. مەفرەزەکانی بادینان لە گەل هیزیکی پشتیوانی و یارمەتیدەر دا بچنەوە بادینان.

بەمجورە یەکیتی هیزیکی گەورەی ساز دا، کە نزیکەی ۱۰۰۰ پیشمەرگە ئەبو لە چەکدار و بی چەک، لە خەلکی ناوچەکانی سەرانسەری کوردستانی عیراق هەر لە خانەقینەوە تا زاخو، لە گەل زورایەتی ئەندامانی ک س و ژمارەیەکی زور لە فەرماندەی هەریم و کەرت و مەفرەزەکان و کادرە سیاسیەکان، کە بکەونە ری.

بریار درا ئەو هیزە گەورەیە ببیتە ۳ بەش، هەر بەشیکیان چەند لیپرسراویکی لە گەل بیت، پیشمەرگەکانی هەندیکی چەکدار و هەندیکی بی چەک و، خوی ئازاد بیت لە هەلبژاردنی ئەو ریگایەدا کە ئەیگریتە بەر بەو مەرجەی لە کات و شوینی دیاری کراودا ئامادە بیت. خوی وەکو هیزیکی سەربەخو بەرپرسی دوزینەوەی ریگا و شارەزا و تەئمین کردنی ئازوقە و زەخیرە و ولاخ.. بیت.

بەشی یەکەمی هیزەکە:

۳۲۰ پیشمەرگە زیاتر بو لەوانە ۱۵۰ چەکدار و ئەوی تریان بی چەک بون.

ئەو لیپرسراوانەی لە گەل هیزەکە بون: خالید سەعید (ئەندامی م ع - ی ن ک)، حسین بابەشیخ (ف. ه. بادینان)، مەحمود عەبدولرەحمان (ف. ه. ۳ شارباژیر)، رئوف مستەفا (ف. ه. پینجوین). حامیدی حاجی غالی (یاریدەدەری ف. ه. ۱ ی هەورامان

و شارەزوور).

ئەم هێزە ئەبوایە لە ٧٨/٤/١٩ دا لە ناوچەی قەلادزەوە بکەویتە ری و، لە سەرەتای مایس دا لە ناوچەی برادوست بی.

بەشی دوەمی هێزەکە:

نزیکەی ٥٠٠ پێشمەرگە ئەبو لەوانەی نزیکەی ١٥٠ کەسیان بی چەک بون.

ئەو لێپرسراوانەی ئەبو لە گەل هێزەکە بن: عەلی عەسکەری (فەرماندەی هێزی پێشمەرگە)، تاهیری عەلی والی (ئەندامی م س و مع - ی ن ک)، سەید کاکە (ف. هـ. ٨ ی هەولێر)، تالیب روستەم (ف. هـ. ٦ ی قەلادزە)، شێخ جەوادی بیدەری (یاریدەدەری ف. هـ. چەمی ریزان).

ئەم هێزە ئەبوایە لە ٧٨/٤/٢١ دا، واتە دو روژ دوای جولانی بەشی یەکەم لە ناوچەی قەلادزەوە بکەویتە ری و، لە سەرەتای مانگی مایس دا لە گەل بەشی یەکەمی هێزەکە لە برادوست یەک بگرێتەوە.

بەشی سێیەمی هێزەکە:

نزیکەی ١٥٠ کەس بو کە زوربەیان چەکدار بون و، ئەبوایە سکرتێری گشتی یەکێتی و، ئەندامانی تری م س و، نوێنەرانی کومیتەی ئامادە کردنی - پ د ک و، پاسوکی لە گەل بی.

ئەبوایە ئەم هێزە لە ٧٨/٤/٢٧ دا بکەوتایەتە ری و لە قەندیل چاوەروانی هەوالی یەکگرتنەوەی بەشی یەکەم و دوەمی هێزەکە برادوستی بکردایە و، ئینجا ئەویش بە ری بکەوتایە بەرەو برادوست.

جگە لەم هێزانەی بەری ئەکران بەرەو برادوست، لە سنوری هەر هەرێمێک دا چەند مەفرەزە یاخود کەرت و، فەرماندەی هەرێمەکە یاخود یاریدەدەرەکەی گل ئەدرایەوە بو ئەوەی ناوچەکە لەو ماوەیەدا چول نەبێت و بوشاییەکی پێشمەرگەیی و سیاسی دروست نەبی.

ئەم هێزانە چەکەکانیان بریتی بو لە: کلاشینکوف، برنەو، هەندی رەشاشی برنەو و، چەند دانەیەک ئارپیجی.

*

دیسانەوە مەسەلەی ق م

ئەم هێزانە و لێپرسراوەکانیان لە روی سیاسی و پێشمەرگەییەوە زور ریک و تەبا نەبون، جگە لەو ناکوکیانەی لە ناو باڵە جیاوازەکانی ناو یەکێتی دا هەبو، هەندی ناکوکی

توندوتیژ لە ناو سەرکردایەتی بزوتنەوەدا هەبو، بە تایبەتی لە سەر مەسەلەی بە عیراقی کردنی شورش، هەلگرتن یا داگرتنی دروشمی روخاندنی رژێمی عیراق، پاک کردنەوەی کوردستان لە پاشماوەی چەکدارەکانی قم.

مەسەلەی پاک کردنەوەی کوردستان لە چەکدارەکانی قم، وە یاخود «هدنە» کردن لە گەلیان و هەولدان بو دوزینەوەی «شێوەیەکی بە هێمنی پێکەوە ژیان» دیسانەوە هاتەوە کایە و، هەندێ لە سەرکردەکانی بزوتنەوە کەوتنەوە لێدانەوەی ئەو بالورەیە، کە بێ گومان لەو کاتە گرنگەدا دودلی و رارایی لە ناو هێزەکەدا دروست ئەکرد و گیانی جەنگاوەرانە و دەس وەشاندنی لە پێشمەرگەکان دا ئەمراند. ئەو قسە و باسانەی لە کوبونەوەکان دا ئەکرا زور جار لە ناو پێشمەرگەکانیش دا دەنگی ئەدایەوە.

یەکدلی لە هەلوێستی سیاسی هێزەکەدا لە روی دیاری کردنی دوست و دوژمنەوە و، یەکدەستی لە هەلوێستی سوپایی هێزەکەدا لە روی لێدانی بێ چەندوچونی دوژمنانەوە، کە شتێکی پێویست بو، دیسانەوە خرایەوە سەر مێزی لێدوان و گفتوگو و باسکردنەوە. دودلی و رارایی لە لێدانی قم دا جارێکی تر لە دلی هەندێک دا شین بوەوە، تەنانەت لە ناو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دا هەبو رەئی وابو کە بو ئەوەی یەکێتی بتوانێ بێ گیرمە و کێشە رێگەی هێنانی چەک بکاتەوە و، ماوەی خەلک چەکدار کردنی هەبێ، لە گەل قم رێک بکەوێ و، نیسبەتێکی ئەو چەکانەی ئەیهێنێ لە باتی «گومرگ» و «باج» بدات بەوان.

پاشماوەی ئەندامانی ک س - ی ن ک دیسانەوە چەند جاری کوبونەوە، بو دیاریکردنی هەلوێستێکی نوێ لە قم، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئیدریس یەکدو کەسی «ساواکیی» راسپارد بو، لەوانە کابرایەک بە ناوی مەینە کویە، بە ناو بو گفتوگوی رێککەوتن و، لە راستی دا بو کوکردنەوەی دەنگوباس و بو خاو کردنەوە و پیلانگێران.

*

نامەنوسین بو دەسەلاتدارەکانیان

بەر لە بەرێکەوتنی هیچ کام لەو ٣ بەشانەی هێزەکان، لە ئەنجامی ئەو کوبونەوانەدا ک س بریاری دا کە ئەم هەلوێستە بەرامبەر قم بگرێ بو ئەوەی سەرکردایەتی هێزەکە پەیرەوی بکات:

١. هێزەکانی یەکێتی لە هەمو حالەتێک دا بچێتە ناوچەی برادوست.

٢. ئەگەر قم بە بێ شەر بارەگاکانی سالی پێشوی یەکێتی یان لە گوستە چول کرد، وا بە دویان نەکەون و وازیان لێ بهێنن.

۳. ئەگەر چەکدارەکانی قم هاتنە سەر ریگەی هیزەکانی یەکیتی، وا بە توندی لیّیان بدری.

دوای دانی ئەم بریارانە، دیسانەوە، چەند کوبونەوەیەکی تر کرا. ئەمجارەیان بریار درا وەکو نیشانەی نیازپاکی و، بە نیازی خۆلادان لە شەری قم و، خاو کردنەوەی گرژی نیوان یەکیتی و ئەوان، دەسپیشخەرییەکی نوی بکری: لە بەر ئەوەی لەو کاتەدا مەلا مستەفا و مەسعودی کوری لە ئەمەریکا بون، چەند نامەیەک بو هەندی لە گەورەکانی بنەمالەی بارزانی و، کەسانی نزیکیان بنوسری، لەوانە: مامجەلال و عەلی عەسکەری سەرو نامەیان بۆ شیخ محەمەد خالید بارزانی و، عەلی عەسکەری نامەی بۆ ئیدریس بارزانی و، خالید سەعید نامەی بۆ دایکی مەسعود و، تاهیری عەلی والی نامەی بۆ رەشید سندی و چەند کەسیکی کە نوسی. ناوەروکی ئەم نامانە بریتی بو لەوەی کەوا:

- کوردستان لە مەترسی راگویزان و بە عەرەب کردن دایە و، کورد لە مەترسی لە ناو چون و تەفروتونا کردن دایە، بویە ئەبی کورد هەموی یەک بگری بو بە گژدا چونی دوژمنی سەرەکی کە حکومەتی عیراقە.

- ئەو هیـزەی بەرەو برادوست ئەکـەویتــە ری بو ئەوەیە کـە هەرچی زوتر ریگای هینانی چەک بکاتەوە و، فریای دانیشتوانی ناوچەکانی سنور بکەوی پیش ۷۸/٦/۱ کە کاتی دەس پی کردنی راگویزانیانە.

- ئەو هیزە نیازی پەلاماردانی قم ی نیە، بەلکو بو ئەو ئاماڤجە پیروزە ئەچی و، ئەوانیش نفوزی خویان لە لای مەلا مستەفا و کورەکانی و پیاوەکانی بەکار بهینن بۆ ئەوەی نەهێنە ریگری هیزی پیشمەرگە لە بادینان و سنوری تورکیا و، شەر بە هیزەکانی یەکیتی نەفروشن.

ئەم نامانە بە راسپیردراوەکانی ئیدریس دا نیردران بۆ تاران و کەرەج و، گەیشتە دەس خاوەنەکانی.

کوبونەوەی یەک لە دوای یەک و، گورینی پەیتا پەیتای بریارەکان و، نوسین و ناردنی ئەم نامانە، رادەی دودلیی سەرکردایەتی یەکیتی دەرئەخا لە مەسەلەی لیدانی قم دا، دودلیی و رارایی لە بریاردانی جەنگیی دا، بە تایبەتی لە کاتی ناسک دا، دەردیکی کوشندەیە و، دوژمن ئەتوانی بە چاکترین شیوە کەلکی لی وەربگری. لە کاتیک دا سەرکردەکانی قم کە هەمو چەکدار و دوست و لایەنگرەکانی خویان بە گیانی دوژمنایەتیەکی سەخت و بی ئەندازەی یەکیتی پەروەردە کرد بو، بۆ ئەوەی کە بی سیودو لە روی دا رابوەستن و بە گژی دا بچن و ئەگەر بتوانن، یەکیتی وەکو هیزیکی دوژمن بە

خویان، له ڕەگوریشه دەربهێنن، کەچی گومان و دودلی و ڕاڕایی خرا بوە ناو هێزەکانی یەکیتیەوە کە: ئاخۆ ئەو شەرە بکری باشە یا نەکری؟ ئەو شەرە براکوژیە یان براکوژی نیە؟ قم لە یەکیتی نادەن ئیتر بوچی یەکیتی لەوان بدات؟

*

بەریکەوتنی هێزەکان بەرەو ناوچەی ٣ سنور

هێزەکان خویان ئامادە کرد بۆ ئەوەی بەرەو ئامانجی دیاریکراو بکەونە ڕێ. لە بەر گەورەیی هێزەکە و زۆر باس کردن و زۆر مانەوە، مەسەلەی پاراستنی نهێنیی بەریکەوتن و ڕیگەکەی و ئیتیجاهی و دواقوناغی، هەروەها مەسەلەی ئامانجی بەریکردنی، لە لای هەمو دوژمنەکانی یەکیتی: چ حکومەتەکانی عیراق، ئێران، تورکیا و، چ قم دیار و ئاشکرا بو.

بەشی یەکەمی هێزەکە، لە کاتی دیاریکراوی خوی دا واتە لە ٧٨/٤/١٩ لە «گورشبیر» ەوە بە دیوی ئێران دا سنوراو سنور کەوتە ڕێ، ناوچەی سەردەشت و بەشیکی خانە (پیرانشەهر) یان بری بو و لە نزیک حاجی هومەرانەوە ئاودیوی عیراق بویونەوە و، لە ئالانە - گوندەژور - گرتک و ڕوست - هیردن - بیرکمە وە گەیشت بونەوە برادوست.

لە بەر ئەوەی هێشتا هێزەکانی دوژمن بە تەواوی بە خۆ نەکەوتبون، ئەم هێزە توشی شەر و برسیتی و سەرما نەبو، گیروگرفت و نارەحەتی زوریان نەهاتە ڕیگا. تەنها لە «بیرکمە» توشی شەریک بون پیشمەرگەیەکیان کوژرا. بەلام هێزەکانی دوژمنی هوشیار کردەوە کە هەرچی زوتر بکەونە خۆ ئامادە کردن بو ڕیگە گرتن و لیدانی هێزەکانی تری یەکیتی.

*

پیلانی حکومەتی ئێران و تیکچونی پلانی ڕویشتن

بەشی دوەمی هێزەکە بە هیوای ئەوەی سود لە چاوپوشینی حکومەتی ئێران لە هاتوچوی کەمی پیشمەرگە وەربگری، خوی دواخست و، بە تەمای ئەوە بو کە بە ئوتومبیل بە ناو ئێران دا لە جادەی سەردەشت - پیرانشەهر - شنۆ وە بڕوات لە نزیک کیلەشین دابەزی و، لەوێوە ئاودیوی عیراق بێ و بچیتە ناوچەی برادوست.

سەرکردایەتی هێزەکە چەند کەسیکی نارد بۆ دیوی ئێران بۆ ئامادە کردن و بە کری گرتنی ئوتومبیلی گواستنەوەی هێزەکە. ئەم هێزە لە باتی ئەوەی وەکو چاوەری ی نەکرد ئوتومبیلی پی بگات، زانیاری پیویست لە سەر ژمارە و لیپرسراو و، چەکەکانی و ئیتیجاهی ڕویشتنی، گەیشتەوە ساواک و ئەرتەشی ئێران. پاش ئەوەی ئائومید بو لە «بە ئوتومبیل ڕویشتن» کەوتە خۆ ئامادە کردن بۆ ئەوەی بە پی بکەویتە ڕیگا و چەند

کەسێکی تری ئاردە دیوی ئێران بۆ کڕین و ئامادە کردنی نان و خواردەمەنی و دانانی لە سەر ڕێگای تێپەڕ بونی هێزەکەدا.

سەرکردایەتی بەشی دوەمی هێزەکە، بەمە هەڵەیەکی یەکجار گەورەی کرد بەوەی کە خۆی دواخست و لە کاتی دیاریکراودا نەکەوتە ڕێگا و، لەوەش گەورەتر کە بە تەمای ئۆتۆمۆبیلی ئێرانی و بە ئاگاداری ئێران خۆی دواخست و نەخشەکەی بە تەواوی بۆ ئێران دەرکەوت و، ئەو (جەدوەلە زەمەنی) یەی کە بۆ جوڵان و بەڕێکەوتن و یەکگرتنەوەی هێزەکان دانرا بو، تێک چو. ئێرانیش لە باتی ئەوەی ڕێگەی تێپەڕینیان بدا بە ئۆتۆمۆبیل، لەو ماوەیەدا بە ناوی (مونااوەرە) ی جەنگییەوە هێزێکی یەکجار زۆری ساز دا و، بە درێژایی سنوری ئێران – عێراق هەمو شوێنە گرنگ و جادە و ڕێگاوبان و تەنانەت قاچاخە ڕێگاکانیشی داگیر کرد. هەر زوو زو کەوتە خۆی هەمو ئەوانەیشی بان گرت بو یاخود کڕی بو، کە چو بون بۆ ئێران، بۆ ئامادە کردنی نان و خواردەمەنی بۆ هێزەکە.

جگە لەمانە، هێزێکی گەورەی تری حکومەتی ئێران لە شاخەکانی دەوروپشتی نۆکان، توژەڵە، گۆزەشێر.. دامەزرا و، هەڕەشەی لە هێزەکانی یەکێتی کرد، کە هێشتا لەو ناوچەیە دا بون، کە ئەگەر لە ماوەی چەند سەعاتێک دا ناوچەکە چۆل نەکەن، هێزی زەمینی و ئاسمانی لێیان ئەدات.

*

بەڕێکەوتنی هێزەکان پێکەوە

بەشی دوەمی هێزەکە کە لە کاتی دیاریکراوی خۆی دواکەوت بو، لە گەڵ بەشی سێیەمی هێزەکە، کە ئەویش بە هۆی دواکەوتنی بەشی دوەمەوە کاتی جوڵانی خۆی دواخست بو، بە ناچاری هەمویان پێکەوە کەوتنە ڕێ بەرەو قەندیل. من لە گەڵ ئەو ڕەتلە دانرا بوم کە لە گەڵ مامجەلال بون، بەلام لە ناو ئەو ڕەتلەدا هیچ ئەرکێکی دیاریکراوم نەبو.

لە گۆزەشێر تێ پەڕی بوین لە ناو هەندێ دارودەوەن دا ڕاوەستا بوین، مەفرەزەیەک ئەگەڕایەوە بۆ خواری. مامجەلال ویستی نامە و هەندێ بڵاوکراوەیان پێ دا بنێری. سەلاح چاوشین فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە بو کە بەرپرسی پاراستنی مامجەلال بو.

مامجەلال سەلاحی بانگ کرد، وتی: «بڵاوکراوەکان بهێنە!»

سەلاح وتی: «مامە نەمان هێناوە»

مامجەلال وتی: «بۆچی نەتان هێناوە؟»

سەلاح وتی: «ولاخەکان ئەو هەمو بارەیان پێ هەڵ نەئەگیرا»

مـامـجـەلال سـەیری ولاخـەکـانی کـرد لـە پەتانی و لـبـاد و نایلون بار کـرا بون، بە توڕەییـەوە روی کردە سـەلاح وتی: «ئـیـمـە مـەکـتـەبی سیاسـیـین، یا مـەکـتـەبی لبادین؟ ئەو هەمو لبادەیان هەلگرتوە نەیانتەتوانی کارتۆنێ بلاو کراوەیش هەل بگرن؟».

سەلاح گەڕایەوە چو بلاوکراوەکانی هینا.

هەمو هیزەکە بە لای گورەشیردا چوینە دولە کوگێ. ئەو شوینانەی بەفریان لی توا بوەوە گـیـا سـەری دەرهینا بو، تازە ریواس پی گـەیشت بو. دولـە کوگی لـە بەر داپراوی و بەفری زور ئاوەدانی تی دا نەبو. چەند سالە پیشـمەرگەیەکی لی بو. شەوێ لە دولە کوگێ ماینەوە. پیش ئەوەی بە جێ ی بهیلین بە پیشـمەرگەکانم وت: «لیرە بـە دواوە ئیـتـر ژن و منال و مـەل نابینن!». لایان وابو گالتەیان لە گەل ئەکـەم. لەویوە هەلکشـاین بو «دەراوی گویزێ» بەرەو قەندیل.

*

ئەوی سەرنجی ریبوار رائەکیشی، لە زمانی کوردی دا هەندی ئەندامی لەشی مروڤ و هەندی شـوینی شاخ، هاوناوی یەکـتـرین. پیٚ ئەچێ کـورد لەشـی شاخی بە لەشی خوٚی شوبهاند بیٚ، وەکو:

سەر، تەپلە سەر: ١. بەرزترین شوینی لەش. ٢. بەرزترین شوینی شاخ.

لوتکە (لـە «لوت» ەوە وەرگـیـراوە): ١. دیارترین ئـەندامی سـەر. ٢. دیارترین و بەرزترین بەشی سەرەوەی شاخ.

مل: ١. ئەو بەشـەی سەری مروڤ ئەبەستی بە لەشەوە. ٢. ملە، وەکو ملە کەوە لە ریگی پینجوین و، ملەی مرواری لە شاخی سورین.

گەردن: هەمان واتای «مل» ی هەیە. گەردنە: ملە.

گـەرو: ١. قـورگ، ئەوگ. ٢. شـوینیکی تەنگەبەر لـە نیـوان دو شـاخ دا، وەکـو «گەرو» ی بینشە، «گەرو» ی عومەر ئاغا.

گەلی: گـەرو. وەکـو گەلی ی عـەلی بەگ، گەلی ی بیجـان لە کوڕەک، گـەلی ی بەدران و سەرگەلی و زارگەلی لە دولی شەهیدان.

گەلو: گەرو، گەلی. وەکو سەرگەلو، بەرگەلو لە دۆلی جافەتی.

«گـەلی» و «گـەلو» و «گـەرو»: هەرسـیـکیـان یەک مـەعنایان هەیە و لـە ریشـەی «گەرووک» ی پەهلەوین و، لە فارسی دا بوٚتە «گلو».

شـان: ١. لە دوا جـومگـەی بالەوە تا مل. ٢. تـەنیـشـت یا لای راست و چەپی شاخ.

سنگ: ١. بەشی پێشەوەی لەش لە نێوان مل و سک دا. ٢. ڕوی پێشەوەی شاخ.

پاسک: ١. پاڵ، لە پەنجەی دەستەوە تا جومگەی شان. ٢. بەرزاییەکی لە شاخەوە درێژ ئەبێتەوە.

*

گوچانەکەی کاک عەلی

لە گەڵ جوڵانی هێزەکانی یەکێتی دا، هێزی ئاسمانیی ئێران کەوتە فڕین بە سەر ئاسمانی ناوچەکەدا و، بە سەر هێزەکانی یەکێتی دا. جگە لەمەش هێزی زەمینیی هەمو ڕێگاکانی داگیر کرد بو بۆ ئەوەی ڕێگەی تێپەڕینی هێزەکانی یەکێتی بگرێت. بەفر ڕێگاکانی گرت بو، لە هەندێ جێگا ولاخی لێ دەرنەئەچو، یەکێ لە کاروانەکانی هێزەکەمان لە بەر گیرانی ڕێگاکەی، ناچار بو بچێتە ناو ئەرزی ئێرانەوە، هێزەکانی ئێران دایانە بەر تۆپ و، ناچاریان کرد کە بگەڕێتەوە دیوی عیراق.

جموجوڵی زۆر و خێرای جەنگیی ئێران، بەرامبەر هێزەکەمان، سەرنجی هەمو کەسێکی ڕاتەکێشا و، هەمو ئەترسان ئێران پیلانێکی دوژمنانەی لە ژێر سەردا بێ. هێشتا لە «دەراوی گوێزێ» بوین مامجەلال، بۆ هەڵسەنگاندنی سەر لە نوێ ی هەلومەرجی تازە، داوای لە: عەلی عەسکەری، تایەری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا و من کرد.. دابنیشین، د. مەحمود و قادر جەباریش ئامادە بون.

مامجەلال وتی: «پێ ئەچێ هەلومەرجەکە گۆڕا بێ، جموجوڵی دوژمنانەی ئێران زۆر زیادی کردوە. ڕۆیشتن بەم قەرەباڵغییە بە ناو ئەرزی ئێران دا کارێکی خەتەرە. لە بەر ئەوە پێشنیار ئەکەم هەمومان بگەڕێینەوە «دۆڵە کۆکێ» و، بە پێ ی ئەو فاکتەرە نوێ یانەی هاتونەتە ناو مەسەلەکەوە، سەر لەنوێ بیر لە هەمو نەخشەکە بکەینەوە و حساب و نەخشە و ڕێگە و شوێنی نوێ دابنێین».

کاک عەلی وتی: «ئێمە هێزێکی ترمان ناردوتە ناوچەی برادوست، چاوەڕوانی گەیشتنی ئێمە ئەکەن، من فەرماندەی پێشمەرگەم بەڵێنم پێ داون لەوێ یەک بگرینەوە لە بەر ئەوە من هەر ئەڕۆم».

مامجەلال وتی: «مەبەستم لەوە نەڕۆیشتن نیە، بەڵکو گۆڕینی جۆری ڕۆیشتنەکەیە».

لەم بارەیەوە هەندێ مشتومڕ کرا. کاک عەلی سور بو لە سەر هەڵوێستەکەی و، وتی: «ئەمە چۆن ئەبێ هەر دو تۆپ تەقێ ئێمە نەخشە و پلانەکانی خۆمان بگۆڕین..؟».

کاک عەلی لە کاتی رویشتن دا گۆچانی بە دەستەوە ئەگرت، لە کاتی قسەکانی دا گۆچانەکەی بە تورەییەوە کێشا بە بەردێک دا گۆچانەکەی شکا.

*

لە یەک جیا بونەوە

بە ناو بەفری کوێستانەکانی قەندیل دا رویشتین. گری و چالی شاخەکان لوس بوبون. هەتا چاو بڕی ئەکرد سپی ئەچوەوە. ریچکەی درێژی پێشمەرگەکان و کاروانی ولاخەکانیان، لە ناو بەفری قەندیل دا دیمەنێکی سەیری هەبو. لە دورەوە بە ئاسانی بە دی ئەکرا. فڕۆکەی ئێرانی بەردەوام بە سەرمانەوە ئەفڕین.

بە لای «کەوپەر» دا تێ پەڕین بۆ «دۆڵە تێ». دولە تێ هەندێ کەورگ و چەند دارێکی لێ بو. لەوێ لامان دا بۆ پشودان. چەند جارێ سەر لە نوێ کۆ بوینەوە. لە بەر مەترسی رێگاوبان وا رێک کەوتین، هێزەکەمان بکەینەوە دوبەش:

بەشێکیان، لە گەڵ کاک عەلی بڕوا بۆ برادوست، لە گەڵ ئەو هێزە یەک بگرێتەوە کە بە سەرکردایەتی خالید سەعید رویشت بون.

بەشەکەی تریان، لە گەڵ مامجەلال بمێنێتەوە، تا هەواڵی گەیشتن و یەکگرتنەوەی بەشی یەکەم و بەشی دوەمی هێزەکان ئەگات، ئەوسا ئێمەیش بەرەو لای ئەوان بە رێ بکەوێ و، هەمویان لەوێ یەک بگرنەوە.

بەشی هەرە زۆری پێشمەرگە چەکدار و چالاک و لاوەکان جیا کرانەوە و، لە گەڵ تایەری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا، سەید کاکە، تالیب روستەم، ئازاد هەورامی، قادری مامەند ئاغا، ئەنوەری مەجید سولتان، فوئاد عومەر.. دانران، تا لە گەڵ عەلی عسکەری بڕون.

هەمو پیر و، نەخۆش و پەککەوتو و، گومان لێکراو و، زۆری بێ چەکەکانیش جیا کرانەوە و بەرەو روی ئێمە: مامجەلال و من، کرانەوە، تا بە شێنەیی بیان نێرینەوە بۆ دواوە و، بلاوەیان پێ بکەین، بۆ ئەوەی نەبن بە بار بە سەرمانەوە. ئەبو تا هەمومان جارێکی تر یەک ئەگرینەوە کاروباری مەکتەبی سیاسی بەش رابپەڕێنین.

لە کۆمیتەی ئامادەکردن: د. مەحمود عەلی عوسمان و قادر جەباری و، لە پاسۆک: جەلالی حاجی حسێن، لە گەڵ ئێمە مانەوە.

مامجەلال و عەلی عسکەری و د. مەحمود، قسەیان بۆ هێزەکە کرد و، بە درێژی و بە وردی ئەرکەکانی سەفەرەکەیان و مەترسیەکانی رێگایان بۆ رون کردنەوە.

ئەوان بەرەو شوێنی دیاریکراو رویشتن و ئێمە لە دولە تێ ماینەوە.

## هەکاری: شانۆی کارەسات

*

سەرەتای مانگی مایس، بەشی دوەمی هێزەکە، لە «دوڵە نێ» وە بە لای خانەدا بەرەو کێلەشین لە پشتی شنۆ کەوتە ڕێ.

هێزەکە کە زۆری ڕێگاکەی تا نزیک ٣ سنور بە دیوی ئێران دا رۆیشت بو، جگە لەوەی تووشی ماندوبونێکی زۆر، برسیەتی، سەرما و سەهۆلبەندان بون. هێزەکانی حکومەتی ئێران لە چەند جێگا بۆردومانی کردن و چەند پێشمەرگەی کوشت و برینداد کرد و، ڕێگاوبانەکانی بە وردی لێ تەنی بون بۆ ئەوەی بە سەرما و برسیەتی تەفروتونایان بکات، کە ئەگەر نەختێک خواردنی چەند شوانێک نەبوایە لە پشتی شنۆ کە لە خێوەتێک دا زەخیرەیان کرد بو، پێشمەرگەکان بە ڕێکەوت تووشی بوبون، بەشێکی زۆری هێزەکەیان لە برسان لە ناو بەفردا ڕەق ئەبونەوە.

تا هێزەکە هەموی گەیشتەوە دیوی عێراق، لە پێناوی هێنانی نان و خۆراک دا لە دەوروپشتی گوندەکانی ئێران چەندین کەس کەوتنە بۆسەی ئێرانیەکانەوە و گیران و، چەندین کەس خۆیان دا بە دەستەوە و، چەندین کەس ڕەق بونەوە و، ئەوی تری بە هەزار فەلاکەت و ناخۆشی بە نیوەگیان گەیشتەوە دیوی عێراق.

بەڵام هەر گەیشتنە دیوی عێراق و پێشمەرگەیەکی بەزیو بە دزیەوە ڕایکرد و تەسلیم بوەوە، هێزەکانی حکومەتی عێراق کە پێشتر خۆیان ئامادە کرد بو، دەسبەجێ لە «خرێنە» پەلاماری بەشی دوەمی هێزەکەیان دا کە هێشتا پشویان نەدا بو و، ماندویەتی ڕێگایان دەرنەچو بو. هێزەکانی عێراق، بە تایبەتی بە هالیکوپتەر، هێرشیان هێنایە سەر هێزەکە و، چەندین کەسیان کوشت و بریندار کرد.

هەرچەندە ئەم هێزە هەندێ نان و خواردنیان پەیدا کرد، بەڵام هێشتا نە ماندویەتی ڕێگایان دەرچو بو، نە گەرم بوبونەوە و، نە حەوا بونەوە.. بەم وەزعەوە سەرلەنوێ ناچار بون بکشێنەوە دوڵی خواکورک. لەویش دیسان هێزەکانی عێراق بە هالیکوپتەر دابەزی و پەلاماری دان، نەی هێشت وچان بدەن و خۆیان ڕێک بخەنەوە. چەند پێشمەرگەیەک کوژران و چەند پێشمەرگەیەک گیران. لێرەشەوە، دیسان لە ژێر گوشاری جەیشی عێراق دا، ناچار بون بکشێنەوە دیوی تورکیا.

بەشی یەکەمی هێزەکە بە سەرکردایەتی خالید سەعید، کە پێشتر گەیشت بوە

هەمان ناوچە و مشووری هەندی ئازوقە و خواردەمەنی خوارد بو، لە گەل بەشی دووەمی هێزەکە بە سەرکردایەتی عەلی عەسکەری، رۆژی ۷۸/۵/۱۳ یەکیان گرتەوە و، لە سەر سنوری تورکیا - عیراق - ئیران کەوتنەوە ڕێکخستنەوەی هێزەکان و پشودان و خۆ کوکردنەوە.

*

ئەو مەینەتی و ناخۆشی و زەرەر و زیانە زۆرەی توشی هێزەکە بو، هەموی نرخی ئەو هەلە کوشندانەیە کە وەکو پێویست حسابیان بو نەکرا بو. بەریکەوتنی هێزەکانی یەکێتی بەرەو ناوچەی ۳ سنور بەو شێوەیەی کە باس کرا، گەلێک هەلەی سیاسی، پێشمەرگەیی، جوگرافی.. تی دا کرا، کە ئەمانە هەندێکیانە:

۱. گوی نەدانە پیلانی هاوبەشی دەولەتە کونەپەرستەکانی ناوچەکە دژی یەکێتی:

حکومەتەکانی ئیران، عیراق، تورکیا.. گەلی کورد و مەسەلە رەواکەی بە دوژمنی دێرینە و هاوبەشی خویان ئەزانن، بویە سەرەرای هەمو ناکوکیە قولەکانی ناوخویان هەمیشە لە کاتی پێویست دا هاوکاری یەکیان کردوە و، یەکیان گرتوە بو شکاندنی جولانەوە شورشگێرییەکانی گەلی کوردستان.

شای ئیران و صەددام حسین لە ۱۹۷۵ دا لە جەزائیر ریککەوتنەکیان ئیمزا کرد بو هاوکاری کردن دەربارەی پاراستنی ئاسایش و ئارامیی هەردو دیوی سنوری عیراق و ئیران.

حکومەتەکانی عیراق و تورکیاش لە سالی ۱۹۷۷ دا ریککەوتنێکی تری لەو بابەتەیان مور کرد بو پاراستنی ئاسایش و ئارامیی هەردو سنوری عیراق و تورکیا.

حکومەتی ئیران زیاد لە ۴۵..... هێزی چەکداری هەبو.

حکومەتی تورکیا زیاد لە ۵...... هێزی چەکداری هەبو.

حکومەتی عیراقیش زیاد لە ۲...... هێزی چەکداری هەبو.

شورش لە کوردستانی عیراق دا، بەو ڕێبازە سیاسی و پێشمەرگەییە پێشکەوتنخوازانەیەوە لە قوناغی ئەوسای رۆژهەلاتی ناوەراست دا کە سەرانسەری ناوچەکە لە ژێر زەبروزەنگی حکومەتە کونەپەرست و فاشیستیەکانی ناوچەکە هێمنیەکی روکەشیان تی دا بلاو کرد بوەوە، شورشی کوردستانی عیراق بوبوە مەترسیەکی گەورە بو سەر ئەم دەولەتانە، شتێکی ئاسایی بو کە لە کاتی پێویست دا قول بکەن بە قولی یەکتری دا و، پیلانی هاوبەش دابنێن بو لە ناو بردنی.

لە کاتی بەریکەوتنی هێزەکانی یەکێتی دا، هاوکاری ئەم ۳ دەولەتە، بە شێوەیەکی

ڕون و ئاشکرا، دیار بو.

حکومەتی عیراق چەندین ئەفسەری سوپایی و پسپوری جاسوسی نارد بوە ئێران و تورکیا بۆ یەکخستنی زانیارییەکان و دانانی پلانی هاوبەش. هەروەکو حکومەتی عیراق زوربەی ناوچەکانی سنوری ڕاگویزا بو، ڕەوەندەکانیشی قەدەغە کرد بو لەوەی کە بە مەر و مالاتەوە بینە کویستانەکان بۆ ئەوەی پێشمەرگە سودی لی وەرنەگری. هەروەها حکومەتی ئیرانیش ڕەوەندەکانی قەدەغە کرد لە هاتنە کویستان، تەنانەت ئەوانەشیان کە هات بون، بە زور گیرانیەوە دواوە.

ئەرتەشی ئیران بە ناوی موناوەرەوە هەمو ریگاوبانەکانی گرت بو، توشی هەرکەس بوایە ئەیگرت، هەروەها هەمو ئەوانەی کە پیشتر نیردرا بونە شارەکانی: سەردەشت، خانە بو ئامادە کردنی خواردن یا گرتبونی وە یاخود کریبونی و، دەستی بە سەر کەلوپەلەکان دا گرت بو. جگە لە مانەش بە فروکە بەردەوام چاودیری هیزەکانی یەکیتی ئەکرد و، هەندی جار بە هالیکوپتەر ئاگرباران ئەکردن.

هیزەکانی ئیران لە دیوی ئیران کەوتنە لیدانی هیزەکانی یەکیتی و، هەر کە چونەوە دیوی عیراق لەویش هیزە چەکدارەکانی عیراق کەوتنە پەلامارادانی و، کە چوە دیوی تورکیایش، عەشیرەتەکانی ناوچەکە کەوتنە خو ئامادە کردن و، میت و داوودەزگا جاسوسیەکان کەوتنە پەیجوریان.

سەرکردایەتی یەکیتی هیزی دوژمنەکانی بە کەم گرت، یاخود بە چاکی هەستی بەم مەترسیە نەکرد. چاوپوشینی حکومەتی ئیران لە هاتوچوی پێشمەرگە بە ناوچەکانی سنوردا، کە لە راستی دا بۆ شاردنەوەی داللە دان و بارمەتیدانی هیزە چەکدارەکانی قم بو و، چاوپوشینی حکومەتی تورک لە دانیشتنی هیزەکانی قم لە ناوچەکانی سنوردا، دەسخەروی کرد و بە گورگان خواردوی دا، وای زانی ئەم چاوپوشینە هیزەکانی یەکیتی یش ئەگریتەوە، کەچی لە ئەنجام دا بو بە هویەکی کاریگەری ئەو شکستە گەورەیە.

٢. باش ریک نەخستنی هیزەکە و، باش نەناردنی بۆ شوینی دیاریکراو.

هەرچەندە هیزەکە کرا بوە ٣ بەش و، دوایی بوە ٢ بەش، بەلام هەربەشیکی لە چاو ری رویشتنیکی وەها و، بە ریگایەکی وەها دوری پر مەترسی دا، بۆ جەنگی پارتیزانی، لە هەلومەرجیکی وەکو ئەو کات و شوینەی کوردستان دا، هەلەیەکی گەورەیە.

هیزەکە لە بەر گەورەیی خوی و، دریژی ریگاکە و باریکی و سەختی، بوبوە ریچکەیەکی زور دور و دریژ کە بە هوی لە ریز دەرچونی یەکسیکەوە بۆ پشودان و وچانگرتن، بۆ ئاو خواردنەوە یا خۆ توند کردنەوە.. هەمو ریزەکە تیک ئەچو و، زنجیرەکە

ئەپچرا و ئەوە هۆی دواکەوتن و لە یەک دابران و لە یەک ون بون.

لە بەر گـــەورەیی و درێژی ڕیچکەکـــە و، نەبونی هۆی پەیوەندی، وەکـــو هۆکی تۆکی، نەئەتوانرا بە چاکی سەرپەرشتی بکرێ. هەرچەندە هێزەکە کرا بوە چەند «ڕەتل» و، هەر ڕەتلە لیپرسراوی خۆی هەبو، بەلام دیسانەوە چونکە هەمو پێکەوە و، بە یەک ڕێگای باریک دا ئەڕۆیشتن و بە یەک خـێـرایی نەئەڕۆیشتن، بە چاکی سـەیتـەرەیان بە سـەردا نەئەکرا.

تەئمین کردنی ئازوقە و خواردەمەنی و پێویستیەکانی تری هێزێکی وا گەورە، بە تایبەتی لەو شوێنە چولانەدا کـە ئەوان پێی دا تێ ئەپەڕین، کـارێکی یەکجـار دژوار و زەحمەت بو.

هێـزەکە لە بەر زۆری ژمارەی خـۆی، نەیئـەتوانی خـۆی لە دوژمن بزر بکا و خـۆی بشارێتەوە، شوێنەونی بکا و شوێنەوارەکانی پاش خۆی بسرێتەوە.

جولانی هێزەکە بەو گەورەییە بە پێ، بەو ڕێگا دووروودرێژە باریک و شاخاوییەدا کە ئاوەدانی تێ دا نیە و، هێشتا بەفر گرت بوی کارێکی زۆر خراپ بو. جولاندنی هێزی وا زل کە لاسایی کردنەوەی جولاندنی هێزی (جەیشی نیزامی) یە لە کاتێک دا کە جەیشی نیزامی ماشین و فڕۆکەی هەیە بۆ گواستنەوە و تەئمین کردنی پێویستیەکانی خواردن و خۆ گەرم کردنەوە و ماندو نەبون، پەیوەندی کردن و تواناى زۆ دەرباز بون و زۆ پەلاماردان و زۆ کـشـانەوەی هەیە، بۆ لەشکرێکی پارتیزانی کە بێ بەشـە لەو ئیـمکانیـاتە هەڵەیەکی ئەوەندە گەورەیە، لە حوکمی خۆکوشتن دایە.

هێزەکەی یەکێتی ئەبوایە بە تاقـمی کەم کەمی ۱۰۰ - ۱۵۰ کـەسی بڕۆیشتـایە، نەک هەمـوی بە کۆمەڵ پێکەوە.

ئەبوایە ئەو تاقـمـانەش ڕێگای جـیـا جـیـایان بگرتایە نەک هەمـویان یەک ڕێگایان بگرتایە بەر.

ئەبوایە لـە کـات و شـــوێنی جـیـــاوازەوە بەڕێ بکەوتنایە و، لە کـــات و شـــوێنی دیاریکراودا یەکیان بگرتایە.

ئەبوایە هەر تاقـمە چەندین سەرچاوەی تەئمین کردنی ئازوقـە و پێویستیـەکانی تری لە پێشەوە، لە چەند شوێنی جیا جیاوە تەئمین بکردایە.

ئەبوایە هەر تاقـمە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگە و شـوێنی حەوانەوەی جیـاواز و ڕابەر و چاوساغی جیاوازی بدایە.

۳. گوێ نەدانە مەناخ و تۆپۆگرافی ناوچەکە.

ئەو کاتەی هیزەکە بە ری کەوت هیشتا سەرەتای بەهار بو، ئەو ناوچانەی کە ئەبو بیبری هەموی کویستانی سەخت و چوڵ بون. شاخی هەزار بە هەزاری روت و دوڵی قوڵ، دور لە ئاوەدانی، زور جار تا سەرەتای هاوین بەفر ئەیگری و، ماوەی هاتوچو کردن نادا.

زور جار سوپا نیزامیە گەورەکان هەر بە هوی حساب نەکردنی ورد و تەواوی «عامیلی مەناخ»، یاخود «عامیلی توپوگرافی» شکستی زور گەورەیان بە سەردا هاتوە، تەنانەت سوپای عیراقی لە چەندین پەلاماری پایز و زستان دا هەر لە بەر بەفر و سەرما و گیژەلوکە شکاوە، یاخود لە بەر سەختی و نالەباری ناوچەکە و تیکەڵ بونی لە گەڵ نالەباریی باری هەوا، شکستی گەورە و زیانی زلی گیانیی، لی کەوتوە.

کاتی بەریکەوتنی هیزەکانی یەکیتی لە چاو مەناخی ناوچە شاخاویە سەختەکانی کویستانەکانی کوردستان دا زور زو بو، بویە جگە لەوەی بەفری شاخەکان هیشتا نەتوابوەوە و، ریگاکانی بەر نەدابو، پیشمەرگە رەشایی نەئەدوزیەوە تا بحەویتەوە یا تیی دا داینیشی، چ جای شوینی نوستن، جگە لەوەش هەندی جار ئەبوەوە بەفر و زریان. ریگایەکی وەها ئەگەر چەند سەعاتی بی، یاخود ماوەی چەند روژی بی، رەنگە کاریکی ئەوتو نەکاتە سەر پیشمەرگە، بەلام ماوەی چەند حەفتەیەک کە دریژەی کیشا، بی کەلوپەلی خو گەرم کردنەوە و، بی سوتەمەنی و خواردەمەنی و، بی شوینی حەوانە، وا سەرەرای ئەوەی توانای جەنگاوەرانەی پیشمەرگە ناهیلی، بەلکو پرزەی لی ئەبری و قری تی ئەخات، هەروەکو بە سەر ئەم هیزە هات.

*

هەڵەی کوشندە:

گورینی بنەرەتیی بریاری جیگیربون لە ۳ سنور

بەشی یەکەم و دوەمی هیزەکانی یەکیتی کەوا لە ناوچەی برادوست یەکیان گرت بوەوە و، بو پشودان و خوریکخستنەوە پەری بونە دیوی تورکیا و ۷ روژ لە وی بە ئاسودەیی مابونەوە، لە باتی ئەوەی خەریکی خوسازدان بن بو جیبەجی کردنی بریارەکانی کومیتەی سەرکردایەتی، لە سەرو هەموریانەوە: دامەزراندنی بنکە و بارەگای سەرکردایەتی لە شوینەکانی پار و، هەواڵ ناردن بو هاتنی بەشی سییەمی هیزەکە و، ئەندامانی تری م س، سەرکردایەتی هیزەکە بە بیانوی ئەوەی کە ئەوان زوربەی ئەندامانی سەرکردایەتی یان لە گەڵە و، بە پی ی هەلومەرجی نوی، ئەتوانن بریاری نوی بدەن، بە تایبەتی دوای ئەوەی راسپیردراویکی ئیدریس بارزانی ئەگاتە لایان و، پیپان رائەگەیەنی کە: پیاوەکانی ئیدریس لە ناو چەکدارەکانی قم دا نایەنە سەر ریگای هیزەکانی یەکیتی، ئەگەر ئەوان

ئەچنە سەریان، سەرکردایەتی هیزەکە بریار ئەدا: لە پاتی مانەوە لە ناوچەی برادوست و، دانانەوەی بارەگا لە دولی گوستە، بۆ ئەوەی توشی شەر نەبی لە گەل قم، بریار ئەدات کە بچیتە ناو قولایی تورکیاوە، بۆ ئەوەی نزیک بکەونەوە لە شوینی وەرگرتنی چەک و چەکدارکردنی بی چەکەکانی هیزەکەیان.

لە نامەیەک دا کە روژی ٧٨/٥/١٦ دا عەلی عسکەری، خالید سەعید، تاهیری عەلی والی نوسیویانە، دوای ئەوەی باسی ئەو مەینەتی و دژواریی و شەرانە ئەکەن کە لە ریگا توشیان بوە، لە بەشیکی نامەکەیان دا، ئەلین:

«ئیمە بۆ چەکەکانمان و راپەراندنی خەلکی ناوچەکە بەرەو بادینان ئەچین و، جاری بریارمان داوە بی چەکەکان پر چەک بکەین و خومان ساز بدەین. نامەمان ناردوە بو برایانی پارتی (مەبەستی دە دە کا دە بوە) و سوریا (مەبەستی بنکەی یەکیتی بوە لە سوریا) کە بە پەلە جیگا و شوینی چەکەکانمان بو بنیرن و یەکیکی پارتی خوی بیت و چاومان پیی بان بکەوی بۆ تەنسیق کردنی ئیشوکارمان و، هەروەها دکتور کەمالی خوشمان بیت بو هەمان مەبەست»

لە کوتاییەکەی دا ئەلین:

«بە تیکرایی وەزعی ناوچەکە و ئیمە زور زور باشە دلتان نارەحەت نەبی و گوی مەدەنە پروپاگاندەی دوژمن. ئومیدمان وایە بە سەرکەوتوانە هەمو کارەکانی خومان ئەنجام ئەدەین و ئاگاداریشتان ئەکەینەوە. تکایە ئیوەش زو زو پەیوەندیمان پیوە بکەن بە هوی کاک نوعمان و برایانی ترەوە»

بەمجورە سەرکردایەتی هیزەکە، پشت ئەستور بە بەلینەکانی دە دە کا دە و، پشت ئەستور بە بەلینەکانی ئیدریس، خوی لە شەری قم لا ئەدا لەو ناوچەیەدا، کە زەعیفترین نوقتەیان بو، یا راستتر خوی لە شەری قم ئەدزیتەوە و لە ناوچەکە دور ئەکەویتەوە بەرەو قولایی تورکیا، بی ئەوەی شارەزاییان هەبی لە ناوچەکەدا و، ناسیاوییان هەبی لە گەل خەلکی ناوچەکەدا، لە پیش خویانەوە بنکەیان هەبی پیشرەوی بو بکەن، یا لە پشتی خویانەوە بنکەیان هەبی بوی بکشینەوە، بی ئەوەی بنکەیەکی جەماوەریی سیاسییان لە ناو کوردەکانی تورکیادا هەبی، بی ئەوەی حساب بو خوکوکردنەوە و پەلاماردانی قم، یاخود بو «تدخل» ی هیزە چەکدارەکانی تورک و، پیلانی میت یا خوسازدانی عەشیرەتەکانی تورکیا بکەن.

قم هیلیکی ئاشکرا و دیاری لە نیوان خوی و یەکیتی دا کیشا بو و، هیزەکانی یەکیتی بە دوژمنیکی سەرسەخت دانا بو و، لە ناوبردنیانی کرد بوە ئەرکی یەکەمی

سەرشانی خۆی.

*

قولایی تورکیا: کەوتنە ناو تەپکە

پەریکەوتنی هێزەکەی یەکێتی بەرەو قولایی تورکیا، پشت ئەستور بە بەڵێنەکانی دە دە کـا دە، بە نـاوی هێنانی چەکـەوە، بێ ئەوەی یەنکەیەکی پشـتـەکی یان یەنکەیەکی پێشەوەیان هەبێ، بێ ئەوەی بزانن بۆ کوێ و، بەرەو کوێ و، بۆ لای کێ ئەچن، بێ ئەوەی لەوێ یەنکەی سـیـاسی و جـەمـاوەریـیـان هەبێ.. لە کـاتێک دا کـە ئەم بەشی هەرە زۆری عەشیرەت و خەڵکی دێهاتەکانی تورکیایان لە یەکێتی پڕ کرد بو، کە گوایە:

- هێزەکانی یەکێتی ئەچنە دیوی تورکیا بو تۆڵە کردنەوەی ئەوانەی سالانی پێشو لێیان کوژراوە.

- گـوایە هـێـزەکـانی یەکـێـتی دێهـاتەکـانی تـورکـیـا تالان ئەکـەن و ئەسـوتێنن، پیاوەکانیان ئەکوژن و، ئافرەتەکانیان بە دیل ئەگرن.

- هاتون بۆ بڵاوکردنەوەی بێ دینیی و کافری و یەزیدیتی و کومونیزم و،

- بە فیتی صەددام و بەعس ئەیانەوێ شۆرشەکەی بارزانی تێک بدەن!

بەم درۆ و دەلـەسـانە ئەم خـەڵکی ناهۆشـیـار و دواکـەوتوی ناوچەکـانی شـەمـزینان، گەوەر، چەلی، ئولودەرە.. یان هان دابو لە یەکێتی و، سەروک عەشیرەتەکانی ناوچەکەش کە ژمـارەیەکی زۆریان لە حـیـزبی «عـەدالەت» و «سـەلامـەتی مـیللی» دا بون و، بە پێ ی ئامۆژگاری و فـەرمـانی «میت» ئەجولانەوە، کەوتنە خۆ و، هێزەکانی خۆیان کۆ کردەوە و ساز دا و پڕچەک کرد و، هەمـو شوێنە گرنگ و ستراتیجیەکانیان گرت و، لە سەر رێگا و پرد و گـەلی و دەربەند و بواری چەم و روبارەکـان، لە ناوچـەیەکی یەکـجار فـراوان و بەرین دا، دامەزران، بۆ رێگە گرتن و لە ناوبردنی هێزەکەی یەکێتی.

جەنگی پارتیزانی بە تەنیا پشت ئەستور نیە بە بیروباوەر و، زاتی شۆرشگێرانەی پێـشـمـەرگـەکـان و، بە گـیـانی خـۆبەختـکردن و لە خـۆبوران، یاخـود بە لێـوەشـاوەیی و ئازایەتیـیـان، بەڵکو بە شـارەزایی پێـشـمـەرگەکانیش لە هەوراز و نشـیو و کون و قـوژبنی ناوچەکـەدا و، بە پەیوەندی باش و دوسـتـانەی پێـشـمـەرگـەکـان لە گـەڵ خـەڵکی ناوچەکـە. کـۆمـەڵانی خـەڵک قـەڵای لە شکان نەهاتوی پێـشـمـەرگـەن، زانیـاری و دەنگوباسی بۆ کۆ ئەکەنەوە، رێگەی پیشـان ئەدەن، خواردن و پێویـسـتـیـەکانی تەئمین ئەکەن، ئەی شارنەوە، برینداو و نەخۆشـەکانی تیـمار ئەکەن و ئەیحەوێننەوە، پەیوەندی بۆ دروست ئەکەن لە گـەڵ هێزەکـانی تری دا، لە کاتی پێویـستی دا چەکی بۆ هەڵئـەگرن و بەرگری چەکـدارانەی لێ

ئەکەن. کاتێ کە خەڵکی ناوچەکە کەوتنە دوژمنایەتی پێشمەرگەکان و پێشمەرگەکان بێ بەش بون لە پشتیوانی و یارمەتی ئەوان، بە تایبەتی کە نەشارەزا بون، وەکو ئەو ماسیەیان لێ دێ کە لە ئاو دەرئەهێنرێ و ئەکەوێتە وشکایێوە و ئەخنکێ.

هێزەکەی یەکێتی بێ بەش بو لە یارمەتی و پشتیوانی خەڵکی ناوچەکە. ئەو زانیارییانەی کە دە دە کا دە دایێ بە سەرکردایەتی هێزەکە ناراست بون و، دە دە کا دە بش خوی هیچ هێز و نفوزێکی کاریگەری لە ناو عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا نەبو و، نەیتوانی یاخود نەیویست هیچ جورە هاوکارییەکی کەم یا زور لە گەڵ هێزەکەدا بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەندێ جار بە پێشکەش کردنی زانیاری و حسابی ناراست، سەری لە هێزەکە ئەشێواند و چەواشەی ئەکرد.

سەرەرای ئەمانە هەموی، سەرکردایەتی هێزەکە خویشی چەندین هەڵەی جەنگیی گەورەی کرد، لە پێش هەمویانەوە بە جێ هێشتنی ناوچەی برادوست و، دور کەوتنەوەی لە خەڵکی کوردستانی عیراق و، ملنانی بەرەو ناو قولایی تورکیا، واتە بەرەو ناو ئەو تەپکە گەورەیەی بو نرا بوە.

سەرکردایەتی هێزەکە، هەروەکو لە باری ستراتیجییەوە توشی هەڵەیەکی کوشندە بوبو، هەروەها لە باری تاکتیکی بشەوە وەکو پێویست هێزەکەی خوی ڕێک نەخست و دانەمەزراند.

سەرکردایەتی هێزەکە لە باتی ئەوەی هێزەکانی بەش بەش بکات بە سەر چەند ناوچەی فراوان دا و، لە مەیدانێکی بەربڵاودا دایان بمەزرێنێ و بیان جولێنێ، هێزەکانی خوی هەموی بە کومەڵ و پێکەوە بە یەک ڕێگادا و لە یەک کات دا و بو یەک شوێن خستە ڕێ، وە هەر لە یەک ناوچەش دا، یا ڕاستتر، لە یەک دوڵ دا مولی دان. ئەمە هەلی دەس دوژمن خست کە بە چاکی «تەرکیز» ی بکاتە سەر. دەنگوباسەکانی بە وردی کو بکاتەوە و بزانێ، هەمو هێزەکانی خوی لە سەر کو بکاتەوە و، «بالادەستییەکی ژمارەیی» بە دێ بهێنێ و، دەوری هێزەکانی یەکێتی لە مەیدانێکی تەسک و سەخت دا بگرێ و، بیخزێنێتە کونێکی تەنگەبەری شەر و بەرگری و دەرباز بونەوە. لە کاتێک دا کە ئەگەر سەرکردایەتی هێزەکە، هێزەکانی خوی بەش بەش بکردایە و، لە چەند شوێنی جیاواز و دور لە یەکتری دا دای بمەزراندایە، مەیدانی شەر فراوان و بەرین ئەبو، بەو پێیە دوژمنش ئەبوایە لە چەند لایەکەوە پەلاماری بدایە هێزەکانی خوی پەرت و بڵاو بکردایەتەوە بە ناوچەیەکی فراوان دا و، لە چەند قولەوە خەریک بوایە.

سەرکردایەتی هێزەکە شوێنێکی دیاریکراوی هەڵنەبژارد بو، کە لە کاتی شەردا،

رووی تی بکا، یا تەنانەت لە کاتی رویشتن دا بوی بچی، بەلکو هەروا لە خـویەوە ری ی کەوت بوە ئەوی و، لە ناوچەی جولەمیرگ دا ئەخولایەوە، بی ئامانجیکی دیاریکراو ملی ری ی گرت بو. هەر لە بەر ئەوە لە کاتی لیقـەومـان و کشـانەوە و لە یەک دابران دا نە پیشمەرگەکان و نە فەرماندەکانیان نەیان ئەزانی رو لە کوی بکەن و بۆ کوی بچن، بەلکو هەر ئەوەندەیان پی وت بون کە پیویستە نەگەرینەوە بۆ دواوە بەلکو بەرەو پیشەوە برون، واتە بەرەو زیاتر قولایی تورکیا. سەرکردایەتی هیزەکە، بەوەی کە چوە ناو تورکیاوە، ئیتر بە یەکجاری و بە تەواوی خوی دابری لە هیزەکانی تری یەکیتی، کە کەوت بونە ناوچەکانی هەولیر و سلیمانی و کەرکوکەوە.

ئەم هیـــزە بە کـــومـــەل پیکەوە بەرەو ناو قـــولایی تورکـــیـــا ریچکەی بەست بو، حەفتـەیەک زیاتر بە ناوچەیەکی سـەخت و شاخاوی کـوردسـتـانی تورکـیـا دا، بە بی وچان گــرتن و پشــودان، رویشتن تا گــەیشــتنە ناوچەی «ژیرکی» کــە یەکــیکە لە هوزەکــانی عـەشیـرەتی گەورەی «هەرتوشی». لە نزیک گوندی پچوکی «بازی» لە دولیک دا بارگە و بنەی خست. سەرکردایەتی هیزەکە کە بە قسە و بەلینەکانی ئیدریس فریوی خوارد بو، کە گوایە چەکدارەکانی قم نایەنە سەریان، لە بەر ئەوە پشتـیـان لی کرد بوەوە، بە بی ئەوەی نەخشەیەکی ورد دابنین بۆ خۆپاراستن و بەرگری، بی خەم کەوتنە پشودان و حەسانەوە.

دوژمنانی هیـزەکـەی یەکـیـتی لەم مـاوەیەدا بە ناوی کـرین و فـروشـتنەوە چەندین کـەسـیـان نارده ناویان بۆ کـوکـردنەوەی زانیـاری پیـویست لە سـەریان، هەر لەو مـاوەیەدا یەکـیـک لە مـەفـرەزەکـانی هیـزەکـە، کـە دەسـتـەی پاراسـتنی تایەری عـەلی والی بون، بە دزییەوە رایان کرد و چونە ناو قم وە، زانیاری پیـویسـتیـان لە سەر هیزەکە و سەرکردە و لیپرسراوەکانی و، ژمارەی چەکدار و بی چەکەکانی و، باری گشتی هیـزەکەیان دا بە قم. ئەمـەش خـوی لە خـوی دا، لە لایەکـەوە خزمـەتیکی گـەورەی پیـشکـەش بە قم کـرد و، لە لایەکی ترەوە زەرەریکی زلی هەم لە باری مـەعنەوی و هەم لە بـاری دەرچونی نهـینیـەکـانی هیزەکانییەوە گەیاند بە یەکیتی.

لەم مـاوەیەدا هیـزەکـانی یەکـیـتی بە هوی خـۆرەتاندن و ری رویشـتنی دورودریژ و نەشارەزایی و پشـونەدان و سـەرمـا و برسـیـتی و نائەمـینیـەوە، بە تەواوی مـاندو و بیـزار و وەرس بوبون.. لە کـاتیـک دا قم سـودیکی زوری لەو مـاوەیە وەرگـرت بو بۆ کـوکـردنەوە و ریکخـسـتن و سـازدانی هیـزە چەکدارەکـانی خوی و عـەشیـرەتەکانی ناوچەکە و، دانانی پلانی پەلاماردانی هیزەکانی یەکیتی.

*

شەری بازێ

له ئیوارەی ٧٦/٦/١ دا هەندێ له پیشمەرگەکان جموجولی چەند چەکداریکیان به شاخ و لوتکەی چیاکانی دەوروپشتیانەوە به دی کرد و، سەرکردایەتی هیزەکەیان ئاگادار کرد، سەرکردایەتی هیزەکش دەسبەجی کەوتە خوی و، هیزەکانی سەر خستە هەردو بەری دولەکە و، به شاخەکەدا بەرەوژور هەلگەران و دامەزران. تەقە دەستی پی کرد. بەلام دیسانەوە هیزەکە بە جوریکی وا دامەزرا و دابەش بو کە خوی دابری لە سەرچاوەی ئاو و ریگای گەیشتنی خواردن.

ئیوارەی روژی ٦/١ و شەوەکەی و روژی دوابیتر شەر دریژەی کیشا، برسیتی و تینویەتی و سەرما و دریژە کیشانی چەند روژەی شەر، تەنگی بە هیزەکە هەلچنی بو. هەرچەندە به گشتی رەوتی شەرەکە بە قازانجی هیزەکانی یەکیتی بو و، لەو شەرانەدا هیزەکانی قم نەیان توانی بو بالادەستی بە دەس بهینن و، لە روژی یەکەمی شەرەکەدا تەنیا فەرماندەی کەرت، شەعبان گیچینەیی و، روژی دوەم فەرماندەی کەرت، حەمەمینی خەلیفە قادر و، فەرماندەی مەفرەزە، خدری کامەلای بالەیی و ٢ پیشمەرگەی تر کوژران و، چەندیکیش بریندار بون. هیزەکانی قم و عەشیرەتەکان زیاتریان لی کوژرا و، یەکی لە فەرماندە ناسراوەکانیان بە ناوی مەلامینی بارزانی کوژرا و، سەنگەرەکەی گیراو، ١٢ کسیان لی بە دیل گیرا.

ژمارەیەکی زور کەم چەکداری قم لەم شەرەدا بەشدار بون، هیزی سەرەکی شەرەکە بریتی بو لە چەکدارەکانی عەشیرەتەکانی: پنیانش بە سەروکایەتی ماجیدی ئەحمەد بەگی چەلی، ئورەماری بە سەروکایەتی فاضل شوکری ئاغا، پیروزی بە سەروکایەتی کورانی مەلا مەحمود، دۆسکی بە سەروکایەتی حاجی صالح ئاغا.. و چەند وردە عەشیرەتیکی کەی کوردستانی تورکیا.

بۆ خۆ دەرباز کردن له برسیتی و تینویتی و، سەبارەت بە پیویستی جیگورکیی هیزەکە و، بۆ ئەوەی نەتوانن هیزی زورتریان لە سەر کۆ بکەنەوە و ئەوقی ئابلوقەکە سەختتر و تەنگتر بکەن و، لە ترسی ئەوەی نەوەکو هیزی تورک بەشداری شەر بن، سەرکردایەتی هیزەکە بریاری کشانەوەی دا.

لەو کاتەدا سەرانسەری ناوچەکانی شەمزینان، یوکسەکوا، چەقورجە، بەیتوشەباب، ئورەمار، ئولودەرە کە چەندین بنکەی ئوردوی تورک و چەندین قەرەقولی جەندرمەی لی بو و، بەسەدان کیلومەتر دریژایی و پانایی بو، بو بە مەیدانی تەراتین و هاتوچوی ئازادی چەکدار و لیپرسراوەکانی قم و شوینی کوبونەوە و لەشکرکیشی عەشیرەتە کوردەکانی

هەکاری. تەنانەت لێپرسراو و پێشمەرگەکانی یەکێتی کەللایەن عەشیرەتەکانی تورکیاوە ئەگیران هەموویان تەسلیمی قم ئەکران، بێگومان، ئەمەش هەموی لە ئەنجامی «هاودەردی نەتەوەیی» ئەم عەشیرەتانە نەبو لەگەڵ قم. بارەگاکانی قم، شوێنی نیستگەی رادیو و دەزگای چاپ، شوێنی زیندانی دیلەکانی شەرەکە هەمو لەسەر ئەرزی تورکیا بو، هاتوچوی لێپرسراوەکانی قم بو ئێران و سوریا و ئەوروپاش هەر بە ناو تورکیادا بو.

چاوپوشی تورک لە جموجولی چەکداری قم و، هاوکاری عەشیرەتە کوردەکانی تورکیا لە گەلی، پێشینەی هەبو. لە مانگی تشرینی یەکەمی ٧٧ یش دا لەکاتێک دا کاروانێکی یەکێتی بە کوێستانێکی هەکاری دا تێ ئەپەری، قم بە هاوکاری چەکدارەکانی عەشیرەتی «باوی» بوسەیەکیان بو دانان، ١٢ کەسیان لە پارێزەرانی کاروانەکە کوشت و ١٤ کەسیان لی گرتن، دەستیان گرت بەسەر چەکەکان دا بو خویان، لاشەی کوژراوەکانیان لە مەیدانی شەرەکەدا بەجی هێشت. داوودەزگاکانی تورک لاشەی کوژراوکانیان کو کردەوە. ئەگەرچی روژنامەکانی تورکیا هەوالی ئەم پیکادانەیان بلاوکردەوە کە لە قولایی تورکیادا قەوماوە، بەلام کاربەدەستانی تورک گوی ی خویان لی خەواند.

*

کشانەوە و، لەتوپەت بون

کشانەوە لە هەلومەرجێکی سەختی وەهادا، بە هێزێکی ماندو و برسی و تینو و کەم ئومێد و کەم ورە و، نەشارەزای دور لە بنکەکانی خوی و، بو شوێنێکی نەزانراو و تاقی نەکراوە، کارێکی یەکجار دژوار و زەحمەت و ئالوزە.

«کشانەوەی رێکوپێک» بو ئەوەی جیا بکرێتەوە لە «هەلاتنی نارێکوپێک»، پێویستی بە رێکخستنێکی ورد و وورەیەکی بەرز و باوەرێکی بەهێز و دیسیپلینێکی پولایین و شارەزاییەکی باش و، سەرکردایەتیەکی ژیر و لێوەشاوە هەیە.

سەرکردایەتی هێزەکە بریاری کشانەوەی دا و، بو ئەو مەبەستە کەوتە خو ئامادە کردن و خوسازدان. هێزەکانی رێک خستەوە و، دابەشی کردن بە سەر چەند «رەتل» یک دا، کە هەندێکیان لە پێشەوە بړون و، ئەوانی تر بە دوایان دا، هەروەها هێزێکیشی تەرخان کرد بو پاراستنی پشتەوەی هێزەکان لە پەلاماری دوژمن و، داپوشینی کشانەوەکە. «ئیتیجاه» ی کشانەوەکەشی دیاری کرد، بەلام چونکە شارەزای ناوچەکە نەبون، هەروا بە شاخەکانی دەوروپشتی خویان دا نیشانەیان کرد و، ئاگاداری فەرماندەی رەتلەکانی کرد.

لێرەدا، سەرکردایەتی هێزەکە، هەلەیەکی تری کرد لە دیاریکردنی «ئیتیجاه» ی کشانەوەکەدا کە چارەنوسی هەمو هێزەکەی بریار دا و، لە ناوی برد، بەوەی لە باتی ئەوەی

بریاری کشانەوە بدات بۆ دواوە بەرەو عیراق، بەرەو ئەو ناوچانەی لێ ی شارەزان و ناسین و ناسیاویان هەیە، دیسان بریاری بەرەو پیشەوە چون، واتە بەرەو قولایی زیاتری تورکیایان دا، بە تەمای ئەوەی لە سنوری سوریا نزیک بکەونەوە، بی ئەوەی هیچ شارەزاییەکیان لەو ناوچەیەدا هەبی، یاخود پیشتر تاقییان کردبیتەوە.

لە تاریکایی شەوی ٢-٧٨/٦/٣ دا رەتلەکان دەستیان کرد بە جولان بە نیازی کشانەوە. بەلام هەر کە هیزەکان گەیشتنە سەر ئەو چەمەی ئەبو لێ ی بپەرنەوە، لە بەر تینویەتی بەشی هەرە زوری پیشمەرگەکان کەوتنە تیکدانی ریزەکەیان بۆ ئاو خواردنەوە. بەو جورە ریزی پیشمەرگەکان و ریزی رەتلەکان تیک چو، هەندی لە تاقمەکان پیش کەوتن و هەندیکیان لە بەر تاریکی و نەشارەزایی و پیویستی بی دەنگ بون، لە یەکتری گوم بون. لە کاتیک دا هەندی لە رەتلەکانی پیشەوە تیپەری بون، بۆسەیەکی پچوکی قم لەو نزیکانە بە جموجولی هیزەکەی زانی و، چەند تەقەیەکی کەمی کرد.

ئەم چەند تەقەیە بو بە هوی تیکچونی تەواوەتی شیرازەی ریکخستنی رەتلەکان. پیشمەرگەکان پەرش و بلاو بونەوە لەو ناوچەیەدا، تاریکایی شەو و نەشارەزایی و ماندویەتی و پەک کەوتن، هیزەکانی لەتوپەت کرد و، سەرکردایەتی هیزەکە نەیتوانی سەیتەرەی بە سەر دا بکاتەوە. بەمجورە هیزەکە کە بە دریژایی ئەو ریگا دورودریژە هەمو پیکەوە بون و، لە یەکتری دانەبرا بون، لەم کاتەدا کە پیکەوە بون و پیکەوە رویشتن لە هەمو کاتیکی کە پیویستتر بو و، ئەبوایە لە یەکتری دانەبرین، کەچی پارچە پارچە بون و، هەر پارچەیەکی کەوتە لایەکەوە.

کە دنیا روناک بوەوە هیزەکە بە ناریکوپیکی بوبوە ٣ بەش:

بەشی یەکەمیان، ئەوانەی بە «ئیتجاه» ی دیاریکراوی کشانەوەکەدا رویشت بون و، لە شوینی تەقەکان دەرباز بوبون.

بەشی دوەمیان، ئەوانەی بە «ئیتیجاه» ی پیچەوانەی «ئیتیجاه» ی دیاریکراوی کشانەوەکەدا، بەرەو لای سنوری عیراق دەرباز بوبون.

بەشی سیبەمیان، ئەو هیزە بو، بۆ پاراستنی پشتەوەی رەتلەکان و داپوشینی کشانەوەکە مابوەوە، لە گەل ئەو کەس و تاقمانەی لە دەوروبەری شەرگەی روژانی پیشوتر و سەرچەم و و نزیک گوندەکە بە جێ مابون و، بە پچر پچری بی ئەوەی هیچیان ئاگای لەوی تریان بی پەرەوازە بوبون.

بەشی یەکەم، خوی ریک خستەوە و دامەزرا، بە هیوای گەیشتنی پاشماوەی هیزەکە.

بەشی دوەم، تومەس هەندی لە فەرماندەی رەتلەکانی پیشتر تەگبیریان کردوە کە بەرەو نزیکترین نوقتەی عیراق بگەرینەوە و، تەسلیم ببنەوە بە عیراق، بویە ریگەیان لە رەتلەکانیان گوری بو.

بەشی سیێەم، هەر ئەو روژە دانە دانە و بە کومەڵ، لە لایەن قم و عەشیرەتەکانی ناوچەکەوە، گیران و چەک کران.

لە ناو ئەوانەدا کە گیرا بون: عەلی عەسکەری، تاهیری عەلی والی، سەید کاکە، قادری مامەند ئاغا و، دەیان فەرماندەی کەرت و مەفرەزەیان تێ دا بو. بە دیل گیرانی فەرماندەی هیزەکە، خوی لە خوی دا گورزیکی کوشندە بو لە هیزەکە کەوت و، یەکی بو لەو هویانەی دوژمنی هارتر کرد بو پەلاماردان و راونانی پاشماوەی هیزەکە.

لە ناو ئەوانەش دا، کە بەرەو عیراق چو بونەوە و تەسلیم بونەوە: تالیب روستەم، شیخ جەوادی بیدەری، عەولا سور، کویخا قادری زودی، حەمەدی بایز، بەکر پیروت.. یان تی دا بو. بە هەمویان ۱۷٦ کەس بون و ۱۱۷ چەکیان پی بو.

*

خوڕیکخستنەوەی پاشماوەی هیزەکە

ئەو هیزەی بە پچرپچری لە شەری بازی دەرباز بوبو، روژی دواییتر پاش ئەوەی یەکی گرتەوە، هەر لە هەمان ناوچەدا مایەوە، بە هیوای گەیشتنی پاشماوەی هیزەکە. بە هەمویان ۱۷۰ کەسی چەکدار و بی چەک بون، لەوانە: خالید سەعید، حسین بابە شیخ، عومەری حاجی عەبدوللا، ئازاد هەورامی، رەئوف مستەفا، مەحمود عەبدولرەحمان، حامیدی حاجی غالی، عەلی ئەحمەد شیعە. لە پاش چاوەروانییەکی نائومیدانە کەوتە ری بەرەو گوندی «کەهنێ» لە نزیک شاری «جولەمیرگ»، ناوەندی ویلایەتی «هەکاری».

ئەم هیزە، نەیئەزانی پاشماوەی هیزەکەیان چی لی بە سەر هاتوە. لە راستی دا دە دە کا دەوریکی خراپی هەبو لە چەواشە کردنی سەرکردایەتی ئەم هیزە و، سەر لی تیکدانی مەکتەبی سیاسی دا، چونکە لە باتی ئەوەی زانیاری راست دەربارەی لە ناو چونی پاشماوەی هیزەکە بە خالید سەعید و هاوریکانی بلی و، دەنگوباسی راست بو ئیمەش بنیری، وای ئاگاداری هەردولایان کرد کە: عەلی عەسکەری و زیاتر لە ۲۰۰ پیشمەرگە چونەتە دیوی عیراق و، لە نزیک «نیروە» بنکەیان داناوە.

لە نامەیەک دا کە روژی ۷۸/٦/۱۰ لە ناوچەی ژیرکیەوە، خالید سەعید، حسین بابە شیخ، عومەر عەبدوللا نوسیویانە، دوای باس کردنی شەری بازی و، کشانەوەیان نوسیویانە، ئەلین:

«.. شەو کە لە چیا هاتینە خواری نزیک گوندی بازێ توشی کەمینیکی جاشەکان بوین و تەقەیان لی کردین، وەکو بومان باس کردن ئیمە نەشارەزا بوین لەو شەوەوە بوین بە دو قوەتەوە و لە یەکتری بر بوین، ئەمرو برادەرانی پ ش م (مەبەستی دە دە کا دە یە) ئاگاداریان کردین بە نوسراو، کەوا کاک عەلی عەسکەری نوسراوی بۆ ئەوان نوسیوە کە بە خوی قوەتەکەی لە گەلی دایە، بەرەو ئەتریش لە ناوچەی عەمادیە چون و، حالیان زور باشە»

لە بەشیکی تری نامەکەیان دا نوسیویانە:

«ئیمە هەر لە سەر ئیشوکارەکانی خومان بەردەوام ئەبین دوای ئەوەی کە وەجبەی چەکەکانمان دەس کەوت بەرەو بادینان ئەرۆین کە لەو ناوچانەدا وەکو ئاگادار کراوین چەکداری خومانی لێ یە: بەیتوشەباب و ئولودەرە»

لە پاش ئەم شکستە سەختەی بە سەر هیزەکانی یەکیتی دا هات، ئەگەر تا ئەو کاتە هەندی لە عەشیرەتەکانی کوردستانی تورکیا دودڵ بون لە بەشدار بون لەو شەرەدا، کە لە بەینی یەکیتی و قم دا بو، وە خویان مات کرد بو سەیری ئەنجامی شەرەکەیان ئەکرد، لە دوای ئەوە ئیتر دەمیان چیشکە بو بو، هەمویان کەوتنە خۆ بۆ راونانی پاشماوەی هیزەکە بەو پەری دڕی و درندایەتیەوە، هیچ نەبی بۆ تالان کردن و روت کردنەوەیان لە چەک و پارە و سەعات، هەندی جار لە پیلاو و جلوبەرگ.

هیزەکە چەند روژیک لە کەنی مایەوە بۆ ئەوەی خوی ریک بخاتەوە و ریوشوینی رویشتنی دابنیت و پەیوەندی لە گەڵ دوستەکانی نوی بکاتەوە.

لەم ماوەیەدا هەروەکو هیزەکەی یەکیتی حسابەوە و پشوی دا و خوی ریک خستەوە، لە هەمان کات دا هەمو عەشیرەتەکانی ناوچەکەش خویان ساز دابو و، سەرانسەری ناوچەکەیان گرت بو، تەنانەت هەوالنیرەکانی تورک لەو وتار و هەوالانەدا کە بەم بونەیەوە لەو روژانەدا ئەیان نوس، هەروەکو دانیان پەوەدا ئەنا کەوا ئەم هیزە بە نەخشەیەکی زیرەکانە دەرباز بوە، بەلام لە هەمان کات دا بە دلنیاییەوە ئەیانوت ئەم هیزە هەلی دەرباز بونی نیە، چونکە ئەیانزانی مبیت و دوژمنەکانی چ تەپکەیەکیان بو لە ناوبردنی ریک خستوە.

مبیت و عەشیرەتەکانی ناوچەکە و قم، زوریان هینا بو خەلکی کەنی و ناوچەکە، کە ئەوانیش تیرەیەک بون لە هوزی ژیرکی، هیزەکەی یەکیتی لەوی دەربکەن، ئەوانیش، بو ئەوەی توشی شەر و پەلامار نەبن داوایان لە هیزەکەی یەکیتی کرد ناوچەکەیان بە جی بهیلی.

ڕۆژی ٧٨/٦/٩ د. کەمال خۆشناو و سالار گەیشتنە شاری وان و، لە گەڵ چەند کەسی لە سەرکردەکانی دە دە کا دە کۆبونەوە بۆ باسی وەزعی هێزەکە و، دانانی ڕێوشوێنی دەربازکردنیان.

کەمال و سالار داوایان لە سەرانی دە دە کا کرد بو: ڕێوشوێنی گەڕانەوەی هێزەکە بۆ ناوچەی شەمزینان - برادوست دابین بکەن و، ئەلێن ئەوە باشترین و گەورەترین یارمەتی یەکێتیە.

بەلام سەرانی دە دە کا دە پێ لە سەر ئەوە دائەگرن کە:

ڕێگاکانی شەمزینان بەرەو برادوست هەمویان گیراون و، لەوێوە ساوەی دەرباز بونیان نیە.

خۆیان زۆریان بیر کردوتەوە لە چونیەتی دەرباز کردنی هێزەکە، هیچ ڕێگایەکی تر نیە جگە لەوەی خۆیان تەگبیریان کردوە:

- پەیوەندیان لە گەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەکە کردوە و، بەلێنیان لێ وەرگرتون شەر بە هێزەکانی یەکێتی نەفرۆشن و ڕێگەیان لێ نەگرن.

- ڕێگەیان بۆ ناوچەی ئولودەرە - زاخۆ بۆ ناو عەشیرەتی گۆیی، کە دوستی ئەوانن تەئمین کردوە و، خۆیان تاقییان کردوتەوە کە سەلامەتە.

- چەند کەسێکی «گۆیی» یان پەیدا کردوە کە بۆ ڕێبەری و ڕێ پیشاندان لە گەڵ هێزەکە بن، تا ئەیان گەیێنە ناوچەکە.

سالار لە گەڵ چەند کەسێکی دە دە کا دە ئەچی بۆ ناوچەی ئولودەرە بۆ ئامادە کردنی مەفرەزەی گۆییەکان بۆ بەپیرەوە چونی هێزەکە و، د. کەمالیش لە گەڵ چەند کەسێکی کەیان ئەچی بۆ سەردانی هێزەکە لە نزیک گوندی کەهی. شەوی ٧٨/٦/١٦ ئەگەنە لایان، هەندی چەک و فیشەک و پارە و خواردنیان بۆ ئەبەن.

لیپرسراوەکەی دە دە کا دە بە دلنیاییەوە ئاگاداری خالید سەعید و هاوڕێکانی ئەکا کە تا ئەگەنە ناوچەی عەشیرەتی گۆیی توشی شەر و ناڕەحەتی نابن، بە تایبەتی چونکە قسەیان لە گەڵ هەمو عەشیرەتەکانی ناوچەکە و، گوندەکانی سەر ڕێگا کردوە و، بەلێنیان لێ وەرگرتون کە دەس نەهێننە ڕێگایان، جگە لەمەش چەند دەلیلێکی گۆییان لە گەڵە و هێزێکی گۆیی چاوەڕێیان ئەکات و، «عەشیرەت شەری عەشیرەت ناکات!».

هەروەها دلنیای کرد بون لەوەی کە عەلی عەسکەری و هێزێکی تر بە سەلامەتی گەیشتونەتە کوردستانی عیراق و، لە سەر سنور بارەگایان داناوە.

د. کەمال و لیپرسراوەکەی دە دە کا دە هێزەکە بە جێ ئەهێلن و، هێزەکەش

ئەكەویتە خوی كە روژی دوایی بەرەو ناوچەی گزیی بە ری بكەوی.

پەیامنیریكی تورك لە كومینتاریك دا كە بو ژمارەی ۱۷-۷۸/٦/۲۳ ی گوڤاری «الوطن العربی» سەر بە عیراقی ناردبو، نوسیویتی:

«كاربەدەستانی تورك هەلویستی تەماشاكەری وریایان گرتوە لە ناكوكی خویناوی نیوان تاقمە كوردیەكان دا لە ناوچەی هەكاری....

ئەگەر كاربەدەستانی تورك هیچ پەژارەیەك دەرنابرن لەوەی رو ئەدا، لەبەر ئەوەیە چونكە مەیدانی پیكادانەكانی ناوچە كوردیەكان ئابلوقەدراوە بەرپوشوینی سوپایی توركی بە جوریك كە ئاهیلی رەنگدانەوەی سیاسی لە ناو سنوری توركیا یا دەرەوەی دا هەبی ..

دوا راپورتی گەیشتوتە ئەنقەرە وائەگەیەنی لەوە ناچی تاقمەكەی خالید سەعید بەخت یاری بی و، لەوە ناچی بتوانی لە سنور بپەریتەوە بو ئەوەی خوی بدا بە دەست عیراقەوە تاكو لە ناو نەچی...

سەیركەو ئیحتیاتی خوت وەربگرە! ئەمە ئەو سەرەتا كردەوەییەیە كاربەدەستانی تورك گرتویانە بەرامبەر ناكوكی ناوخوی كوردی بو ئەوەی لە چوارچیوەی كوردی دا بیهیلنەوە، بە شیوەیەك كە ریگەی نەدا ببیتە هوی هیچ ئیجراائاتیك بو پەیوەندیەكانی دەرەوەی توركیا، هەروەكو ناشهیلی رەنگدانەوەی سیاسی ناو دەولەتانی هەبی لە ناوچەكانی كەمایەتی كوردا لە توركیا»

*

لە ناو چونی یەكجاری

ئەم هیزە، دوای ئەوەی حەسایەوە و، هەندی چەك و تەقەمەنی و خوراك و بارەی پی گەیشت، ئەیتوانی لە تەوقی ئابلوقەدان رزگاری بی و بگەریتەوە ناوچەی ۳ سنور، بو ئەم مەبەستە ئەیتوانی كەلك لە ئوتوموبیل و تراكتور وەربگری بۆ ئەوەی بە زویی لە ناوچەی دوژمن دەربچی، بەلام بە پیٚ ی ئەگیریەكەی دە دە كا دە كەوتنە ری و، مەلا مەحمودی گزیی و، چەند كەسیكی كە، كەوتە پیشیان.

هیزەكە هەر كە بە ری كەوت، كەوتە ناو چەند عەشیرەتی ئەهار و كزكەوە، چەند روژ بو خویان ئامادە كرد بو بۆ لیدانی. هیزەكە ئەگەرچی هەولی زوری دا لە گەل عەشیرەتەكان توشی شەر و پیكادان نەبی و، بو ئەو مەبەستە چەند جاری ریگەی گوری و، ریگەی زور سەخت و دژواری گرت و، چەند جاری «قاسید» ی ناردە لایان و، ۸ كەسی لە مام خوران بە بارمتە گرت، بەلام هەر سودی نەبو، چونكە عەشیرەتەكان لە هەمو لایەكەوە بۆ لە ناوبردنی بە خۆ كەوت بون و، بۆیان دامەزرا بون.

شەوەکی ڕوژی ٧٨/٦/١٩ لە کاتیک دا بە دەربەندیک دا تی ئەپەرین، کەوتنە بوسەیەکی گەورەی سەدان چەکداری عەشیرەتەکانی: ژیرکی، مام خوران، زیوکیان، کوچەر، سپیرتی و، گیتە.. کە شیخموس کەرەشان دای نابو. لەم شەرەدا کە چەند سەعاتیکی خایاند، دەیان پیشمەرگەی دلیر و ئازا شەهید بون و، چەند پیشمەرگەیەکیش بە برینداری بە جی مان لەوانە: رەوەفی مستەفا بەگ و، دەیان فەرماندەی پیشمەرگە بە دیلی کەوتنە دەس چەکدارەکانی ژیرکی، لەوانە: خالید سەعید، حسین بابە شیخ، عومەر عەبدوللا، ئازاد هەورامی، مەحمود عەبدولرەحمان، عەلی شیعە، حامیدی حاجی غالی، فوئاد عومەر... پاش چەند ڕوژی، تەسلیمی قم یان کردن.

بەمجورە دوایەشی هیزەکە لە ناو چو.

لە مانگی مایس دا «ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورک» بو لیکولینەوەی دو مسەلە کوبونەوە: یەکیکیان، مسەلەی کورد. ئەوی تریان، مسەلەی زوربونی کوژران لە تورکیا لە ئەنجامی پیکادانی سیاسی دا.

لە سەرەتای مانگی حوزەیران دا وەفدیکی عیراقی بە ناوی گفتوگوی بازرگانیەوە دەربارەی قەرزی نەوت سەردانی ئەنقەرەی کرد.

هەر لە مانگی حوزەیران دا، وەکو ژمارەی ڕوژانی ٢٤-٧٨/٦/٣٠ حەفتەنامەی پاریسی «الوطن العربی» نوسی بوی: جەنەراڵ کەنعان ئەفرین، سەروکی هەیئەتی ئەرکان، لە گەڵ فەرماندەی هیزی زەمینیی و، فەرماندەی جەندرمە و، چەند گەورە ئەفسەری میت، سەردانی کەرتەکانی فەیلەقی ٣ ی ئوردوی کرد لە کوردستان و، هەر لەو ماوەیەدا سەروکی وەزیرانیش، بولەند ئەجەوید، سەردانی هەکاری کرد. لە سەردەمی دامەزراندنی جمهوریەتی تورکیاوە، ئەمە یەکەمین جار بو، سەروکی وەزیران سەردانی ئەم ناوچەیە بکات و، لە وتاریک دا داوای لە دەوڵەتانی دراوسی کرد: کە هاوکاری بکەن بو گەشە پی دانی ناوچەکە و، چەسپاندنی ئاسایش.

لە ٢٠ حوزەیران دا، واتە ئەو ڕوژەی دوایین پیکادان قەوما، وەزیری کاروباری ناوخوی تورکیا عیرفان ئوزایدنیلی رایگەیاند کە هیزەکانی تورک لاشەی ١٢ کەسی دوزیوەتەوە کەلە شەری ١ی حوزەیران دا کوژراون، هەروەها وتی: «هیزەکانی عیراق لە هیرشەکانیان دا دژی کورد، لەجاریک زیاتر لە سنور تی پەریون» و، بەلینی دا لە پاشەروژدا «سنوری تورکیا بە چاکی بپاریزن و نەهیلن پشیوی لە دەرەوەی سنوری ئەوانەوە بیتە ناو تورکیاوە».

لەم کەین و بەینەدا ئەگەر تورکیا بەرەسمی و ڕاستەوخوش یارمەتی قم ی نەدابی

دژی یەکیتی، ئەوا چاوپوشی ئەنقەستی لی کردبو کە ناوچە سنوریەکانی تورکیا بکاتە مەیدانی بەریوەبردنی چالاکی عەسکەری و سیاسی و ئیعلامی خوی، ئەگینا تورک ئەیتوانی کونترولی ناوچەکە بکا و نەهیلی ئەم کەلک لە قەلەمرەوی ئەوان وەربگری و، عەشیرەتە کوردەکانی تورکیا بەشداری شەر بکەن بە قازانجی ئەم.

چەند روژنامەنوسیکی تورک چون بو بینینی گیراوەکانی یەکیتی و، گفتوگویان لە گەل کردن. مامجەلالیش نامەیەکی بو ئەجەوید نارد، دەربارەی گیرانی سەرکردەکانی یەکیتی لە ناو خاکی تورکیادا، «ریگای ئازادی» هاوتای کرمانجی «ئوزگوریرلک یولو» نامەکەی بلاو کردەوە. ئەجەوید، نامەکەی پشت گوی خست.

چاوپوشی ئەنقەرە، بەتایبەتی دەزگاکانی میت و جەندرمە و ئوردو، لەچالاکی ئەم ئەگەریتەوە بو چەند هویەک:

١. ئەجرویەی پیشوی پارتی عیراق لە رەفتاری دا لەگەل بزوتنەوەی کوردی تورکیا، دەری خستبو کە زیانی بو حکومەتی تورکیا نیە، چونکە پارتی مەسەلەی خوی بەسەرەکی دائەنی و کە رەفتاری لەگەل بزوتنەوەی پارچەکانی تر ئەکرد بو خزمەتی خوی و بەهیزکردنی هەلویستی خوی بو، نەک بو هاندان و یارمەتیدانیان دژی حکومەتی مەرکەزی خویان. بە پیچەوانەی یەکیتی کە هەلویستیکی توندرەوی هەبو لە مەسەلەی کوردی پارچەکانی تری کوردستان، زیاتر لەوەی ناوچەیی بی، بوچونی «پان کوردیستی» هەبو.

٢. لەو کاتەدا تورک لەگەل عیراق لەسەر مەسەلەی قەرزی نەوت توشی کیشە بوبو، تورک لە تەنگوچەلەمەیەکی ئابوری دژواردا بو، قەرزیکی زوری ولاتانی تری لەسەر کەلەکە بوبو، کیشەی زوری هی کرینی نەوت بو، لەوە ٣٣٠ ملیون دولاری عیراقی لەسەر کەلەکە بوبو، نەیئەتوانی بو بە دراو بیداتەوە وەکو عیراق ئەیویست، بەلکو ئەیویست نرخەکەی بە کەلوپەلی تورکی بدا لەسەر ئەوە ٦ مانگ بو عیراق رویشتنی نەوتی لە لولەی تورکیەوە راگرت بو، تورکیش قازانجی لەوەدا ئەبو هەمو جولانەوەکە بەتەواوی لە ناو بچی و ریگە بو عیراق تەخت بی، بەلکو ئەیویست کەلک لە کیچەلی کوردی وەربگری دژی عیراق بو ئەو سەودایەی بە دەستیەوە بو.

٣. حکومەتی ئەجەوید لە هەلبژاردن دا لە ناوچە کوردنشینەکان دا زورایەتی دەنگی خەلکی بەدەست هینابو سەبارەت بەو نەرمیەی لە کوردستان پەیرەوی ئەکرد، نەیئەویست لە ئەنجامی بەکارهینانی توندوتیژی دا، ئەو بنکە جەماوەریە گرنگە لەدەست بدا، چاوپوشی لە باکیلی بزوتنەوەکە ئەکرد.

٤. هەر لە سەرەتای دامەزراندنی قم وە بە پەیڕەوی لە سیاسەتی پیشوی پارتی بەرامبەر تورکیا، توانی بویان پەیوەندی لەگەڵ دەزگای میت و هەندی لەکاربەدەستانی سنور دروست بکەن.

لەبەر ئەم هویانە تورکیا لە رووداوەکانی هەکاری دا یارمەتی قم دا دژی یەکیتی.

*

سامی سنجاری، کە ئەوسا، سکرتیری قم بو، بە بونەی تیشکانی یەکیتیەوە، بە ناوی قم دوە بەیانیکی نوسی لە ژیر سەرناوی: «حملە الالف جحش» و، لە ئەوروپاش ئەم بەیانەیان بە ئینگلیزی بلاو کردەوە.

*

## قەندیل: هەستانەوە

*

«دۆڵە نیٚ» ناوچەیەکی بەفراوی و چوٚل و دور بو لە ئاوەدانییەوە. خومان هەندی رایەخ و بەتانی مان لە گەڵ خومان هەلگرت بو، ئەمو مشوری پەیدا کردنی خواردن بخوین. تەنیا چاوساغ و شارەزامان: قادر خەبات، بو. قادر هەتا بلی ی بە هیمەت و دلسوز و لە بەردەم ماندوبون و ناخوشی دا خوراگر بو.

هەمو روژی فروکەی جەنگیی ئیرانی بە ئاسمانی ناوچەکەدا ئەسورانەوە. ئەمو بە روژ خومان حەشار بدەین و، ئاگر و دوکەڵ نەکەینەوە. چەند جاری هالیکوپتەری ئیرانی هاتە سەرمان تەقەی لی ئەکردین و، جاریکیان چەند ولاخیکی کوشتین. زوری پیشمەرگەکان ورەیان بەر دابو، لایان وابو لە ناو ئەچین، ناو بە ناو لی یان هەڵ ئەهات، هەندیکیان ئەچون تەسلیمی ئیران ئەبون و، هەندیکیان ئەگەرانەوە بو دراوە.

*

دۆڵە نیٚ و مراد شیریژ

«دولە نیٚ» هەندی بیرەوەری کونی لە لا وروژاندم. دەساڵ پیشتر مراد شیریژ و هەندی لە هاوریکانی لیرەدا کوژرا بون. موراد یەکی بو لە فەرماندەی پیشمەرگەکانی بزوتنەوە چەکدارییەکەی سالی ١٩٦٧ - ١٩٦٨ ی کوردستانی ئیران. بەم بونەیەوە بە پیویستی ئەزانم یادی لە روداوەکانی ئەو سەردەمە بکەمەوە، بە تایبەتی لەو کاتەدا ئیمە: ئەوانەی گوڤاری «رزگاری» مان دەرئەکرد، لە پیش هەمو لایەک و، گوڤار و روژنامەیەکی تردا بە هاودەردییەکی قولەوە هەواڵەکانی جولانەوەکە و، وینەی قارەمانەکانیمان بلاو کردەوە.

دوای شورشی ١٤ تەموز ریکخراوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران کەوتنە بەر هیرشی «ساواک» چەند کەسی لە سەرکردە و ئەندام و لایەنگرەکانیان گیران و، چەند سەد کەسی لە سەرکردە و ئەندامەکانیشیان پەنایان بو کوردستانی عیراق هینا. ئەوسا کوماری عیراق بە قەلای ئازادیخوازان دائەنرا و، مەلا مستەفای بارزانی وەکو قارەمانی نەتەوەیی کورد تەماشای ئەکرا.

هەر لە سەرەتاوە زوری ئەم ئەندامانەی دیموکرات خویان لە بارزانی نزیک خستەوە و، بە چاوی پیشەوای هەمو کورد سەیریان ئەکرد و، زورتر لەو نزیک بون تا

سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق.

کە شورشی ئەیلول دەستی پی کرد هەندی لە مانەش چونە ریزی شورشەکەوە. جولانەوەکە لە ناوچەکانی سلیمانی و هەولیر دا لە سەرەتادا توشی نیشتنەوە و کشانەوە بو. ئەمان ئەوەیان بە هەل زانی بەو داوودەزگای چاپەی هەیان بو کەوتنە بلاوکردنەوەی شتی بە ناوی «دیسان بارزانی» بەوە. لەم بلاوکراوەیەدا ستایشیان لە بارزانی ئەکرد و، توانج و تانەیان لە ریکخراوەکانی پارتی ئەدا. تووی ناکوکی و دوبەرەکییان ئەوەشاند.

ئیران جوری لە پەیوەندی لە گەل مەکتەبی سیاسی دروست کرد بو، هیشتا پەیوەندی لە گەل بارزانی دانەمەزراند بو، بارزانی بو ئەوەی ئیران لە مەکتەبی سیاسی توورە بکا و، ناچاریان بکا پیوەندییەکە بگویزنەوە بو لای خوی، هەندی لە مانەی نارده ناوچە سنوورییەکانی نزیک مەکتەبی سیاسی تەقە لە پاسگاکانی ئیران بکەن.

سالی ١٩٦٤ لە کاتی لەت بونی پارتی دا بی دودلی پشتیوانییان لە بارزانی کرد دژی مەکتەبی سیاسی، هەندی لە بەیانەکانی بە ناوی بارزانییەوە دەرئەچو ئەمان بویان ئەنوسی، تەنانەت لە سەنگەسەر هەندیکیان بون بە زیندانەوانی گیراوەکانی لایەنگری مەکتەبی سیاسی.

دوای لەت بونی پارتی و، سەرکەوتنی بارزانی، ئیران پیوەندی لە گەل بارزانی بەهیز کرد، تا ئەهات بەهیزتریش ئەبو. بارزانی ئیتر نەیئەتوانی هاوسەنگی لە نیوان پەیوەندی لە گەل ساواک و پەیوەندی لە گەل دیموکرات دا رابگری، ئەبو لە نیوان شا و دیموکرات دا یەکیکیان هەلبژیری. سەرەنجام شای هەلبژارد و، کەوتە تەنگ پی هەلچنین و راونانی کادر و پیشمەرگەکانی دیموکرات. لەو کاتەدا دیموکرات لە ژیر کارتیکردنی حیزبی تودەی ئیران و حیزبی شیوعی عیراق و، لەت بونی پارتی بو دو ریکخراوی جیاوازی «مەلایی» و «جەلالی»، توشی تەنگوچەلەمەیەکی سیاسی و ریکخراوەیی قول بوبون و، لە ناو خویان دا بوبون بە چەند بەشیکەوە:

بەشیکیان لە ئەورووپای روژهەلات جیگیر بوبون وەکو بەشی لە حیزبی تودە یان وەکو خویان ئەیانوت: «حیزبی مادەر» کاریان ئەکرد.

بەشیکی تریشیان لە کوردستانی عیراق بون ئەمانیش بوبون بە ٣ پارچەوە:

- پارچەیەکیان لە گەل بارزانی بون.
- پارچەیەکیان لە گەل مامجەلال بون.
- پارچەیەکیشیان خویان هاویشت بوە پەنای حیزبی شیوعی.

ئەوانەی لە گەل مەلا مستەفاش بون، بو بون بە دو دەستەوە:

دەستەیەکیان عەبدوللای ئیسحاقی «ئەحمەد توفیق» ڕیبەری ئەکردن، هەر بە دلسوزی ما بونەوە بو بارزانی، بەلام بارزانی لە سنوری ئیران دوری خستنەوە بو بادینان. لە هەلومەرجیکی نادیاردا سەریان تی دا چو.

دەستەکەی تریان سولەیمانی موعینی «فایەق ئەمین» ڕیبەری ئەکردن، «کومیتەی ئینقیلابی» یان پیک هینا بو. ئیسماعیلی شەریف زادە، عەبدوللای موعینی، مەلا ئاوارە لە سەرکردە ناسراوەکانیان بون. لە ژیر گوشاری بارزانی دا ئەمانە بڕیاریان دا بگەڕینەوە بو کوردستانی ئیران و، بە چەکداری لە دیهاتەکان دا بکەونە گەڕان و، خەباتی سیاسی و چەکدار.

سەرکردە و پیشمەرگەکانی کومیتەی ئینقیلابی گەڕانەوە بو کوردستانی ئیران و، بە ناوچەکانی بانە، سەردەشت، خانە دا بلاو بونەوە و، خەریک بو جیگیر ببن. ئەمە مەترسییەکی گەورەی بو سەر ئیران دروست کرد. جولانەوەکە خەریک بو لە دنیادا دەنگی ئەدایەوە و، هەندی لە ڕیکخراوە چەپەکانی ئیران لە ئەوروپا خویان ئامادە کرد بو بەن بەشداری تی دا بکەن.

ئیران بە هاوکاری بارزانی کەوتە ڕاونانی جولانەوەکە. عەبدولوەهاب ئەتروشی، ئەوسا لە ئەویلە بو، پولی پیشمەرگەی دیموکراتی بە گیراوی تەسلیمی ساواک کرد. هیزەکانی بارزانی یارمەتی هیزەکانی ئیرانیان ئەدا بو دوزینەوەیان. لە ماوەیەکی کورت دا هەمو سەرکردەکانیان: ئیسماعیلی شەریف زادە، عەبدوللای موعینی، مەلا ئاوارە، مەراد شیریزی... یەک لە دوای یەک کوژران و، سولەیمانی موعینی کە ڕیبەری جولانەوەکە بو، لە کاتی گەڕانەوەی دا بو کوردستانی ئیران لە شارباژیر کەوتە بوسەی «صدیق ئەمین» ەوە کە لیپرسراوی لقی ٤ ی پارتی بو، ئەم و هاوری یەکی بە ناوی خەلیل شەوباش گیران و، ڕەوانەی لای بارزانی کران. هەردوکیان کوشتن و تەرمی سولەیمانیان تەسلیمی ساواک کرد. ساواک بو شکاندنی چاوی کورد تەرمەکەی بە کوردستان دا گیرا.

جولانەوکەی ١٩٦٧ - ١٩٦٨ کە ١١ مانگی خایاند بە کوژرانی سەرکردەکانی کوتایی هات.

*

هەوالنامە

هیشتا لە نوکان بوین، دەفتەر و ڕوژمیرەکانم کو کرد بوەوە ئەمویست هەوالەکانی شورش ڕیک بخەم. پیشتر «بەلاغیکی عەسکەری» دەر کرا بو، بەلام زور لە ڕوداوەکانی نەگرت بوەوە. سەر لە نوی هەمو ڕوداوەکانم بە سەر کردەوە بە گویرەی ڕوژ و

مانگ و سال ریزم کردن و، دامرشتنەوە. داوام لە مامجەلال کرد ئەویش پیشەکی بو بنوسی. هیمەتی کرد لەو هەلومەرجە سەختەدا پیشەکی دریژی بو نوسی.

تایپەکەمان لە گەل خومان برد بو، بەلام رونیو و ستینسل و کاغەز و مەرەکەب مان لە لای حەمە سەعید لە «دولە کوکی» بە جی هیشت بو. ناردمان ستینسل مان بو هات. لە بن کەورگەکانی دولەنی دا کەوتینە تایپ کردنی.

کوریک هات بو بو پیشمەرگایەتی ناوی مەلا رەحیم بو. گومانی لە سەر بو. لە بەر ئەوە دەس بە سەر دامان نابو. کوریکی زیرەک و دەسرەنگین و قسە زان بو. خوی هاویشت بوە پەنای د. مەحمود. جاروبار خواردنی بو دروست ئەکردن. مەلا رەحیم تایپیستیکی باش بو. یەکەمین ژمارەی: «هەوالنامەی خەباتی شورشگیرانەی گەلی کوردستانی عیراق لە ماوەی دو سال دا» لە سەر ستینسل بەم پیاوە گومان لی کراوەم تایپ کرد و، ناردمەوە بو حەمەسەعید ئەویش بە رونیو چاپی کرد و، بو هەریم و لقەکان و، ریکخستنەکانی شار و، بو ئەوروپامان نارد. لە ئەوروپا سەرلەنوی چاپیان کردەوە.

یەکەم «هەوالنامە» ٥٤ لاپەرەی فولسکاپ بو. ٢٤ لاپەرەی پیشەکیەکی تیوری و سیاسی... بو، مامجەلال نوسی بوی، ئەوی تریشی هەوالی جوربەجوری دو سالی سەختی جولانەوەکە بو، من ئامادەم کرد بو.

چەند وتاریکی تریشم نوسی بە ناوی کومەلەوە بە هەمان ریوشوین چاپمان کرد.

*

بو خوپاراستن چەند جاری جیگورکی مان کرد بەلام هەر لە هەمان ناوچەدا ماینەوە، چونکە بەرزاییەکانی قەندیل هیشتا رەشاییان تی دا پەیدا نەبوبو، بوی بگویزینەوە. بەفر و سەرما و برسیتی پەریشانی کرد بوین. وردە وردە کوارگ و گیای کیوی پەیدا ئەبو. کوارگی قەندیل سپی و تامی خوش و تیایەتی بە قەد قاپیکی خواردن ئەبی. هەندی ئاردیشمان پەیدا کرد. بە زوری ئەمان کرد بە ناوساجی. چەند جاری ئەو پیشمەرگانەی رایان ئەکرد لە گەل خویان ناوساجیەکەشیان ئەبرد، ئیمەیان نانەراو ئەکرد.

*

سورانەوەی هالیکوپتەری ئیرانی شپرزەیان کرد بوین. بریارمان دا بگویزینەوە بو «دولی بالەییان» لە دیوی عیراقی قەندیل. کەلوپەلەکانمان پیچایەوە هەندیکی خومان هەلمان ئەگرت و، هەندیکی مان لە ولاخ بار کرد. پیش خومان ولاخەکانمان بە ری کرد و، لە هەر مەفرەزەیەک پیشمەرگەیەکمان لە گەل نارد. لە مەفرەزەکەی من «فەرید ئەسەسەرد» مان لە گەل ناردن.

فەرید چەند حەفتەیەک بۆ هات بۆ بۆ پێشمەرگایەتی. پاش هاتنی بە چەند ڕۆژی لە «مالومە» ی جافەتی بەر هێرشێکی جەیش و دابەزینی هالیکۆپتەر کەوت بو، بە فەلاکەت دەرباز بوبو. دوای ئەویش توشی ئەم سەفەرە سەختە بوبو. تازە تفەنگێکی برنەومان دابویە.

کاروانەکە بە ڕێ کەوت بو. ئەبو بە ناو بەفرێکی ئەستور دا هەلگەڕین. زۆر زۆر ولاخەکان لە بەفر دا چەقی بون. فەرید گەیشت بوە تینی لە باتی نەقیزە برنەوەکەی بۆ لیخوڕینی ولاخەکە بە کارهێنا بو. داری تفەنگەکە بۆ بۆ بە دو کەرتەوە. ڕاستیەکەشی من بە هەلەدا چو بوم، ئەرکێکی نالەبارم پێ سپارد بو: فەرید ئەهلی قەلەم بو، نەک ئەهلی تفەنگ. فەرید گەنجێکی ڕوشنبیر و نوسەرێکی باش و پێشمەرگەیەکی خوراگر بو.

ئێمەش بە قەندیل دا هەلگەڕاین بۆ لای «شێخ شەرو». هێشتا کەلاکی هالیکۆپتەرێکی لێ مابو کە سالی ڕابوردو لە شەڕێکی قورس دا بەردرابوەوە. چاوەری مان کرد تا دنیا تارێکی کرد. بە قەندیل دا شۆر بوینەوە و، بە لای «پشتئاشان» دا ڕویشتین، دیسانەوە بە «سیلم» دا هەلگەڕاینەوە و، ئینجا شۆر بوینەوە بۆ «خێلاپ» لە دۆلی بالەییان. دەمەوبەیانی گەیشتینێ.

چەند بزن و گیسک مان پەیدا کرد بو لە گەل خومان هێنا بومان. لەو کاتەدا بۆ ئێمە بە نرختریں سەرمایە بو. بە پێشمەرگەیەکمان سپارد بو ئاگای لێ یان بێ. بزنگەلەکەمان دیار نەبو. بزنەوانەکە بە شەو لە ماندویەتی دا فەراموشی کرد بون. بزنەکان چوبونە ناو بەفر و سەهولبەندانێکەوە لە شوێنێکی کور و سەخت دا. بزنەکان عاسی بوبون، ئەمیش تەبویرا بو دوایان بکەوێ بیان هێنێتەوە. قادر خەیات و سامان گەرمیانی گەڕانەوە دواوە بۆ هێنانەوەیان. قادر خەیات شاخەوانێکی شارەزا و کردە بو. بۆ ئەوەی ئەخزی و نەخلیسکی بە پێ ی پەتی بە شەختەی کوری شاخەکەدا هەلگەڕا بۆ بزنەکانی هێنایەوە.

*

جاری یەکەم من لە شوباتی ٧١ دا ئەم ناوچەیەم دی بو. ئەو کاتە من خۆمم لە داوودەزگا ئەمنییەکانی بەعس شارد بوەوە، چونکە بە پیلانێک کە تاقمی بارزانی لە سلیمانی بۆ تاوانبار کردنی من ڕێکیان خست بو، «محکمە الثورە» حوکمیان دا بوم. دوای یەکگرتنەوەی هەردو بالەکەی پارتی، لە گەل ئیبراهیم ئەحمەد، مامجەلال، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری، منیش چوم بۆ بارەگای بارزانی لە «قەسری». چەند مانگی لەوێ ما بومەوە زۆری شاخەکانی ناوچەکە و، ئاواییەکانی گەڕا بوم.

دولی بالەییان ناوچەیەکی شاخاوی عاسی بو، کەوت بوە بناری قەندیلەوە. ئەرزیان بو کشتوکال کەم بو، بەلام لەوەرگای گەورەیان هەبو. کانی و ئاوی زور و ئاووهەوای خوش و دیمەنی جوان بو. گویزی باش و هەنگوینی ئاوایییان هەبو. بەشیک بو لە ناوچەی بالەکایەتی، کە چومان ناوەندی بەریوەبەرایەتییەکەی بو.

لە سالاتی شورشی ئەیلول دا مەلا مستەفا کرد بوی بە بنکەی ژیان و کارەکانی خوی. خانو و بەرەی بو ژیانی خوی و خیزانەکەی لە «دیلمان» و، بارەگای کاری لە «قەسری» دروست کرد بو. زوریان ئازاری دانیشتوانی ناوچەکە دا بو، لە بەر ئەوە حەزیان لە چارەی بنەمالەی بارزانی و، بارزانییان نەدەکرد.

زوری پیاوەکانی دولی بالەییان لە شورشی ئەیلول دا پیشمەرگە بون. هوشی سیاسییان پیشکەوتو و شارەزاییان لە پیشمەرگایەتی دا زور بو. لە سەرەتای دەس پی کردنەوەی شورشی حوزەیران دا دولی بالەییان بو بو بە یەکی لە بنکە سیاسی و ریکخراوەیی و پیشمەرگەییەکانی یەکیتی. لە ۲۳ ی تشرینی دوەم و ۱۷ ی کانونی یەکەمی ۷٦ دا و، لە کوتایی مارتی ۷۷ دا جەیش چەند لەشکرکیشییەکی گەورەی بو سەر دولی بالەییان کرد بو. لەم شەرانەدا جەیش زەرەری گیانیی قورسیان لی کەوت بو. دانیشتوانی ناوچەکە لە ئابی ۷۷ وە راگویزرا بون، لە ئوردوگای «قەسری» دا کو کرا بونەوە.

*

ئیمە ژمارەمان کەم بو، بەرگەی هیرشی جەیش مان نەدەگرت. ئەبو خومان حەشار بدەین و، نەهیلین کەس جیگە و ریگە و ژمارەمان بزانی. لە قەسری «مەعسکر» یکی گەورەی لی بو، هەروەها ریکخستنی زوری یەکیتی لی بو.

کە گەیشتینە «خیلاپ» هەر مەفرەزەیەک پیویستییەکانی خوی، لە پیلاو و جلوبەرگ و جگەرە و خواردنی قوتو، کرد بە لیستەیەک. لیستەکەمان بو کومیتەی قەسری نارد بیکرن و بومان بنیرنەوە. ئەوەندەی پی نەچو، کومیتەی قەسری و لیپرسراوەکەیان، بە خواردن و کەلوپەلیکی زورەوە هاتن. پیمان سەیر بو چونییان زانیوە. تومەز ئەو پیشمەرگەیەی لیستەکانی کرد بو، لە سەری نوسی بو: لیستی پیویستییەکانی مەفرەزەکەی مام جەلال.. و کاک فلان و کاک فیسار. ناوی هەمومانی نوسی بو. کاغەزەکە کە گەیشت بوە دەستیان زانی بویان ئیمە لە ناوچەکەیان داین، بو ریز لی نان بە چاکیان زانی بو خویان بین بو سەردانمان.

بە دریژی ئەو ماوەیەی لە دولی بالەییان بوین «کومیتەی قەسری» بەو پەری

تواناپانەوە خزمەتیان کردین، یەکەمین چادر ئەوان بۆیان پەیدا کردین.

*

ئەمانویست لە خیلاپەوە بگوێزینەوە بۆ «زەنگەلین» یا «سەرشیخان». لە گەڵ قادر خەبات و دوسی پیشمەرگەی تر چوین بۆ «استطلاع» ی ناوچەکە. لە ریگا زۆرمان کوارگ کۆ کردەوە. دو جامانەمان پڕ کرد لە گەڕانەوەدا لە گەڵ خۆمان بیبەینەوە بۆ برادەران.

لە دورەوە ترووسکەیەکی ئاگرمان بە دی کرد. نەمانویست خۆمانی لی ئاشکرا بکەین. بۆ ئەوەی ئەمان بینن و هەستمان پی نەکەن دزەمان کرد بۆ نزیکیان. سەیرمان کرد تاقمی پیشمەرگەی بالەیین. کاتی خۆی لە گەڵ پایز ئاغا تەسلیم بوبونەوە. بەلام دیسان هات بونەوە دەرەوە. لە بەر بەفر و سەرما داپرا بون لە هیزەکانی تر. فەرماندەکەیان ئەحمەد مەولود بو. لەو ساوە لە گەڵ ئەحمەد بوین بە دو دوستی گیانی بە گیانی لە هەمو گەران و سوران و شەرەکان دا لە من جیا نەبوەوە، تا شەهید بو.

ئەم مەفرەزەیە بۆ ئیمە گەنجینەیەکی بە نرخ بو. پیاوی ئازا و گورجوگۆڵ بون. خەلکی ناوچەکەش بون. دوای جیا بونەوەمان لە هیزە سەرەکییەکەی یەکیتی، ئەمان یەکەم تاقم بون دەستمانی پی گەیشت بو.

*

دلی پیس

کە گەیشتینە «زەنگەلین»، داروەرەختمان بینی، وامان زانی دەرگای رەحمەتمان لی کراوەتەوە. پردیکی پچوکی لی بو. لە نزیک پردەکەدا لە بن شاخیکی هەزار بە هەزارا جیمان راخست. لە میژ بو گەرمان نەبوبوەوە. لە خۆشی دا کەوتینە کۆکردنەوەی چیلکە و دار. ئاگریکی زۆر گەورەمان کردەوە. ساوەرمان لی نا. هەویرمان شیلا. بە دیار ئاگرەکەوە بە چیچکانەوە دانیشت بوم. دنیا زۆر تاریک بو، گڕی ئاگرەکەش چاوی بە شەوارە خست بوین. منیش و پیشمەرگەکانیش هەستمان کرد لە شاخەکەی پشتەوەمان خرتە خرت دی و، هەندی جار بەرد خلور ئەبیتەوە. بەلام هیچمان نەئەدی. ناوچەکە چۆڵ بو لە ترسی جەیش کەس نەیئەویرا روی تی بکات. «مەعسکر» یکی گەورە لە قەسری بو. ئیرەش لە قەسری دور نەبو. وتمان رەنگە ورچ یان دەعبایەکی کیوی بی.

زۆری پی نەچو تارمایی زەلامیک دەرکەوت. ئافرەتیکی گەنج بو کە لیمان نزیک بوەوە سەلامی لی کردین و، هاتە ناومانەوە. بە خیرهاتنمان کرد. ساوەر و نان و چا مان پیشکەش کرد هیچیانی نەخوارد. وتی: «برسیم نیە». جاری نەمویست بکەومە

لیکولینەوە و پرسیار و وەلام. لیم پرسی: «ئەزانی نان بکەی؟» وتی: «بەلی ئەزانم».
وتم: «تاقەتت هەیە هەندی ناغان بو بکەی دەمیکە نانی باش مان نەخواردوە؟» وتی:
«خوتان هەویرەکە بشیلن، من نانەکەتان بو ئەکەم».

پاش ئەوەی هیمن بوەوە لیم پرسی: «خوت بە تەنیای یا پیاویشت لە گەلە؟»

وتی: «خوم بە تەنیام»

وتم: «رەدو کەوتوی؟»

وتی: «نەخیر رەدو نەکەوتوم»

وتم: «ئەگەر رەدوش کەوت بی و پیاویشت لە گەل بی، مەترسە بو ئیمە شتیک نیە، بەلام ئەگەر پیاوت لە گەلە پیمان بلی بو ئەوەی بانگی بکەین»

وتی: «پیاوم لە گەل نیە. من خوم میرد و مندالم هەیە و بە میردەکەی خوم رازیم»

وتم: «چی ئەکەی بە تەنیا لەم شاخە»

وتی: «میردەکەم دلی لیم پیسە. هەر چەن لە گەل پیاویک چاکوچونی بکەم لیم تورە ئەبی یان لیم ئەدا. پیری ئیوارە لە گەل دراوسی یەکمان قسەم ئەکرد. بە سەرا هاتەوە. لیم تورە بو خەریک بو لیم بدا. منیش هەلاتم. مالەکەمان نزیکە لە رەبیەی عەسکەرەوە. لە رەبیەکە تی پەری بوم. شەوی بە سەرا هات نەویرام بگەریمەوە بو مال. بەرەو کەونە گوندەکەی خومان چوم. ئەوە ۳ روژە لەو ناوەم ئەمشەو کە ئاگرەکەی ئیوەم دیت. لیتان نزیک بومەوە زانیم پیشمەرگەن هاتمە لاتان».

وتم: «ئەم ماوەیە چیت خواردوە؟».

وتی: «کوارگ و ریواس و گژوگیای کیوی».

وتم: «ئەتەوی لە میردەکەت جیا ببیتەوە؟»

وتی: «من میردەکەی خومم خوش ئەوی نامەوی لی ی جیا بمەوە»

ئافرەتەکە خەلکی گوندیکی راگویزراوی دولی بالەییان بو لە نزیک زەنگەلین.
هەندی لە پیشمەرگەکانی بالەییانی بە ناو ئەناسی. ئەو شەوە لای ئیمە مایەوە. بەیانی ناردم بە دوی ئەحمەد مەولودا. ئەحمەد ژنەکە و میردەکەی ئەناسی. بردیە بنکەکەی خویان. ژنەکە خیری بو دانەوە نانی بو ئەکردن و چیشتی بو لی ئەنان. کە ئیمە ناوچەکەمان چول کرد ئینجا ناردیان بە دوی میردەکەی دا ئاشتیان کردنەوە و، گەرانەوە مالی خویان لە قەسری.

*

رۆژێکیان لە «سەرشیخان» پالم بە گابەردێکەوە دابو سەیری شاخەکەی بەرامبەرمانم ئەکرد لە دوورەوە ریزێک زەلامم بینی ریچکەیان بەست بو بەرەو سەرشیخان ئەهاتن. ناوچەکە چول بو هاتوچوی بە سەرەوە نەبو. چومە سەر رێگەکەیان. باشتر لەیان ورد بومەوە هەمویان بی چەک بون و جلی کوردییان لە بەردا بو. گەیشتنە لای من سەلامیان کرد. منیان نەئەناسی. لیم پرسین: «بە دوای چی دا ئەگەرێن لەم شاخە چولە؟»

وتیان: «بە دوای ئێوەدا ئەگەرێین»

وتم: «بو ئەزانن ئیمە کیین بە دوامان دا ئەگەرێن؟»

وتیان: «ئێوە پیشمەرگە نین؟»

وتم: «بەلی ئیمە پیشمەرگەین. فەرمون چیتان ئەوی؟»

وتیان: «ئەمانەوی ئیمەش ببین بە پیشمەرگە!»

وتم: «ئیمە خومان تاقەتمان لە پیشمەرگایەتی چوە خەریکین وازی لی ئەهینین»

وتیان: «ئێوە تاقەتتان چوە ئیمە دەس پی ئەکەین!»

وتم: «چەکمان نیە بتاندەینی»

وتیان: «خومان پارەمان لە گەل خومان هیناوە ئەیکرین»

وتم: «نانمان نیە بتاندەینی»

وتیان: «خومان خەلکی ناوچەکەین نان پەیدا ئەکەین!»

خەلکی گوندە راگویزراوەکانی بناری قەندیل بون تازە پارەی «تعویض» ی دیهاتەکانیان وەرگرت بو. کە پارەکەیان وەرگرت بو یەکسەر هات بون بو پیشمەرگایەتی. بە خیر هاتنیکی گەرمم کردن. لە گەل خوم بردمن بو بنکەکەمان. مامجەلال و ئەوان چاوەروان بون بزانن ئەمانە چین و بوچی هاتون. چوم حیکایەتەکەم بو گیرانەوە. وتم: «ئەم میللەتە بویە نامری. ئیمە لە خومان بیزار بوین ئەوان تازە ئەیانەوی دەس پی بکەن».

*

نوا

لە ناو پوستەی ریکخستنی شاردا نامەیەکی بەختیاری برامم پی گەیشت لە گەل چەردەیەکی باش پارە. لە نامەکەدا هەوالی خویانی بو نوسی بوم. خوا کچیکی پی بەخشی بون، داوای لی کرد بوم، من ناوی بنیم. وەلامم دایەوە و ناوم نا «نوا» و، لە بەر ئەوەی ئەم وشەیە نائاشنا بو بەوان، مەعناکەشم بو نوسی: «نوا» بو باران وەکو «سیبەر» و «سایە» بو هەتاو، «نوا» بەو شوینەیان ئەوت کە بو خوپاراستن لە باران و بەفر ئەچونە ژیری.

بو یەکەمین جار وشەی «نوا» م لەم سەفەرەدا بیست بو. هەروەها چەند وشەیەکی تر وەکو:

لی نیشتن: هەندی جیگای شاخەکە کووڕ و لوس و خز بو، بە بەفرەکەدا بە پی مەترسی گلان و خزان و بەربونەوەی هەبو. پارچەیەک لباد، یا نایلون، یا قەمسەلەکەی لە سەر بەفرەکە دائەخست. هەردو لنگی دریژ و جوت ئەکرد و، دەستی ئەخستە ژیر سمتیەوە، هەردو پی ی بە جوتکراوی کەمی لە ئەرز بەرز ئەکردەوە، بە خیرایی بەرەو خوار ئەخلیسکا و، نشیویکی دریژی بە ماوەیەکی کەم بە سەلامەتی ئەبری.

لینمشت: لافاوی باران و بەفراو.

سول: تافگەی ئاو.

رنو: هەرەسی بەفر.

جمگە: داروخانی شاخ و، جمینی ئەرز.

کستەک و، سند: تۆپی بەفر کە لە بەرزایی شاخەوە خل ئەبیتەوە بەرەو خوار تا دی زلتر ئەبی. یان وەکو بە ئینگلیزی پی ی ئەلین: «سنۆ بۆڵ» و، وەکو زاراوی سیاسی بو زلبونی بەردەوامی گیروگرفت بە کاری ئەهینن.

چەقەڵ: شوینی بەردەلان لە ناو شاخ دا. کەچی لە ناوچەی سلیمانی دا ناوی دەعبایەکە لە خیزانی ریوی، لەم ناوچەیەدا بەو دەعبایە ئەلین: «تورگ».

گۆڕ: تەختایی سەر شاخ. کەچی لە ناوچەی سلیمانی بە شوینی ناشتنی مردوی ئەلین.

*

کەلاوەی خانوی ئاوایییە روخینراوەکان و، کەلەک و پاردەی زور لە باخەکان ما بون. باخەکانی سپیدار و میوە بە زوری لە بی ئاوی دا وشک بوبون. هەندی خەرمان، کە سالی پار لە کاتی راگویزان دا فریای هەلگرتنی نەکەوت بون، لە شوینی خویان دا دامرکا بونەوە. لە هەندی جی پیاز و پەتاتەی پار روا بونەوە.

پیشمەرگەکان لە بیکاریی دا کەوتنە گەران بە ناو کەلاوەی خانو و کەلەکی بەردەکان دا. تەور، پاچ، خاکەناز، ساج، سەتل و، زور شتی تری لەم بابەتەیان دوزییەوە. ئەمانە هەمو کەرەستەی بە کەلک بون بو ئیمە. لە ناو کەلەکی بەردەکان دا چەندین تفەنگ و چەندین هەزار فیشەکی شاردراوەیان دوزییەوە. باش هەلگیرا بون. لە دوایی دا خاوەنەکانیان پەیدا بون و بومان بژاردن.

*

ئەو ماوەیەی لە دولی بالەییان بوین خەریک بو ئەبوژاینەوە: لە خواردەمەنی دا هەرچی مان بویستایە لە «قەسری» وە بویان ئەهینایین، لە سوتەمەنی دا بو خو گەرمکردنەوە و نان کردن و چیشت لینان کەموکوری مان نەبو. هەندی چادرمان پەیدا کرد بو. هیزەکەش مان خەریک بو زیادی ئەکرد.

بەیانییەکیان لە بن بەردیک دا دانیشت بوین گوی مان لە هەوالەکانی «بی بی سی» گرت بو، باسی هەلگیرسانی شەریکی قورسی کرد لە ناو خاکی تورکیادا لە نیوان هیزەکانی یەکیتی و قم دا. بە وردی دریژەی هەوالەکەم لە بیر نەماوە، بەلام ئەوەم لە بیر ماوە کە زەرەری گەورە لە هیزەکانی یەکیتی کەوت بو.

هەمومان تاساین. ئەوە هیزی سەرەکیی یەکیتی و شورشەکە و، زوری سەرکردەکانی جولانەوەکەشی لە گەل بو.

*

سەراسی و شەوبیداری

پەندیکی پیشینان ئەلی: «دراوسی لە دراوسی، ئەگری سەراسی».

سەراسی: جوریکە لە ژانە سەر توشی لایەکی سەری مروڤ ئەبی، ئازاریکی ئەوەندە سەخت و بە تینی هەیە، ئەو چاوەی کەوتوتە ئەولایە لە تاو توندی ئیشەکە فرمیسک ئەریژی. لە زمانی پزیشکی دا پی ی ئەلین: «میگرەین». پەندەکە هیچ بنچینەیەکی زانستی نیە، چونکە سەراسی «ساری» نیە و، کەس لە کەسەوە توشی نابی، بەلام ئەبی مەبەستی پەندەکە ئەوەبی کە دراوسی لە دراوسیوە توشی گیروگرفت و گیچەل و دەردەسەر ئەبی.

لە کوردەواری دا، هوی ئەم نەخوشییە ئەهینەوە بو ئەوەی «سەری» ئەو کەسە «کەوتوە»، چارەسەریشی بەوە ئەکەن «سەری ئەگرنەوە».

«سەر کەوتن» وەکو هوی نەخوشییەکە و، «سەر گرتنەوە» وەکو چارەسەری لە کونەوە باو بوە بەم جورە:

نەخوشەکە دائەنین و، پەتیک لە دەوری سەری لە ئاستی لاجانگەکانی دا ئەگیرن و ئەندازەی هەردولای سەری ئەگرن و، پاشان هەردولای پەتەکە بەراورد ئەکەن ئەگەر لایەکی لە لایەکی دریژتر بی ئەوە بە نیشانەی کەوتنی سەری کابرای نەخوش دائەنین و، سەر لەنوی پەتەکە لە دەوری سەری ئەجەرینن و، بە کلکی تەشییەک یان داریکی باریک زیاتر بای ئەدەن و ئەیجەرینن تا بە تەواوی توند ئەبی، بە مەش گوایە سەری کابرا ئەگرنەوە. ئینجا بە جاجم یا بەرمالیکی تاریک سەری دائەپوشن تا ژانەکەی لە کول ئەبیتەوە.

من له میژ بو جارویار میگرەینم توش ئەبو. له ڤییەننا چەند جاری چویومە لای پزیشکی پسپور بەلام چارەی بنەرەتیی نەبو، هەندی «حەب» ی کەمکردنەوەی ئازاریان بو ئەنوسیم. ئەو ماوەیەی له ڤەندیل بوم، سەرباری هەمو گیروگرفتەکانی تر، سەرئیشەکەم زور زیادی کرد بو. هەندی جار له کاتی نوستن دا ئەمگرت و، له تاو ئازاری سەرم خەبەرم ئەبوەوە. هەندی جار زیاتر له دو سەعاتی ئەخایاند. ئەوەندە ناخوش بو له گەڵ کابرای فارس دا ئەموت: «ای مرگ بیا زندگی مارا کوشت»، واتە: «ئەی مەرگ وەرە ژیان کوشتمی».

جگە لەمە بە گشتی هەمومان تەندروست و لەش ساغ بوین، بە دەگمەن یەکیکمان نەخوش ئەکەوت.

یەکیکی تر له گیروگرفتەکانم بە سەر بردنی شەو بو. هەر له منالیمەوە نەمئەتوانی شەوان زو بنوم. لەو شوینانەی لی ی ژیا بوم هەمیشە کارەبای لی بو، شەو تا درەنگ دائەنیشتم، ئەمتوانی سەیری تەلەفزیون بکەم، گوی له رادیو بگرم، بخوینمەوە و، بنوسم. بەلام ئەو ماوەیەی له برادوست بوین چرامان دانەئەگیرسان. ئەبو له ئیوارەوە خومان بو نوستن ئامادە بکەین و، بەیانی زو هەلبستین. هەرچەندە منیش وەکو هەمو ئەوانی تر بەیانیان زو هەلئەستام بەلام بە شەو تا درەنگ خەوم لی نەئەکەوت. له سەر جیگاکەم گینگلم ئەخوارد، سەیری ئەستیرەکانی ئاسمانم ئەکرد، جگەرەم ئەکیشا، تا بە تەواوی شەکەت ئەبوم. گیانی منیش ئەبو بە هاودەرد و هاوئاوازی گیانی ئەو گورانیبیژە فولکلورییەی وتویەتی:

دیسان شەو هات بو حالی من
بو دلەی پر له خەیالی من
عالەم سوتا له نالەی من...

بەلام بو خوشبەختی ئەم شەونەخونییەی من «نەخوشیی» نەبو بەلکو «خو» بو.

کە گەرامەوە ناوچەی سلیمانی ئەم گیروگرفتەم نەما. شەوانمان له ئاوەدانی دا بە سەر ئەبرد تا درەنگ له بەر لوکس یان چرا دائەنیشتین. بەلام کە چوینەوە ڤەندیل هەفتەکانی یەکەم توشی هەمان گیروگرفت بومەوە. پی ئەچی پیش منیش زور کەس لەم دەردەیان چیشت بی. «کوردی» و «سالم»، کە له نیوەی یەکەمی سەدەی نوزدەهەم دا ژیاون، دیارە ئەوانیش هەمان گیروگرفتیان هەبوە. چەندین شیعری ناسک و بە سوزیان له سەر شەو و شەوبیداری داناوە. شەو له شیعری کوردی دا ئەهینی لیکولینەوەیەکی تایبەتی له سەر بکری. «کوردی» له سەرەتای یەکیکیان دا ئەلی:

شەوی یەلدا، وە یا دەیجورە ئەمشەو
کە دیدەم دور لە تو بی نورە ئەمشەو
شەوی یەلدا دریژترین شەوی ساڵ و، شەوی دەیجور تاریکترین شەوە. بو من هەمو شەوی «شەوی یەلدا» و «شەوی دەیجور» بو، نەمئەزانی چونی بە سەر بەرم.

لە دولی بالەییان ناردمان هەندیک فانوس و نەوت و موم یان بو هینایین. بو من ئەمە خوشییەکی گەورە بو. حەسانەوەیەکی زوری ئەدا بە میشک و گیانم. شەوان تا درەنگ لە بەر روناکییەکی کزی فانوس یا موم «نالی» گوتەنی: کە «وەک ئاگری بی شەوقی دزان» بو دائەنیشتین و من کارەکانی خوم: خویندنەوە و نوسینی نامە و، وتار، کتیبم ئەنجام ئەدا.

پیشمەرگەکان نەیان ئەهیشت تنۆکیک لە تواوەی مومەکە بە خەسار بچی. پاشماوەکەیان کۆ ئەکردەوە و پلیتەیان تی ئەخست و ئەیان کردەوە بە موم. ئەم نیعمەتە بەردەوام بو تا بو پیشەوە ئەچوین روناکییەکەمان گشتر ئەبو.

*

لە ناو پوستەی دەرەوەی ولات دا نامەیەکی فوئادی مەلا مەحمودم پی گەیشت. پاش دەربرینی هاودەردی و هەندی بیروورای خوی دەربارەی هەلومەرجی ئەو کاتە، لە نامەکەی دا بوی نوسی بوم کەوا توشی نەخوشییەکی کوشندە بوە چاک بونەوەی نیە و، ئەوپەری دوسالی تر ئەژی، لە بەر ئەوە حەز ئەکا پاشماوەی ژیانی لە کوردستان و لە ناو هاوریکانی دا بە سەر بەری و، لە ولات بمری.

ئەم هەواڵەم زور پی ناخوش بو. فوئاد هاوری ی سەردەمی خویندنی سانەوی و کاری سیاسی و سالانی ژیانی ئیپەننام بو. سالانی ۱۹٦۳ - ۱۹٦٤ پیکەوە لە سکرتاریەتی یەکیتی قوتابیانی کوردستان بوین، هاوری یەکی خوشەویست و دلسوزم بو. لە لایەکەوە پیم ناخوش بو توشی ئەو نەخوشییە بوە و، لە لایەکی ترەوە پیم ناخوش بو چونکە نەمانئەتوانی خواستەکەی بە جی بهینین. هەلومەرجی ژیانی پیشمەرگایەتی سەخت بو، جیگا و ریگایەکی دیار و، دکتور و دەرمانمان نەبو. چارەنوسی خویشمان دیار نەبو.

سالی ۷۹ کە جاریکی تر سەردانی ئیپەننام کردەوە فوئادم بینییەوە. نەخوشیی بە تەواوی کاری تی کرد بو بەلام خوی پیاویکی بە زات بو، ترسی نزیکبونەوەی مردنی پیوە نەئەبینرا. دوای ئەوە زوری نەخایاند، هیشتا لە هەرەتی لاوی دا بو، کوشتی.

*

لە گەل توانەوەی بەفری قەندیل دا ئیمەش بەرەوژور هەل ئەکشایین. خەریک بو

رەشـایی لە بەرزاییـەکـان دا دەر ئەکـەوت. دولی بالەیـان مـان بە جی هیـشت و چوینە هەواری «شـیخ نایش». لە بەر بەفـر نەمـانتـوانی بینینەوە سـەر لەنوی بەرەو «دولە نی» داکشاینەوە و بارمان خست. تەنیـا یەک خیـوەتمان هەبو مامجەلالی تی دا بو. من ژیر بەردیکم بو خوم چاک کرد بو بە نایلون بەرم گرت بو. پیشمەرگەکانیش هەر یەکەی لە بن بەردیک دا جیگایان بو خویان چاک کرد بو.

*

دوکەل و جاسوس

بە روژ ئەبو هەمـومـان خـومـان لە بن گـابەردا حـەشـار بدەین و، هیچ کـەس ئاگر نەکـاتەوە. لە قـەندیل هـەر گوینی تەری لی بو بو سـوتاندن، ئەویش دوکەلیکی زوری لی بەرز ئەبوەوە. هالیکوپتـەری ئیراتی چاودیریی ئاسمـانی ناوچەکەیان ئەکرد لە هەر شوینیک دوکـەل بەرز بوایەتەوە ئـەچونە سـەری. هەر لەو مـاوەیەدا چەند پیشـمـەرگەیەکی ئاکـویەتی خویان لە ئیـمـە دزی بوەوە چوبونە شـوینیکی دور ئاگریان کـرد بوەوە و چایان لی نا بو. هالیکوپتـەر گەیشت بوە سـەریان و هەمـویانی گرت بو لـە گەل خـویان برد بـویانن. دوای روخانی شا گەرانەوە.

نیـوەرویەکـیان لە گـەل مـامـجـەلال لە ناو چەقـەلە بەردیک دا بە بەرپەرزاییـەکـەوە دانیشت بوین. دیمـان لە خوار خومانەوە دوکەل بەرز ئەبیتـەوە. مـامجەلال تورە بو چو بو لای دوکەلەکە. قوتویەک گوشتی ماسیبان لە سەر گەرم ئەکردەوە. مامجەلال چو بە گژیان دا و وتی: «ئیـوە جـاسـوسن. دوژمن ناردونی بو ئەوەی شـوینەکـەمـان ئاشکرا بکەن!». هەردوکـمـان چەک کـردن و دەس بە سـەر دامـان نان. پیـشـمـەرگەکـان، یەکـیکیـان عـەلی کـویلەیی بو، خـەلکی دولی بالەیی بون تازە هات بون بو پیـشمـەرگـایەتی. پاش ئەختـی چەکەکانمان دانەوە.

*

پیش ئەوەی بە ری بکەوین لە توکان چەند پیشمەرگەیەکیـان بەرەو رو کردینەوە کە لە دەسـتـەی مـامجەلال و من بن. ئەمانە هەندیکیان لە شار هاوری ی کومـەلە بو بون، لە بەر ئەوە جیگای بروای ئیـمـە بون. سەختیی ژیان و نادیاریی چارەنوس ئەمانەشی روخاند بو. مـامجـەلال لە صـەلاح تورە بوبو لە دەسـتـەکـەی خـوی دوری خـست بوەوە. دوای ئەو سامـان گەرمیـانی کرد بو بە سـەردەسـتـەی پیشـمـەرگەکانی. لەویش تورە بوبو لای برد بو کـوریکی لە جیـگا دانا بو ناوی لە خـوی نا بو فـەتاح. فـەتاح هاوری ی کـومـەلە بو، لەو پیشمەرگانە بو کە لە بەر ئەمینی گواستبویانەوە لای مامجەلال.

هەموریان شیلا بو نان و ناوساجی بکەن. فەتاح ئەرکەکەی گرتە ئەستوی خوی کە بە شەو لە گەڵ چەند پیشمەرگەیەکی تردا بەریز حەراسەت بکرن و، نانەکەش بکەن. تومەز لە گەڵ دو کەسی تر لە پیشمەرگەکان: فاخر و رەنجە، ئەوانیش هاوری ی کومەلە بون، ریک کەوت بو بە ریز لە سەعات پانزە و دوانزە و یەکی نیوەشەودا حەرەس بن و، لەو ماوەیەدا فرسەت بهینن رابکەن بو ئیران.

نیوەشەو مامجەلال هەستا بو لە خیوەتەکەی هات بوە دەرەوە حەرەسی بانگ کرد بو کەس وەلامی نەدا بوەوە. لە دەنگی مامجەلال هەمومان هەستاین. مامجەلال لە سامانی پرسی: «کوا حەرەس؟» سامان وتی: «وەنگە رایان کرد بی» مامجەلال چو بە گژی دا وتی: «دیارە تو ئاگات لی بەتی ئەگینا چون ئەزانی رایان کردوە؟». هەر ٣ پیشمەرگەی راکردو سەرو نامەیان بە جی هیشت بو، نوسی بویان لە داخی توڕە بونی ئیمە هەلاتون و، خویان بە خائین نازانن و، ریگەی خیانەت ناگرن.

لە گەڵ خویان ٣ تفەنگ و، زوری نان و ناوساجییەکانی ئیمەشیان برد بو. تەسلیمی ئیران بون و بون بە پەنابەر لەوی.

بو روژی دوایی مەفرەزەیەک لە پیشمەرگەکانی سلیمانی لە گەڵ شەمال (شیخ محەممەدی شیخ مەحمودی باخ) گەیشتن. ئازاد محەممەد غەریب، دلشاد توفیق، مەلا عەلی (حسین مەولود).. گەیشتنی ئەمان لەو هەلومەرجە نالەبارەدا تولەی راکردنی ئەوانی کردەوە. گەنجی خاوەن بیروباوەر و بە زات بون. لەو ساوە ئیتر لە گەڵ من بون بە هاوری ی گیانی بە گیانی. شەمال و دلشاد و حسین هەریەکەیان لە مەیدانیکی تیکوشان دا کوژران.

*

نائومید بوین لەوەی هەوالی کاک عەلی و هیزەکەمان بو بیت و، ئیمەش بچین بو برادوست. ئیتر بەردەوام شوینەکانی خومان ئەگوری و، لە هەواریکەوە ئەمان گواستەوە بو هەواریکی تر. ئیران ئەوساڵە ریگای بە رەوەندەکان نەدا میگەلەکانیان بو لەوەرخوری بهینن بو قەندیل. بە هالیکوپتەریش ئەگەران لە هەر جیگایەک دا رەشمالیکیان بە دی بکردایە، ئەنیشتنەوە و ئەیان گیرایەوە دواوە. بەلام ئیمە ئیتر ژیانی خومان و، ریگای پەیوەندی مان لە گەڵ ریکخستن و پیشمەرگەکانی خومان لە ناوچەکانی تری کوردستانی عیراق و، لە گەڵ چەند کەسیکی باش لە سەردەشت و خانە و شنو لە دیوی ئیران ریکخست بو.

خەلیل جەلال و هاوار جەلال لە نزیک قەلاتوکان بنکەیەکی نهینییان دانا بو، هەم ئازوقەیان بو ئەکرین و بویان ئەناردین، هەم بەریدیان لە گەڵ ریکخستنەکانی شاردا بو

دابین کرد بوین. کاک ئیبراهیمی براگەورەیان تەگبیری کرد بو.

*

لە رەشایی ناو یەکی لە هەوارە بەرزەکانی قەندیل چەند خێوەتێکی هەزارانەمان هەڵ دابو. چوار دەورمان هێشتا بەفر بو. یەکی لەو کوردانەی شەمزینان کە ساڵی پار بوبو بە ئاشنامان و، زوری یارمەتی دابوین، پەیدا بو. نامەی عەبدولحافظی هینا بو. حافظ لە نامەکەی دا هەواڵی لە ناوچونی هێزەکەمان و، گیرانی سەرکردەکانی بو نوسی بوین. ئەمە وەکو ئەوە وابو هەورە تریشقە لێمان بدا. تا ئەو کاتە هەواڵەکەی بی بی سی مان بیست بو، لە روژنامەکانی ئێرانیش دا هەندی وردە دەنگوباسی شەر و شوری نێوان هێزەکانی یەکیتی و قم مان دی بو. بەلام دڵمان بروایی نەئەدا بروا بکەین هێزەکەمان لە ناو چوە، هێشتا هیوایەک مان هەر هەبو، تا ئەم نامەیەی حافظ مان پی گەیشت و، هەواڵەکانی یەکلایی کردەوە.

هێزەکەمان و، کادر و سەرکردەکانی، گەورەترین سەرمایەی ئێمە بون، بە رەنجی دو ساڵی سەختی پر لە ماندوبون کومان کرد بونەوە و ریکمان خست بون، ئومیدی گەورەی گەلەکەمان بون، تو بلی ی هەروا بە ئاسانی رەنجەرو بوبین!

پێشتر زورم بیر لی کرد بوەوە ئەگەر لەم روداوەدا هێزەکانمان لە دەس دا چی بکەین؟ ئێمەش واز بهێنین و، بچینەوە بو دەرەوەی ولات، یان درێژە بە ئەرکی نیشتمانی و نەتەوەیی خومان بدەین و، سەر لەنوی دەس پی بکەینەوە؟ بە تەنیا چوم بو لای مامجەلال. هەندی قسەی گشتی مان کرد، ئینجا وتم: «مامجەلال دڵنیای لەوەی من توم خوش ئەوی؟»

وتی: «بەلی دڵنیام!»

وتم: «من ئەوەندە تو بە پێویست ئەزانم بو گەلەکەمان، ئەگەر گوللەیەک بیت بو تو من خومی ئەدەمە بەر بو ئەوەی بەر تو نەکەوی!»

وتی: «دڵنیام وایە»

وتم: «مادەم دڵنیای لە دڵسوزی و خوشەویستی من، ئەمەوی هەندی قسەت بە سەربەستی لە گەڵ بکەم»

وتی: «فەرموا»

وتم: «ئەو هێزەی هەمان بو لە ناوچوە، شتێکی ئەوتومان نەماوە، مەعلوم نیە ئیمەش ئەمێنین یا تیا ئەچین، تا ئیستا سەرکردەکانی کورد لە شکان دا هەلاتون، یا ئەمجارە ئیمە ئەریتێکی تازە بو ئەوەکانی داهاتو داهێنین و رانەکەین ئەگەر پێویستی

کرد له دوای خومان چەند گوری له کوردستان به جی بهیلین. خەلک بلین ئەمانە رایان نەکرد مانەوه تا کوژران! دلنیام ئەگەر خومان رابگرین هەل ئەسینەوه»

مامجەلال قسەکانی پی خوش بو. وا ریک کەوتین به هەمو توانامانەوه له جاران زیاتر خومان ماند بکەین بو هەلساندنەوەی باری گلاوی شورشەکە و، ریکخستنەوەی هیزی پیشمەرگە. له گەل د. مەحمود و جەلال قسەمان کرد. ئەوانیش بەلینی هاوکاریان پی داین.

*

هاتنەوەی جەمالی عەلی باپیر

تەنیا تاقمی له شەرەکانی تورکیا دەرباز بون و گەرانەوه ۸ کەس بون لەوانە جەمالی عەلی باپیر، حەمەی حاجی مەحمود، تایەری حاجی عەزیز... ئەمان چوبونەوه ناو کوردستانی عیراق و، له بادینانەوه گەرا بونەوه. به دریژی روداوەکانیان بو گیراینەوه. هەر لەو ماوەیەد گوڤاری «الوطن العربي» که له پاریس دەرئەچو، سەر به عیراق بو، وتاریکی دریژی له سەر روداوەکان نوسی بو، باسی خویەدەستەوەدانی تالیب روستەم و، هیزەکەی ئەوی کرد بو. به زمانی ئەویشەوه هەندی قسەی نوسی بو.

*

هەڤال درندە

لەو هیرشەدا که جەیش و هیزی ئاسمانی عیراق بو سەر هیزەکەی یەکیتی کرد بو له برادوست، گورانبیژ عەبەی مەلا کوژرا بو، ئەنوەری سەعید والی به سەختی بریندار بو بو. به برینداری گویزابویانەوه ماله جوتیاریکی برادوست لەوی حەشاریان دابو تا برینەکانی کەمی ساریژ بو بو. به هوی دوستەکانمانەوه له شنو هاتەوه بو قەندیل. هیشتا به تەواوی چاک نەبوبوه. ئەم بنەمالەیه له کارەساتی هەکاری دا زیانی زوریان لی کەوت. کاک تایەر و روستەم گیران و، رەوف بەگ کوژرا و، ئەنوەر بریندار بو.

ئەنوەر له سەردەمی هەرزەکاریەوه تیکەلاوی کوردایەتی بو بو. له شورشی ئەیلول دا پیشمەرگە بو. ئەمجارەش له گەل دەس پی کردنەوەی شورش دا سەرلەنوی هات بوەوه ریزی پیشمەرگایەتی. پیاویکی کەمدو و مۆن و مۆر بو. له سەرەتای شەستەکان دا که له پارتی دا ناوی نهینیان بو دانا بو، ناویان نا بو «هەڤال برندە». بەو هویەوه هاوریکانی بو ئەوەی تورەی بکەن گوری بویان بو «هەڤال درندە». راستیەکەی نەک درندە نەبو، بەلکو پیشمەرگەیەکی دلناسک و باش و دلسوز بو، دوایبیتر له بوسەیەک دا کە جاشەکانی زەرایەن بویان دانا شەهید بو.

*

قم گیراوەکانی هەکاری کرد بو بە چەند تاقمیکەوە:

- عەلی عسکەری، خالید سەعید، شیخ حسین لەو کاتەوە کە گیرا بون لەوانی تر جیا کرا بونەوە، کەس نەی دی بون و، کەس نەی ئەزانی لە کوین.

- ئازاد هەورامی، شیخ عەلی (مەحمود عەبدورەحمان)، عەلی شیعە، حامیدی حاجی غالی، لە کادرەکانی کومەلە، پیکەوە لە شوینیک دا گیرا بون.

- تاهیری عەلی والی، سەید کاکە، قادری مامەند ئاغای میراودەلی، عومەری حاجی عەبدوللا، دەس بە سەر لە نزیک خویانیان دانا بون.

قم زور خەریک بو بو لە گەل پیشمەرگەکانی یەکیتی بچنە ریزی قم ەوە. جگە لە چەند کەسیکی کەم ئەوانی تر ئامادە نەبون هیچ جورە هاوکارییەکیان لە گەل بکەن. ژمارەیەکی زوریان لە پیشمەرگەکان، بە تایبەتی تازەکانیان، ناچار کرد بو تەسلیمی عیراق بینەوە. هەندیکی تریشیان لە وی گل دابوەوە. پاش ماوەیەک یەکە یەکە و دو دو ئیزنیان ئەدان برون، بە زوری ئەهاتنەوە بو لای ئیمە.

عوسمانی قادر منەوەر و نەبەز گەیشتنەوە. هەوالەکانی ئەوی یان بە دریژی بو باس کردین. دوای ماوەیەک سەلامی مەلا عەبدوللا شیان ئیزن دابو. سەلام لە سەرەتاوە پاسوک بو، ئەیویست سەفەر بکا بو ئەوروپا.

هەولیکی زورمان دا هەوالی چارەنوسی کاک عەلی و هاوریکانی بزانین. زور کەسایەتی ناوچەکەمان راسپارد، لەوانە شەمسەدین موختاری گوندی هەرکی کە لە مەیدانی روداوەکانەوە نزیک بو. هیچ ئەنجامیکمان دەس نەکەوت.

کوریکی کەرکوکی ناوی «کامیل» بو، ئەویش لە گیراوەکان بو ئیزنیان دا بو. گەیشتەوە لامان. ئەویش هەوال و دەنگوباسەکانی گیراوەکان، ئەوەندەی ئاگای لی بو، بوی گیرایەوە. هەوالی کاک عەلی و هاوریکانی مان لی پرسی. وتی: «ئەوانیان هەر لە سەرەتاوە لە ئیمە جیا کردەوە. شوینەکەیان دیار نیە. بەلام لام وایە نەماون». وتمان: «چون ئەزانی؟». وتی: «پیلاوەکانی کاک خالیدم لە پی ی یەکی لە حەرەسەکان دا بینیوە». کاک خالید کە لە سوریاوە گەرابوەوە، جوتی پیلاوی باشی شاخەوانی لە گەل خوی هینا بو، بو ئەم سەفەرە لە پی ی کرد بو. ئەمە تیبینیەکی ورد بو. کامیل لە کاتی خوی دا «معارن شرطه» بو بو.

ئەم تیبینییە ئیمەشی خستە پەژارەوە. ترسیکی زورمان هەبو لە چارەنوسی هاوریکانمان.

*

پاش ماوەیەک دەرکەوت دوای گیرانیان بە چەند روژێ سەرانی قم: سامی سنجاری، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق، ئازاد بەرواری، ئەورەحمان بیداوی، غازی زیباری، ئازادی مەحمود خەففاف، وریای رەوف سەعاتچی... لە کوبونەوەیەکی خویان دا بریاری «ئیعدام» هەر سیکیان: عەلی عەسکەری، خالید سەعید، حسین بابەشیخ یان ئیمزا کرد بو، دوای ئەوەی مەلا مستەفا لە واشینتونەوە فەرمانی پی دابون بە گەورەترین چەک بیانکوژن.

هەر سیکیان کرد بون بە نیشانەی ئارپیجی حەوت.

کوشتنی ئەم ٣ سەرکردەیەی یەکیتی بە فەرمانی بارزانی و، لە لایەن قم وە دوژمنایەتی نیوان یەکیتی و پارتی قولتر کرد. کوشتنەکەیان دوای گرتنیان و، لە ناوچونی هیزەکانی یەکیتی، زور نارەوا بو. کوشتنیان بی چاودروانی و لیپرسینەوە، پیچەوانەی قانون و ویژدان و، پیچەوانەی نەریتی سیاسی و کومەلایەتی باوی کوردەواری بو.

قم ئەیتوانی ئەو کارساتەی بە سەر یەکیتی هات بو، بکا بە سەرەتای دەس پی کردنی قوناغی دوستایەتی و برایەتی لە گەل یەکیتی. بەلام ویستی بیکا بە سەرەتای لە ناوبردنی یەکجاری یەکیتی چ وەکو ریکخراویکی پیشمەرگەیی و، چ وەکو ریکخراویکی سیاسی.

*

کاک عەلی کوری شیخ عەبدوللا و برازای شیخ عەبدولکەریمی شەدەلە، شیخی تەریقەتی حەقە، سالی ١٩٣٧ لە گوندی عەسکەر لە دایک بو بو. باوکی یەکی بو لە لایەنگرەکانی شیخ مەحمود لە شورشەکانی دا بو بە دەسهینانی مافی نەتەوەیی کورد.

ئەو کاتەی قوتابی سانەوی بو لە کەرکوک لە سەردەمی پاشایەتی دا چوە ناو یەکیتی قوتابیانی کوردستان و، ئینجا بو بە ئەندامی پارتی. لە هەردو ریکخراوی قوتابیان و لاوان دا بو بە ئەندامی «لیژنەی بالا». دوای شورشی ١٤ ی تەموز بو بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کەرکوک و، لە یەکەمین کونگرەی ئاشکرای پارتی دا سالی ١٩٦٠ هەلبژیردرا بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و، لە باتی ئەوەی دریژە بە خویندنی زانستگا بدا بو بە کادری پیشەیی پارتی.

ئەو کاتەی بارزان کەوتە بەر هیرشی خیلە نەیارەکانی دەوروپشتی، پارتی کاک عەلی نارد بو بو بادینان، بو سازدانی ریکخراوەکانی پارتی و کوکردنەوەی چەکدارەکانیان

بو بەشداری لە پاراستنی بارزان و بارزانییەکان. ئەرکەکەی بە جوری ئەنجام دا جیگەی ریزیکی تایبەتی شیخ ئەحمەد و مەلا مستەفا بو.

عەلی عەسکەری لە بادینان مایەوە و لە گەل عەلی حەمدی و ئەحمەد عەبدوللا، هەردوکیان ئەندامی کومیتەی ناوەندی بون دواییتر بارزانی هەر یەکەی بە جوری کوشتن، کاروباری ئەوی یان بەریوە ئەبرد و لە گەل دەس پی کردنی شورشی ئەیلول دا عەلی وەکو لیپرسراویکی پیشمەرگە لە بادینان مایەوە. بە هوی ئەو بروسکەیەوە کە شیخەکانی بارزان بو قاسمیان نارد و، بە هوی ئەو قسانەوە کە شیخ ئەحمەدی بارزانی بە دەنگی خوی لە رادیوی بەغداوە کردی و، داوای لە خەلک کرد: «ئالوز بالوز نەکەن» و «بگەرینەوە ناو عیل و عەیالی خویان» و، بەشداری لە شورشەکەدا نەکەن، توشی کیشەیەکی گەورە بو زوری ئەوانەی لە گەلی بون بە جی یان هیشت و بە هیزیکی بچوکەوە مایەوە.

لەو تیشکانەدا مەلا مستەفا نوینەری خوی نارد بو بو تورکیا و سوریا داوای پەنادانی سیاسی لی کرد بون. عەلی و هاوریکانی هەولیکی زوریان لە گەل دا لەو بریارە پەشیمانی بکەنەوە. داوایان لە مەکتەبی سیاسی کرد چالاکی پیشمەرگە لە ناوچەکانی تری کوردستان دا زیاد بکەن و، پارە و یارمەتی بو بنیرن بو ئەوەی بمێنیتەوە. هەردو حکومەت داواکەی بارزانییان رەت کردەوە. جولانەوەکەش بەرە بەرە هەلسایەوە. عەلی بە دریژایی ١٩٦١ تا ١٩٦٢ لە گەل بارزانی مایەوە و، یەکی بو لە نزیکەکانی، یارمەتی ئەدا بو ریکخستنی هیزەکان و، سەرکردایەتی چەندین شەری کرد لە بادینان بو تیکشکاندنی هیرشی جاشەکان.

بارزانی ئەیویست نفوز و هەیبەتی پارتی وەکو حیزب بشکینی. ئەمەش لە گەل بیری عەلی نەئەگونجا لە سەر ئەوە بارزانی بە جی هیشت و گەرایەوە ناوچەی سلیمانی کرا بە فەرماندەی «هیزی خەبات» کە بەشی زوری لیوای سلیمانی ئەگرتەوە. تا لەت بونی پارتی لە ١٩٦٤ دا ئەم فەرماندەی ئەو هیزە بو، بە یەکی لە سەرکەوتوترین و ئازاترین فەرماندەکانی پیشمەرگە ناسرا بو.

لە لەت بونی پارتی دا لە گەل مەکتەبی سیاسی مایەوە. لە گەلیان چو بو ئیران و، لە گەل ئەوان گەرایەوە. بارزانی لە دولەرەقە دەس بەسەر دای نان. هەر لە گەل ئەوان هەلات و، سەر لەنوی پارتی و پیشمەرگەیان ریک خستەوە. سالی ٧٠ دەوریکی کاریگەری گیرا بو ئاشتبونەوەی بالی مەکتەبی سیاسی لە گەل بارزانی و، دەوریکی کاریگەری گیرا لە کونگرەکەدا بو هەلوەشاندنەوەی ئەم حیزبە، کە مەرجی یەکەمی بارزانی بو بو ئاشتبونەوە. لەو ساوە تیتر لە چومان دانیشت. کە ٧٤ شەر هەلگیرسایەوە و،

هیرشی جەیش بو سەر ناوچەکانی نزیک بارەگای بارزانی دەستی پی کرد. بارزانی عەلی عەسکەری هەلبژارد بو سەرکردایەتی ئەو هیزەی ناوچەی سەرکردایەتی ئەپاراست. ئەمجارەش ئەرکەکانی خوی بە چاکی بە جی هینا و تا روژی ئاشبەتال ناوچەکەی پاراست.
دوای ئاشبەتال چوە ئیران بەلام کە لە بارزانی نائومید بو لە گەل هەندی لە هاوریکانی قسەیان کرد بە یەک کە بگەرینەوە کوردستانی عیراق و، ریکخستنیکی تازە دروست بکەن. گەرانەوە و «بزوتنەوە» یان دامەزراند، بەلام عیراق دوری خستەوە بو خواروی عیراق و، لە روفاعی کردی بە سەروکی شارەوانی. مامجەلال لە سەرەتای دامەزراندنی یەکیتی دا پەیوەندی لە گەل دامەزراند. لە گەل دەس پی کردنەوەدا ئەمیش لە روفاعیەوە هەلات بو چیاکانی کوردستان. هاتنی کاک عەلی و عومەر مستەفا و خالید سەعید و هاوریکانیان تەوژمیکی گەورەی بە جولانەوەکە دا.
لە یەکەمین کوبونەوەی سەرکردایەتی یەکیتی دا بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکیتی و، فەرماندەی هیزی پیشمەرگەی کوردستان هەلبژیردرا.
ناسیاوی من لە گەل کاک عەلی ئەگەرایەوە بو ٦٣. ئەو کاتە ئەو فەرماندەی هیزی خەبات و من خویندکاری زانستگای بەغداد بوم دوای دەس پی کردنەوەی شەر لە کوردستان دا (حوزەیرانی ٦٣) تازە لە بەغداوە هەلات بوم و گەیشت بومە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتەکەی مالومە.
ناسیاویەکمان سالانی ٦٤ - ٧٠ بەهیزتر بو. هەرچەندە ماوەیەک ناکوکی کەوتە بەینمانەوە بەلام زور زو ئاشت بوینەوە و، دوستایەتی مان دوای ٧٠ لە بەغداد و دوایەتر کە چوین بو بارەگای بارزانی بەهیزتر و قولتر بو.
کاک عەلی پیاویکی دلپاک، قسە خوش، نوکتەباز، ئەدەب دوست، ئازا و چاو نەترس بو، ریزی هاوریکانی ئەگرت و وەفادار و بەر چاو فراوان بو. کوژرانی بەو جورە و لەو تەمەنەدا زیانیکی گەورە بو لە یەکیتی و لە کورد.

*

خالید سەعید

کاک خالید کوری حاجی سەعید لە کویە سالی ١٩٣٤ لە دایک بوبو. بە هەرزەکاری تیکەلاوی کاری سیاسی بو بو. هەر زو بو بە ئەندامی پارتی و، دوای شورشی ١٤ ی تەموزی ٥٨ ئەندامی لیژنەی ناوچەی کویە بو. لە مانگی ئەیلولی ٦١ دا کە چەکداری عەشیرەتەکانی کورد ریگاوبانەکانیان گرت، کاک خالیدیش لە گەلیان چەکی هەلگرت و، دوای بلاوە لی کردنی ئەوان، ئەم خوی و چەند پیشمەرگەیەک مانەوە تا

جولانەوەکە خوی ریک خستەوە.

لە پیشمەرگایەتی دا بە ئازایەتی و لیوەشاوەیی و توانای بەدەنی ناسرا بو. لە ناو پیشمەرگەدا خوشەویست و بەریز بو. هەر لە بەر ئەم سیفەتانە بو بە سەر لق و، بو بە فەرماندەی بەتالیون و، فەرماندەی قوەتی گەروک. سەرکردایەتی دەیان شەری گەورەی کرد بو.

لە سەر داوای بارزانی لە ناو شاری کویەدا بوسەیەکی بو حەویزی مام یەحیا دانا، خوی و تاقمی لە چەکدارەکانی کوشت. حەویز سەروکی جاشەکانی کویە و، ناحەزی بارزانی بو. دوای ئاشبەتاڵ ئەم زو گەرایەوە عیراق. بو ئەوەی لە کوردستان دوری بخەنەوە بە موچەخور لە «نەخوشخانەی شەعاعیە» لە بەغدا دایان مەزراند.

کە یەکیتی دامەزرا پەیوەندی دامەزراند و، چەند ریکخراویکی گرنگی لە ناو کونە پیشمەرگەکانی ئەیلول دا دامەزراند، کە لە هەلگیرسانەوەی شورشەکەدا دەوری کاریگەریان هەبو. کاک خالید لە پەیوەندییەکی بەردەوام دا بو لە گەڵ مامجەلال و دەستەی دامەزرینەر و، زور بە گەرمی داوای دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکداری ئەکرد و، لای وا بو هەرچی زوتر دەس پی بکریتەوە باشترە، چونکە کات بە قازانجی دوژمن تی ئەپەری و، نائومیدی خەلک زورتر ئەبی.

کە دەستەی دامەزرینەر داوایان لی کرد بچیتە شاخ، بی دودلی یەکسەر خوی و هاوریکانی ئامادە کرد. هەر ئەمیش داوای لە کاک عەلی و لە کاک عومەر مستەفا کرد، بینە ناو یەکیتییەوە و، لە گەلی بچنە شاخ بو دەس پی کردنەوەی شورش و، ئەوانیش داوایان لی کرد بەرامبەر بە بەشداری کردنی ئەوان لە یەکیتی دا و، لە شورشەکەدا، کاک خالید بچیتە سەرکردایەتی «بزوتنەوە» وە.

ئەوانە بە کومەڵ چونە شاخ و، لە گەڵ خویان کومەلیک کادر و پیشمەرگەی ناسراوی شورشی ئەیلولیان بردە شاخ و، لە ناو خەلک دا دەنگیکی گەورەی دایەوە.

بو یەکخستنی هەولی پیشمەرگایەتی لە ناوچەکانی بابان و سوران و، دوزینەوەی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی، گەشتیکی دریژی بو بادینان کرد، بەلام کەسی نەدوزینەوە، چونکە قم ئیبراهیم و هاوریکانی کوشت بون.

بەهاری ٧٧ هاتە هەلگورد و دەشتی بەرازگر و برادوست بو ئەوەی لە گەڵ ئیمە لە سوریا پەیوەندی دابمەزرینی و، هەر لەوی مایەوە تا پەیوەندی مان دامەزراند. من لە کوتایی مانگی نیسانی ٧٧ گەیشتمە برادوست و، مانگی نیسان یەکتری مان بینی و، لە برادوست بنکەمان دانا و، هەڤالاتی دەرەوە دەستیان کرد بە گەرانەوە.

ناسیاوی کاک خالید و من ئەگەڕایەوە بو سالی ١٩٦٤ ئەو کاتەی تازە خەریک بو پارتی لەت ئەبو. دوای ئەوە لە بونەی جیاجیادا چەندین جار یەکتری مان دی بو تا من چوم بو ڤییەننا.

دوای گەڕانەوەم لە گەل کاک خالید بوین بو بە دو هاوڕێ ی زور نزیک. ناخی دەرونی خومانمان بو یەکتری هەلئەڕشت و، بیرمان لە چارەسەر کردنی کیشە و گیروگرفتەکان ئەکردەوە و، لە زور شت دا هاوبیر و هاوڕەوشت بوین.

عاشقی گەل و نیشتمانەکەی بو. نمونەی پیشمەرگەی خوراگر و پشو درێژ بو، توانایەکی بی وینەی بەرگە گرتنی ناخوشیی و ماندویەتی و ریگا رویشتن و بە شاخ دا هەلگەرانی هەبو. لە مردن نەئەترسا و گوی ی نەئەدایە دوژمنایەتی و سەختی.

*

شیخ حسین کوری بابەشیخ سالی ١٩٤١ لە شیخان لە دایک بو بو. هەر لەوی چو بوە بەر خویندن و لە سەردەمی لاویتییەوە تیکەلاوی کاری سیاسی بوبو، چو بوە ریزی یەکیتی قوتابیانی کوردستان و، دوایتر پارتیەوە. سانەوی تەواو کرد بو. بو بو بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی شیخان و، لە کاتی هەلگەرسانی شورشی ئەیلول دا گیرا تا ٦٤ لە زیندان دا مایەوە. دوای بەربونی چوە ریزی پیشمەرگەوە. ماوەیەک لیپرسراوی لیژنەی ناوچەی شیخان و، ماوەیەک فەرماندەی بەتالیون و، ماوەیەک ئەندامی لقی دهوک بو.

دوای ئاشبەتال بە پی لە ئیرانەوە بە ناو تورکیادا خوی گەیاندە سوریا و لە قامیشلی جیگیر بو. یەکی بو لە کادرە هەرە چالاک و ژیرەکانی یەکیتی لە جەزیرە. مانگی مایسی ٧٧ سەرکردایەتی پیشمەرگە بادینییەکانی کرد بو گەڕانەوە لە جەزیرەوە بو کوردستانی عیراق. لە یەکەمین کوبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی دا هەلبژیردرا بە ئەندامی سەرکردایەتی و فەرماندەی هەریمی بادینان.

لە گەل کاک خالید پیکەوە هاتن بو ناوچەی سلیمانی و پیکەوە لە ناوچەکەدا گەڕاین و پیکەوە چوینەوە بو نوکان.

پیویست ناکا دوبارە لە سەر خو و رەوشتی جوامیرانەی ئەم پیاوە بنوسم چونکە پیشتر باسم کردوە.

*

کەوتینە کار، کاری بی ماندوبونی روژ و شەو.

من ژمارەی دوهەمی «هەوالنامە»م ئامادە کرد و، سەروتارەکەیم تەرخان کرد بو ئەم کارەساتە. ناردمان حەمە سەعید و هاوڕێ جەبار و چەند کەسیکی تر هاتن بو ئەوەی

کاروباری چاپ و بلاوکردنەوە ریک بخەین.

مامجەلال نامەی بو هەڤالاتی دەرەوە و، «تجمع» و، سەروک ئەسەد و، سەروک قەذذافی... نوسی و، شەمال نامەکانی برد و، لە ریگای ئەو دوستانەوە لە ناو کوردەکانی ئیران دا پەیدامان کرد بو بە نهینی بە ناو ئیران دا چو بو تورکیا و لەویوە بو سوریا.

لە گەل مامجەلال سەدان نامەمان نوسی بو ریکخراوەکانی یەکیتی، فەرماندەکانی پیشمەرگە و، کەسایەتی و پیاوماسراوەکانی کورد، سەرانی ئیل و ریش سپی و پیاو ماقولاتی ناوچەکان، روداوەکانی هەکاریمان بو رون کردنەوە، داوامان لی کرد بون: هەر کەسە بە گویرەی توانای خوی بەشداری بکا لە ژیاندنەوەی شورشەکەدا. بە پارە، بە چەک، بە چەکهەلگرتن و پیشمەرگایەتی، بە قسەی باش و ریکخستن.

کارەکەمان لە ماوەیەکی کورت دا ئەنجامی زور گەورەی بە دەستەوە دا. خەلک بە دەنگمانەوە هاتن بە سەدان کەس بە چەکی خویانەوە لە سەرانسەری کوردستان دا بون بە پیشمەرگە. هیزیکی تایبەتی مان بو مەکتەبی سیاسی دروست کرد، ناومان نا «هەریمی پاریزگاری» لە ماوەی چەند حەفتەیەک دا ١٤ کەرت مان پیک هینا و، ژمارەیان لە ٧٠٠ پیشمەرگە تی پەری. زوری هەریمەکانی تریش مان بوژاندەوە.

هیزەکانمان لە گەشە کردن دا بون و، تا ئەهات ژمارەیان زورتر ئەبو. زوریان نەخویندەوار و خەلکی لادی بون. بو ئەوەی چونایەتی سیاسییان باش بکەین پیویستی مان بە ژمارەیەک کادری سیاسی خویندەوار هەبو دایان بنیین بە رابەری سیاسییان. داوام لە سەرکردایەتی ریکخستنەکانی ناوخو کرد: هەندی کەس مان بو بنیرن بە کەلکی ئەم کارە بین. پاش ماوەیەک چەند کەسیکیان بو ناردین لەوانە: دانا ئەحمەد مەجید، کوکو عەسکەری، پشکو ناکام، جەلال شیخ توفیق، نوری محەمەد عەلی... هەمویان ئەندامی کومەلە و، گەنجی تازە پیگەیشتو و، شاری بون. وایان چاوەری کرد بو ژیان لە سەرکردایەتی یەکیتی خوشتر بی لەوەی کە دییان، هەندیکیان توشی «خیبە امل» بون، بو ئەوەی چاویان بکریتەوە ماوەیەک لای خومان گلمان دانەوە.

*

سیستەمی ئایدیولوجی

روژیکیان یەکی لە پیشمەرگەکان لی ی پرسیم: «سیستەمی ئایدیولوجی چیە؟». پرسیارەکەیم بە لاوە سەیر بو وتم: «لە چی دا ئەمەت خویندوتەوە؟». وتی: «نەمخویندوتەوە». وتم: «ئەی لە کوی بیستوتە؟»

وتی: «دکتور حسین و حەمەسەعید ئەم بەیانیە لە سەر پاککردنی سەرویی

تیکچون. دکتور حسین زور توره بو به حەمەسەعیدی وت: «برو تو سیستەمی ئایدیولوجیت تیک چوە!».

دکتور حسین کادری «سازمانی ئینقیلابی حیزبی توده» بو. لە گەل مامجەلال هات بو بو کوردستان و هەر لە گەل ئیمە مابوەوە. سەری لە پرێنپیچی دەرئەچو لە بەر ئەوە پیمان ئەوت دکتور. کوریکی خوراگر و خاوەن باوەر بو. زوری خزمەتی پیشمەرگە ئەکرد. دوای روخانی شا ئینجا گەرابوەوە بو ئیران.

*

شیخ مەحمودی کاریزە جوابی بو ناردین کە ئەیەوی مامجەلال ببینی. هات بوە قەلاتوکان لەوی چاوەروانی ئەکرد. مامجەلال هەندی لە کویخاکانی مەنگوری لە گەل خوی برد. منیش لە گەلی چوم. حەسەنی برایم شوان رەشمالیکی لە هەواریکی پشتی «قەلاتوکان» هەل دابو. جیگەی گفتوگوکەمان لەوی دانا بو.

لە گەل شیخ مەحمود دانیشتین. پاش چاکوچونی و هەوال پرسین. مامجەلال لە شیخ مەحمودی پرسی: «فەرمو قسەکانت بکە!»

شیخ مەحمود وتی: «من حکومەت ناردومی لیتان بپرسم: ئیوە چیتان ئەوی؟»

مامجەلال وتی: «هیچی تریان پی نەوتی؟»

وتی: «نەخیر. هەر ئەوەندەیان وتوە لیتان بپرسم: چیتان ئەوی؟»

مامجەلال وتی: «بچورەوە پی یان بلی: هیچیان ناوی ئەوانە جەماعەتیکی شیتن داویانەتە شاخ»

شیخ مەحمود چەندی لە سەری رویشت، مامجەلال لەوە زیاتر وەلامی نەدایەوە. وتی: «قابیلە ئەوانە نەزانن ئیمە چی مان ئەوی؟»

ئەم خولەی گفتوگو بەوەندە تەواو بو. شیخ مەحمودیان نەنارد بو بو گفتوگو، لەو کاتەدا ئیمە توشی شکستیکی گەورە بوبوین، بەعس ئامادە نەبو هیچ دەسکەوتیکی سیاسی مان پیشکەش بکا. زوری هیزەکانمان لە هەکاری لە دەس دابو، ئەیانویست تاقی مان بکەنەوە دوای ئەو روداوە ئاخو چون بیر ئەکەینەوە و، تا چ ئەندازەیەک کاری لە هەلویستی ئیمە کردوە.

*

هەندی لەوانەی بو پاریزگاری ئیمە و راپەراندنی کارەکان لە گەل ئیمە بون، گەنجی خویندەوار و، روشنبیر و ئازا بون، دوای گەیشتنی تاقمیکی تر لە کادرەکانی شار، لە ناو پیشمەرگەکانی هەریمەکانی تریش دا چەند کەسیکی کەمان هەلبژارد و، لە دەروای گورگان

«دەورە» یەکمان بو پەروەردەکردنی سیاسی بو کردنەوە.

بەشدارانی دەورەکە هەمو بەیانییەک لە خێوەتێک دا کو ئەبونەوە و، زیاتر لە ۳ سەعات قسەیان بو ئەکرا. مامجەلال دەرسی فەلسەفەی مارکسیزم و جەنگی پارتیزانی، د. مەحمود مێژوی پارتی دیموکراتی کوردستان لە دامەزراندنیەوە تا ئاشبەتال و، منیش مێژوی کورد و ئابوری کوردستان و، هەندی بابەتی پێویستم لە سەر رێکخستن پێ ئەوتن.

قوتابیەکان زیرەک و گوێرایەڵ و ژیر بون. زوری بابەتەکانیان لە لای خویان ئەنوسییەوە و کەلکی زوریان لی وەرئەگرت. پاشان زوریان کاروباری پیشمەرگەیی و رێکخراوەییان پی سپێردرا.

*

صەددام بە بونەی ئاهەنگەکانی ۱۷ - ۳۰ تەموزەوە کورێکی روژنامەوانی بەست. لە وەلامی پرسیارێک دا دەربارەی ئیمە، وتی: ئەوانە هیچ نین لە شاخەکان دا گیریان خواردوە، جاروبار تەقە لە پولیسێکی گیل ئەکەن. ئیمە ئەتوانین تا ۲۰ سالی تر لە گەل ئەو جورە روداوانە بژین.

*

هێزەکمان تا ئەهات قەرەباڵغتر ئەبو. ئەوانەی تێی دا کوبوبونەوە هەمویان لە گەل یەک تەبا و رێک بون.

دو جار شەماڵ مان، لە رێگای دوستەکانی ئیرانەوە، نارد بو سوریا.

مەلا عەلی گەنجێکی خاوەن باوەری کەللە رەق و لاسار بو. هەتا بلی ی لەش سوک و ئیشکەر بو، بەلام لە شتی زور پچوک تورە ئەبو، خێشی ئەکرد و، مانی ئەگرت لە خواردن. هەندی جار خوی خواردنەکەی دروست ئەکرد، لە وەختی دانان دا تورەیان ئەکرد، ئەتورا و لی ی نەئەخوارد، نان و چای ئەخوارد.

بە کادری گەرایەوە ناوچەی سورداش. کەوتە داوی دوژمنەوە گیرا و، ئیعدام کرا. لە زیندان دا دەستەیەک شیعری داناوە و، لە سەر وەرەقی پاکەتی جگەرە نوسی بویەوە و، بوی ناردبین، لە چاو شیعری زیندان دا بی نمونەبو، لە ریزی شیعرە بەرزەکانی کوردا دائەنری. بە شیعرەکانیەوە دیار بو، شیعرەکانی هیمن کاریان تی کرد بو. لە کاتی خوی دا هەمومان لە دیوانێک دا چاپ کرد.

ئەم تاقمە پیشمەرگەیە، سەرەرای ئەوەی هەمو ئەرکەکانی پیشمەرگایەتیان بە جی ئەهینا و، ئیشوکاری روژانەی بارەگەکەیان رائەپەراند، کاروباری چاپی هەمو بلاو

کراوەکانی یەکێتی و کۆمەڵەشیان ئەکرد.

ئازاد و حەمە سەعید و جەبار و شێرکۆ و هێمن هەتا زەمانێکی درێژ لە گەڵمان مانەوە.

*

مامۆستا جەعفەر

فاضیل کەریم ئەحمەد، کادر بوو لە بەری قەرەداغ، لەوێ ناوی لە خۆی نا بوو: «مامۆستا جەعفەر»، من پێشتر ئاشنایەتیم لە گەڵی نەبوو. بۆ کۆبوونەوەی کادرەکانی کۆمەڵە لە نۆکان نامەیەکی درێژی بە عەرەبی بۆ من نووسی بوو. نامەکەی هەندێکی لێکۆڵینەوە بوو لە سەر هەلومەرجی گشتی کوردستان و، هەندێکی بیروبۆچوون بوو لە سەر کەموکورییەکانی کۆمەڵە و، هەندێکی پێشنیار بوو بۆ چاککردنی. وەکو هەنگم لە دارا دۆزی بێتەوە دڵم خۆش بوو، لە ناو کادرەکان دا کەسێکی وام دۆزیبوەتەوە ژیرانە بیر بکاتەوە و، نووسەرێکی باش بێ. هەر ئەو کاتە لە کۆبوونەوەکان دا پێشنیارم کرد فاضیل لە ناوەندی دابنێین بۆ کاروباری نووسین.

هەندێ لەو برادەرانەی ئەیانناسی هاتنە لام وتیان: «پیاوی چاک بە، ئەمە مەهێنەرە پێشەوە، ئەم کابرایە بە کەڵکی ئەو ئیشە نایەت». زۆریان لە سەر وت. ئەو شتانەی ئەوان لە سەر ئەم باسیان ئەکرد بایی ئەوە نەبوو من ژیوان بکاتەوە لە ناودیر کردنی. لام وابوو بەخیلی پێ ئەبەن گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بە زوویی پێش بکەوێ. هەرچۆنێ بوو زۆری هاوڕێکانم لە کۆبوونەوەکەدا رازی کرد و، خۆیشم نامەم بۆ نووسی بگاتە لای ئێمە بۆ ئەوەی ئەرکی نوێ ی پێ بسپێرین.

لە قەندیل بوین گەیشتە لامان. پیاوێکی بێدەنگ و مۆن بوو. لە چاو زۆر لە کادرەکانی تردا رۆشنبیرتر بوو، هەندێ وتاری لە رۆژنامە کوردییەکانی بەغدادا بڵاو کرد بوەوە.

بە مامجەلالم ناساند و، وەکو نوێنەری کۆمەڵە لای مەکتەبی سیاسی دامان نا. مەسئولییەت لەو زەمانەدا لە قەندیل هیچ دەبدەبەیەکی نەبوو، پیاو خۆی پێوە هەڵ بکێشێ یا بایی بێ، بەڵام دیارە ناوەکە خۆی زل بوو: ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە و ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی. بە هەنگاوی مامجەلال و عەلی عەسکەری و هەموانی گرت بوەوە. پێشتر شتی وای بە خۆیەوە نەدی بوو، چاوەڕوانی شتی وەهاشی نەکرد بوو، لە بەر ئەوە هەر لە یەکەم رۆژەوە بە فیز و بایی بوونێکی زۆرەوە لە گەڵ پێشمەرگەکانی تر رەفتاری ئەکرد. نێوانی لە گەڵ هیچ کامیان خۆش نەبوو. پێشمەرگەکانی لە دەوری من

بون، هەمویان کادر بون و، هیچیان لەو پچوکتر نەبون، بەلکو هەندیکیان خویان لەو بە تەیکوشەرتر و گەورەتر دائەنا، تەنها لە بەر پلەی لەپەرسراوەتی لە کومەلە و یەکیتی دا ریزیان ئەگرت.

ماموستا جەعفەر خوی لە قەرەی هیچ کاریکی بارەگەکە نەئەدا، وەکو میوان ئەجولایەوە، روژیکیان لە گەل صەلاح چاوشین دەمیان لە یەک گیرا بو. ماموستا جەعفەر لە پالەوە هەرەشەی لە صەلاح کرد بو، وت بوی: «زور لە سەری بروی هەل ئەستم صەللیەیەک کلاشینکوفت پیوە ئەنیما». صەلاح قسەخوش و، گالتەچی بو، لە کاتی خوی دا قسەی بو ئەهات، بە گالتە پی کردنەوە وت بوی: «بە خوا سەیر نەبی لەم شورشەدا هیشتا تەقەت نەکردوە، یەکەم تەقە لە منی بکەیت!»

لەم وەلامە قورشەقی بوبو دابویە شاخ ویست بوی بروا بە سەد تکا و پارانەوە هینامانەوە. هیچ مەرجیکی سەرکردەی تی دا نەبو. زوری پی نەچو تی گەیشتم لە هەلبژاردنەکەم دا زور بە هەلە چوبوم، بەلام تازە نەئەکرا دەستی پیوە بنیم.

*

سالم، لە سەردەمی خوی دا، ئەبی بە قەندیل دا تی پەری بی، چونکە لە شیعریکی دا باسی هەوای فینک و خوشیی ئەکا و، ئەلی:

شنەی نوردی بەهەشتی وەصلی یار گەر بی بە سەر من دا

لە لام قەندیل و لاجانە بە هاوین گەر لە مسقەط بم

جاریکیان یەکی لە پیشمەرگەکان بە نارەزاییەوە پرسی، ئەری ئەو کابرایە کی بە وتویەتی:

بیرە کوردستان عەزیزم گەر تو سەیرانت ئەوی

بتبەمە قەندیل ئەگەر گولزاری کویستانت ئەوی

تو بلی ی خوی هات بی بو قەندیل؟ ئەگەر بی دیایە ئەیوت: «بتبەمە قەندیل ئەگەر هەورازی جوانت ئەوی!»

ناخوشیی هەندی جار جوانیی لە بەر چاو ئەخا. قەندیل بەو هەمو جوانیی و پاکیی و دەولەمەندییەوە لە بەر چاوی ئیمە، کە بە هەورازە بەفراوییە سەختە دریژەکانی دا هەلئەگەراین، هیچ رەونەقیکی نەما بو.

ئەمە یەکیکە لە شیعرە نەتەوەییە بە ناوبانگەکانی «نەسیری» ی کەرکوکی لە سییەکان دا هەلی بەستوە. ئەبی هات بی بەلام بیگومان نەک وەکو ئیمە بو پیشمەرگایەتی، بەلکو ئەبی بو سەیران و گەران هات بی.

له بەر بەرزیی قەندیل داری لی ناروی. وەکو جوگرافیناسەکان ئەلین: لە بەرزایی ۱٦۰۰ مەتردا لە ئاستی دەریاوە، سنوری روانی دار و درەخت تەواو ئەبی. قەندیل بەرەوژوری ۳ هەزار مەتر و لە هەندی جیگادا بە تایبەتی لوتکەی «کەوگەز» نزیکەی ٤ هەزار مەتر بەرز بو. بەلام هەتا بلی ی دەولەمەندە لە دەوەن و گژوگیا و، گولی جوراوجور دا. لەوی تاشنای شلیر، چنور، میلاقە، هەلالە، سویسن، گولە رون، ئەسپون، گیابەند و خاو... بوم و، ریواس، مەندوک، کورادە، جاترە، گیلاخە، بیژان، هەلز و کەما..م ناسی.

هەروەها ژمارەیەکی زور جەروجانەوەری جوراوجوری وەکو پەپولە، پەروانە، جالجالوکە، کوللە، قالونچە، گولنەستیرە...ی لی بو. سەرەرای سارد و سەرما مار، دوپشک، پەسپەسوکە، مشک و کیچی هەبو.

گژوگیای قەندیل و جروجانەوەرەکانی ئەهینی چەندین لیکولینەوەی زانستییان لە سەر بکری و، ئەلبومی تایبەتییان بو ریک بخری. رەنگە چەند جور گول و گیا و، جانەوەری تی دا بدوزریتەوە لە شوینانی تر هاوتایان نەبی. زورجار بە ئاواتم ئەخواست کە شارەزاییم هەبوایە لە زانستی بایولوجی دا، لە زولوجی یا بوتانیک دا بو ئەوەی کەلکم لەم هەلە وەربگرتایە.

لە بەهاردا کوارگی زورە. بەزوری لە سەرینجی کەمای سالی پیشو دەرئەچی.

قەندیل ۳ گومی پچوکی لە سەرە: کرمە سوران، پیر خەیلند، بیکودیان. لەوەرگاکانی جیگای سەدان هەزار سەر ئاژەل ئەبیستەوە. لە کونەوە ئیلەکانی مەنگور، مامەش، ئاکو، بلباس، پیران، بالەک... کویستانەکانیان لە ناو خویان دا دابەش کردوە. هەر ئیلە و، لە ناو هەر ئیلەش دا تیرە و هوز و بنەمالەکانی هەواری تایبەتی خویان هەبوە، رانەکانیان تی دا لەوەراندوە.

بەرزاییەکانی قەندیل لە زستان دا مەل و ئاژەلی لی نازی. لە هاوین دا تاک و تەرا نیری و بزنەکیوی بو ئەچی و، کەودەری کە ملیکە لە رەگەزی کەوە، بەلام گەورەترە، هەروەها هەلو هیلانەی لی ئەکا. هەلو بە جوت لە ئاسمانی قەندیل دا ئەفرن. بو یەکەمین جار لە «تەنگی سلیمانی» گویم لە چریکەی هەلو و، چاوم لە هەلمەت و دابەزینی بو بو راوی کەو. لەو کاتەدا پارەکەو گەورە بوبون. کەو بە پول ئەیان قاسپاند. هەلو کە بە ئاسمانەوە ئەیچریکاند کەوەکان ورەیان بەر ئەدا و لە شوینی خویان دا ئەوەستان، هەلوکە بە دەم فرینەوە دائەبەزی و پری بە یەکیکیان دا ئەکرد و ئەیفراند.

جیگەی داخە لە کوردستان هەلو و، هەمو ئەو مەلانەی لەم تیرەیەن وەکو: شەهین، چەرخە، بالەبان، دوبرا.. و، پچوکتر وەکو: باز، واشە، باشوکە، مشکگرەو کوللارە.. زور

کەم بونەتەوە. هەندێکیان نەماون و هەندێکیان بە دەگمەن ئەبینرێن، لە کاتێک دا جاران زۆر بون.

*

پاش گیرانی کاک عەلی و کاک تاهیر، مەکتەبی سیاسی یەکیتی نوێنەری بزوتنەوەی تێ دا نەما بو. هیچ کەس لە ئەندامانی سەرکردایەتی بزوتنەوەش لە گەڵ ئێمە نەبو بەشداری کۆبونەوەکان و بڕیارەکان بکا. داوامان لە رەسول کرد کە یان خۆی یان نوێنەرێکی بزوتنەوە بنێری بۆ لامان. کاک رەسول دوجار هات. جارێک بۆ گفتوگۆ لە سەر ئەم مەسەلەیە و جارێک لە گەڵ هەمزاغای پشدەری.

بیروراکانی رەسول لە گەڵ هی ئێمە جیاواز بو، وەکو لە گەڵ بیروراکانی کاک عەلی و کاک خالید جیاواز بو، بە نەمانی ئەوان بالەکەی ئەمان ریگەیان بۆ تەخت بو وەکو ئەیانویست هەلوێستی جیاواز لە هی یەکیتی وەربگرن. مەلا ناصیح لە شار ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بو لەو ماوەیەدا ئەویش هاتە دەرەوە، بەلام مەلا ناصیح نەیئەتوانی تەرازوەکە راست بکاتەوە.

*

حاجی شێخە

لەو کاتەدا ئێمە هیچمان نەبو بیدەین بە پێشمەرگە: نە چەک، نە پارە، نە جلوبەرگ، نە «ئیمتیاز»، تەنیا شتی هەمان بو بیروباوەر و قسەی خوش بو. زورجار لەمەش بێ بەشمان ئەکردن. یەکی لە گەورەترین گیروگرفتەکانی من تورەبونی مامجەلال بو. لە هەمو شت تورە ئەبو ئەچو بە گژ پێشمەرگەکان دا و ئەیشکاندن، بە تایبەتی کە ماندو یا برسی ئەبو. هەندێ لەو پێشمەرگانەی رایان ئەکرد یان ئەتوران تورەبونی ئەمیان ئەکرد بە بیانو.

مامجەلال هەندێ نامەی نوسی بو دابوی بە عوسمان پچکول بیبات. عوسمان تازە لە زیندانی قم ئازاد کرا بو. سالی پار لەو بوسەیەدا کە بو حەسەن خوشناویان دانا ئەم گیرا بو. عوسمان لای حاجی شێخەی بنزیری پێشمەرگە بو. حاجی شێخە و مەفرەزەکەی بەشی بون لەو هێزەی ئەرکی پاراستنی مامجەلالیان لە ئەستو بو.

مامجەلال عوسمانی دی بو هێشتا نەرویشتوە بانگی کرد بو لێ ی پرسی بو بوچی نەرویشتوە نامەکان بیبات. وت بوی: «حاجی شێخە پێ ی وتم تازە ئەمرو درەنگە سبەینێ برو!». لە سەر ئەوە مامجەلال تورە بو بو عوسمانی چەک کرد بو و کەوت بو جنێو پێ دان و لێدانی. حاجی شێخە لەمە دلگیر بو پێشمەرگەکانی لە بەرامبەرمان

دامەزراند. نیازی باش نەبو. بە پەلە لە خیوەتەکەمان دەرپەرین. پێشمەرگەکانی ئێمەش بەرامبەر پێشمەرگەکانی حاجی شێخە دامەزران. من دابەزیم بو لای مامجەلال. رەسولیش لەوی بو ئەویش هاتە لای مامجەلال. مامجەلال لە بینینی دامەزرانی حاجی شێخە و پێشمەرگەکانی تورەتر بو پری کرد بە کلاشینکوفەکەی دا پەلاماریان بدا. هەلویستێکی ناسک و پر مەترسی بو. لەوانە بو بێی بە تەقەی خوێنخو و یەکتری بکوژین، بە تایبەتی حاجی شێخە و ئەوان سەنگەریان لە مامجەلال گرت بو. هەرچونێ بو مامجەلالمان خاو کردەوە. عوسمانمان ناردە جێگایەکی تر و حاجی شێخەمان هێمن کردەوە. حاجی شێخە خوی کو کردەوە و دەمەو ئێوارە باری کرد و رویشت بو لایەکی تر.

مامجەلال کتوپر تورە ئەبو، تورەبونەکەی ئەوەندە نائاسایی بو، دوای ئەوەی ئەهاتەوە سەر خوی، ماتی دای ئەگرت و نەخوش ئەکەوت، هەندێ جار چەند روژێکی ئەخایاند. چەندی لە گەلی خەریک بوین ئەم خوە تەرک بکا، کەلکی نەبو.

ئێوارەکەی بە مامجەلالم وت ئەگەر بە چاکی ئەزانی ئەچینە سەر حاجی شێخە و چەکی ئەکەین و بە گیراوی ئەیهێنینەوە. مامجەلال قبولی نەکرد وتی چاکەی زوری بە سەرمەوە هەیە بو کوی ئەروا با بروا. حاجی شێخە بو روژی دوهەم لە قەندیل ئاوا بو پاش چەند روژی تەسلیمی حکومەت بوەوە.

حاجی شێخە لە سەرەتای شورشی ئەیلول دا لە گەل مامجەلال پێشمەرگە بوە و، لە شەری تەگەران دا بە بریندار بە دیل گیرا بو. لە سەرەتای شورشی حوزەیران دا ئەم یەکێ بو لەوانەی لە ناوچەی حاجی ئومەران دەستەی چەکداریان دامەزراند و بەشدار بو لە دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکدار دا. ئەگەرچی تەسلیم بوەوە بەلام دەزگای ئیستیخبارات لی ی خوش نەبو کوشتیان.

*

حاجی چاوشین

بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە قەندیل بوین هیچ هویەکی پەیوەندی مان نەبو لە گەل کادر و پێشمەرگەکان، تەنیا رێگای پەیوەندی نامە و تەتەری پیادە بو.

ئەو کاتەی لە شارباژێر بوم کارێکم بە یەکێ لە فەرماندەی مەفرەزەکانی هەرێمەکەم سپارد ناوی حاجی چاوشین بو، بوی نەکرا بو، من وامزانی کەمتەرخەمی کردوە، لە سەر ئەوە کە هات بو نوکان مەفرەزەکەیم هەلوەشاندەوە. بە دلشکاوی رویشت. ماوەیەک بزر بو وامزانی تەسلیم بوتەوە.

حاجی چاوشین ناوی صدیق و ئەندامی کومەلە بو. بە پیشە نانەوا بو. لە شورشی

ئەیلول دا پێشمەرگایەتی کرد بو، سەرەتای ئەم شورشەش دیسان بوبو بە پێشمەرگە. لە پێشمەرگایەتی دا ئازا و دلسوز بو. یەکی بو لەوانەی لە ریگا رویشتن دا کەس پی ی نەئەگەیشت.

لە پر حاجی چاوشین پەیدا بو ژمارەیەکی زور نامەی فەرماندە و کادرەکانی شاباژیر و هەورامان و قەرەداغی... هینا بو. تومەز ئەو ماوەیەی بزر بوبو ناوچەکان گەرا بو. هەرچی نامەی هەبوە لی ی وەرگرت بون و هات بو بو سەرکردایەتی. حاجی پیاویکی ئەمین و دەسپاک بو. دامان نا بە نامەبەری مەکتەبی سیاسی.

لە ماوەیەکی زور کورت دا بەریەی سەرکردایەتی ئەگەیاندە دورترین شوینی پیویست و وەلامەکانی ئەهینایەوە. پێشمەرگەکان لە بەر خیرایی هاتوچوی ناویان نا بو: «کوپتەری شورش». بە دریژایی چەند مانگ ئەم ئەرکە قورسەی بی پرتە و بولە ئەنجام ئەدا و، بە شوینی پر لە مەترسی دا تی ئەپەری.

پاشان لە بەر ئەو دلسوزیە کرایە فەرماندەی کەرت لە هەریمی ٥ و، لەو بوسەیەدا کوژرا کە حەمەخانی حاجی دارا لە نزیک زەرایەن بو فەیسەل تالەبانی (سیروان) و پولی لە پێشمەرگە و کادرەکانی ئەوی ی دانا.

*

حاجی نیرگز

هەندی لەوانەی هات بون بو پێشمەرگایەتی خەلکی گوندە راگویزراوەکانی بناری قەندیل بون. یەکی لەوانە ناوی حاجی کاک ئەحمەدی پشتئاشان بو. خوی بە براگەورەی پشتئاشانییەکان دائەنا. پیاویکی ساویلکە و خوش و نەخویندەوار بو. مامجەلال پی ی وت بو: تو ئامیر هەریمی پاریزگاریت. موریکی یەکیتی داپویە. حاجی ئەحمەد ئەوەندە دلی پی ی خوش بو نامەی بو هەرکەس و بو هەر مەبەستیک بنوسیایە، تەنانەت نامە تایبەتیەکانی خویشی کە بو هەوالپرسینی کەسوکاری ئەنارد موریکی پیا ئەنا.

حاجی کاک ئەحمەد جلی سەیری لە بەر ئەکرد. هەمیشە شەروالەکەی لە رەنگیک و، مراخانییەکەی یان فانیلەکەی بە سەر مرادخانی دا لە بەری ئەکرد رەنگیکی تر بو. رەنگەکانیش زەق بو. روژیکیان فانیلەیەکی زەرد و شەروالیکی سەوزی لە پی کرد بو. عەلی ئامەخان کە بەو جورە دی بوی، وت بوی: «سەیری کەن بزانن لە نیرگز ئاچی!». لەوەوە ئیتر ناویان نا بو «حاجی نیرگز».

*

کابرایەکی جوتیار خەلکی یەکی لە گوندەکانی بناری قەندیل بو لە دیوی ئیران

هەمو حەفتەیەک بە نهێنی ئەحات بو لامان باریک تەماتە و خەیار و کولەکە و تەرەی ئەهێنا بو مامجەلال.

ژمارەیەکی زور کەم مالە رەوەندیش بە دزی کاربەدەستانی ئێرانەوە لە پەناو پەسیری قەندیل دا هەلیان دا بو، روژی جەژن پیاوەکانیان بە «ران» یکی پچوکەوە لە بەرخ و گیسک بو جەژنە پیروزە هاتن بو سەردانمان.

جگە لە خوشەویستی کورد هیچ پال پێوەنەریکی تر نەبو پال بەم جوامیرانەوە بنی ئەم «موجازەفە» پر مەترسییە بکەن و، چاوەروانی هیچ پاداشتێکیش نەبون. لەو کاتەدا کە ئیمە لە بازار و ئاوەدانی دابرا بوین دیارییەکانیان نرخێکی مادی گەورەی هەبو، بەلام نرخە سیاسییە «مەعنەوی» یەکەی زور گەورەتر بو.

*

زلکردنی دوژمن

بابەتەکانی دوەمین ژمارەی «هەوالنامە» م ئامادە کرد بو، دام بە حەمەسەعید و نەوان بو چاپ کردنی. پێشم وت بون چەندی ئەتوانن پەلە بکەن لە تەواو کردنی. هەمو جار هاوری جبار بابەتەکەی ئەخویندەوە و، حەمەسەعیدیش تایپی ئەکرد. خەریکی تایپ کردنی سەروتاری ژمارەکە بون. سەروتارەکە لە سەر روداوەکانی هەکاری بو.

مانشێتەکانی وتارەکە ئەم رستانە بو:

- کونەپەرستانی ئێران، تورکیا، عیراق و ئەم پیلان ئەگێرن دژی شورشی پیروزی گەلەکەمان.

- چەتە کوردکوژەکانی بارزانی دوا پەردە لە سەر دەوری خائینانەی خویان لا ئەدەن.

- کومەلانی خەلکی کوردستان سورن لە سەر دریژەدان بە خەباتی شورشگێرانە.

بەشی یەکەمی وتارەکەش ئەمە بو:

«جەنگ لە چەندین شەر و نەبەرد و پێکادانی دزراو و براوە، لە چەندین پەلامار و کشانەوە، هێرش و راکردن، قازانج و زەرەر، سەرکەوتن و ژێرکەوتن.. پێک دێت.

هیچ جەنگێک، بە تایبەتی هیچ جەنگێکی دریژخایەن، هیشتا لە مێژودا روی نەداوە کە لە سەرەتاوە تا کوتایی هەر سەرکەوتن و پەلامار و هێرش و قازانج بوبێت و، هیچ شورشێکیش نادوزیتەوە کە هەر لە خەتێکی راست و دروست دا بی پیچ و پەنا، بی هەوراز و نشێو، بی شکان و گلان و نوچدان، بی زەرەر و زیان.. بەرەو ئامانج و سەرکەوتن رویشتبێت.

شورش له سەرەتاوە تا کوتایی بە چەندین هەوراز و نشیو، بە چەندین کوسپ و کەندەلان دا رائەبوریت، چەندین جار توشی هەلچون و نیشتنەوە ئەبیت، چەندین ژیرکەوتن و سەرکەوتنی گەورە و پچوکی بە سەر دیت، رەوتی گوران و گەشە کردنی شورش بریتیە لە زنجیرەیەک نوچدان، هەلسانەوە، هەلەنگوتن و راست بونەوە، دوراندن و بردنەوەی.. پیکەوە بەستراو.. تا دوا سەرکەوتن بە دەست ئەهینی.

شورشەکەی ئیمەش لەم یاسایە بە دەر نیە، تا ئەو کاتەی بە دوا ئامانج ئەگات، توشی چەندین شکست و نسکو، گلان و نوچدان، شکان و زەرەر، هەوراز و نشیو.. دیت و، تا دوا سەرکەوتن بە دەس ئەهینی ئەبی چەندین قوناغ بپیویت، کە هەر یەکیکیان زنجیرەیەک ژیرکەوتنی جوزئی و سەرکەوتنی جوزئی تی دایە، جا ئەگەر هەندیک جار لە هەندیک شورش دا یەک نەبەردی گەورە و کاریگەر چارەنوسی شورشەکەی بریار دابیت وا بی گومان لە شورشی نوی ی کوردستان دا، لە قوناغی ئیستادا، یەک شەری گەورە چەند کاریگەر و بە ئازاریش بی، ناتوانی چارەنوسی شورشەکە بریار بدا.

سەرکەوتن یا ژیرکەوتنی شورشی ئەم جارەمان لە ماوەیەکی دریژدا، لە چەندین شەر و نەبەرد دا، لە چەندین ناوچەدا، لە چەندین مەیدانی جەنگیی، سیاسی، ئابوری.. بریاری لە سەر ئەدریت.

دوژمن چەند بەهیز و توانا بیت، ئەتوانیت یەک نەبەرد یاخود چەند نەبەردیک بباتەوە، بەلام ناتوانیت جەنگەکە بە یەکجاری بباتەوە و، چارەنوسی شورش بریار بدات و، هیزی شورش بە یەکجاری لە ناو ببات، چونکە هیزی شورش، کە هیزی جەماوەری گەلە، سەرچاوەیەکی لە بن و لە برانەوە نەهاتوی هەیە و، هیزی شورش لە سەرانسەری ولات دا وەکو تو و چینراوە و، لە مەیدانی نەبەردیک دا کو نەبوتەوە و، لە ناو ناچیت.

لە مانگی نیسانی ١٩٧٨ دوە هیزیکی تیکەلاو لە پیشمەرگەی هەمو هەریمەکانی کوردستانی عیراق خوی ساز دا بو بە ری کەوتن بەرەو بادینان بە نیازی هینانی چەک و تفاقی جەمکیی شورش و، هەلگیرساندنی بلیسەی پیروزی شورش لە ناوچەکانی بادینان.

هیزەکە بویە وا زو کەوتە ری تاکو پیش دەس پی کردنی رژیمی رەگەزپەرستی عیراق بە راگویزانی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور بتوانیت هەندی چەک و تفاق بە دەس بهینیت و، فریای چەکدار کردنی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور بکەویت پیش راگویزانیان، تا بتوانن بەرگری هیرشی دوژمن بکەن بو سەر نیشتمانەکەیان.

ئەم هیزەی کە بو بە جیهینانی ئەم فرمانە نیشتمانیە پیروزە کو بوبوە و، کەوتە ری بەرەنگاری پیلانیکی ئیمپریالیستی گەورە بو، کە دەولەتەکانی ئیران و عیراق و

تورکیا و جاشە دەولیەکانی بارزانی تی دا بەشدار بون و، لە ئەنجام دا ئەو هیزە تیکەلاوەی کوردستانی عیراق ئەگەرچی بەوپەری قارەمانیتی و ئازایەتییەوە بەرگری لە بەرسیتی و سەرما و ماندو بون و پەلاماری درندانەی هیزەکانی ئیران، عەشیرەتە کونەپەرست و دواکەوتوەکانی تورکیا و، جاشەکانی قم کرد، بەلام لە زنجیرەیەک شەردا لە ۱ - ۱۹ ەی حوزەیران دا لە تورکیا، دوای ئەوەی دەیان پیشمەرگەی قارەمان شەهید بون و بریندار کران توشی شکستیکی گەورە بو.

ئیمە ئەبەردیک مان لە خاکی حکومەتیکی بیگانە، لە دەرەوەی سنوری ولاتەکەی خومان دا، سەبارەت بە هەلە و غەلەتی سیاسی و سوپایی خومان، سەبارەت بە چاک هەلنەسەنگاندنی پیلانی دوژمنانی شورشەکەمان نەک سەبارەت بە هیز و توانای دوژمنەکانمان دوراند، بەلام شورشمان نەدوراند، ئیمە ئەبەردیکمان لە روی سپاییەوە دوراند، بەلام ئەبەردیکی سیاسی گەورەترمان بردەوە»

لە بەشەکانی تری دا ئەو دژوارییانەی هیزەکە لە سەرەتاوە تا لە ناوچونی توشی بوبو، بە تایبەتی پەلامارەکانی ئیران و عیراق و تورکیا، باس کرا بو.

لە کاتی تایپ کردنی وتارەکە دا تاقمی پیشمەرگە، لەوانەی تازە هات بون بو پیشمەرگایەتی، بە میوانی ئەچن بو خیوەتەکەیان. پاش بەخیر هاتن و چاکوچونی حەمەسەعید داوا لە هاوری جەبار ئەکا بەردەوام بی لە سەر خویندنەوە.

جەبار ئەلی: «جاری راوەستە! میوانمان هەیە».

حەمەسەعید ئەلی: «بیخوینەرەوە! شتیکی نهینی تی دا نیە با ئەمانیش گوی یان لی بی».

چەندی حەمەسەعید لە گەلی ئەلی بیخوینیتەوە، کەلکی نابی. چاوەری ئەکەن تا میوانەکان ئەرون. حەمەسەعید لە جەبار ئەپرسی کە بوچی بوی نەخویندەوە؟

جەبار ئەلی: «کورە چیت بو بخوینمەوە؟ ئەگەر گوی یان لی بوایە یەکیتی ئەو هەمو دوژمنەی هەیە و پیلانی لی ئەگیرن و، پارتی ئەو هەمو دوستەی هەیە و یارمەتی ئەدەن.. هەر ئەمشەو بە کومەل ئەرویشتن تسلیم ئەبونەوە».

تیبینییەکەی هاوری جەبار راست بو. بو من بو بە «دەرس». لە کاری سیاسی دا زلکردنی دوژمن کاریکی راست نیە و خەلکی سادە ئەترسینی، ئەبوایە من ئەمەم رەچاو بکردایە. بەلام بو پەروەردە کردنی کادر و پیشمەرگەکان لە نوسینەکان و نامەکان دا هەولمان دا چەند سەرەتایەک بچەسپینین لەوانە: سەرەتای پشت بە خو بەستن، سەرەتای خەباتی دریژ خایان، سەرەتای کوکردنەوەی چونایەتیی باش..

*

نیوەڕۆیەکیان ٣ هالیکوپتەری ئیرانی لە ناکاو هات و زۆر بە نزیکی بە سەرمان دا فڕین و چەند جاری هاتن و چوون سەیری بنکە و بارەگەکەیان کردین. هەر زوو هەموومان دامەزراین و خۆمان ئامادە کرد و کەوتینە چاودێری. فڕۆکەوانەکان ئێمە و ئێمە فڕۆکەوانەکانمان ئەبینی. هیچ جۆرە چەکێکی قورس یا ناوەنجی مان نەبو بۆ شەڕی فڕۆکە. لەوەو پێش ئاگاداری پێشمەرگەکانمان کرد بو هەر کە گوێ یان لە دەنگی هالیکوپتەر بو یەکسەر دابەزرێن و، چاودێری بکەن، ئەگەر تەقەی نەکرد وازی لی بهێنن و، ئەگەر تەقەی کرد یان نیازی دابەزاندنی هێزی هەبو بە هەموو تواناوە بە تەقە دای بگرنەوە. هالیکوپتەرەکان بی ئەوەی تەقەمان لی بکەن گەڕانەوە. ئێمەش بارووبنەمان پێچایەوە و گوێزامانەوە بو هەوارێکی تر.

پێشمەرگەکان بە گشتی فێری ئاگرکردنەوە، چێشت لی نان، هەویر شێلان، نان کردن، هەلدان و خستن و پێچانەوەی خێوەت، بارکردنی ولاخ.. بو بون. ئەم کارانە بو بون بە بەشێک لە پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی هەمومان.

*

ماموستا عەزیز لە داوی بەعس دا

عەزیز مەحمود لە قەرەداغەوە هات بو دەراوی گورگان. سەرکردایەتی ناوخو لە نامەکانیان دا چەند جاری گلەییان لی کرد بو لە سەر ئەوەی چەند جاری بی ئەوەی هیچ کارێکی پێویستی هەبوبی چو بوە ناوشار. مەترسییان هەبو بکەوێتە داوی دوژمن و بگیری. ئاگادارمان کرد کە نابی ئیتر هاتوچوی شار بکا. تەنانەت مامجەلال بە گالتەوە هەرەشەی لی کرد کە ئەگەر لە سلێمانی لە «پەنای مەنجەل» دا بگیری هیچی لە سەر نانوسی.

ماموستا عەزیز گەڕایەوە بو قەرەداخ. گوی ی نەدایەوە ئاموژگاری و هەرەشەکەی مامجەلال و، جارێکی تر خوی کرد بوەوە بە سلێمانی دا. ماوەیەکی درێژ لە مالی کابرایەکی گومان لی کراو دا، کە سەر بە ئیستیخبارات بو، مابوەوە. ئەمجارەیان گیرا و، ئازار و ئەشکەنجەیەکی زوریان دا و، حوکمی ئیعدام درا.

بەعسییەکان بە فێڵ بە عەزیزیان وت بو: «کابرایەک لای یەکێتی گیراوە، ئاگاداریان بکە ئەگەر ئەوان ئامادە بن ئەو کابرایە بەر بدەن، ئێمەش تو بەر ئەدەین». ماموستا عەزیز کادرێکی بەنرخ و هەلکەوتو بو ئێمە ئامادە بوین چەند دیل مان لە لا هەبو هەمویان لە بەرامبەر ئازاد کردن یان ئیعدام نەکردنی دا بەرەڵلا بکەین. بەلام

بەعسییەکان لە سەردەمی شەر دا، پێشمەرگە و ئەندامە گیراوەکانی ڕێکخراوە نهێنییەکانی یەکێتییان بە «دیلی جەنگ» و «گیراوی سیاسی» دانەنا و، هیچ کات ئامادە نەبون بۆ گۆڕینەوەیان.

پێش ئیعدام کردنی بۆ ئەوەی بیروخێنن و بیبەزێنن قسەیە پێ یان وت بو: «هاوڕێکانت بەرامبەر تۆ بێ وەفا بون. ئامادە نەبون زەلامێک بۆ تۆ بەر بدەن. خۆت ڕزگار بکە و، چی ئەزانی بیڵێ!».

ئەم فێڵە نامەردانەیە کاری لە مامۆستا عەزیز نەکرد بو، لەوەلام دا وت بوی: «دیارە هاوڕێکانم لە من باشتری لێ ئەزانن بۆیە ئامادە نەبون بمان گۆڕنەوە»

مامۆستا عەزیز دەورێکی گرنگی هەبو لە خەباتی ژێرزەمینیی ناو شار دا و، ماوەیەک لێپرسراوی ڕێکخستنی سلێمانی بو. هەروەها لە ئامادە کردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی سلێمانی دا. لە زیندان دا نمونەی تێکۆشەری خوراگر و ئازا بو. حەیف بو بەو جورە کوتایی بە ژیانی هات.

*

لە کوردستانی ئێران ڕێکخراوێکی سیاسی لێ نەبو هاوکاری لە گەڵ بکەین. حیزبی دیموکرات بۆ ئەوەی دڵی حکومەتی عیراقی لێ نەڕەنجی خوی لە هەمو جورە هاوکارییەک لە گەڵ یەکیەتی ئەبوارد. جگە لەوە هیچ ڕێکخستن و نفوزێکیشی لە ناو کوردستانی ئێران دا نەبو تا ئێمە کەڵکێکی لێ وەر بگرین. ئێمە بۆ ڕاپەراندنی کاروبارەکانی خومان پێویستی مان بە کەسانێک هەبو لە ئێران و تورکیا یارمەتی مان بدەن. لە هەردو پارچەوە خەڵک هاتوچویان ئەکردین و نامەیان بۆ ئەناردین. بە هاودەردیەوە لە گەڵ ئێمە پەیوەندییان ئەکرد.

هەوڵمان دا دوستەکانی خومان ڕێک بخەین. توری ڕێکخستن مان لە شنو، ورمی، مەهاباد، خانە، سەردەشت، بانە، مەریوان، پاوە... دروست کرد. ئەمانە یارمەتییەکی زوریان ئەداین بۆ کرین و گوێزانەوەی کەلوپەلی جوراوجور هەر لە ئاردەوە تا سەر خەیمەت و پەتو و پێلاو و کاغەز و مەرەکەبی رونیو، هەروەها بۆ تیماری هەندی برینداز و، گوێزانەوەی هەندی لە کادرەکانمان. هەر لە ڕێگای ئەمانەوە دوجار شەماڵ چو بۆ تورکیا و، لە تورکیاوە بۆ سوریا و، گەڕایەوە لامان لە قەندیل. هەر لە ڕێگای ئەمانیشەوە قادر جەباری نیردرا بۆ سوریا و گەڕایەوە. هەر لە ڕێگەی ئەمانەوە ئەنوەری سەعید والی هاتەوە و، کە ڕوستەم بە بریندازی هاتە دەراوی گورگان برا بۆ تاران بۆ تەداوی و، دوای تیمارکردن گەڕایەوە.

جگە لە مان، د. سەید عەزیزی شەمزینی و صەلاحەدینی موهتەدی و چەند کەسیکی تر بەردەوام نامەیان لە گەل مامجەلال ئالوگور ئەکرد.

*

کومەلە لە ئیران لە ناو خویان دا بریاریان دابو خانەی موعینی کە یەکی لە کادرەکانی سەرکردایەتییان بو، تازە لە زیندان بە سەربەرزی دەرچو بو، بنیرن بو کوردستانی عیراق بو لای ئیمە. محەممەدی مەلا عەلی هینا بوی بو ناوچەی ئالان بەرەو روی ئەحمەد فەتحوللا، جیگری فەرماندەی هەریمی ۳ ی، کرد بوەوە بیگەیەنیتە لای ئیمە. لەو کاتەدا شوینی ئیمە نادیار بو.

چەند روژی خانە لە گەل ئەحمەد بو، جەیش لە ۲۱ ی حوزەیرانی ۷۸ دا هیرشی بو کردن بو سەر «کانی بیشو» لە نزیک گوندی «دری» لە ناوچەی ماوەت. لەم هیرشەدا ٦ کەس کوژران، یەکیکیان ئەحمەد و ئەوی تریان خانە بو.

خانە، وەکو هاوریکانی ئەیانوت گەنجیکی روشنبیر و تیگەیشتو و ئازا بو. برای شەهیدان: سولەیمان و عەبدوللا و، کوری محەممەد ئەمینی موعینی بو.

دوای کوژرانی خانە دو کەسی تر لە هاوریکانی بریار ئەدەن بین بو کوردستانی عیراق، ئەودەم ئیمە لە دەراوی گورگان بوین لە قەندیل، هەردوکیان گەیشتن: د. جەعفەری شەفیعی خەلکی بوکان و، ساعیدی وەطەندوست (کاک برایم) خەلکی سنە بون. ساعید لە گەل خوی چەردەیەک پارەی بو هینا بوین پاشەکەوتی کرد بو. د. جەعفەریش لەو کاتەدا بو ئیمە زور بە سود بو چونکە پزیشکمان نەبو. تەنیا یەک برینپیچمان هەبو، ئەویش هەر ئیرانی بو، ئەندامی «سازمانی ئینقیلابی» بو.

دو پیاوی روشنبیر و تیگەیشتو و بە زات و ورە بەرز بون. حەزیان نەئەکرد کەس بزانی کە ئیرانین و ناویان چیە

*

روژیکیان لە بەردەمی چادرەکەی خومان دا دانیشت بوین، حەمە سەعید لە دورەوە دو کەسی بە دی کرد، یەکیکیان جلی کوردی و، ئەوی تریان پانتولیکی جینز و کراسیکی زەردی لە بەر دا بو، پرچی بەر دا بوەوە. وتی: «وابزانم روژنامەنوسە».

کە نزیک کەوتنەوە پانتول لە پیکە عومەری حاجی عەبدوللا بو. زورم پی خوش بو ئەویش بە سەلامەتی گەیشتنەوە لامان. کاک عومەر لە گەل کاروانەکەدا رویشت بو بچی بو سوریا و، لەویوە بە یەکجاری بروا بو ئەوروپا. قم نامەیەکیان پی دا نارد بو بو سەرکردایەتی کومەلە. بە ناو ئیران دا لە مەهابادەوە بە نهینی لە گەل یەکیکی شارەزادا

گەرا بووەوە. کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «سەفەری دەرەوت کرد. دو وڵاتی بێگانەت بە بێ پاسپورت و ڤیزا بینی - مەبەستم تورکیا و ئێران بو - ئیتر هەڵی گلەییت نەماوە!»

کاک عومەر لای ئێمە گیر نەبو ئیزنی خواست بو سەردانی کەسوکاری بگەڕێتەوە نزیک سلێمانی.

سەرانی قم، سامی سنجاری و هاوڕێکانی، چەند جارێ لە گەڵ ئازاد هەورامی و عومەر دانیشت بون. بەو ئیعتیبارەی هەردو ڕێکخراو: «قم» و «کومەڵە» مارکسین، باسی ڕێککەوتنی دوقوڵی و هاوکارییان لە گەڵ کرد بون. بو دەربڕینی نیازی باشی خویان ئەم نامەیەیان نوسی بو و، داویان بە عومەر بیهێنێ و، درێژەی قسەکانیشمان بو بگێڕێتەوە.

قم تاکتیکێکی زیرەکانەی هەڵبژارد بو: ئەیویست یەکێتی لە ناوەوە هەڵ بوەشێنێ. پیوەندی لە گەڵ کومەڵە و بزوتنەوە، بە جیا لە یەکێتی یان وردتر بە جیا لە مامجەلال، دروست بکا. لەوێ، لە گەڵ ئازاد و عومەر لە سەرکردایەتی کومەڵە دانیشت بون و، ئەم نامەیەیان بو کومەڵە نوسی بو، هەر بەو جورە لە گەڵ کاک تاهیر و سەید کاکەش لە سەرکردایەتی بزوتنەوە دانیشت بون و، پەیوەندییان لە گەڵ ڕەسول مامەند کرد بو.

تاکتیکەکەی سامی بە سەر ئێمەدا لە کومەڵە تێ نەپەڕی، ئێمە سور بوین لە سەر ئەوەی کە ئەگەر بیانەوێ ڕێک بکەون ئەبێ لە گەڵ یەکێتیی نیشتمانی ڕێک بکەون، نەک لە گەڵ باڵەکانی و، داوامان لێ کردن چارەنوسی هەڤاڵە بزرەکانمان ئاشکرا بکەن و، لە گەڵ ئەوان گفتوگوی ڕێککەوتن دابمەزرێنن.

بە ڕاوێژ لە گەڵ مامجەلال و د. مەحمود وەڵامی نامەکەمان بو نوسیەوە. هەر ئەو کاتە ئەسڵی نامەکەی قم و وێنەی وەڵامەکەی خومانم بو ئاگاداری و هەڵگرتن نارد بو هەڤالاتی دەرەوە. ئەبێ لە لایان مابێ.

بەڵام تاکتیکەکەی سامی کاری لە بزوتنەوە کرد و، پشێوییەکی زوری خستە ڕیزەکانیانەوە. ڕەسوڵ و هەندێ لە هاوڕێکانی شاری کە ماوەیەک بو نارازی بون لە یەکێتی، ئەو کارەساتەی بە سەر یەکێتی هات بو داینا بە بەڵگەی ڕاستیی بوچونەکانی خویان. بە تەنیا کەوتنە پەیوەندی و گوڕینەوەی نامە. ئەمەش پێچەوانەی ئەو ڕێککەوتنانە بو کە لە ناو خومان دا لە سەری پێک هات بوین. پەیوەندی لە نیوان هەر ۳ باڵەکە دا: کومەڵە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، لە سەر بنچینەی جورێ لە فیدرالیزم ڕێک خرا بو. لە ناو یەکێتی دا هەر باڵە سەرکردایەتی تایبەتی و، سەربەخویی ئایدیولوجی و، ڕێکخراوەیی خوی هەبو، بەڵام لە کاروباری پێشمەرگەیی و، دارایی و، پەیوەندی سیاسی

دا له گەڵ حیزب و دەوڵەتان ئەبو یەکگرتو بن. هیچ پالیک بوی نەبو لەشکری تایبەتی خوی دروست بکا و، سەرچاوەی دارایی سەربەخوی هەبی و، پەیوەندی تایبەتی لە گەڵ حیزبی تر و دەوڵەتان دابمەزرینی.

لەو هەلومەرجە دژوارەدا کە تی ی کەوت بوین، بزوتنەوە بە سەرکردایەتی رەسول لە باتی ئەوەی ببی بە فاکتەریکی کاریگەر بو هەلساندنەوەی شورشەکە و بەهیزکردنی یەکیتی و هیزی پیشمەرگە، بون بە هوی دروستکردنی ناتەبایی و ئاژاوەیەکی سیاسی ناوخو لە ناو ریزەکانی یەکیتی و پیشمەرگەدا، تا ئەمات رەسول بزوتنەوەی بەرەو دابڕین و جیاکردنەوەی لە یەکیتی ئەبرد. ئەمانە لایان وابو بە جیا لە یەکیتی باشتر گەشە ئەکەن و گەورە ئەبن.

*

«مفە» حەیاتەکەدا

هەمزە ئاغای میراودەلی تا ئاشبەتاڵ لە زیندانی بارزانی دا بو. دوای بەربونی وەکو پیاویکی سەربەخو خەریکی ژیانی خوی بو، بەلام لە داوودەزگاکانی بەعس نزیک بو. حکومەت رای سپارد بو مامجەلال ببینی و گفتوگوی لە گەڵ بکات. هەمزاغا ئاگای لە ناکوکییەکانی ناو یەکیتی ئەبو. ئەم هەواڵەی بو رەسول نارد بو. رەسول ویست بوی خوی بە تەنیا ببینی. هەمزاغا وەلامی دابوەوە کە رایان سپاردوە مامجەلال ببینی. ئەگەر ئەو نەیبینی نایەت. رەسول گفتوگوی لە گەڵ بەعس هەمیشە بە «خیار» ی یەکەم دائەنا. پاش ساردبیەکی دریژ لە پەیوەندییەکانی دا لە گەڵ مامجەلال، بەم بونەیەوە نامەیەکی گەرموگوری بو مامجەلال نوسی، داوای لی ئەکرد «عرض» ەکەی حکومەت قبوڵ بکا و، بو ئەو مەبەستە بچی بو بارەگاکەی ئەوان.

ئیمە لامان وابو: هەمزاغاش هیچ «عرض» یکی سیاسی پی نیە و، قسەکانی ئەمیش لەوانەی شیخ مەحمودی کاریزە زیاتر نیە. هەمزاغا لە کونەوە دوستی مامجەلال بو. تەنیا بو بینینی خویشی بوایە حەزی ئەکرد لە گەڵی دابنیشی. قسەی لە گەڵ بکا و، هەواڵی میراودەلییەکان و، دەنگوباسی دوست و ناسیاو و حکومەتی لی ببیستی. مامجەلال، «عرض» ەکەی قبوڵ کرد. لەو کاتەدا ئیمە سەرگەرمی ریکخستنەوەی پیشمەرگە و ریکخراوەکان بوین، ئەو شوینەی رەسول دای نا بو بو یەکتر بینین زور دور بو لە شوینەکەی ئیمەوە، شوینیکی نزیکتری دیاری کرد بو یەکتر بینین.

هەمزاغا هات. رەسول جوابی بو مامجەلال نارد بچی بو بینینی. مامجەلال جوابی دابوەوە کە ئەگەر هەمزاغا بو گفتوگو هاتوە لە گەڵ من با بفەرموی بو لامان، خو ئەگەر بو

لای ئیوەش هاتوە، پێویست ناکا من بیم خوتان قسەی لە گەڵ بکەن. د. مەحمودیش، لەو کاتەدا چو بو بو لای رەسول ئەیویست پشتیوانی لەو بکا و، مامجەلال رابکیشی بو ئەوی، هەندی بروبیانویان هینابوە گوایە هەمزاغا ناتوانی ئەو ریگا دریژە بپیوی. سەرەنجام هەمزاغا هات بو لای مامجەلال. رەسول و د. مەحمودیش شوینی کەوت بون. وەکو چاوەری مان ئەکرد، هەمزاغا، جگە لە موجامەلە، شتیکی سیاسی دیاری کراوی پی نەبو.

ئەو کاتە بە هوی نادیاریی چارەنوس و، ناخوشیی ژیانی روژانەمانەوە، هەندی لە کادرەکان شەیدای «مفاوضات» بوبون. زور جار کە قسەیان لە گەڵ مامجەلال ئەکرد، تکایان لی ئەکرد ئەگەر بو ماوەیەکی کورتیش بیت «مفاوضات» لە گەڵ حکومەت دروست بکا. د. مەحمودیش هەمان رەئی هەبو، بەو بونەیەوە «مفاوضات» ی ناو نا بو «مفە حەیاتەکەدا».

*

«تقییم» ەکەی د. مەحمود

د. مەحمود لە سوریا لە گەڵ قادر جەباری و شەمسەدین موفتی و عەدنان موفتی کومیتەی ئامادەکردنیان دامەزراند بە نیازی ریکخستنەوەی پارتی لە سەر بنچینەیەکی هاوچەرخ و نوی. لەوی کەسیان لی کو نەبوەوە. ئەوانەی کاری سیاسییان ئەکرد بە زوری دابەش بوبون بە سەر یەکیتی و قم دا.

د. مەحمود لە گەڵ شەمسەدین و قادر جەباری، لە دوا مانگەکانی ۷۷ دا گەرایەوە کوردستان. لە گەڵ مامجەلال و مەکتەبی سیاسی مانەوە. ئەگەرچی کومیتەی ئامادەکردن لە یەکیتی دا نەبو، بەلام لە هەمو مەسەلەیەک دا پرسیان پی ئەکردن، بیرورایان وەرئەگرتن و، بو زور کوبونەوە بانگ ئەکران، ئەوانیش وەکو ئەندامانی سەرکردایەتی یەکیتی رەئیان ئەدا.

لە کوردستانیش چەندی هەولیان دا کەسیکی ئەوتو لە حزبەکەیان کو نەبوەوە.

کە لە گەڵ کاک عەلی لە یەکتری جیا بونەوە، د. مەحمود و قادر لە گەڵ ئیمە مانەوە. ئەو ماوەیەی بە یەکەوە بوین هیچ شتیکمان لی نەشاردەوە. وەکو یەک دەستەی یەک حیزب کارمان ئەکرد. خویشی پیاویکی بە ورە و تیگەیشتو و شارەزا بو. گوی ی نەئەدایە ناخوشیی و تەنگوچەلەمە. بیروراکانی خوی لە هەمو بونەیەک و لای هەموان بە سەربەستی دەرئەبری.

دوای کارساتی هەکاری ئەویش ئەیویست گەلێک لە هەلەکانی یەکیتی و لاواز

بونی وەریگری بو بەهیزکردنی حیزبەکەی خوی. راکیشانی دانە دانەی کادر و پیشمەرگە کاریکی ئاسان نەبو. تەنگوچەلمەی سیاسی ناو یەکیتی ئەزانی و، ئاگاداری ناکوکیەکانی نیوان بزوتنەوە و یەکیتی و، هەلویستەکانی رەسول بو. زورجار لای ئیمە رەخنەی لی ئەگرت، بگرە گالتەی پی ئەهات، کەچی لای ئەویش جوریکی تر قسەی ئەکرد. لە نامەکانیشی دا بو ئەم و ئەو جارویار توقورچی لە یەکیتی ئەگرت.

ماوەیەک بو کەوت بوە سەر باسی ئەوەی کە یەکیتی هیچ «تقییم» یکی نیە بو رابوردو، بە تایبەتی بو ماوەی «جەلالی»، لە بەر ئەوە یەکیتی تاوانبار ئەکری بە دریژەکیشانی هەمان حیزبی «جەلالی». من ئەو زەمانە نەمئەزانی لەمە مەبەستی چیە. لام وابو ئەیەوی تەرازو راست بکاتەوە: نامیلکەیەکی نوسیبوە لە سەر هەلسەنگاندنی شورشی ئەیلول و، دەوری بنەمالەی بارزانی، ئیستا ئەیەوی نامیلکەیەکیش بنوسی لە سەر جەلالی.

من خوم لام وایە هەمیشە پیاچونەوەی رابوردو، هەلسەنگاندنی بابەتیی و بیلایەن، شتیکی باش و بە کەلکە. تەنانەت بو مروڤیش پیویستە جارویار، لە ناو دەرونی خوی دا بە خوی دا بچیتەوە، کارەکانی خوی هەل بسەنگینی و چاک و خراپەکانی دیاری بکا، چ جای بو جولانەوەیەکی سیاسی کە سەدان هەزار کەس بەشداریان تی دا کرد بی و، دەیان هەزار کەسی تی دا کوژرا بی.

هەرچەندە لەو لیقەومانەدا وەختی «تقییم» و هەلسەنگاندنی رابوردو نەبو، بەلام ئەوەندەی دوبارە کردەوە وتمان باشە مادەم خوت خاوەنی بیرەکەی خوت بینوسە. پی ئەچو پیشتر بیرە بنەرەتییەکانی لە میشکی خوی دا ئامادە کرد بی، لە ماوەیەکی کورت دا نامیلکەیەکی ئامادە کرد، لە ژیر ناوی: «تاقیکردنەوەی رابوردو و خەباتی ئەمروی گەلەکەمان» دا. باسە سەرەکییەکانی بریتی بو لە:

پیشەکییەک لە ژیر ناونیشانی: با سود لە تاقیکردنەوەکانی رابوردومان وەربگرین بو یەکخستنی ریزەکانی گەلەکەمان و بەهیزکردن و سەرخستنی خەباتی ئەمرو و ئایندەی.

باسەکانی بە گویرەی ماوەکانی دابەش کرد بو بە چەند قوناغی: ماوەی ۱۹٥۸ - ۱۹٦۱. ماوەی ۱۹٦۱ - کوتایی سالی ۱۹٦٤: کەرت بونی پارتی و شورش. ماوەی ۱۹٦٥ - ۱۹۷۰. ماوەی پاش دەرچونی بەیانی ۱۱ ی ئازاری ۱۹۷۰ - ۱۹۷٥ وە تیکچونی شورش. ماوەی پاش تیکچونی شورشی ئەیلول.

هەلسەنگاندنەکە پشت ئەستور نەبو بە هیچ بەلگە و دوکومینت یا کتیب و نوسینیک. لەو کاتەدا ئارشیف یا کتیبخانەمان لە بەر دەس دا نەبو. هەمووی لە سەر بنچینەی بیرەورییەکانی خوی نوسی بو.

له هەڵسەنگاندنەکەی دا هەردولا: «مەلایی» و «جەلالی»، له هەندی قوناغ دا لایەکیان زورتر و، له هەندی قوناغ دا هەردوکیانی به جوته، به توندی کوتا بو.

ئەگەرچی مامجەلال زور له هەڵسەنگاندن و بوچون و ئەنجامگیرییەکانی پی راست نەبو، بەلام هیچ «اعتراض» یکی دەرنەبری. من لام وابو د. مەحمود پیاویکی دلسوز و شارەزا و خاوەن تەجروبەیە ریگەی بدەین له «مینبەر» ی یەکیتییەوە باوەرەکانی خوی رون بکاتەوە، بی ئەوەی بچینەوە به گوی دا. بی مشتومر موافەقەتمان له سەر کرد و له ئەیلولی ۱۹۷۸ دا وەکو یەکی «له بلاوکراوەکانی یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان» خومان چاپمان کرد و بلاومان کردەوە.

زوری نەخایاند دەرکەوت: مەبەستی له کوتانی «مەلایی» و «جەلالی» تەنیا هەڵسەنگاندنی «تاقیکردنەوەی رابوردو» بو «یەکخستنی ریزەکانی گەلەکەمان» نەبو، بەلکو بو دروستکردنی «خەتی سیهەم» بو. «خەت» یک خوی سەرکردایەتی بکا.

بەلام د. مەحمود نەیتەتوانی ئەم دەورە ببینی، له بەر هویەکی سادە و ئاشکرا، ئەویش ئەوە بو: د. مەحمود خوی له ۱۹٦٤ تا ۱۹۷٥ توندرەوترین تیوریسیەنی «مەلایی» بو له ناو پارتی و، له ناو جولانەوەی کوردا.

*

داری بوق

یەکی له گیروگرفتەکانمان سوتەمەنی بو. قەندیل داری سوتاندنی لی نیه. گوینی و چەقالە و هەندی درک و دالی هەیە. دوکەلی زور و ئاگری کەم و زو دائەمرکیتەوە. ئاگری هیچ کامیان پشکو ناکا. هەمو روژی هەمومان ئەبو بەشی له وەختی خومان بو کوکردنەوەی گوینی و چەقالە و درک و دال تەرخان بکەین، هیشتا بەشی نان کردن و چا و چیشت لی نانی نەئەکرد. روژیکیان یەکی له پیشمەرگەکان به تەلیسیکی پرەوە هاتەوە وتی: «کورینەا لای مەفرەزەکانی تر باسی مەکەن شتیکی زور گرنگم دوزیوەتەوە، گیروگرفتی سوتەمەنی چارەسەر ئەکا». وا به خوشی و شانازییەوە باسی ئەکرد ئەتوت بیرە نەوتی دوزیوەتەوە. تەلیسەکەی هەلرشت هەموی کوتەرەی پچوک پچوک بو. کوتەرەکان له درزی بەردا روا بون، قەدی دارەکەی باریک و، بالای چەند بستیک و، گەلاکانی سەوز و ئەستور و گەورە بون، ناوی «داری بوق» بو.

وشەی بوق بو چەند شتی جیاواز به کار ئەهینری: ۱. ناوە بو گیانلەبەریکی وشکاوی. ۲. ناوە بو ئەو هەلم و هالاوە گەرمەی له نیوەروی هاوین دا له ناو کشتوکال دا پەیدا ئەبی. ۳. ناوە بو ئەم روەکە. ٤. پالْ، وەکو بوقی پیوە نا، واتە پالی پیوە نا.

زوری پی نەچو مەفرەزەکانی تریش داری بۆقیان دوزیەوە و کەوتنە هەلکەندن و سوتاندنی.

تا لە تەنگی سلیمانی بوین لە پەنای «داری بۆق» دا حەساینەوە.

*

یەکی لە پیشمەرگەکانی دەستەکەی مامجەلال ناوی هاوری مارف بو. هاوری مارف گەنجیکی تازە پیگەیشتو و، ئەندامی کومەلە و، برازای عەلی پچکول بو. هەتا بلی ی مامجەلالی خوش ئەویست و، بو کومەلە دلسوز بو. بە هەمو کەسیکی ئەوت «هاوری». روژیکیان کویخاکانی مەنگور هات بون بو لای مامجەلال. هاوری مارف کە بەخیر هاتنی کرد بون وت بوی: «هاوری کویخا فلان و هاوری کویخا فیسار... بەخیر بین!». کویخاکان لەم نازناوە تازەیە سەیریان هات بو.

روژیکیان هاوری مارف کتیبیکی لەو کتیبانەی «دار التقدم» لە موسکو بە عەرەبی لە سەر فەلسەفەی مارکسی دەری ئەکرد بە دەستەوە ئەبی بو پیشمەرگەیەکی تری ئەخوینیتەوە. چەند جاریک وشەی «المستغلە - بکسر الغین و المستغلە - بفتح الغین» دوبارە ئەبیتەوە. گویگرەکە لی ی ئەپرسی: «ئەم بکسر الغین و بفتح الغینە یەعنی چی؟»

هاوری مارف یەکسەر وت بوی: «یەعنی چینی کریکار کوت و پیوەند کراوە!»

سالانی دوایی هاوری مارف بە دیل گیرا و لە زیندانی موسل لە سیدارە درا. چەند نامەیەکی لە زیندانەوە نوسیبوە نمونەی پیشمەرگەی ئازا و خوراگر بو.

*

هەلگرتن - رەدوکەوتن

بەشی لە چیای قەندیل کەوتوتە سنوری مەنگورایەتییەوە. مەنگور لە هەردو دیوی سنوری ئیران و عیراق هەن و، لە کوردستانی عیراق لە پشدەر و بناری قەندیل دا ئەژین. تا ئیستا ریکخراوی خیلەکیان ماوە. بنەمالەی «کادرویشی» سەروکایەتی ئیلی مەنگوری ئەکرد و، تیرە سەرەکییەکانی بریتی بو لە: خدر مامسینی، باب رەسوە، زودی، رەزگەیی، چنارەیی، مەنگورە روتە. هەر تیرە و تایەفەیەک «کویخا» ی تایبەتی خوی هەبو بو سەرپەرشتی کاروباری تیرەکە.

لە سەرەتای دامەزراندنی یەکیتی و دەس پی کردنەوەی شورش دا ئیلی مەنگور بە گشتی هەلویستیکی شورشگیرانەیان هەبو. کویخا محەممەدی مەلا شەریف، کویخا عەلی قەلاوی، کویخا قادری زودی، کویخا محەممەدەمینی رەزگەیی، کویخا حەسەنی برایم

شوان، شیخە کولْ.. بە کومەڵ بون بە پیشمەرگە و، لە روژانی سەختی کارەساتی هەکاری دا بە دەوری مەکتەبی سیاسی یەکیتییەوە مانەوە.

لە ناو مەنگوردا هەندێ نەریتی دیرینەی «ژن هینان و شو کردن» ماوە لەوانە: «هەلگرتن» و «رەدوکەوتن».

ئەمانیش وەکو زور لە ئیلەکانی تر لە ناو خویان دا ژن و ژنخوازییان ئەکرد «الزواج الداخلي: ئیندوگامی»، تەنانەت هەلگرتن و رەدوکەوتنیش هەر لە ناو خویان دا و، بە زوری لە ناو هەمان گوند و هەمان بنەماڵە و هەمان بەرەباب دا ئەبو. زور کەم روی داوە ژن و ژنخوازی لە گەڵ تیرەیەکی تری مەنگور بکەن چ جای ئیلیکی تر. بە گشتی «ژن و میردایەتییان» لە گەڵ ژن و پیاوی دەرەوەی بەرەباب، هوز، تیرە، ئیلەکەی خویان «الزواج الخارجي: ئیکسوگامی» بە پەسند نەئەزانی، مەگەر ئاغاکانیان بو مەبەستی دامەزراندنی هاوپەیمانیتی لە گەڵ ئیلەکانی تر ئەمەیان کرد بی.

هەرچەندە هیچ کوسپیکی کومەلایەتی یان دینیی لە بەردەمی پیاوی مەنگوردا نەبو بو پیکەوەنانی خیزانی «فرە هاوسەر: پولی گامی»، یان «دو هاوسەر: بی گامی»، کەچی خیزانەکانیان بە زوری «یەک هاوسەری: مونو گامی» بو.

کویخاکانی مەنگور بو ریکخستنی «مسلمت» هەندی یاسا و ریوشوینیان دانا بو کە لە نەریتی باوەباپیرانەوە بویان بە جی ما بو، داوایان لە ئیمەش کرد بویان بسەلمینین، بە تایبەتی دیاری کردنی پارەی ریککەوتنەکە.

کور لە ناو مەنگور دا بە زوری بە ریگەی «ژن بە ژن» ژن ئەهینی.

کە داوای کچی ئەکا ئەبی ئەمیش کچ (خوشک یان ئاموزا)ی هەبی بیدا بە یەکی لە کەسوکار (برا، باوک، ئاموزا) ی کچی خوازبینی کراو.

هەردو کچ لە یەک زەمان دا لە دو کورەکە مارە ئەکرین.

کچی دوهەم ئەبیتە «مارەبراو» بەلام مەرج نیە لەو کاتەدا بگویزریتەوە، چونکە زور جار کچیکی مناڵ لە باتی کچی خوازبینی کراو ئەدری بە لاکەی تر «گەورە بە کچکە». خو ئەگەر هیچ کچیکیان نەبو بەلینی «بنەتزو» یان پی ئەدەن، واتە کچیک کە لە پاشەروژدا لە دایک ئەبی، دوای لە دایکبونی ئەیدەنی. کچە منالەکە مارە ئەکری بەلام لە بەر منالی جاری نایگویزنەوە تا گەورە ئەبی.

کچە مارەبراوەکە، کە گەورە بو، ئەگەر دلی بە کورەکەوە بو، ئەوسا ئەگویزریتەوە، ئەگەر بە کورە مارەکراوەکەی خوی رازی نەبو، بە نهینی لە گەڵ کوریکی تر ریک ئەکەوی پیکەوە برون. کچەکە رەدوی کورەکە ئەکەوی و، کورەکە کچەکە هەلئەگری، بە جوتە ئەرون

و ئەچن خویان ئەخەنە خانوی کویخا یان پیاوماقولیکی دەسەلاتداری تایەفەکەیان و لەوی ئەمیننەوە.

هەندی جار پیاویکی دەسەلاتدار کچ یا ژن هەلئەگری، ئەگونجی ئارەزوی ئافرەتەکەی لە سەر نەبی بە جوری لە زور و هەرەشە بیبا، بەلام رەدوکەوتن هەمیشە ئارەزوی ئافرەتەکەی لە سەرە.

خاوەن مال بویان تی ئەکەوی لە گەل مالی کوری مارە لی براو بو «مەسلەحەت». مەسلەحەت دیسان لە ریگەی «ژن بە ژن» یان «گەورە بە گچکە» یان «بەنەتزو» ئەکری.

کوری یەکەم کە کاتی خوی کچەکەیان لی مارە کردوە، دەس هەل ئەگری لە کچە مارەبراوەکە و، «تەلاق» ی ئەدا بەرامبەر بەوەی کچیکی تر بدەن بە خوی یان بە کەسیکی نزیکی (کور، برا، باوک، ئاموزا). ئەوسا ئافرەتەکە لە دەزگیرانە تازەکەی مارە ئەکری.

– رەدوکەوتنی کچی مارەنەکراو ئاسانتر و «مەسلەحەت» ی هەرزانترە لە کچی مارەکراو.

– رەدوکەوتنی کچی مارەکراوی نەگویزراویەتەوە ئاسانتر و مەسلەحەتی هەرزانترە لە هی گویزراوە.

– رەدوکەوتنی ژنی گویزراوەی بی منال ئاسانتر و مەسلەحەتی هەرزانترە لە ژنی گویزراوەی خاوەن منال.

– مەسلەحەتی رەدوکەوتنی ژنی خاوەن منال لە هەمویان گرانترە، چونکە میردی ژنە هەلگیراوەکە چەند منالیکی بی دایکی بە سەردا ئەکەوی، بە ئاسانی ژنیکی تری دەس ناکەوی شوی پی بکات و منالەکانیشی بو بە خیو بکات.

ئەم نەریتە لە کونەوە لە هەندی شوینی کوردستان و، لە ناو هەندی خیل و هوز و تیرەدا باو بوەوە و، لە ناو پیاوەکانی چینەکانی خواری و ناوەنجی دا شیوەی سەرەکی ژنهینان بوە. وەکو روداویکی کومەلایەتی ئاسایی سەیری ئەکری، بەلکو هەندی لەو کچانەی هەلیان بو هەل نەکەوتوە رەدویکەون یان هەل بگیرین هاوریکانیان کە لی یان تورە ئەبن پی یان ئەلین: «ئەگەر خیرت پیوە بوایە یەکی هەلی ئەگرتی!» و، هەندی ژن کە چەند جاری هەلگیراون لە ناو هاوتاکانی خویان دا شانازی پیوە ئەکەن.

بەلام هەلگرتن و رەدوکەوتن لە هەندی شوینی تری کوردستان و، لە ناو هەندی خیل و هوز و تیرەدا بە «سەرشوری کومەلایەتی» گەورە دائەنری، تەنیا بە کوشتنی هەردوکیان (کچ و کور یان ژن و پیاو) و، هەندی جار منالەکانیشیان، ئەگەر منالیان لی کەوت بیتەوە، ئەم سەرشوریە پاک ئەکریتەوە.

*

ژمارەیەکی زور لە خەلکی گوندی «چەوە» ی خوشناوەتی کاروانچیتیەیان ئەکرد. لەم کارەدا زور شارەزا و وریا و تیژرو بون. زوریان کوردپەروەری دلسوز بون. سەید کەریم و د. خدر مەعصوم لە خوشناوەتی بون، بەلام ماوەیەکی دریژ بو لی مان بزر بوبون و، هیچ هەوالیکمان نەئەزانین. بە هوی یەکی لە کاروانچیەکانی چەوەوە نامەیەکم بو سەید کەریم نوسی. روداوەکانی هەکاری م بو نوسی و، داوام لی کرد بو کە بینە لامان لە قەندیل.

لە «تەنگی سلیمانی» یەوە خەریک بو بگەرینەوە بو «دەراوی گویزی» سەید کەریم و چەند پیشمەرگەیەک پەیدا بون. یەکیکیان لە ریگا بەردیک لە قاچی دابو لە رویشتنی خست بو، لە هەندی جیگا بە کولی خویان و لە هەندی جیگا بە کولی ولاخ هینا بویان. من جگە لە سەید کەریم ئەوانی ترم نەئەناسی. بەلام هەندیکیان لەو جارەوە ئیتر بون بە هاوری ی گیانی بە گیانیم هەتا کوژران، لەوانە عەلی نەبی و ریباز.

پەیدا بونی سەید کەریم بو من مژدەیەکی خوش بو.

عەلی نەبی پیشمەرگە نەبو. بە نوینەرایەتی ریکخراوی «کەومەش» ی کومەلە هات بو. پاش ئەوەی هەندی قسە و باسی پیویستمان کرد گەرایەوە. وا ریک کەوتین خوی و چەند کەسیکی تر چەک پەیدا بکەن و ببن بن بە پیشمەرگە. پاش گەرانەوەی بە ماوەیەکی کەم بەلینەکەی خوی بە جی هینا.

لە هەمو روژە سەختەکانی ژیانی پیشمەرگایەتی م دا لە مەنگورایەتی، بالەکایەتی، ئاکویەتی، سوران، خوشناوەتی بو هەر جییەک ئەچوم، هەمیشە دو شیرپیاوم لە گەل بو هەردوکیانم لە قەندیل ناسی: ئەحمەد مەولود و عەلی نەبی، بە خویان و پیشمەرگەکانیانەوە لە گەل خوم ئەبون و، هەر کاریکی دژوار بهاتایەتە ریگەمان بە یەکی لەم دوانەم ئەسپارد و، بە بی ترس لە مردن جیبەجییان ئەکرد.

*

رەوینە

لە کاتی گواستنەوەدا لە ریگا توشی هەوارەکەی حەسەنی برایم شوان بوین. حەسەن لە گەل چەند کەسیکی تردا چو بون بو راو چەند سەری بزنە کیویان کوشت بو. ۳ سەریان دا بە ئیمە. لە گەل خومان بردمان بو هەواری تازە. لەوی چاکمان کرد.

بناری قەندیل لە هەردو دیوی لیرەواری زوری هەبو. دول و شیو و زەرد و ماهی زوری تی دا بو، شوینی ژیانی دەعبای کیوی بە تایبەتی نیری و بزنەکیوی بو. چەند

راوکەریکی شارەزای شاخەوانیی لە ناو خویان دا ریک ئەکەوتن. دەسراستەکان لە سەر ریگای حەیوانەکەدا خویان مەلاس ئەدا و، چەند کەسیکیش «جەلەب» ی حەیوانەکانیان راو ئەنا. حەیوانەکان ئەکەوتنە بوسەی دەسراستەکانەوە و، ئەیان کوشتن. بەم جورە راوەیان ئەوت: «رەوینە».

چیاکانی کوردستان چەندین جور حەیوانی کیویی نایابی هەبوە. مەر، بزن، شور «فیلە گیژە»، ورچ «هەرس»، پلنگ، وشەک، ریوی، دەلەک، کەمتیار... بەلام راوی بی «دیسیپلین»، تو وی هەندی دەعبای کیوی وەکو: مەرە کیوی و شوری براندوتەوە و، هەندیکی تریشی وەکو بزنە کیوی و ئاسک خستوتە مەترسی لە ناوچونەوە.

*

نەستیلی سادر

دەراوی گویزی کەوت بوە نیوان زنجیرە چیاکانی «سادر» و «جاسوسان» ەوە. هاوینە هەواریکی خوش و، کانی و ئاوی سارد و سازگاری هەبو. هەندی دار و چیلکەشی بو سوتاندن لی دەس ئەکەوت.

کە بە دەراوی گویزی دا شور ئەبیتەوە بەرەو خوار ئەچیتە دولە کوکی لەویشەوە کە شور ئەبیتەوە ئادی هەردو شاخی ئەمبەر و ئەوبەر «جاسوسان» و «سادر» لە یەکتری نزیک ئەبنەوە پیش ئەوەی بگاتە گوندی «سویسنی» ئەبیتە تەنگیکی زور تەسک. ئەم تەنگە شوینیکی لە بارە بو دروستکردنی دیواریکی بەرز، ئاوی کانی و جوگاکانی دولەکە و، ئاوی باران و بەفراو لە نەستیلیکی گەورەدا کو بکاتەوە. بە دریژایی ئەم دولە هیچ ئاوەدانییەکی تی دا نیە و، ئەرزیکی ئەوتوی تی دا نیە لە هیچ وەرزیکی سال دا بە کەلکی کشتوکال بی. هەموی لیژایی شاخ و بەردەلانە. ئاوەکەی ئەتوانری بە کار بهینری بو ئاوەدانی دەشتی قەلادزی و بەرهەمهینانی کارەبای ئاوی.

*

نائارامی لە «جەزیرەی ئارام» دا

دامەزراوی دینیی شیعە لە کونەوە لە ئیران دا گرنگییەکی تایبەتی هەبوە. چەند جیاوازییەکی بنەرەتی لە هی سوننە هەیە:

- دامەزراوی دینیی شیعە ریکخراویکی هەرەمییە، «آیت الله العظمی» یەک «موجتەهیدی ئەکبەر» «مەرجەعی تەقلید» ی هەمو شیعەکانی جیهان، لە لوتکەی هەرەمەکەدایە، دوای ئەویش چەند «آیت الله العظمی» و، ئینجا چەند ئایەتوللایەک، بنکە فراوانەکەیشی هەزاران «حجە الاسلام» و «ثقە الاسلام» و، دەیان هەزار «طلابی علمی»

بە.

- دامەزراوی شیعە لە روی دارایییەوە سەربەخویە لە دەسەلاتی دەولەت. هیچ مەلایەکی شیعە و هیچ خویندنگا و «حوزەی عیلمیە» پشت بە موچە و یارمەتی دارایی حکومەت نابەستی. ئەمەش سەربەخویی کار و ئیجتیهادی بو دابین کردون. کاتی خوی رەزا شا هەولیکی زوری داوە بیبەستی بە حکومەتەوە سەرکەوتو نەبوە.

- ئەوانەی گەیشتون بە پایەی «ئایەتوللا» جوری لە «حەصانە» یان هەیە ئەیانپاریزی لە لیپیچانەوەی قانونی و گرتن.

سالی ۱۹٦۳ شا «ئینقیلابی سفید» ی راگەیاند. ویستی هەندی ئالوگوری سیاسی، ئابوری، کومەلایەتی، روشنبیریی لە ژیانی خەلک دا بکا بە نیازی ئەوەی بنکەیەکی کومەلایەتی فراوان لە ناو گەلانی ئیران دا بو پشتیوانی لە خوی دروست بکا.

دامەزراوی دینیی شیعە بە توندی دژی هەندی لەم ریفورمانە راوەستا. بو بە رویەرو بونەوەی خویناوی لە نیوان رژیم و دامەزراوی شیعەدا. ئاخوندیک بە ناوی روحوللای خومەینی ریبەری ئەم جولانەوەیە بو. رژیم جولانەوەکەی سەرکوت کرد. خومەینی کەوتە بەر تەنگ پی هەل چنین و دەستدریژی ساواک، بەلام دامەزراوی دینیی شیعە، بو ئەوەی خومەینی لە گرتنی ساواک بپاریزی، نازناوی «ئایەتوللا» ی پی دا. بەم هویەوە شا نەیتوانی بیگری، دوری خستەوە بو شوینە پیروزەکانی عیراق.

بە.روالەت رژیم زال بو. هەر کەس و تاقمی رەخنەی لی بگرتایە تەفروتونای ئەکرد. وەکو نارازییانی ئیرانی ئەیانوت: «تیرور و ئیختیناق» بالی بە سەر ئیران دا کیشا. هەندی تاقم دروست ئەبون بەلام ساواک بە توندی سەرکوتی ئەکردن. هەزاران کەسیان لە زیندانەکان ئاخنی بو، هەزاران کەسیان بە لیدان لە زیندانەکان دا و لە سەر جادە کوشت. ناوبانگی سیاسی رژیم لە دنیادا دا زرا بو. وەکو یەکی لە نمونەکانی پیشیل کردنی مافی مروڤ سەیری ئەکرا. خویندکارانی ئیران لە دەرەوە «کونفیدراسیون» یکیان دروست کرد بو چالاکییەکی زوری تەنواند بو ریسوا کردنی شا و ساواک و رژیمی ئیران.

ئیمام خومەینی لە نەجەف وەکو دوژمنیکی سەرسەختی شا ناسرا بو، بەلام چالاکییەکی ئەوتوی نەنەنواند تا ریککەوتنی جەزایری ۷٥ کە ئیتر پیوەندی عیراق - ئیران ئاسایی بوەوە و، هاتوچوی نیوان دانیشتوانی هەردو ولات گەرم بو. هەزاران ئیرانی سالانە ئەچون بو «زیارەت» ی شوینە پیروزەکانی شیعە لە نەجەف، کەربەلا، کاظمیە... و، سەدان قوتابی بو خویندن لە مزگەوتەکانی دا ئەمانەوە. ئەمە هەلیکی گەورەی بو ئیمام خومەینی رەخساند پیوەندی خوی لە گەل دامەزراوی دینیی شیعە لە ئیران تازە بکاتەوە

و، یەکەوێتە هاندان و سازدان و جولاندنی. ئێران لەو کاتەدا زیاتر لە ۸۰ هەزار مزگەوت و ۱۸۰ هەزار مەلای شیعەی تێ دا بو.

یەکێ لەو تاکتیکە تازانەی ئیمام خومەینی دای هێنا: «شورشی کاسیت» بو. خومەینی وتارەکانی خوی لە سەر شریتی کاسیت تومار ئەکرد و شاگرد و لایەنگرەکانی بە ناوی «گورانی و موسیقای شەرقی» یەوە ئەیانبردەوە بو ئێران و لە مزگەوتەکان دا لێ یان ئەدایەوە و، لە تاران و قوم و شارەکانی تر لە دوکانی تسجیلات تومار یان ئەکرد و ئەیان فروشت. جگە لەمەش کتێبەکانیان ئەبردەوە بو ئێران.

نارەزایی لە ناو ئێران دا تا ئەهات زیادی ئەکرد و لە بەرامبەر ئەوەدا تیرور و ئیختیناق تا ئەهات زیادتر ئەبو. فەساد لە هەمو بوارەکانی ژیان دا: فەسادی ئیداری، مالی، سیاسی، ئەخلاقی.. قولتر ئەبو. بنەمالەی سەلتەنەتیی (خوشک و برا و کچەکانی شا) ریبەریی ئەم فەسادەیان ئەکرد. چەندەها قومارخانە و شوێنی رابواردنیان لە سەرانسەری ئێران دا دامەزراند بو. ئەشرەف سەرپەرشتی توری ناوخو و جیهانی بازرگانیی هیرویینی ئەکرد. بنەمالەکەی شا کە کاروباری ئابوری خویان لە «بونیادی پەهلەوی» دا ریک خست بو، بو بو بە گەورەترین دەولەمەندی ئێران و، لە هەمو سەودا و پروژە ئابورییە قازانجدارەکان دا بەشیان هەبو.

شا بە بونەی تێپەربونی ۲٫۵۰۰ سال بە سەر دامەزراندنی رژێمی شایەتی لە ئێران دا ئاهەنگێکی گەورەی گیرا و، خوی بە میراتگری ئەریتی ۲٫۵۰۰ سالەی شایەتیی ئێران دانا. بودجەیەکی گەورەی بو ئەم ئاهەنگانە تەرخان کرد بو. ئەم ئاهەنگانە لە باتی ئەوەی جێگای شا لە ناو ئێران و دنیادا قایمتر بکا کردی بە نیشانەی تیری رەخنە و نارەزایی.

بو رونکردنەوەی بیروراکانی خوی شا کتێبێکی بە ناوی: «بە سوی تمدن بزرگ» بلاو کردەوە. ئەم کتێبە وەرگێردرایە سەر هەمو زمانە گرنگەکانی دنیا. هەزاری موکریانی بش کردی بە کوردی. هەرچی ئەم کتێبەی خوێند بوەوە لایان وا بو شا توشی نەخوشی میگالومانیا «جنون العظمە» بوە. شا وای بلاو ئەکردەوە کە لە ماوەی چەند سالی داهاتودا ئێران ئەکا بە هێزی ئابوری پێنجەمی دنیا و، وای دەرئەبری کە لە ناوچەکەدا ئێران «جەزیرەی ئارام» ە و، نمونەیەکی دیموکراسی ئەوتویە لە روژئاواش دا وێنەی نیە.

شورشی کاسیت تا ئەهات کاریگەرتر ئەبو. ئوپوزیسیونی ئێرانی کە تا ئەوسا ریبەرێکی دیار و هەلکەوتویان نەبو سەرکردایەتییان بکا دژی شا و «رژێمی سەلتەنەتی» خەریک بو سەری دەرئەهێنا.

دوای ١٢ ساڵ سەرۆکایەتی وەزیران لە ١٩٧٧ دا، شا عەبباس هوەیدای لێ خست و جەمشیدی ئامووزگاری دانا بە سەرۆوەزیران. ئەم گۆڕینە کاری لە بزوتنەوەی نارەزایی نەکرد. ئەویش هیچ گۆڕینێکی لە ژیانی سیاسی دا ئەنجام نەدا. حیزبی «رەستاخیز» تەنیا حیزبی ڕێگا دراو بو. ئەویش حیزبێکی شاپەرست بو، ساواک پێکی هێنا بو، خەڵکیان بە زۆر لێ کۆ کرد بوەوە.

هەندێ لە سیاسییە ناسراوەکانی ئێران وەکو: د. کەریمی سنجابی، مەهدی بازرگان، شاپوری بەختیار، داریوشی فروهەر، مەتین دەفتەری... کەوت بونە جموجوڵ. پاشماوەکانی «جبهەی میللی» سەردەمی موصەددەق و هەندێ لە حیزبەکانیان ڕێک خست بوەوە و، بوبون بە ناوەندی ئۆپۆزیسیۆنی شارستانی و دیموکراتی.

مەهدی بازرگان، «کومیتەی دیفاع لە ئازادی و حقوقی بەشەر» ی دروست کرد بو. بڵاوکراوەی لە سەر مافی مرۆڤی ئێران دەرئەکرد.

تاقمێ لە قانونییە ناسراوەکانی ئێران کەوتنە دەرکردنی بەیاننامە سەبارەت بە دەس تێ خستنی حکومەت لە کاروباری دادگاکان و، تاقمێ لە نوسەرانی ناسراوی ئێران کەوتنە بەیان دەرکردن داوای ئازادی دەربڕین و نوسین و لابردنی سانسوریان ئەکرد.

بە نهێنی پش سەدان بەیان و بڵاوکراوە دژی شا و ساواک دەرئەچو.

شا لە ژێر گوشاری بەڕێوەبەرایەتی سەرۆکی ئەمریکی کارتەر دا بەرنامەی «فضای باز سیاسی» ڕاگەیاند کە گویا بەرەو لیبرالیزم ئەچێ.

سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ لە «قوم» خۆپیشاندان دەستی پێ کرد. داوودەزگای ئاسایشی شا بە توندی لێ یان دا و، چەند کەسێ کوژرا. لە چلەی ئەم ڕوداوەدا لە تەوریز خۆپیشاندانێکی گەورە ڕێک خرا. خەڵک هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی حیزبی ڕەستاخیز، سینەماکان، بانکەکان. دەزگاکانی ئاسایش لەم خۆپیشاندانەش دا ٣٠ کەسیکیان کوشت.

بو چلەی کوژراوەکانی تەوریز پێشەوایانی شیعە داوایان لە خەڵک کرد خۆپیشاندان بکەن. لە تاران و ئەسفەهان و زۆر شاری تری ئێران خۆپیشاندانی گەورە کرا و، لە هەندێ جێ بو بە پێکادان لە نێوان خۆپیشاندەران و پولیس دا.

یادکردنەوەی چلەی کوژراوەکان بو بە یەکێ لە تاکتیکە سەرکەوتوەکانی سازدانی خەڵک بو خۆپیشاندان. بەڵام خۆپیشاندانەکان تا ئەهات زیاتر ڕەنگی دینییان ئەگرت و، مەلاکان ئەهاتنە مەیدانی کارەوە. دەوری سەرکردە نادینییەکان کەمتر ئەبوەوە.

ڕۆژی هەینی خەڵک لە مەیدانی ژالەی تاران کۆبونەوە بو یادی کوژراوەکانی

سەرەتای ئەیلولی ٧٨ بەڵام داوودەزگاکانی ئاسایش گوللەبارانی خۆپیشاندانەکەیان کرد و نزیکەی ٥٠٠ کەسیان لێ کوشتن. ئەم ڕووداوە بە ناوی «جومعەی سیاه» ناوی دەرکرد. ئەم کوشتارە شەپۆلی نارەزایی و توندوتیژی لە سەرانسەری ئێران دا زۆرتر کرد و، بوو بە سەرەتای قۆناغێکی تری پڕ تەوژمی بزوتنەوەی دوژمنایەتی شا.

خۆپیشاندان و مانگرتن پەرەی ئەسەند، شوێنەکانی وەکو: مزگەوت، زانستگا، بازار، کارگاکان... و، چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ وەکو: ڕۆشنبیر، بازرگان، چینی ناوەنجی، کرێکاران... و، ڕێبازە سیاسییەکانی ڕاست و کۆنەپارێز و، و چەپی پێشکەوتنخوازی وەکو: دینیی، کۆمۆنیست، مارکسی، دیموکرات، نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری... ئەگرتەوە.

شا بۆ ئەوەی نارەزایی خەلک دابمرکێنێتەوە هەندێ ئاڵوگۆڕی کرد. جەمشیدی ئامووزگاری لابرد و، شەریفی ئیمامی بە سەرۆوەزیران دانا و، جەنەراڵ نەسیری لە سەرۆکایەتی ساواک لابرد و جەنەراڵ موقەددەم ی دانا بەڵام ئەم ئاڵوگۆڕانە شتێکی ئەوتۆ نەبوون هەلومەرجی داگیرساو بکوژێنێتەوە. دروشمی «مرگ بر شاه» کەوت بوە سەر زمانی هەموو کەس و، خەلک بە گشتی ئەیانویست شا بڕوات و ڕژێمی شایەتی بڕوخێنرێ.

شا، جەنەراڵ ئووەیسی دانا بە «فەرمانداری نیزامی تاران»، ئەویش کۆبوونەوە و خۆپیشاندانی قەدەغە کرد. بەڵام جوڵانەوەی نارەزایی تاکتیکی خۆی لە خۆپیشاندانەوە گۆڕی بۆ مانگرتن. ڕۆژانی پرسە و ماتەمی کوژراوەکانیان ئەکرد بە ڕۆژی مانگرتنی گشتی. دوکان و بازار دائەخرا و، زانستگا و خوێندگاکان ئەبەستران، کرێکاران دەستیان لە کار ئەکێشایەوە و، دائیرەکان دەوامیان نەئەکرد.

شا لە کۆتایی حوزەیرانی ٧٨ دا لە گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانی دا بە هەواڵنووسێکی ئەمەریکایی وت بوو: «هیچ کەسی ناتوانی من لابەری، چونکە ٧٠٠ هەزار سپایی و، هەموو کرێکاران و، زۆرایەتی خەلک پشتیوانی منن».

خومەینی بوو بوو بە دوژمنێکی ڕاستەقینە و هاندەری جوڵانەوەی نارەزایی لە ئێران دا. دروشمە ڕیفۆرمیستییەکانی سیاسییەکان و مەلاکان، کە ئەیانویست لە چوارچێوەی قانونی ئەساسی ئێران دا ئازادییەکان دابین بکەن، بە جۆرێکی بنەرەتیی گۆڕی بە دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی شایەتی.

گۆڕانی دۆخی سیاسیی ئێران کاری لە چارەنووسی ئێمەش ئەکرد، لە بەر ئەوە بوو ببوە جێگەی دڵخۆشییەکی بێ ئەندازە بۆ: ڕژێمی شا وەکو دوژمنی نەتەوەی کورد بە گشتی و، وەکو دوژمنی یەکێتی نیشتمانی بە تایبەتی و، وەکو پاڵپشتی بنەماڵەی

بارزانی و قم، توشی تەنگوچەلەمەیەکی قولی لە چارەسەرکردن نەهاتن هات بو. لە دوورەوە بە وردی چاودیریی رووداوەکانمان ئەکرد.

بریارمان دا بو پشتیوانی لەم جولانەوەیە مامجەلال بە ناوی شورشی کوردستانی عیراقەوە چەند نامەیەک بو سەرکردە ناسراوەکانی بنوسی و، ئامادەیی یەکیتی دەربری بو هەر جورە هاوکارییەکی ئەوان بە چاکی ئەزانن.

مامجەلال نامەی بو ئیمام خومەینی و، ئایەتوللا شەریعەتمەداری، ئایەتوللا حسینعەلی مونتەظیری و، چەند کەسیکی تر نوسی. نامەکەی ئیمام خومەینی مان نارد بو ریکخستن ئەوان بە دەستیکی ئەمین دا بوی بنیرن. نامەکانی تریش ساعید و جەعفەر ناردیان بو هاوریکانی خویان لە ئیران پی یان بگەیەنن. ریکخستن کەسیکی شایستەیان دوزی بوەوە نامەکەیان پیا نارد بو نەجەف بو خومەینی، ئەویش داود حسین، باوکی شەهید سەلمان، لە ریخراوی «هەلوی سور»، کە تازە لە بەغدا ئیعدام کرا بو. باوکی سەلمان کەسایەتییەکی ناسراو بو لە ناو کوردە شیعەکان دا، خەلکی مەندەلی بو، بەلام لە بەغدا دائەنیشت.

ئیران و عیراق لەو کاتەدا هەردوکیان کیشەی ناوخویان هەبو لاکەی تر ئەیتوانی بە کاری بهینی: ئیران کیشەی خومەینی و، عیراق کیشەی کورد. هەردولا ئەیویست لاکەی تر رازی بکا بو ئەوەی یاری بەم تاگرە نەکا و، یارمەتی جولانەوەکە نەدا. رژیمی شا جولانەوەی کوردی عیراقی گەمارو دابو، هاوکاری لە گەل کاربەدەستانی عیراق ئەکرد بو دامرکاندنەوەی. رژیمی بەعسیش هاوکاری ئیرانی ئەکرد بو گەمارودانی ئیمام خومەینی.

کاربەدەستانی عیراق بەری چالاکی خومەینیان گرت و، ریگەیان گرت لە لایەنگرەکانی سەردانی بکەن. بەمەش دانەکەوتن. وەزیرانی دەرەوەی عیراق و ئیران کە چوبون بو کوبونەوەی کومەلەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان، ریک کەوتن خومەینی لە عیراق دەربکەن. ئەمە لە ئیران دا دەنگی دابوەوە و بو بە هوی شەپولیکی تری مانگرتنی گشتی لە تاران و شارەکانی تردا. عیراق گوی ی نەدایە نارەزایی خەلکی ئیران خومەینی دەرکرد. خومەینی ماوەیەک لە سەر سنوری کویت مایەوە هیچ دەولەتیک ئامادە نەبو بیگریتە خوی. سەرەنجام فەرەنسا ریگای دا. ٦ ی تشرینی یەکەمی ٧٨ خومەینی گەیشتە فەرەنسا. لە «نوفیل لو شاتو» لە نزیک پاریس بارەگای دانا.

سالی ١٩٨٤ لە کاتی گفتوگوکانی بەعس - یەکیتی دا، سەعدون شاکیر، وەزیری ناوخوی ئەوسای عیراق، رووداوی دەرکردنی ئیمام خومەینی لە نەجەف و لە عیراق بو گیرایەوە، وتی: «کە پیمان وت تو لە عیراق دالدە دراوی بوت نیە دەس بخەیتە

کاروباری ئیرانەوە. لە وەلام دا وتی: «مەسەلەی ئیران تەواو بوە من پەیامم هەیە بۆ هەمو جیهان». وەزیری عیراقی، کە ماوەیەکی درێژ سەرۆکی دەزگای «موخابەرات» ی عیراق بو، دانی پەودا تا کە هەرگیز بە بیریان دا نەئەهات، ئەم ئاخوندە پیرەی لە نەجەف کەوت بو دەسەلاتێکی شاردراوە و نهێنی وەها گەورەی هەبێ و، بێ بەم رێبەرە ئەفسانەییە. بێگومان ئەگەر ئەوسا بەعس ئەوەیان بزانیایە هەرگیز نەیانئەهێشت لە دەستیان دەرچێ.

ئەگەرچی نۆفلێل لو شاتو لە روی جوگرافییەوە، لە چاو نەجەف دا، لە ئیرانەوە دورتر بو، بەلام بو ئیمام خومەینی لە روی پیوەندی کردنەوە بە ئیران و بە لایەنگرەکانیەوە لە دنیا دا ئاسانتر و، ئازادی جولان و قسە کردنی زورتر بو.

دەستەی نوێنەرایەتی یەکێتی کە پێک هات بو لە: د. فوئاد مەعصوم، عادل موراد، ئەحمەد بامەرنی، دو جار لە نوفلیل لو شاتو دیداری ئیمام خومەینیان کرد. چارەنوسی شورشەکە هێشتا دیار نەبو. د. ئیبراهیم یەزدی یش لە دانیشتنەکەدا ئامادە ئەبێ. نوێنەرانی یەکێتی لەم دو دیدارەدا:

پشتیوانی تەواوی یەکێتییان لە شورشەکە دەربری بو.

ئامادەیی یەکێتییان پیشان دا بو کە هەمو هێز و توانای خوی بخاتە خزمەتی شورشی ئیرانەوە.

ئامادەیی یەکێتییان دەربری بو بۆ مەشقدادانی لایەنگرەکانیان و گوێزانەوەیان، بۆ گوێزانەوەی چەک و تەقەمەنی و، لە کاتی پێویست دا خەریککردنی ئەرتەشی ئیران بە شەرەوە لە سەر سنورەکان بۆ ئەوەی نەتوانی هەمو هێزەکانی لە سەر تەوان کو بکاتەوە.

ئامادەی یەکێتییان دەربری بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی ئەوان داوای بکەن و بمان بکرێ.

ئیمام خومەینی سپاسیان ئەکا و، ئەلێ ئیمە ئیستا بەم رێگایە شەری رژێم ئەکەین، ئەگەر ئەم رێگایە سەرکەوتو نەبو، ئەوسا پەنا ئەبەینە بەر چەک و، پێویستیمان بە هاوکاری ئیوەیش ئەبێ. ئینجا لی ی پرسی بون: ئیوە چیتان لە ئیمە ئەوێ؟

نوێنەرەکانی یەکێتی وت بویان: روخانی شا بۆ ئیوە چەند گرنگە، بۆ ئیمەش ئەوەندە گرنگە. ئیمە تەنیا سەرکەوتنی ئیوەمان ئەوێ!

*

لە کاتێک دا سەرانسەری ئیران گری گرت بو، کوردستانی ئیران هێشتا لە خاموشییەکی وەکو خاموشی گورستان دا بو، ئەمەش ئەگەڕایەوە بو چەند هویەک، لەوانە:

١. دانیشتوانی کوردستان بە تایبەتی کوردەکانی ئوستانەکانی کوردستان،

ئازەربایجانی غەربی، بەشێکی کرماشان سوننەن و، مەلاکانیان هیچ جورە پەیوەندییەکیان لە گەڵ دامەزراوی دینیی شیعەدا نەبو. بانگەوازەکانی خومەینی و پیشەواکانی تری شیعە نەیئەتوانی کاریان تێ بکات و بیانبزوێنێ، بە تایبەتی چونکە پێشینەیەکی دورودرێژی چەوسانەوەی مەزهەبیی سوننەی ژێردەستە لە لایەن شیعەی دەسەلاتدارەوە، لە بیری خەلک و پیشەوا دینییەکان دا مابو.

۲. لەوەش گرنگتر کوردستان بۆشاییەکی سیاسی گەورەی تێ دا بو. هیچ رێکخراوێکی سیاسی تێ دا نەبو، خەلک ساز بدا و رێکی بخا و رێبەریی بکا بو دەس پێ کردنی بزوتنەوەیەکی سیاسی دژی شا و ساواک. ئەوسا «کومەلە» رێکخراوێکی پچوک بو پێک هات بو لە ژمارەیەکی کەم کادر. هێشتا خوی ئاشکرا نەکرد بو. نەیشی ئەویست توشی زەرەر بێ. «حیزبی دیموکراتی کوردستان» یش لە ناو ئێران دا رێکخستن یا نفوزی نەبو. سەرکردە و کادر و ئەندامەکانی دور بون لە کوردستان و روداوەکانی ناو ئێران. هەندێکیان لە بەغدا و هەندێکیان لە ئەوروپا بون. دەنگوباسەکانیان لە رادیوکانی دنیاوە ئەبیست.

*

ئەو ماوەیەی لە دەراوی گوێزێ بوین لە ماوەی چەند روژێکی کەم دا چەند کەسێکی ناسراو هاتنە ریزی پێشمەرگەوە لەوانە: سەید سەلیم، شێرکوی شێخ عەلی، ئیبراهیم جەلال.

ئیبراهیم جەلال لە سەرکردایەتی ناوخوی رێکخستنی کومەلە بو. لە قەلاتوکانەوە کە هات بو لە رێگا لە گەڵ هەندێ لە پێشمەرگەکانی مەنگور دەمیان لە یەک گیرا بو. کێشەیەکی زلی لە سەر دروست بو مامجەلال بو پشتیوانی لە ئیبراهیم بە توندی چو بە گژیان دا و سزای دان. برایم لە سەرکردایەتی مایەوە بو بە ئەندامی ناوەندی کومەلە.

شێرکو خوی بە هیچ لایەک دا ساغ نەکرد بووەوە. پێش ئەوەی بێت بێ بە پێشمەرگە لە سلێمانی مەحمودی مەلا عیزەتی دی بو، مەحمود ئاموژگاری کرد بو بێتە لای من و پاش گفتوگو ئینجا کارێک بگرێتە ئەستو. شێرکو لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شورش دا ئەندامی قم بو تەسلیم بوبوو. باوەری بە پارتی نەبو. لە کارەساتی هەکاری دا، ئارازی برای کە لە گەڵ کاک عەلی پێشمەرگە بو، کوژرا بو. چەند روژێ لای ئێمە مایەوە بە ناوی سەردانەوەی ناوچەکەی خویان خواحافیزی لە ئێمە کرد. چو بوە لای رەسول. رەسول کرد بوی بە مەسئولی بزوتنەوە لە دولی جافەتی.

سەید سەلیم لە رێکخستنی بزوتنەوە بو، سەردانی رەسولی کرد بو، رەسول زوری

قسه بو کرد بو له دژی مامجەلال و یەکیتی، کە هاتە لای ئیمە ئەیویست باری سەرنجی هەردولا لە یەک نزیک بکاتەوە. لە گەل خوی چەند پیشمەرگەیەکیشی هینا بو. یەکیکیان ئەورەحمان سەیدە بو. رەحمان برای مەحمود سەیدە بو. مەحمودی برای لە سەرەتای دەس پی کردنەوەدا فەرماندەی کەرت بو لە بالەکایەتی. پیاویکی هەلکەوتوی قارەمان بو. بە زوری ئەم پەرینەوەی پیشمەرگەی لە پردی ناوەندە دابین ئەکرد. ئەو کاتەی ئیمە لە برادوست بوین شەهید بو. مەحمود هاوری ی کومەلە بو.

سەید سەلیم دانرا بە فەرماندەی هەریمی ١٢ ی رەواندز و، دانای ئەحمەد مەجید بە رابەری سیاسی هەریمەکەی. پیکەوە رویشتن بو ناوچەی کارەکانی خویان. بەلام سەید سەلیم کە تورە بونی مامجەلالی لە مەنگورەکان بینی، زوری پی ناخوش بو ئیتر دلی رەنجا.

*

لیپرسینەوە

سەید کاکە و قادری مامەند ئاغای پشدەری هەردوکیان لای ئەم لە دیوی تورکیا دەس بە سەر بون. هەلیان بو هەلکەوت بو هەلات بون. بە دوقولی لە دیوی تورکیاوە خویان کرد بو بە بادینان دا و بە چەند روژی بە ناو کوردستانی عیراق دا گەیشتنەوە لامان. سەید کاکە ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە و، یەکیتی و، فەرماندەی هەریمی ٨ ی دەشتی هەولیر بو. قادرئاغاش فەرماندەی هەریمی ١٢ ی پشدەر بو.

سەید کاکە لە شورشی ئەیلول دا سەرلق بو بو، سەرەتای ئەم شورشەش کاک خالید قسەی لە گەل کرد بو لە گەل خوی هینا بویە دەرەوە. کابرایەکی نەخویندەوار بو بەلام زیرەک و فیلباز و قسە خوش بو. لە سەردەمی پاشایەتی دا چەند جاری لە سەر دزی گیرا بو. لەم شورشەش دا خوشکیکی خوی کوشت بو لە سەر ئەوەی بی رەزامەندی ئەم شوی کرد بو.

ئەو کاتەی ئەوان هاتنەوە نیوانی بزوتنەوە لە گەل یەکیتی تا ئەهات ساردتر ئەبو. عەلی سلیمان برینپیچ بو و، خوی بە کادری بزوتنەوە دائەنا. بو تیمار کردنی هەندی نەخوش چو بو بو ناو هەواری مەنگورەکان و، هەندی قسەی ناشیرینی لە دژی کومەلە کرد بو. قسەکەمان پی گەیشتەوە زورمان پی ناخوش بو. مامجەلال لە هەمومان زیاتری پی ناخوش بو. نامەی بو بزوتنەوە نوسی لە سەر ئەو قسانە لی ی بپرسنەوە. گوی ی خویانیان لی خەواند. مامجەلال گلەیی کرد. سەید کاکە سەری رەسول و ئەوانی دا و هاتەوە. سەید کاکە بە مامجەلالی وت: «بوچی شکات لە عەلی ئەکەیت چونکە قسەی کردوە و گلەیی لە

رەسول ئەکەی چونکە لی ی ئەپرسیوەتەوە؟»

مامجەلال وتی: «ئەی چی لی بکەم؟»

سەید کاکە وتی: «وەکو من محاسبەیان بکە!»

مامجەلال وتی: «چون؟»

سەید کـاکـە وتی: «لە شورشی پیشـودا سـەرلقـیکم هەبو زو زو لە لای بارەگـای بارزانی شکاتی لی ئەکردم. چەند جاری ئامـوژگـاریم کـرد شتی وا نەکـا کـەلکی نەگرت. روژیکیان هات بو بارەگای بەتالیون. منیش چومە مالەوە چەک و فیشـەکدانەکەمم دانا. داریکی ئستورم هەلگرت لە کەندیک دا شاردمەوە. چومە بارەگا لە بەر چاوی هەمویان بە گـەرمی بەخیـر هاتنی کـابرام کـرد و ئەم لا و ئەو لایم مـاچ کـرد. پاش نەختی وتم ئیشم پیتە. لە گـەل خوم بردم بو کەندەکە. هەتا توانیم دارکاریم کرد و پیم وت هەرچەند شکاتم لی بکەی لەمـــولا وەهات لی ئەکـەم. چومـــەوە بو مـــالەوە و لەویوە چومـــەوە بو بارەگـای بەتالیون. کابرا کرد بوی بە هەرا کەوا من لیم داوە. وتم درو ئەکا بە بەرچاوی هەموتانەوە من ریزم لی گـرتوە و، ئەویش لە من بەهیـزتر و قـەلافـەتی گـەورەترە چون ئەتوانم لی ی بدەم. کابرا ئیتر تەمی بو بیرای بیر شکاتی لی نەئەکردم.

توش پیویستی نەئەکـرد شکات لە عەلی سلیمان بکەی. بانگت بکردایە بو ئیرە بتوتایە دەرمانمان بو هاتوە وەرە بەشت بدەم. کە هات لە بەر چاوی هەموان ریزت بگرتایە و نەختی دەرمانیشت بدایەتی. ئینجا بتبردایە بو کەندی لە پەناوە تیروپر داوکاریت بکردایە. کەس نەیئەزانی و عەلی یش تەمی ئەبو»

*

کـــە چوینە ناو پاییزەوە ئیـــتـــر ئەمــــانتـــوانی بلیـــین: لە تیـــشکانی هەکــــاری هەستاوینەتەوە.

- لە روی سیاسییەوە:

گـەلەکـومـەکی ی دەولەتانی ناوچەکـە بو تیکشکاندنی شـورشـەکە و، پـیلانی قم بو تیکشکاندنی یەکیتی، ناوبانگی یەکیتی بەرز کرد بوەوە و، ناوبانگی بنەمالەی بارزانی و قم ی زیاتر دابەزاند بو. خەلکی کـوردسـتـان بە هاودەردیـیـەکی قـولـەوە سـەیری یەکـیـتی و، چالاکییە سیاسی و پیشمەرگەییەکانی ئەکرد. لە خوبرانی پیشمەرگەکانی لە شاخەکان دا و، جموجولی فراوانی ئەندامـەکانی لە شارەکان دا و، ئازایەتی بی وینەی گیـراوەکانی لە زیندانەکـان دا، جیگای ریزی هەمـو کـوردیکی دلسـوز بو. ئـەمـەش زەمـینەی گـەشـەکـردنی ریکخراوەیی و پیشمەرگەیی یەکیتی خوشتر کرد بو.

